# معالم السنة النبوية

## مەشخەڵی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ

پوختەی (١٤) کتێبە، کە بنچینەی کتێبەکانی فەرموودەن


کۆکردنەوەی

صالح أحمد الشامي

وەرگێڕانی

عبدالكريم فتاح




بەرگی یەکەم

# مەشخەڵی سوننەتی پێغەمبەر"صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

## "پوختەی (١٤) کتێبە، کە بنچینەی کتێبەکانی فەرمووده‌ن"

کۆکردنەوەی

صالح احمد الشامي

وەرگێڕانی

عبدالكريم فتاح

بەرگی یەکەم

مەبەستی یەکەم: بیروباوەڕ

مەبەستی دووەم: زانست و سەرچاوەکانی

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# پێشەکی وەرگێڕ

## (پوختەکراوی پێشەکی دانەر)

پرۆژەی (تقريب السنة المطهرة) ئەو پرۆژە مەزنەیە زانای پایەبەرز صالح ئەحمەد شامی رەنگرێژی بۆ کردووە و هەستاوە بە جێبەجێ کردنی، لە چوارچێوەی ئەم پرۆژە مەزنەدا چواردە کتێبی سوننەی ئیخراج کردووە کە زانایان بەسەر کتێبەکانی تری سوننەدا پێشیان دەخەن.

کتێبی (معالم السنة النبوية) پازدەهەمین کتێبە و پوختەی چواردە کتێبەکەی سوننەیە.

**ئەو چواردە کتێبەش ئەمانەن:**

١. موطأ الإمام مالك.
٢. مسند الإمام أحمد.
٣. الجامع الصحيح للإمام البخاري.
٤. الجامع الصحيح للإمام مسلم.
٥. سنن الإمام أبي داود.
٦. جامع الإمام الترمذي.
٧. سنن الإمام النسائي.
٨. سنن الإمام ابن ماجة.
٩. سنن الإمام الدارمي.
١٠. السنن الكبرى للإمام البيهقي.
١١. صحيح الإمام ابن خزيمة.
١٢. صحيح الإمام ابن حبان.
١٣. مستدرك الإمام الحاكم.
١٤. الأحاديث المختارة للإمام المقدسي.

پرۆژەی ئەم چواردە سەرچاوەی فەرموودە لە شەش کتێبی دانەردا کۆکراونەتەوە کە ئەمانەن:

١) الجامع بين الصحيحين.

٢) زوائد السنن على الصحيحين.

٣) (زوائد الموطأ) و (المسند) على الكتب الستة.

٤) (زوائد السنن الكبرى) للبيهقي على الكتب الستة.

٥) (زوائد ابن خزيمة) و (ابن حبان) و (المستدرك) على الكتب التسعة.

ئامانجی سەرەکی پرۆژەکە لادانی فەرموودەی دووبارەیە لەو چواردە سەرچاوەیە، بە جۆرێك فەرموودەیەك تەنها یەك جار باس بکرێت، مەبەست لە یەك فەرموودە ئەوەیە یەکێك لە هاوەڵان ریوایەتی کردووە و لە یەکێك لە چواردە سەرچاوەکەدا دووبارە بووەتەوە.

نموونەی ئەمە: ئەو فەرموودەی کە عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) ریوایەتی کردووە: (إنما الأعمال بالنيات..))، ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا لە چەندین شوێن حەوت جار باسی کردووە، هەروەها ئیمامانی تر وەك ئیمامی ئەحمەد، و موسلیم، و ئەبو داود، و تیرمزی، و نەسائی، و ئیبن ماجە، و ئیبن خوزەیمە، و ئیبن حیبان ئیخراجیان کردووە، لە کۆی ئەم دووبارەبوونەوەیە لە پرۆژەکەدا تەنها یەك جار فەرموودەکە هێنراوە، ئەوەش لەژێر ئەو بابەتەی بۆی دانراوە.

گەر ئەم فەرموودە هاوەڵێکی تر جگە لە عومەر(خوا لێی رازی بێت) ریوایەتی کردبێت لانەدراوە و بە دووبارە سەرژمێر نەکراوە، بەڵکو سەرژمێری فەرموودەیەکی تری بۆ کراوە لەبەر جیاوازی ئەو هاوەڵەی ریوایەتی کردووە.

## سوودی ئەم پرۆژەیە:

گەر ئەم ئامارەت لەبەردەست بێت سوودی پرۆژەکە دەزانی: کۆی ئەو فەرموودانەی لە چواردە سەرچاوەکەی فەرموودەدا هاتوون (١١٤١٩٤) فەرموودەن،

لەدوای لادانی فەرموودە دووبارەکان تەنها (٢٨٤٣٠) فەرموودە ماوەتەوە، ئەمەش واتە کەمتر لە چارەکی فەرموودەکان.

لێرەوە تێدەگەین ئەم پرۆژەیە چەندە کات بۆ خوێنەر و لێکۆڵەر دەگێڕێتەوە.

وتمان پرۆژەکەی لە شەش کتێبدا داڕشتووە، بەڵام ئەم شەش کتێبە-کە بریتین لە ٢٢ بەرگ- فەرموودەی دووبارەیان تێدایە، ئەوەش چونکە زیاتر لە یەك هاوەڵی پێغەمبەر فەرموودەکەی ریوایەت کردووە، بۆیە دانەر جارێکی تر چواردە سەرچاوەکەی بۆ یەك کتێب پوختە کردووە و فەرموودەی دووبارەی تێدا نەهێڵاوە و تەنها لە یەك رێگەوە-یەك هاوەڵەوە- فەرموودەکەی هێناوە و لە کتێبەکەدا دایناوە، بۆ نموونە: فەرموودەی (الحرب خدعة) لە ئەبی هورەیرە، و جابری کوڕی عەبدوڵا، و ئبن عەباس، و کەعبی کوڕی مالیك، و دایکی باوەڕداران عائیشەوە(خوا لە هەموویان رازی بێت) ریوایەت کراوە، لەم کتێبەدا ریوایەتە دووبارەکانی لاداوە و تەنها یەك رێگەی هاتنی فەرموودەکەی هەڵبژاردووە، ئەوەش ئەو رێگەیە دەچێتەوە سەر ئەبو هورەیرە(خوا لێی رازی بێت)، هەڵبژاردنی ئەو رێگەش بۆ صەحیحی یان حەسەنی فەرموودەکە دەگەڕێتەوە، **هێنانی ئەو فەرموودەش ئەم مەرجانەی تێدا رەچاو کراوە:**

یەکەم: فەرموودەکە هەموو ئەو ئەحکامانە بگرێتە خۆ لە دەروازەکەدا بوونیان هەیە.

دووەم: هەموو ئەو مانانە لەئامێز بگرێت لە دەروازەکەدا هاتوون.

ئەم کتێبە(معالم السنة النبوية)-لە بنەڕەتدا- فەرموودەی لاوازی تێدا نییە، گەر لە جێگەیەك فەرموودەیەکی لاوازی هێنا بێت بۆ ئەم مەبەستانەیە:

- لە فەرموودە لاوازەکەدا مانایەك لە ماناکانی فەرموودە صەحیحە هەڵبژێراوەکە رۆشن بکاتەوە، ئەو کات رۆشنکردنەوە و بەیان مەبەستە نەك شتێکی تر.

- فەرموودە لاوازەکە لەسەر زمانی خەڵك بێت و فەرموودەیەکی باو بێت و لەو دەروازەیەدا تەنها ئەو فەرموودە بوونی هەبێت، بۆیە فەرموودە لاوازەکە هێنراوە تا لاوازییەکەی بە خوێنەر و لێکۆڵەر نیشان بدات.

– فەرموودەکانی دەروازەکە هەموو لاواز بن و لە دەروازەی هاندان و ترساندن(ترغيب و ترهيب أو فضائل الأعمال) بن، ئیمام ئەحمەد لەم مەیدانەدا فەرموودەی لاوازی باس کردووە.

نزیك بە سی و سێ فەرموودەی لاواز لەم کتێبەدا هاتوون، لەگەڵ دە فەرموودەی حەسەن کە هەندێك بە لاوازیان دادەنێن، لەگەڵ ئەوەش فەرموودەیەك لاوازییەکەی زۆر بووبێت نەهێنراوە و باس نەکراوە، چونکە فەرموودەی لاواز لە یەك ئاستدا نین.

## رێکخستنی فەرموودەکان لەم کتێبەدا:

لە سەرەتای دەروازەکەوە فەرموودەی دوو صەحیحەکە هێنراوە، پاشان فەرموودەی سوننەکان و دواتر فەرموودەی مەسنەد و کتێبەکانی تر لە چواردە سەرچاوەکەی فەرموودە.

لە کۆتایی هەر فەرموودەیەك بە مەبەستی گەڕانەوە بۆ سەرچاوە سەرەکییەکەیان هێما و ژمارەی داناوە، هێماکە بۆ کتێب دەگەڕێتەوە، و ژمارەکە بۆ ژمارەی فەرموودەکە لەو کتێبەدا، هەروەها–جگە لە فەرموودەی دوو صەحیحەکە– لە کۆتایی فەرموودەکەدا ئاماژە کراوە بۆ پلەی صیححەت و حەسەنی فەرموودەکە.

## هێما و ژمارەکان بەم جۆرەن:

| هێما | کتێب |
|---|---|
| خ | البخاري |
| م | مسلم |
| ق | متفق عليه |
| خـ | معلقات البخاري |
| د | سنن أبي داود |

| | |
|---|---|
| ت | سنن الترمذي |
| ن | سنن النسائي |
| جه | سنن ابن ماجة |
| مي | سنن الدارمي |
| حم | المسند(للإمام أحمد) |
| ط | الموطأ |
| مه | ابن خزيمة |
| حب | ابن حبان |
| ك | المستدرك |
| هق | سنن البيهقي |
| مخ | الأحاديث المختارة |
| ع | للدلالة على أن الحديث من رواية عبدالله بن الإمام أحمد، أو من وجاداته |

دوای پوختەكردن و لادانی فەرموودەی دووبارە لە كۆی (١١٤١٩٤) فەرموودە تەنها (٣٩٢١) فەرموودە ماوەتەوە كە لە كتێبی (معالم السنة النبوية)دا جێگەیان بووەتەوە.

## باسەكانی ناو كتێبەكە بەم جۆرە رێكخراون و هاتوون:

مەبەستی یەكەم: بیروباوەڕ.

مەبەستی دووەم: دەربارەی زانست و سەرچاوەكانی.

مەبەستی سێیەم: دەربارەی عیبادەتەكان.

مەبەستی چوارەم: حوكمەكانی خێزان.

مەبەستی پێنجەم: دەربارەی پێویستییە زەروورەكان.

مەبەستی شەشەم: دەربارەی مامەڵەکان.

مەبەستی حەوتەم: دەربارەی ئیمامەت و کاروباری حوکم.

مەبەستی هەشتەم: دەربارەی دڵنەرمکەرەکان و ئەخلاق و ئاداب.

مەبەستی نۆیەم: دەربارەی مێژوو و ژیاننامە و سەروەرییەکان.

مەبەستی دەیەم: دەربارەی فیتنەکان.

## دەرهێنانی فەرموودەکان و حوکم بەسەریاندا:

لە کۆتایی هەر فەرموودەیەك حوکم بەسەریدا دراوە، صەحیحە یان حەسەن یان شتێکی تر، سەرچاوەی حوکمدان بەسەر فەرموودەکاندا ئەمانەن:

- (السنن الأربعة)–الشيخ ناصر الدين الألباني.
- (سنن الدارمي) محققه الأستاذ حسين سليم أسد الداراني.
- (مسند الإمام أحمد)–الشيخ شعيب الأرناؤوط.
- (الموطأ)–الشيخ عبدالقادر الأرنؤوط.
- (السنن الكبرى) للبيهقي.
- (صحيح ابن خزيمة) محققه الدكتور محمد مصطفى الأعظمي وشاركه في بعضها الشيخ الألباني.
- (صحيح ابن حبان) محققه الشيخ شعيب الأرنؤوط.
- (المستدرك) قام الحافظ الذهبي بالتعليق على بعض أحاديثه.
- (الأحاديث المختارة) قام محققه الدكتور عبد الملك بن دهيش بتخريج أحاديثه.

وەرگێڕ هەوڵیداوە پابەند بێت بە وەرگێڕانێکی دەقا و دەقی فەرموودەکان بە جۆرێك وشە بە وشەی فەرموودەکە وەرگێڕانی بۆ کرابێت، لەگەڵ ئەوەش هەوڵمداوە وەرگێڕانەکە رەوان و روون بێت، گەر لە جێگەیەکی لە دەقە کوردییەکە پێویست بە

ڕوونکردنەوە هەبێت لە پەراوێزدا ڕوونکردنەوەی لەسەر دراوە و پیتی (و)-کە مانای وەرگێڕی هەیە- لەبەردەم دانراوە، بۆ نووسینی ئەو پەراوێزە گەڕاومەتەوە بۆ چەندین سەرچاوە تاکو لە ڕاستی و دروستی پەراوێزەکە دڵنیاببمەوە، دانەریش پەراوێزی تایبەت بە خۆی هەیە، گەر پەراوێزەکە بۆ دانەر بگەڕێتەوە پیتی (و)ی لەبەردەم دانەنراوە.

لە کۆتاییدا حەمد و شوکری خودا دەکەم کۆمەکی کردم بۆ وەرگێڕانی ئەم سەرچاوە پڕ بەرەکەتەی فەرموودە، صەڵات و سەلام لەسەر پێغەمبەری خودا(ﷺ).

وەرگێڕ

عبدالكريم فتاح

٦ی ڕەمەزانی ١٤٤٣

بەرانبەر

٢٠٢٢/٤/٧

## ١- دەروازەی: پایەکانی ئیسلام و ئیمان

١- (ق) عَن ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ). [خ٨، م١٦]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: شەهادەتی (لا إله إلا الله محمد رسول الله)، ئەنجامدانی نوێژ، و دانی زەکات، و حەج، و ڕۆژووی ڕەمەزان).**

٢- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي سَفَرٍ، فَأَصْبَحْتُ يَوْماً قَرِيباً مِنْهُ وَنَحْنُ نَسِيرُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الجَنَّةَ، وَيُبَاعِدُنِي من النَّارِ.

قَالَ: (لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ عَظِيمٍ، وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللهُ عَلَيْهِ: تَعْبُدُ اللهَ وَلاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ البَيْتَ).

ثُمَّ قَالَ: (أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الخَيْرِ: الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ المَاءُ النَّارَ، وَصَلاَةُ الرَّجُلِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ)، قَالَ: ثُمَّ تَلاَ ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ﴾، حَتَّى بَلَغَ: {يَعْمَلُونَ} [السجدة:١٦، ١٧].

ثُمَّ قَالَ: (أَلاَ أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الْأَمْرِ كُلِّهِ وَعَمُودِهِ وَذِرْوَةِ سَنَامِهِ) ؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلاَمُ، وَعَمُودُهُ الصَّلاَةُ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الجِهَادُ).

ثُمَّ قَالَ: (أَلاَ أُخْبِرُكَ بِمَلاَكِ ذَلِكَ كُلِّهِ) ؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رسول اللهِ! فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ، قَالَ: (كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا)، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ! وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ؟ فَقَالَ: (ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا مُعَاذُ! وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ، أَوْ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ؛ إِلاَّ حَصَائِدُ أَلسِنَتِهِمْ). [ت٢٦١٦/ جه٣٩٧٣]

* صحيح.

**لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە وتی: لە سەفەرێك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووم، ڕۆژێك ئێمە دەڕۆیشتین و من لە ئەو نزیك بووم، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، کارێکم پێ بڵێ بمباتە بەهەشتەوە و لە ئاگر دوورم بخاتەوە.**

فەرمووی: **(داوایەکی گەورەت لە من کرد، ئاسانە بۆ کەسێك خودا لەسەری ئاسان بکات، خودا بپەرستە و هیچ شتێك مەکە بە هاوەڵی، نوێژ ئەنجام بدە، و زەکات بدە، و رەمەزان بەڕۆژوو بە، و حەجی ماڵی خودا بکە).**

پاشان فەرمووی: **(دەتەوێ دەروازەکانی خێرت پێ نیشان بدەم؟ رۆژوو قەڵغانە، صەدەقە هەڵە و گوناه دەکوژێنێتەوە وەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە، نوێژی پیاو لە بەشی کۆتایی شەودا)**، وتی: پاشان ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ﴾ تا کەیشتە: ﴿يَعْمَلُونَ﴾ [السجدة:١٦، ١٧].

پاشان فەرمووی: **(دەتەوێ هەواڵت پێ بدەم دەربارەی سەری هەموو کارەکە و پایە و لوتکەی بڵندی)؟** وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: **(سەری کارەکە ئیسلامە، پایەکەی نوێژە، لوتکەی بڵندی[1] جیهادە).**

پاشان فەرمووی: **(دەتەوێ پوختەی هەموو ئەوانەت پێ بڵێم)؟** وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، زمانی خۆی گرت و فەرمووی: **(ئەمەت لە کۆڵ بکرێتەوە)**، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، بۆچی ئێمە لەسەر ئەوەی دەیڵێین لێپێچانەوەمان لێ دەکرێت؟ فەرمووی: **(لەباری دایکت بچوویای ئەی مەعاز، بۆچی خەڵکی کە لە ناو ئاگر بە روودا دەخرێن-یان لەسەر لوتیان- چیترە جگە لە بەرهەمی زمانیان).**

**٣-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم سَأَلَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الإِيمانُ؟ قال: **(إِذَا سَرَّتْكَ حَسَنَتُكَ وَسَاءَتْكَ سَيِّئَتُكَ فَأَنْتَ مُؤْمِنٌ)**. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الإِثْمُ؟ قَالَ: **(إِذَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ شَيْءٌ فَدَعْهُ)**. [ك٣٣]

*** قال الذهبي: على شرطهما.**

[وانظر: **٣١٥** حديث ضمام بن ثعلبة.

وانظر: **٣٣٣٦** في «الطهور شطر الإيمان».

وانظر: **٤٩** في «الإسلام والإيمان والإحسان».

---

[1] "لوتکەی بڵندی" وەرگێڕانە بۆ (ذروة سنامه)، "ذروة" بریتییە بەرزترین خاڵ لە هەر شتێك واتە لوتکە، "سنام" بریتییە لە کۆمایەکی خڕ لە چەوری لەسەر پشتی حوشتر-و.

وانظر: **٦٧** في أركان الإسلام.

وانظر: **٣٥٦٠** في أركان الإيمان.

وانظر: **٣٣٣٢** في أفضل الأعمال].

له ئەبی ئومامەوە: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئیمان چییە؟ فەرمووی: **(گەر چاکەت دڵخۆشی کردی و خراپەت دڵتەنگی کردی تۆ باوەڕداری)**، پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، "الإثم–خراپە" چییە؟ فەرمووی: **(گەر شتێك لە سینەدا خوتوکەی دایت وازیلێبهێنە)**.

## ٢- دەروازەی: ئیخلاص و نییەت

٤- (ق) عن عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(يَا أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ ، وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ ، فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ هَاجَرَ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوْ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ)**.

[خ٦٩٥٣ (١)/ م١٩٠٧]

(ق) لە عومەری کوڕی خەتابەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(خەڵکینە، کارەکان بە نییەتن، هەر مرۆیەك[(١)] ئەوەی بۆ هەیە نییەتی بۆ هێناوە، هەر کەس کۆچەکەی بۆ لای خودا و پێغەمبەرەکەی بێت، کۆچەکەی بۆ لای خودا و پێغەمبەرە، هەر کەس بۆ دنیا کۆچی کردبێت بەدەستی دەهێنێت، هەر کەس کۆچەکەی بۆ ئافرەتێك بێت هاوسەرگیری لەگەڵ دەکات، بۆیە کۆچەکەی بۆ ئەو شتەیە کۆچی بۆ کردووە)**.

- وفي رواية للبخاري: **(إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى..)**. [خ١]

لە ڕیوایەتێکی بوخاریدا: **(کارەکان بە نییەتن، هەر مرۆیەك ئەوەی بۆ هەیە نییەتی بۆ هێناوە..)**.

(١) لەم وەرگێڕانەدا وشەی (إنسان)م بە (مرۆڤ) وەرگێڕاوە و وشەی (امريء)م بە (مرۆ) وەرگێڕاوە –و.

٥- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ أَوَّلَ النَّاسِ يُقْضَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَيْهِ رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ، فَأُتِيَ بِهِ، فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا. قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: قَاتَلْتُ فِيكَ حَتَّى اسْتُشْهِدْتُ، قَالَ: كَذَبْتَ! وَلكِنَّكَ قَاتَلْتَ لِأَنْ يُقَالَ جَرِيءٌ؛ فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ.

وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ وَعَلَّمَهُ وَقَرَأَ الْقُرْآنَ، فَأُتِيَ بِهِ، فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا. قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ وَقَرَأْتُ فِيكَ الْقُرْآنَ. قَالَ: كَذَبْتَ! وَلكِنَّكَ تَعَلَّمْتَ الْعِلْمَ لِيُقَالَ عَالِمٌ، وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ لِيُقَالَ هُوَ قَارِئٌ؛ فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ.

وَرَجُلٌ وَسَّعَ الله عَلَيْهِ، وَأَعْطَاهُ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ كُلِّهِ، فَأُتِيَ بِهِ، فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا. قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: مَا تَرَكْتُ مِنْ سَبِيلٍ تُحِبُّ أَنْ يُنْفَقَ فِيهَا إِلاَّ أَنْفَقْتُ فِيهَا لَكَ. قَالَ: كَذَبْتَ! وَلكِنَّكَ فَعَلْتَ لِيُقَالَ هُوَ جَوَادٌ؛ فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ، ثُمَّ أُلْقِيَ فِي النَّارِ). [م١٩٠٥]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(لە رۆژی قیامەت یەکەمین کەسێك قەزاوەتی بەسەردا دەسەپێت پیاوێکە شەهید کراوە، کەسەکە دەهێنرێت و نیعمەتەکانی خۆی پێ دەناسێنێت، ئەویش دەیانناسێتەوە، پێی دەفەرموێ: چ شتێکت لەو نیعمەتانەدا ئەنجامدا؟ دەڵێ: لەپێناوی تۆ جەنگام تا شەهید بووم، پێی دەفەرموێ: درۆت کرد، بەڵکو بۆ ئەوە جەنگای پێت بوترێ کەسێکی بوێرە، ئەوەت پێ وترا، پاشان فەرمان دەکرێت ببرێت و لەسەر روو رابکێشرێت تا هەڵدەدرێتە ناو ئاگرەوە.**

**پیاوێکیش زانست فێر بووە و خەڵکی فێری زانست کردووە و قورئانی خوێندووە، کەسەکە دەهێنرێت و نیعمەتەکانی خۆی پێ دەناسێنێت و دەیانناسێتەوە، دەفەرموێت: چ شتێك لەو نیعمەتانەدا ئەنجامدا؟ دەڵێت: فێری زانست بووم و خەڵکم فێری زانست کرد و بۆ تۆ قورئانم خوێند، پێی دەفەرموێ: درۆت کرد، بەڵکو فێری زانست بووی بۆئەوەی پێت بوترێت زانایە، قورئانت خوێند بۆئەوەی پێت بوترێت قورئانخوێنە، ئەوەت پێوترا، پاشان فەرمان دەکرێت ببرێت و لەسەر روو رابکێشرێت تا هەڵدەدرێتە ناو ئاگرەوە.**

پیاوێکیش خوا نیعمەتی بەرینی بەسەردا دابارانـدووە لـە هـەموو جۆرەکـانی مـاڵ و سامان، کەسەکە دەهێنرێت و نیعمەتـەکانی خـۆی پـێ دەناسـێنێت و دەیانناسـێتەوە، دەفەرموێت: چ شتێکت لەو نیعمەتانەدا ئەنجامدا؟ دەڵێت: هەر ڕێگەیـەت تـۆ پێتخـۆش بوویێ تیایدا خەرج بکرێت لەپێناوی تۆ خەرجم کردووە[1]، پێی دەفەرموێت: درۆت کرد، بەڵکو ئەو کارانەت کرد بۆئەوەی پێتبوترێت بەخشندە و سەخی، ئەوەت پێوترا، پاشان فەرمان دەکرێت ببرێت و لەسەر ڕوو ڕابکێشرێت تا هەڵدەدرێتە ناو ئاگرەوە).

٦- عن أَبي كَبْشَةَ الْأَنْمَارِيِّ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (ثَلاَثَةٌ أُقْسِمُ عَلَيْهِنَّ، وَأُحَدِّثُكُمْ حَدِيثاً فَاحْفَظُوهُ:

قَالَ: مَا نَقَصَ مَالُ عَبْدٍ مِنْ صَدَقَةٍ، وَلاَ ظُلِمَ عَبْدٌ مَظْلَمَةً فَصَبَرَ عَلَيْهَا إِلاَّ زَادَهُ اللهُ عِزّاً، وَلاَ فَتَحَ عَبْدٌ بَابَ مَسْأَلَةٍ إِلاَّ فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِ بَابَ فَقْرٍ) أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا.

(وَأُحَدِّثُكُمْ حَدِيثاً فَاحْفَظُوهُ، قَالَ: إِنَّمَا الدُّنْيَا لِأَرْبَعَةِ نَفَرٍ: عَبْدٍ رَزَقَهُ اللهُ مَالاً وَعِلْماً، فَهُوَ يَتَّقِي فِيهِ رَبَّهُ، وَيَصِلُ فِيهِ رَحِمَهُ، وَيَعْلَمُ لِلَّهِ فِيهِ حَقّاً، فَهَذَا بِأَفْضَلِ المَنَازِلِ؛ وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللهُ عِلْماً وَلَمْ يَرْزُقْهُ مَالاً، فَهُوَ صَادِقُ النِّيَّةِ، يَقُولُ: لَوْ أَنَّ لِي مَالاً لَعَمِلْتُ بِعَمَلِ فُلاَنٍ، فَهُوَ بِنِيَّتِهِ، فَأَجْرُهُمَا سَوَاءٌ. وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللهُ مَالاً وَلَمْ يَرْزُقْهُ عِلْماً، فَهُوَ يَخْبِطُ فِي مَالِهِ ، بِغَيْرِ عِلْمٍ، لاَ يَتَّقِي فِيهِ رَبَّهُ، وَلاَ يَصِلُ فِيهِ رَحِمَهُ، وَلاَ يَعْلَمُ لِلَّهِ فِيهِ حَقّاً، فَهَذَا بِأَخْبَثِ المَنَازِلِ. وَعَبْدٍ لَمْ يَرْزُقْهُ اللهُ مَالاً وَلاَ عِلْماً، فَهُوَ يَقُولُ: لَوْ أَنَّ لِي مَالاً لَعَمِلْتُ فِيهِ بِعَمَلِ فُلاَنٍ، فَهُوَ بِنِيَّتِهِ، فَوِزْرُهُمَا سَوَاءٌ).　　[ت٢٣٢٥/ جه٤٢٢٨]

* حسن صحيح.

لە ئەبی کەبشەی ئەنمارییەوە: گوێی لە پێغەمبەری خودا بووە دەیفەرموو: (سێ شت سوێندیان لەسەر دەخۆم و قسەیەکتان بۆ دەکەم لەبەری بکەن:

فەرمووی: ماڵ و سامانی بەندە بە صەدەقە لێکردن کەم ناکات، هەر بەندەیەك ستەمێکی لێبکرێت و مافێکی پێشێل بکرێت و لەسەری ئارام بگرێت خودا عیززەتی بۆ زیاد دەکات، هەر بەندەیەك دەروازەی داوا(سواڵی) لە خۆی بکاتەوە خودا دەروازەی هەژاری بە ڕوودا دەکاتەوە) یان وتەیەکی هاوشێوەی ئەوە.

---

[1] واتە: بەپێی شەرعی تۆ خەرجم دەکرد و نێتەکەشم بۆ تۆ بوو-و.

**(هەروەها قسەیەکتان بۆ دەڵێم لەبەری بکەن: فەرمووی: دنیا بۆ چوار کەسە: بەندەیەك خودا ماڵ و سامان و زانستی پێ بەخشیوە، لەوانەدا لە پەروەردگاری خۆی دەترسێت، تیایاندا سیلەی رەحم بەجێدەهێنێت، دەشزانێت لەوانەدا بۆ خودا مافێك هەیە، ئەمە لە باشترین پلە و پایەدایە، بەندەیەك خودا زانستی پێ بەخشیوە، بەڵام ماڵ و سامانی پێ نەداوە، ئەو خاوەنی نییەتی راستگۆیە، دەڵێت: گەر ماڵ و سامانم هەبوایە وەك فڵانە کەسم ئەنجام دەدا، ئەو بە نییەتەکەی خۆی دەگات، بەندەیەك خودا ماڵ و سامانی پێداوە و زانستی پێ نەداوە، ئەو لەناو ماڵ و سامانەکەی–بەبێ زانست– دەگەوزێت، تیایدا لە پەروەردگاری خۆ ناترسێت و سیلەی رەحمی تێدا ئەنجام نادات و وا نازانێت لەوەدا خودا مافێکی هەیە، ئەمە لە خراپترین(پیسترین) مەنزیلەتدایە، بەندەیەکیش خودا ماڵ و سامان و زانستی پێ نەداوە، ئەو دەڵێت: گەر ماڵ و سامانم هەبوایە وەك فڵانم ئەنجام دەدا، ئەو بە نییەتی خۆی دەگات، کۆڵی گوناهی هەردووکیان یەکسانە[1]).**

٧- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ البَاهِلِيِّ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: أَرَأَيْتَ رَجُلاً غَزَا يَلْتَمِسُ الْأَجْرَ وَالذِّكْرَ، مَا لَهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لا شَيْءَ لَهُ)**، فَأَعَادَهَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ يَقُولُ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لا شَيْءَ لَهُ)**، ثُمَّ قَالَ: **(إِنَّ اللهَ لاَ يَقْبَلُ مِنَ العَمَلِ إِلاَّ مَا كَانَ لَهُ خَالِصاً، وَابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ)**. [ن٣١٤٠]

* حسن صحيح.

**لە ئەبی ئومامەی باهیلییەوە وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: چۆن پیاوێك تەماشا دەکەی غەزای کردووە و هەوڵی پاداشت و ناوی باشی داوە، چی بۆ ئەو هەیە؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هیچ شتێکی بۆ نییە)، پیاوەکە سێ جار پرسیارەکەی دووبارە کردەوە و لە هەر جارێکدا پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (هیچ شتێکی بۆ نییە)، پاشان فەرمووی: (خودا تەنها کارێك قبووڵ دەکات پاك و پاڵفتە بۆ ئەو بێت، و تیایدا رووی بەخشندەی خودا بەمەبەست گیرابێت).**

---

[1] چونکە ئاوات بە کەسێك دەخوازێت لە گوناه و خراپە و تاواندایە–و.

٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّمَا يُبْعَثُ النَّاسُ عَلَى نِيَّاتِهِمْ). [جه٤٢٢٩]

* صحيح.

له ئەبی هورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خەڵکی لەسەر نییەتی خۆیان زیندوو دەکرێنەوە).**

٩- عَنِ الضَّحَّاكِ بنِ قَيْسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ اللهَ تعالى يَقُولُ: أَنا خَيْرُ شَرِيكٍ، مَنْ أَشْرَكَ بِي فَهُوَ لِشَرِيكي، يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَخْلِصُوا أَعْمَالَكُمْ للهِ، فَإِنَّ اللهَ لا يَقْبَلُ مِنَ العَمَلِ إِلاَّ مَا خَلَصَ، وَلا تَقُولوا: هَذا للهِ والرحمِ، فَإِنَّه لِلرَّحمِ، وَلَيْسَ للهِ مِنْهُ شَيْءٌ، ولا تَقُولُوا: هَذا للهِ وَلِوُجُوهِكم، فَإِنَّما هُوَ لِوُجُوهِكم، وَلَيْسَ للهِ فِيهِ شَيْءٌ**). [مخ٨/٩٢]

* إسناده حسن.

[وانظر: **١٥٩٣** (يبعث على ما مات عليه).

وانظر: **١٢٨، ١٢٩** (يبعثون على نياتهم).

وانظر: **٢١٠١، ٢١٠٢** في إخلاص العمل.

وانظر: **٣٦٨٧**، جهاد ونية].

له زەحاکی کوڕی قەیسەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: من باشترین هاوبەشم، هەر کەس هاوبەشم بۆ دابنێت هەمووی بۆ هاوبەشەکەمە، خەڵکینە، کارەکانتان بۆ خودا پاك و پاڵفتە بکەن، خودا تەنها کارێك قبووڵ دەکات پاك و پاڵفتە بێت، مەڵێن: ئەمە بۆ خودا و بۆ سیلەی رەحمە، چونکە ئەوە بۆ سیلەی رەحمە و شتێکی بۆ خودا نییە، مەڵێن: ئەمە بۆ خودا و بۆ خاتری ئێوەیە(بۆ رووی ئێوەیە)، چونکە تیایدا شتێك لەوە بۆ خودا نییە).**

## ٣- دەروازەی: ئیسلام پێش خۆی دەڕمێنێت

١٠- (م) عَن ابْنِ شُمَاسَةَ المهْرِيِّ قَالَ: حَضَرْنَا عَمْرَو بْنَ العَاصِ وَهُوَ فِي سِيَاقَةِ الموْتِ ، فَبَكَى طَوِيلاً وَحَوَّلَ وَجْهَهُ إِلَى الجِدَارِ، فَجَعَلَ ابْنُهُ يَقُولُ: يَا أَبَتَاهُ! أَمَا بَشَّرَكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِكَذَا؟ أَمَا بَشَّرَكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِكَذَا؟ قَالَ: فَأَقْبَلَ بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: إِنَّ أَفْضَلَ مَا نُعِدُّ شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، إِنِّي قَدْ كُنْتُ عَلَى أَطْبَاقٍ ثَلاَثٍ:

لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَمَا أَحَدٌ أَشَدَّ بُغْضاً لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنِّي، وَلاَ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَكُونَ قَدْ اسْتَمْكَنْتُ مِنْهُ فَقَتَلْتُهُ، فَلَوْ مُتُّ عَلَى تِلْكَ الحَالِ لَكُنْتُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ.

فَلَمَّا جَعَلَ اللهُ الْإِسْلاَمَ فِي قَلْبِي، أَتَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقُلْتُ: ابْسُطْ يَمِينَكَ فَلْأُبَايِعْكَ، فَبَسَطَ يَمِينَهُ، قَالَ: فَقَبَضْتُ يَدِي. قَالَ: **(مَا لَكَ يَا عَمْرُو)** ؟ قَالَ قُلْتُ: أَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِطَ قَالَ: **(تَشْتَرِطُ بِمَاذَا)** ؟ قُلْتُ: أَنْ يُغْفَرَ لِي، قَالَ: **(أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الْإِسْلاَمَ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ؟ وَأَنَّ الهِجْرَةَ تَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلِهَا؟ وَأَنَّ الحَجَّ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ)**؟.

وَمَا كَانَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَلاَ أَجَلَّ فِي عَيْنِي مِنْهُ، وَمَا كُنْتُ أُطِيقُ أَنْ أَمْلأَ عَيْنَيَّ مِنْهُ إِجْلاَلاً لَهُ، وَلَوْ سُئِلْتُ أَنْ أَصِفَهُ مَا أَطَقْتُ، لِأَنِّي لَمْ أَكُنْ أَمْلأُ عَيْنَيَّ مِنْهُ، وَلَوْ مُتُّ عَلَى تِلْكَ الحَالِ لَرَجَوْتُ أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ.

ثُمَّ وَلِينَا أَشْيَاءَ مَا أَدْرِي مَا حَالِي فِيهَا، فَإِذَا أَنَا مُتُّ، فَلاَ تَصْحَبْنِي نَائِحَةٌ وَلاَ نَارٌ، فَإِذَا دَفَنْتُمُونِي؛ فَشُنُّوا عَلَيَّ التُّرَابَ شَنّاً، ثُمَّ أَقِيمُوا حَوْلَ قَبْرِي قَدْرَ مَا تُنْحَرُ جَزُورٌ، وَيُقْسَمُ لَحْمُهَا، حَتَّى أَسْتَأْنِسَ بِكُمْ، وَأَنْظُرَ مَاذَا أُرَاجِعُ بِهِ رُسُلَ رَبِّي. [م١٢١]

**(م) لە ئیبن شوماسەی مەهرییەوە وتی: لەسەر عەمری کوڕی عاص ئامادە بووین ئەو لە سەرەمەرگدا بوو، زۆر گریا و ڕووی خۆی کردە دیوارەکە، کوڕەکەی دەیوت: باوکە گیان، ئایا پێغەمبەری خودا(ﷺ) مژدەی ئەوەی پێ نەدای؟ دەڵێ: ڕووی کردەوە ئێمە و وتی: باشترین شتێك ئامادەی بکەین شەهادەی (أن لا إلە إلا الله، وأنَّ محمدا رسولُ الله)یە، من لەسەر سێ حاڵ بووم:**

**منت بینی ڕۆژگارێك هیچ کەس بەقەدەر من ڕقی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەبوو، هیچ کەس بەقەدەر من حەزی بەوە نەبوو دەسەڵاتم هەبوایە و بمتوانیبا بیکوژم، گەر لەسەر ئەو حاڵە بمردبام لە ئەهلی ئاگر بووم.**

کاتێك خودا ئیسلامی خستە ناو دڵمەوە، هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتم: دەستی راستت بکەرەوە با بەیعەتت پێ بکەم، ئەویش دەستی راستی کردەوە، وتی: منیش دەستیم گووشی، پێغەمبەر فەرمووی: **(چیتە عەمر؟)** وتی: وتم مەرجم هەیە، فەرمووی: **(چ مەرجێك)**، وتم: خودا لێمخۆش ببێت، پێغەمبەر فەرمووی: **(بۆ نازانی ئیسلام ئەوەی لە پێشییەوە بوو دەڕمێنێت؟ کۆچ کردن ئەوەی لە پێشییەوە بوو دەڕوخێنێت؟ حەج کردن ئەوەی لە پێشییەوە بوو هەرەس پێ دەهێنێت؟)**.

هیچ کەس لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لای من خۆشەویستتر نەبوو، و هیچ کەس لە ئەو لەبەرچاوم شکۆمەندتر نەبوو، نەمدەتوانی چاوەکانم لە تەماشاکردنی ئەو تێر بکەم لەبەر مەزنی و شکۆمەندی ئەو، گەر لەسەر ئەو حاڵە بمردبام رجام وابوو ئەهلی بەهەشت بم.

پاشان کۆمەڵێك شتمان گرتەدەست نازانم حاڵم چۆنە تیایاندا، گەر من مردم با مردوولاوێن و ئاگر[1] هاوەڵیم نەکات، گەر منتان ناشت خۆڵ بکەن بەسەرمدا، پاشان ئەوەندەی حوشترێك سەردەبڕن و گۆشتەکەی دابەش دەکەن بە دەوری گۆڕەکەمدا بوەستن، تا پێتانەوە هۆگر ببم و وردببمەوە بزانم چی وەڵامی نێراوانی پەروەردگار دەدەمەوە.

١١- عَنْ أَنَسٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولُ اللهِ، مَا تَرَكْتُ حَاجَّةَ ولا دَاجَّةَ إِلاَّ قَدْ أَتَيْتُ. قَالَ: (**أَلَيْسَ تَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ؟**) ثَلاثَ مراتٍ. قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (**فَإِنَّ ذَلكَ يَأْتِي عَلى ذَلكَ**). [مخ٥/١٧٧٣]

* إسناده صحيح.

لە ئەنەسەوە وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، هەرچی گوناهی بچووك و گەورەیە ئەنجامم داوە، پێغەمبەر(ﷺ) سێ جار فەرمووی: **(ئایا شایەتی دەدەی (أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله؟))** وتی: بەڵێ، فەرمووی: **(ئەوە دێت بەسەر ئەوەدا)**.

---

[1] ئاگر شوێنخستنی مردوو نەرێتێکی ئەهلی نەفامی بوو—و.

## ٤- دەروازەی: ئیسلام دینەکانی پێشوو دەسڕێتەوە

**١٢-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (**وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ! لاَ يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ يَهُودِيٌّ وَلاَ نَصْرَانِيٌّ، ثُمَّ يَمُوتُ، وَلَمْ يُؤْمِنْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ؛ إِلاَّ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ**). [م١٥٣]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، فەرمووی: (**سوێند بەو کەسەی نەفسی محەمەدی بەدەستە، هەر کەس لەم دوو ئومەتە یەهودی و نەصرانی پەیامەکەی من ببیستێ، و باوەڕ نەهێنێت بەوەی بە مندا رەوانەکراوە و پاشان بمرێت، دەبێتە یەکێك لە هاوەڵانی ئاگر**).

**١٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: أَيُّ الْأَدْيَانِ أَحَبُّ إِلَى اللهِ؟ قَالَ: (**الْحَنِيفِيَّةُ السَّمْحَةُ**). [حم٢١٠٧]

* صحيح لغيره.

لە ئیبن عەباسەوە وتی: بە پێغەمبەر وترا: چ دینێك لای خودا خۆشەویسترینە؟ فەرمووی: (**دینی حەنەفییەتی پڕ لە ئاسانی و لێبوردن و چاوپۆشی**).

## ٥- دەروازەی: هەر کەس لەسەر یەکتاپەرستی بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە

**١٤-** (ق) عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَتَانِي آتٍ مِنْ رَبِّي، فَأَخْبَرَنِي . أَوْ قَالَ: بَشَّرَنِي . أَنَّهُ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِي لاَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً، دَخَلَ الْجَنَّةَ**). قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: (**وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ**). [خ١٢٣٧/ م٩٤]

(ق) لە ئەبی زەڕەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هاتوویەك لە پەروەردگارەوە هات بۆ لام و هەواڵی پێدام**-یان فەرمووی: **مژدەی پێدام- هەر کەس لە ئومەتەکەم بمرێت و شتێکی نەکردبێت بە هاوەڵ بۆ خودا، دەچێتە بەهەشتەوە**) وتم: ئەگەر زینای کردبێ و دزی ئەنجام دابێت؟ فەرمووی: (**با زینای کردبێ و دزیشی ئەنجام دابێت**).

**١٥-** (ق) عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم . وَمُعاذٌ رَدِيفُهُ عَلَى الرَّحْلِ . قَالَ: (**يَا مُعَاذُ بْنَ جَبَلٍ**) ! قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ! قَالَ: (**يَا مُعَاذُ**) ! قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ! ثَلاَثاً، قَالَ: (**مَا مِنْ أَحَدٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، صِدْقاً مِنْ قَلْبِهِ؛ إِلاَّ حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ**). قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَفَلاَ أُخْبِرُ بِهِ النَّاسَ فَيَسْتَبْشِرُوا؟ قَالَ: (**إِذاً يَتَّكِلُوا**). وَأَخْبَرَ بِهَا مُعَاذٌ عِنْدَ مَوْتِهِ تَأَثُّماً. [خ١٢٨، م٣٢]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: مەعاز لە پاشکۆی پێغەمبەری خودادا سوار بووبوو، پێغەمبەر فەرمووی: (ئەی مەعازی کوڕی جەبەل)، مەعاز وتی: "لبیك یا رسول الله وسعدیك"[1]، پێغەمبەر فەرمووی: (ئەی مەعاز)، مەعاز وتی: (لبیك یا رسول الله وسعدیك)، سێ جار، پێغەمبەر فەرمووی: (هەر کەس راستگۆیانە لە دڵەوە شایەتی بدات "أن لا إلە إلا الله وأن محمدا رسولُ الله" خوا ئەو لە ئاگر حەرام دەکات)، مەعاز وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا هەواڵبدەم بە خەڵکی تا شاد و دڵخۆش بن؟ فەرمووی: (گەر هەواڵیان پێ بدەی شان لەسەر ئەوە دادەدەن)، مەعاز لەسەر مەرگدا لە ترسی گوناهی شاردنەوەی زانست ئەو هەواڵەی گەیاند.**

**١٦-** (ق) عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: بَيْنَا أَنَا رَدِيفُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ إِلاَّ أَخِرَةُ الرَّحْلِ، فَقَالَ: (**يَا مُعَاذُ**) ! قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ! ثُمَّ سَارَ سَاعَةً ثُمَّ قَالَ: (**يَا مُعَاذُ**) ! قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ! ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: (**يَا مُعَاذُ**) ! قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: (**هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللهِ عَلَى عِبَادِهِ**) ؟ قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: (**حَقُّ اللهِ عَلَى عِبَادِهِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً**). ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: (**يَا مُعَاذُ بْنَ جَبَلٍ**) ! قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ، فَقَالَ: (**هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ العِبَادِ عَلَى اللهِ إِذَا فَعَلُوهُ**) ؟ قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: (**حَقُّ العِبَادِ عَلَى اللهِ أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمْ**). [خ٥٩٦٧ (٢٨٥٦)/ م٣٠]

**(ق) لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: لە پاشکۆی پێغەمبەر(ﷺ) سوار بووبووم، تەنها کۆتایی کۆڵ و بارەکە لە نێوان من و پێغەمبەر بوو، فەرمووی: (ئەی مەعاز)، وتم: (لبیك رسولَ الله، وسعدیك)، پاشان ماوەیەك رۆیشت و**

---

[1] **"لبیك وسعدیك": ئەم گوزارشتە دوعایە، واتە من لە خزمەتم، یان من خزمەتکارم-و.**

ئـەوجا فـەرمووی: **(ئـەی مـەعاز)**، وتم: (لبيـك رسـولَ الله، وسـعديك)، پاشـان ماوەيـەك ڕۆيشت و ئەوجا فەرمووی: **(دەزانی مافی خودا چییە لەسەر بەندەکانی؟)**، وتم: خـودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: **(مافی خودا لەسەر بەنـدەکانی ئەوەيـە بيپەرسـتن و شتێك نەکەن بە هاوەڵی)**، پاشان ماوەيەك ڕۆيشت و ئەوجا فـەرمووی: **(ئـەی مـەعازی کـوڕی جەبـەل)**، وتم: (لبيـك رسـولَ الله، وسـعديك)،، فـەرمووی: **(ئايـا دەزانـی مـافی بەندەکان لەسەر خودا چییە گەر ئـەوەيان ئەنجامـدا)؟** وتم: خـودا و پێغەمبەرەکـەی زاناترن، فەرمووی: **(مافی بەندەکان لەسەر خودا ئەوەيە سزايان نەدات)**.

**١٧**– (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَا الموجِبَتَانِ؟ فَقَالَ: **(مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً دَخَلَ النَّارَ)**. [م٩٣]

(م) لە لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە وتی: پياوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتـی: ئەی پێغەمبـەری خـودا، دوو پێويسـتەکەرەکان(الموجبتـان[1]) کامانـەن؟ فـەرمووی: **(هەر کەس بمرێت و شتێك نەکات بە هاوەڵی خودا دەچێتە بەهەشتەوە، هەر کـەس بمرێت و شتێکی کردبێت بە هاوەڵ(هاوبەش) بۆ خودا دەچێتە ئاگرەوە)**.

**١٨**– عن عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ لَقِيَ اللهَ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً لَمْ تَضُرَّهُ مَعَهُ خَطِيئَةٌ، وَمَنْ مَاتَ وَهُوَ يُشْرِكُ بِهِ لَمْ يَنْفَعْهُ مَعَهُ حَسَنَةٌ)**. [حم٦٥٨٦]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس بە خودا بگات و شتێکی نەکردبێت بە هاوەڵی خودا هەڵە و گوناهێك لەگەڵی زيان بە ئەو ناگەيەنێت، هەر کەس بمرێت و شتێکی کردبێت بە هاوەڵ بۆ خودا چاکەيەك لەگەڵی سوودی پێ ناگەيەنێت)**.

---

[1] "الموجبتان": واتە: ئەو خەسڵەتەی بەهەشت پێويست دەکات و ئـەو خەسـڵەتەی ئـاگر پێويست دەکات.

**١٩**– عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَنْ لَقِيَ اللهَ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً، يُصَلِّي الخَمْسَ، وَيَصُومُ رَمَضَانَ، غُفِرَ لَهُ**)، قُلْتُ: أَفَلاَ أُبَشِّرُهُمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**دَعْهُمْ يَعْمَلُوا**). [حم٢٢٠٢٨، ٢١٩٩٤]

* صحيح.

لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس بە خودا بگات و شتێکی نەکردبێت بە هاوبەش بۆ خودا، پێنج نوێژەکە بکات و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت، خودا لێیخۆش دەبێت)**، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا مژدەیان پێ بدەم؟ فەرمووی: **(لێیانگەڕێ با کار ئەنجام بدەن)**.

## ٦- دەروازەی: هەر کەس لەسەر بێباوەڕی بمرێت دەچێتە ئاگرەوە

**٢٠**– (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ابْنُ جُدْعَانَ، كَانَ فِي الجَاهِلِيَّةِ يَصِلُ الرَّحِمَ، وَيُطْعِمُ المِسْكِينَ، فَهَلْ ذَاكَ نَافِعُهُ؟ قَالَ: (**لا يَنْفَعُهُ، إِنَّهُ لَمْ يَقُلْ يَوْماً: رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ**). [م٢١٤]

(م) لە عائیشەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئیبن جودعان لە سەردەمی نەفامیدا سیلەی ڕەحمی بەجێدەهێنا، و خواردنی بە هەژاران(گەدایان) دەدا، ئایا ئەوە سوودی پێ دەگەیەنێت؟ فەرمووی: **(سوودی پێ ناگەیەنێت، ئەو ڕۆژێ نەیوت: پەروەردگار، لە ڕۆژی دوایی لە هەڵە و گوناهەکانم خۆشببە)**.

**٢١**– عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**كُلُّ ذَنْبٍ عَسَى اللهُ أَنْ يَغْفِرَهُ؛ إِلاَّ الرَّجُلُ يَقْتُلُ المُؤْمِنَ مُتَعَمِّداً، أَوْ الرَّجُلُ يَمُوتُ كَافِراً**). [ن٣٩٥٥]

* صحيح.

لە موعاویەوە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(رجا وایە خودا لە هەموو گوناهێك خۆشببێت جگە لە گوناهی پیاوێك بەئەنقەست باوەڕدارێك دەکوژێت، یان پیاوێك بە بێباوەڕی دەمرێت)**.

## ٧- دەروازەی: تا دەڵێن: (لا إله إلا الله)

٢٢- (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لا إله إلا اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلاةَ، ويُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ؛ إلا بِحَقِّ الإِسلامِ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ). [خ٢٥/ م٢٢]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵك بجەنگم تا شایەتی دەدەن "أنْ لا إله إلا الله، وأنَ محمدا رسولُ الله"، نوێژ ئەنجام بدەن و زەکات بدەن، گەر ئەوەیان ئەنجامدا، خوێن و ماڵ و سامانیان لە من پارێزراوە، مەگەر بە حەقی ئیسلام، و حسابی ئەوان لەسەر خودایە).**

## ٨- دەروازەی: ئەو کاتەی تیایدا ئیمان قبووڵ ناکرێت

٢٣- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (ثَلاَثٌ إِذَا خَرَجْنَ، لاَ يَنْفَعُ نَفْساً إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ، أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْراً: طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَالدَّجَّالُ، وَدَابَّةُ الْأَرْضِ). [م١٥٨]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر سێ شت دەرکەوتن ئیمان سوود بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت، گەر پێشتر ئیمانی نەهێنابێت، یان بە ئیمانەکەی خێری ئەنجام نەدابێت: هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، ودەجال، و دابەکەی زەوی[1]).**

---

[1] "دابة الأرض": دابەکەی زەوی لەم ئایەتەی قورئاندا باس کراوە: ﴿وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لا يُوقِنُونَ﴾ [النمل: ٨٢].

## ٩- دەروازەی: (الرَّحْمَانِ الرَّحِيمِ)

**٢٤-** (ق) عن أبي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (جَعَلَ اللهُ الرَّحْمَةَ فِي مِائَةَ جُزْءٍ، فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ جُزْءاً، وَأَنْزَلَ فِي الْأَرْضِ جُزْءاً وَاحِداً، فَمِنْ ذَلِكَ الجُزْءِ يَتَرَاحَمُ الخَلْقُ، حَتَّى تَرْفَعَ الفَرَسُ حَافِرَهَا عَنْ وَلَدِهَا، خَشْيَةَ أَنْ تُصِيبَهُ). [خ٦٠٠٠/ م٢٧٥٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(خودا رەحمەتی کردووە بە سەد بەشەوە، نەوەد و نۆ بەشی لای خۆی هەڵگرتووە، تەنها یەك بەشی بۆ زەوی دابەزاندووە، بەو بەشە دروستکراوان بەزەیی بە یەکتر دەکەن، تەنانەت ماین(مێیەی ئەسپ) سمی خۆی لە بەچکەکەی بەرزدەکاتەوە لە ترسی ئەوەی ئازاری بدات).**

- زاد في رواية لهما: (فَلَوْ يَعْلَمُ الكَافِرُ بِكُلِّ الَّذِي عِنْدَ اللهِ مِنَ الرَّحْمَةِ لَمْ يَيْأَسْ مِنَ الجَنَّةِ، وَلَوْ يَعْلَمُ المُؤْمِنُ بِكُلِّ الَّذِي عِنْدَ اللهِ مِنَ العَذَابِ، لَمْ يَأْمَنْ مِنَ النَّارِ). [خ٦٤٦٩/ م٢٧٥٥]

لە ریوایەتێکی تری هەردووکیان هاتووە: **(گەر بێباوەڕ بە هەموو ئەو رەحمەتە بزانێت لای خودایە لە بەهەشت بێهیوا نابێت، گەر باوەڕدار بە هەموو ئەو سزایە بزانێت لای خودایە لە ئاگر لە ئاسایشدا نابێت).**

**٢٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَمَّا قَضَى اللهُ الخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابِهِ، فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ العَرْشِ: إنَّ رَحْمَتِي غَلَبَتْ غَضَبِي). [خ٣١٩٤/ م٢٧٥١]

(ق) لە ئەی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کاتێك خودا دروستکراوانی بەدیهێنا لە نووسراوەکەی خۆیدا-کە لە لای خۆیەتی لەسەرو عەرشەوە- نووسی: رەحمەتم بەسەر تووڕەبووونمدا زاڵ بووە).**

- وفي رواية لهما: (سَبَقَتْ غَضَبِي). [خ٧٤٢٢]

لە ریوایەتێکی هەردووکیان هاتووە: **(پێش تووڕەبوونم کەوتووە).**

**٢٦-** (خ) عن أبي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي صَلاَةٍ وَقُمْنَا مَعَهُ، فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ: اللهُمَّ ارْحَمْنِي وَمُحَمَّداً، وَلاَ تَرْحَمْ مَعَنَا أَحَداً، فَلَمَّا سَلَّمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، قَالَ لِلْأَعْرَابِيِّ: **(لَقَدْ حَجَّرْتَ وَاسِعاً)**. يُرِيدُ: رَحْمَةَ اللهِ. [خ٦٠١٠]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نوێژێکدا هەستایە و ئێمەش لەگەڵی هەستاینەوە، ئەعرابییەك-كە لە نوێژدا بوو- وتی: "أللهم ارحمني ومحمدا ولا ترحم معنا أحدا-خودایە ڕەحم بە من و محەمەد بکە و ڕەحم بە هیچ کەس لەمانە مەکە لەگەڵ ئێمەن"، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) سەلامی دایەوە، بە ئەعرابییەکەی فەرموو: (تۆ بەرینێکت بەرتەسك كردەوە[1])، مەبەستی ڕەحمەتی خودا بوو.**

**٢٧-** عَنْ أَنَسٍ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَصَبِيٌّ فِي الطَّرِيقِ، فَلَمَّا رَأَتْ أُمُّهُ القَوْمَ خَشِيَتْ عَلَى وَلَدِهَا أَنْ يُوطَأَ، فَأَقْبَلَتْ تَسْعَى وَتَقُولُ: ابْنِي ابْنِي! وَسَعَتْ فَأَخَذَتْهُ، فَقَالَ القَوْمُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا كَانَتْ هَذِهِ لِتُلْقِيَ ابْنَهَا فِي النَّارِ، قَالَ: فَخَفَّضَهُمُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(وَلاَ اللهُ عزّ وجل، لاَ يُلْقِي حَبِيبَهُ فِي النَّارِ)**. [حم١٢٠١٨]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوەڵانی تێپەڕین، منداڵێك لەسەر ڕێگەکە بوو، کاتێك دایکی منداڵەکەی بینی ترسی ئەوەی هەبوو پێی پێدابنرێت، بەخێرایی هات و دەیوت: کوڕەکەم، کوڕەکەم، بەپەلە منداڵەکەی هەڵگرت، خەڵکەکە وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەم ئافرەتە منداڵەکەی خۆی ناخاتە ئاگرەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هێواشی کردنەوە و فەرمووی: (خوداش(ﷻ) هەر بەو جۆرە، خۆشەویستەکەی خۆی ناخاتە ئاگرەوە).**

**٢٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لِلَّهِ عزّ وجل مِائَةُ رَحْمَةٍ، وَإِنَّهُ قَسَمَ رَحْمَةً وَاحِدَةً بَيْنَ أَهْلِ الْأَرْضِ فَوَسِعَتْهُمْ إِلَى آجَالِهِمْ، وَذَخَرَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ رَحْمَةً لِأَوْلِيَائِهِ، واللهُ عزّ وجل قَابِضٌ تِلْكَ الرَّحْمَةَ الَّتِي قَسَمَهَا بَيْنَ أَهْلِ الْأَرْضِ إِلَى التِّسْعَةِ وَالتِّسْعِينَ، فَيُكَمِّلُهَا مِائَةَ رَحْمَةٍ لِأَوْلِيَائِهِ يَوْمَ القِيَامَةِ)**. [حم١٠٦٧٠، ١٠٦٧٢]

* صحيح على شرط الشيخين.

---

[1] **واتە تۆ ڕەحمی بەرینی خودات بەرتەسك كردەوە-و.**

**لە ئەبی هورەیرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بۆ خـودا(ﷻ) سـەد رەحمـەت هەیە، یەك رەحمەتی لە نێوان ئەهلی سەر زەوی دابەش کردووە تـا کۆتـایی تەمـەنیان بەشیان دەکات، نەوەد و نۆ رەحمەتی بۆ دۆستانی خۆی هەڵگرتووە، خودا(ﷻ) لە رۆژی قیامەت ئەو رەحمەتەی لە نێوان ئەهلی زەوی دابەشی کرد بوو دەهێنێت و دەیخاتە سەر نەوەد و نۆ رەحمەتەکە و دەیکات بە سەد رەحمەتی تەواو بۆ دۆستانی خۆی).**

**٢٩**– عَنْ أَبِي طَلْحَةَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ قَالَ: لا إِلهَ إِلا اللهُ، دَخَلَ الجَنَّةَ وَوَجَبَتْ لَهُ الجَنَّةُ، وَمَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، مِائَةً، كَتَبَ اللهُ لَهُ أَلْفَ** حَسَنَةٍ وأربعاً وعشرينَ حَسَنَةً)، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِذاً لا يَهْلِكُ مِنَّا أَحَدٌ؟ قَالَ: (بَلَى، **إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَجِيءُ بِالحَسَنَاتِ لَوْ وُضِعَتْ عَلى جَبَلٍ أَثْقَلَتْهُ، ثُمَّ تَجِيءُ النِّعَمُ فَتَذْهَبُ بِتِلْكَ، ثُمَّ يَتَطَاوَلُ الرَّبُّ بَعْدَ ذَلِكَ بِرَحْمَتِهِ**). [ك٧٦٣٨]

* قال الذهبي: صحيح.

لە ئەبی تەلحەی ئەنصارییەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بڵێ: "لا إله إلا الله" دەچێتە بەهەشتەوە و بەهەشتی بۆ واجب دەبێت، هەر کەس سەد جار بڵێت: "سبحان الله وبحمده" خودا هەزار و بیست و چوار چاکەی بۆ دەنوسێت)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، کەوابوو کەس لە ئێمە تیاناچێت؟ فەرمووی: **(با، یەکێك لە ئێوە ئەوەندە چاکە دەهێنێت گەر لەسەر چیایەك دابنرێت دەیپسێنێت، پاشان نیعمەتەکان دێن و ئەوانە دەبەن، پاشان پەروەردگار بە بەزەیی خۆی فەزڵ(مننەت) دەنوێنێت).**

## ١٠- دەروازەی: (ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ)

**٣٠**– (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ، عَن النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فِيمَا رَوَى عَن اللهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَنَّهُ قَالَ: (**يَا عِبَادِي! إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّماً، فَلاَ تَظَالَمُوا.**

**يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ؛ فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ.**

**يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ؛ فَاسْتَطْعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ.**

يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ؛ فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ.

يَا عِبَادِي! إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً؛ فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ.

يَا عِبَادِي! إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي.

يَا عِبَادِي! لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئاً.

يَا عِبَادِي! لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئاً.

يَا عِبَادِي! لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلُونِي، فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي؛ إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ.

يَا عِبَادِي! إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْراً فَلْيَحْمَدِ اللهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ). [م٢٥٧٧]

(م) لە ئەبی زەڕەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، لەوەی لە خوداوە(تبارك وتعالى) گێڕایەوە، خودا فەرموویەتی: **(بەندەکانم، من ستەمم لەسەر نەفسی خۆ حەرام کردووە، لە نێوان ئێوەش حەرامم کردووە، بۆیە ستەم مەکەن،**

**بەندەکانم، هەمووتان گومڕان جگە لەوەی هیدایەتم داوە، داوای هیدایەتم لێ بکەن هیدایەتتان دەدەن،**

**بەندەکانم، هەمووتان برسین جگە لەوەی خۆراکم پێداوە، داوای خۆراکم لێ بکەن پێتان دەبەخشم،**

**بەندەکانم، هەمووتان رووتن جگە لەوەی پۆشتەم کردووە، داوای پۆشتەکردنەوەم لێ بکەن پۆشتەتان دەکەمەوە،**

**بەندەکانم، ئێوە بە شەو و بە رۆژ هەڵە و گوناە دەکەن، منیش لە هەموو گوناهان خۆشدەبم، داوای لێخۆشبوونم لێ بکەن لێتان خۆشدەبم،**

**بەندەکانم، ئێوە ناگەنە زیان گەیاندن بە من تا زیانم پێ بگەیەنن، هەروەها ناگەنە قازانج گەیاندن بە من تا قازانجم پێ بگەیەنن،**

**بەندەکانم، گەر پێشینەکانتان و پاشینەکانتان(یەکەمین و دواهەمینتان) و مرۆڤ و جنۆکەتان لەسەر دڵی تەقوادارترین پیاو بێت لە ئێوە، شتێك لە موڵکی من زیاد ناکات،**

**بەندەكانم، گەر پێشینەكانتان و پاشینەكانتان(یەكەمین و دواهەمینتان) و مرۆڤ و جنۆكەتان لەسەر دڵی بەدڕەفتارترین پیاو بێت لە ئێوە، شتێك لەوەی لای منە كەم ناكات، مەگەر وەك دەرزییەكی دروومان بخرێتە ناو دەریایەك،**

**بەندەكانم، ئەوانە كارەكانی ئێوەن بۆ ئێوەی هەژمار و تۆمار دەكەم، پاشان لەسەریان پاداشت و سزا وەردەگرن، هەر كەس خێری بینییەوە با حەمدی خودا بكات، هەر كەس شتێكی تری بینییەوە با تەنها لۆمەی نەفسی خۆی بكات).**

## ١١- دەروازەی: خودا ناخەوێت

**٣١-** (م) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ، فَقَالَ: (**إِنَّ اللهَ عزّ وجل لاَ يَنَامُ وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ، يَخْفِضُ الْقِسْطَ وَيَرْفَعُهُ، يُرْفَعُ إِلَيْهِ عَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَلِ النَّهَارِ، وَعَمَلُ النَّهَارِ قَبْلَ عَمَلِ اللَّيْلِ، حِجَابُهُ النُّورُ، لَوْ كَشَفَهُ لأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ**).

(م) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا بۆ وتنی پێنج وتە لەناو ئێمە راستبوویەوە: **(خودا(ﷻ) ناخەوێت، بۆ ئەو شیاو نییە بخەوێت، ترازوو دادەبەزێنێت و سەردەخات، كاری شەوی بۆ بەرزدەكرێتەوە بەر لە كاری رۆژ، هەروەها كاری رۆژی بۆ بەرز دەكرێتەوە بەر لە كاری شەو[1]، پەردەكەی نوورە، گەر ئەو پەردە لابدات نوور و جەلال و مەزنی(سبُحات) روخساری تا چاو هانا بكات دروستكراوان دەسوتێنێ).**

- وَفِي رِوَايَةٍ: (حِجَابُهُ النار). [م١٧٩]

لە ریوایەتێكدا: **(پەردەكەی ئاگرە).**

---

[1] هەر كەس سروشتی هاتنی شەو و رۆیشتنی رۆژ و هاتنی رۆژ و رۆیشتنی شەو بەسەر زەویدا حاڵی ببێت لەم فەرمووده تێدەگات و ئەو پرسیارەی بۆ دروست نابێت: چۆن كاری شەو بەر لە كاری رۆژ بۆ لای خودا بەرزدەبێتەوە و پاشان دەفەرموێت كاری رۆژ بەر لە كاری شەو بۆ لای ئەو بەرز دەبێتەوە، خودا كۆمەڵێك فریشتەی تایبەت كردووە بە نووسینی كاری بەندەكان لە شەودا، ئەم فریشتانە لە نوێژی عەسرەوە دادەبەزن، وەك لە فەرموودەدا هاتووە، كۆمەڵێك فریشتەش تایبەت كراون بە نووسینی كاری بەندەكان لە رۆژدا و لە نوێژی بەیانییەوە دادەبەزن–و.

## ١٢- دەروازەی: سیفەتی ئارامگری و شتانی تر

**٣٢-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا أَحَدٌ أَصْبَرُ عَلَى أَذًى سَمِعَهُ مِنَ اللهِ، يَدَّعُونَ لَهُ الوَلَدَ، ثُمَّ يُعَافِيهِمْ وَيَرْزُقُهُمْ**). [خ٧٣٧٨، (٦٠٩٩)/ م٢٨٠٤]

(ق) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**هیچ کەس بەقەدەر خودا ئارامگر نییە لەسەر قسەیەك بیستبێتی، بانگەشەی کوڕ بۆ خودا دەکەن لەگەڵ ئەوەش عافییەتیان پێ دەدات و ڕۆزییان دەدات**[1]).

**٣٣-** عن النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَا مِنْ قَلْبٍ إِلاَّ بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ، إِنْ شَاءَ أَقَامَهُ وَإِنْ شَاءَ أَزَاغَهُ**).
وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**يَا مُثَبِّتَ القُلُوبِ! ثَبِّتْ قُلُوبَنَا عَلَى دِينِكَ**)، قَالَ: (**وَالمِيزَانُ بِيَدِ الرَّحْمَنِ، يَرْفَعُ أَقْوَاماً، وَيَخْفِضُ آخَرِينَ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ**). [جه١٩٩]
* صحيح.

لە نەواسی کوڕی سەمعانەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**هەر دڵێك لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی ڕەحماندایە، گەر بیەوێت ڕاوەستاوی دەکات، و گەر بخوازێت لایدەدات**).

پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: (**ئەی دامەزرێنەری دڵان، دڵمان لەسەر دینەکەت دابمەزرێنە**)، هەروەها فەرمووی: (**ترازوو بە دەستی ڕەحمانە، دەستەیەك بەرزدەکاتەوە و دەستەیەکی تر دادەبەزێنێت تا ڕۆژی قیامەت**).

**٣٤-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مسعود، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (**ما مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرُ مِنَ اللهِ، مِنْ أَجْلِ ذلِكَ حَرَّمَ الفَوَاحِشَ، ومَا أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ المَدْحُ مِنَ اللهِ**). [خ٥٢٢٠ (٤٦٣٤)/ م٢٧٦٠]

---

[1] واتە حیلمی خودا بەرینە تەنانەت بەرانبەر ئەو بێباوەڕانەی کوڕ و هاوتا دەدەنە پاڵ خودا، قازی دەڵێت: "الصبور" لە ناوەکانی خودایە(سبحانه وتعالى)، ئارامگر(صبور) ئەو کەسەیە لە تۆڵەسەندنەوە لە یاخیبووان پەلە ناکات.

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هیچ کەس بەقەدەر خودا بەغیرەت نییە، لەوپێناوەدا فاحیشەی حەرام کردووە، هیچ کەسیش بەقەدەر خودا مەدحی پێخۆش نییە).**

- زاد في رواية لمسلم: (وَلَيْسَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ العُذْرُ مِنَ اللهِ، مِنْ أَجْلِ ذلِكَ أَنْزَلَ الكِتَابَ وَأَرْسَلَ الرُّسُلَ).

لە ریوایەتێکی موسلیمدا ئەمەی زیاد کردووە: **(هیچ کەس بەقەدەر خودا عوزر(پاساو)ی پێخۆش نییە، لەو پێناوەدا کتێبی دابەزاندووە و پێغەمبەرانی رەوانە کردووە).**

**٣٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قالَ: **(إِنَّ اللهَ يَغَارُ، وَغَيْرَةُ اللهِ أَنْ يَأْتِيَ المُؤْمِنُ مَا حَرَّمَ اللهُ).** [خ٥٢٢٣/ م٢٧٦١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خ) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(خودا غیرە دەکات، غیرەی خودا ئەوەیە باوەڕدار هەستێك بەوەی خودا حەرامی کردووە).**

## ١٣- دەروازەی: باوەڕدار بە خودا و بێباوەڕ بە هەسارە

**٣٦-** (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم صَلاَةَ الصُّبْحِ بِالحُدَيْبِيَةِ، عَلَى إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلَةِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: **(هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ)؟** قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: **(أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ وَكَافِرٌ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ: مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللهِ وَرَحْمَتِهِ، فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ بِالكَوْكَبِ، وَأَمَّا مَنْ قَالَ: بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا، فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي وَمُؤْمِنٌ بِالكَوْكَبِ).** [خ٨٤٦/ م٧١]

(ق) لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە، وتی: لە حودەیبییە لەدوای باران کە لە شەوەکەی باری بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی بەیانی بۆ کردین، کاتێك تەواوبوو و رۆیشت، رووی لە خەڵکەکە کرد و فەرمووی: **(دەزانن پەروەردگاری ئێوە چی فەرموو؟)**، وتیان: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: **(هەندێ لە بەندەکانم رۆژیان لێبوویەوە باوەڕدار و هەندێکی تریان بێباوەڕ، ئەو کەسەی وتی: بە فەزڵ و رەحمەتی خودا بارانمان**

**بۆ باری ئەوە باوەڕدارە بە من و بێباوەڕە بە هەسارە، ئەو کەسەش وتی: بە کەشوهەوای ئەوە و ئەوە، بە من بێباوەڕ و بە هەسارە باوەڕدار).**

## ١٤- دەروازەی: شیرینی ئیمان و بەشەکانی ئیمان

**٣٧-** (ق) عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاَوَةَ الْإِيمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ للهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ). [خ١٦/ م٤٣]

(ق) لە ئەنەسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(هەر کەس سیانی تێدا بێت[1] شیرینی ئیمانی بینیوەتەوە: خودا و پێغەمبەری لە هەرچی کەس و شتی ترە خۆشتربوێت، کەسێکی خۆشویست تەنها لەبەر خودا خۆشیبوێت، پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی وەك چۆن پێی ناخۆشە هەڵبدرێتە ناو ئاگرەوە).**

**٣٨-** (م) عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (ذَاقَ طَعْمَ الإِيمَانِ، مَنْ رَضِيَ بِاللهِ رَبّاً وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً). [م٣٤]

(م) لە عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبەوە: گوێی لە پێغەمبەری خودا بوو دەیفەرموو: **(تامی ئیمانی کردووە ئەو کەسەی رازی بێت: "الله" پەروەردگاری بێت، و ئیسلام دینی بێت، و محەمەد پێغەمبەری بێت).**

**٣٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الإِيمَانُ بِضْعٌ وَسِتُّونَ شُعْبَةً، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمَانِ). [خ٩/ م٣٥]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ئیمان شەست و ئەوەندە[2] بەشە، حەیا بەشێکە لە ئیمان).**

---

[1] "سیانی تێدا بێت": واتە سێ خەسڵەتی تێدا بێت-و.

[2] وشەی "ئەوەندە"م بۆ وەرگێڕانی "بِضْع" بەکارهێناوە کە لە زمانی عەرەبیدا بەکاردەهێنرێت بۆ ژمارەکان لە (سێ)وە بۆ (نۆ)-و.

## ١٥- دەروازەی: خۆشویستنی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم" لە ئیمانەوەیە

٤٠- (ق) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ)**. [خ١٥/ م٤٤]

(ق) لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هیچ کام لە ئێوە ئیمان ناهێنێت تا منی لە باوك و منداڵ و هەموو خەڵکی زۆرتر خۆشدەوێت)**.

٤١- (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ هِشَامٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَهُوَ آخِذٌ بِيَدِ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ! لأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ إِلاَّ مِنْ نَفْسِي، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ نَفْسِكَ)**، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: فَإِنَّهُ الآنَ، وَاللهِ، لأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(الآنَ يَا عُمَرُ)**. [خ٦٦٣٢ (٣٦٩٤)]

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی هیشامەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، ئەو دەستی عومەری کوڕی خەتابی گرتبوو، عومەر پێی وت: ئەی پێغەمبەری خودا، تۆ لە هەرچی شتە لام خۆشەویستتری جگە لە نەفسی خۆم، پێغەمبەر فەرمووی: **(نا، سوێند بەو کەسەی نەفسی منی لەدەستدایە، تا لە نەفسی خۆت منت خۆشتر دەوێ)**، عومەر پێی وت: سوێند بە خودا، ئێستا بەو جۆرەیە، تۆم لە نەفسی خۆ لا خۆشەویستترە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: **("الآن، یا عمر-ئێستا تەواوە"[1]، ئەی عومەر)**.

٤٢- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مِنْ أَشَدِّ أُمَّتِي لِي حُبّاً، نَاسٌ يَكُونُونَ بَعْدِي، يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ رَآنِي، بِأَهْلِهِ وَمَالِهِ)**. [م٢٨٣٢]

(م) لەئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(زۆرترین و بەهێزترین خۆشەویستی ئوممەتم بۆ من خەڵکانێکن بەدوای مندا دێن، یەکێك لەوان خۆزگە دەخوازێت گەر منی ببینیبا بەرانبەر بەخشینی خانەوادە و ماڵ و سامانی)**.

---

[1] "الآن یا عمر-ئێستا تەواوە، ئەی عومەر" واتە: ئێستا زانیت و ئەوەی پێویست بوو بە زمان دەرتبڕی، ئیبن حەجەر لە (الفتح)دا ئەمەی وتووە.

**٤٣**- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: إِنِي أُحِبُّكُم أَهْلَ البَيْتِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ: (آلله) قال: الله، قال: **(فأَعِدَّ لِلفَقْرِ تِجْفَافاً، فَإِنَّ الفَقْرُ أَسْرَعُ إِلى مَنْ يُحِبُّنا مِنَ السَّيْلِ مِنْ أَعْلى الأَكَمَةِ إِلى أَسْفَلِها)**. [ك٧٩٤٤]

* قال الذهبي: على شرطهما.

[وانظر: **٣٣٥١** (المرء مع من أحب).

**٣٢٦٠** حب الذي حُدَّ في الخمر.

**٢٦٦٢** في حب ما كان يحبه صلّى الله عليه وسلّم].

لە ئەبی زەڕەوە(خوا لێی رازی بێت)، ئەو هات بۆ خزمەت پێغەمبەر و وتی: ئەی ئالوبەیت، من ئێوەم خۆشدەوێت، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: **(سوێند دەخۆی بە خودا)**، ئەبو زەڕ وتی: سوێند بە خودا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(كەوابوو بۆ هەژاری (تِجْفاف[1])ێك ئامادە بكە، چونكە ئەو كەسەی ئێمەی خۆشدەوێت هەژاری خێراترە بۆ لای ئەو لە بەربوونەوەی لافاو لە گرد و بەرزییەوە بۆ خوارەوە)**.

## ١٦- دەروازەی: فەرمان بە چاكە و رێگری لە خراپە

**٤٤**- (خ) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَثَلُ القَائِمِ عَلَى حُدُودِ اللهِ وَالوَاقِعِ فِيهَا، كَمَثَلِ قَوْمٍ اسْتَهَمُوا عَلَى سَفِينَةٍ، فَأَصَابَ بَعْضُهُمْ أَعْلاَهَا وَبَعْضُهُمْ أَسْفَلَهَا، فَكَانَ الَّذِينَ في أَسْفَلِهَا إِذَا اسْتَقَوْا مِنَ المَاءِ مَرُّوا عَلَى مَنْ فَوْقَهُمْ، فَقَالُوا: لَو أَنَّا خَرَقْنَا في نَصِيبِنَا خَرْقاً، وَلَمْ نُؤْذِ مَنْ فَوْقَنَا، فَإِنْ يَتْرُكُوهُمْ وَمَا أَرَادُوا هَلَكُوا جَمِيعاً، وَإِنْ أَخَذُوا عَلى أَيْدِيهِمْ نَجَوْا، وَنَجَوْا جَمِيعاً)**. [خ٢٤٩٣]

(خ) لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە(خوا لێی رازی بێت): لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(نموونەی ئەو كەسەی لەسەر سنوورەكانی خودا وەستاوە و ئەو كەسەی**

---

[1] "تجفاف" پۆشاكێك بوو وەك زرێپۆش لە جەنگدا دەدرا بەسەر ئەسپدا بۆئەوەی لە تیر و نێزە و رم بیپارێزێ، واتە: ئەی ئەبو زەڕ گەر ئێمەت خۆشدەوێت پۆشاكێك ئامادە بكە بۆ تیری هەژاری–و

**دەکەوێتە ناو سنوورەکانی خوداوە وەك کۆمەڵێکن دەچنە ناو کەشتییەکەوە و بە قورعەکردن هەر کەس بەشێك لە کەشتییەکەی بەردەکەوێت، هەندێکیان سەرەوەی کەشتییەکەیان بەردەکەوێ و هەندێکیان خوارەوەی کەشتییەکە، ئەوانەی لە خوارەوەی کەشتییەکەن گەر ئاو لە دەریاکە هەڵبگۆزن بەسەر ئەوانەدا تێدەپەڕن لە سەرەوەن، بۆیە وتیان: گەر ئێمە بتوانین لە بەشەکەی خۆمان کونێك بکەینە کەشتییەکە و ئەوانەی سەرەوەی خۆمان ئازار نەدەین، گەر وازیان لێ بهێنرێ ئەوەی دەیانەوێ ئەنجامی بدەن هەموویان تیادەچن، گەر دەستیان لەو کارە بگرن ئەوان رزگاریان دەبێت و هەموان رزگاریان دەبێت).**

**٤٥**– (م) عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَوَّلُ مَنْ بَدَأَ بِالْخُطْبَةِ، يَوْمَ العِيدِ قَبْلَ الصَّلاَةِ، مَرْوَانُ، فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ، فَقَالَ: الصَّلاَةُ قَبْلَ الخُطْبَةِ، فَقَالَ: قَدْ تُرِكَ مَا هُنَالِكَ.

فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: أَمَّا هذَا، فَقَدْ قَضَى مَا عَلَيْهِ. سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَراً فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ**). [م٤٩]

(م) لە تاریقی کوڕی شیهابەوە، وتی: یەکەمین کەسێك لە ڕۆژی جەژن بەر لە نوێژ وتاری دەست پێ کرد مەروان بوو، پیاوێك بۆی هەستا و وتی: نوێژ بەر لە وتاردانە، وتی: ئەوە وازیلێهێنرا.

ئەبو سەعید وتی: ئەو پیاوە ئەوەی لەسەر شانی بوو جێبەجێی کرد، گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەرکەس لە ئێوە مونکەرێکی بینی با بە دەستی[1] بیگۆڕێ، گەر نەیتوانی با بە زمانی[2]، گەر نەیتوانی با بە دڵی[3]، ئەوەش لاوازترین ئیمانە).**

---

[1] بە دەستی: واتە بە دەسەڵات و هێز و کرداری–و

[2] با بە زمانی: واتە با بە زمانی بیگۆڕێ–و

[3] با بە دڵی: واتە با بە دڵ ئەو مونکەرەی لا ناخۆش و خراپ و ناباش بێت–و

٤٦- (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَا مِنْ نَبِيٍّ بَعَثَهُ اللهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي؛ إِلاَّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ وَأَصْحَابٌ، يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ، وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ، ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ، يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ، وَيَفْعَلُونَ مَا لا يُؤْمَرُونَ، فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ). [م٥٠]

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەر پێغەمبەرێك پێش من خودا رەوانەی کردبێت لە ئومەتەکەی حەواری و هاوەڵی هەبووە، سوننەتی پێغەمبەرەکەیان وەردەگرت و شوێنی فەرمانی ئەو دەکەوتن، پاشان بەدوایاندا کەسانێك دێن شتانێك دەڵێن خۆیان ئەنجامی نادەن، شتانێك ئەنجام دەدەن فەرمانیان پێ نەکراوە، هەر کەس بە دەستی[1] دژ بەوانە بکۆشێت ئەو باوەڕدارە، هەر کەس بە زمانی دژ بەوانە بکۆشێت ئەو باوەڕدارە، هەر کەس بە دڵ دژ بەوانە بکۆشێت ئەو باوەڕدارە، لەدوای ئەوە بە ئەندازەی دەنکە خەردەلێك ئیمان بوونی نییە**).

٤٧- عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَيُّها النَّاسُ، مُرُوا بِالْمَعْرُوفِ، وانْهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ، قَبْلَ أَنْ تَدْعُوا اللهَ فَلا يَسْتَجِيبُ لَكُمْ، وَقَبْلَ أَنْ تَسْتَغْفِرُوا فَلا يَغْفِرُ لَكُم. إِنَّ الأَمْرَ بِالْمَعْرُوفِ والنَّهيَ عَنِ الْمُنْكَرِ لا يَرْفَعُ رِزْقاً، ولا يُقَرِّبُ أَجَلاً. وإِنَّ الأَحْبَارَ مِنَ اليَهُودِ، وَالرُّهْبَانَ من النَّصَارى لَمَّا تَرَكُوا الأَمْرَ بِالْمَعْرُوفِ والنَّهْيَ عَنِ الْمُنْكَرِ لَعَنَهُمُ اللهُ عَلى لِسَانِ أَنْبِيَائِهِم، ثُمَّ عُمُّوا بِالبَلاءِ). [مخ١٣/٣٣٨، ٣٣٩]

* إسناده صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**خەڵکینە، فەرمان بە چاکە بکەن و رێگری لە خراپە بکەن، بەرلەوەی داوا**

---

[1] بە دەستی: واتە بە دەسەڵات و هێز و کرداری-و

**لە خودا بکەن و وەڵامتان نەداتەوە، بەرلەوەی داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن و لێتان خۆشنەبێت، فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە ڕۆزی بەرز ناکاتەوە[1] و وادەی مردن نزیك ناکاتەوە، ئەحباری یەهوود و ڕوهبانی نەصارا کاتێك وازیانهێنا لە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە خودا لەسەر زمانی پێغەمبەرانیان نەفرەتی لێکردن[2]، و پاشان بە بەڵا هەموویان داگیرانەوە).**

٤٨- (ق) عَنْ أُسامة بن زيد قال: سمعت رسول الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (يُجَاءُ بِالرَّجُلِ يَوْمَ القِيَامَةِ، فيُلْقى في النَّارِ، فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُهُ في النَّارِ، فَيَدُورُ كما يَدُورُ الحِمَارُ بِرَحاهُ، فَيَجْتَمِعُ أَهْلُ النَّارِ عَلَيْهِ فَيَقُولُونَ: أَيْ فُلاَنُ ما شَأْنُكَ؟ أَلَيْسَ كُنْتَ تَأْمُرُنَا بِالمَعْرُوفِ وَتَنْهَانَا عَنِ المُنْكَرِ؟ قَالَ: كُنْتُ آمُرُكُمْ بِالمَعْرُوفِ وَلاَ آتِيهِ، وَأَنْهَاكُمْ عَنِ المُنْكَرِ وَآتِيهِ). [خ٣٢٦٧/ م٢٩٨٩]

(ق) لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(ڕۆژی قیامەت پیاوێك دەهێنرێ هەڵدەدرێتە ناو ئاگرەوە، لەناو ئاگر ریخۆڵەکانی دێنە دەرەوە، دەسوڕێتەوە وەك چۆن گوێدرێژ بە بەرداشەوە دەسوڕێتەوە، ئەهلی ئاگر لەسەری کۆدەبنەوە و دەڵێن: ئەی فلان، ئەوە چیتە؟ ئایا تۆ فەرمانت پێ نەدەکردین بە چاکە و ڕێگریت لێ نەدەکردین لە خراپە؟ دەڵێت: فەرمانم پێ دەکردن بە چاکە خۆم ئەنجامم نەدەدا، نەهیم لێ دەکردن لە خراپە و خۆم ئەنجامم دەدا).**

## ١٧- دەروازەی: ئیمان و ئیسلام و ئیحسان

٤٩- (م) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ذَاتَ يَوْمٍ، إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ، شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعْرِ، لاَ يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ، وَلاَ يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ، حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَوَضَعَ

---

[1] ڕۆزی بەرز ناکاتەوە: واتە ڕۆزی نابڕێت و کەم ناکات-و

[2] مەبەست لەم ئایەتەیە: ﴿لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ﴾[المائدة: ٧٨].

كَفَّيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ، وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَخْبِرْنِي عَنِ الإِسْلاَمِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(الإِسْلامُ: أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ البَيْتَ، إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً)**، قَالَ: صَدَقْتَ.

قَالَ: فَعَجِبْنَا لَهُ، يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِيمَانِ؟ قَالَ: **(أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ، وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ، وَاليَوْمِ الآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ)**، قَالَ: صَدَقْتَ.

قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِحْسَانِ؟ قَالَ: **(أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ، فَإِنَّهُ يَرَاكَ)**.

قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ السَّاعَةِ؟ قَالَ: **(مَا المَسْؤُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ)**. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنْ أَمَارَتِهَا؟ قَالَ: **(أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا، وَأَنْ تَرَى الحُفَاةَ العُرَاةَ، العَالَةَ، رِعَاءَ الشَّاءِ، يَتَطَاوَلُونَ فِي البُنْيَانِ)**.

قَالَ: ثُمَّ انْطَلَقَ، فَلَبِثْتُ مَلِيّاً، ثُمَّ قَالَ لِي: **(يَا عُمَرُ! أَتَدْرِي مَنِ السَّائِلُ)**؟ قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: **(فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ، أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ)**. [م٨]

**(م) لە عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: ڕۆژێك لە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین، پیاوێکمان لێ دەرکەوت پۆشاکەکەی بەری زۆر سپی بوو، و پرچی زۆر ڕەش بوو، ئەسەری سەفەری لەسەر نەدەبینرا و هیچ کام لە ئێمە نەماندەناسی، هات و لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت، دوو ئەژنۆی توند کرد لە دوو ئەژنۆی پێغەمبەر، و دوو دەستی خۆی لەسەر ڕانی خۆی دانا[1] و وتی: ئەی محەمەد، هەواڵم پێ بدە دەربارەی ئیسلام؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئیسلام ئەوەیە شایەتی بدەی "أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسولُ الله"، نوێژ بکەی، زەکات بدەی، ڕۆژووی ڕەمەزان بگری، و حەجی ماڵی خودا بکەی گەر توانیت ئەو ڕێگەیە بگرییەبەر)، وتی: ڕاست دەکەی[2].**

**عومەر وتی: سەرمانسوڕما لەو پیاوە: پرسیار لە پێغەمبەر دەکات و تەصدیقی فەرموودەکەی پیغەمبەر دەکات، وتی: هەواڵم پێ بدە دەربارەی ئیمان؟ پێغەمبەر فەرمووی: (ئیمان بهێنی بە خودا، و فریشتەکانی، و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی، و ڕۆژی دوایی، هەروەها ئیمان بە قەدەر بهێنی بە خێر و شەڕیەوە) وتی: ڕاست دەکەی.**

---

[1] واتە: بە ئەدەبەوە و لە شێوازی فێرخوازدا دانیشت.

[2] وتنی: "ڕاست دەکەی" واتە پیاوەکە وەڵامی پرسیارەکەی زانیوە، بۆیە دەڵێت: ڕاست دەکەی، ئەو وتنەی جێگەی سەرسوڕمانی هاوەڵان بوو-و.

وتی: هەواڵم پێ بدە دەربارەی ئیحسان؟ فەرمووی: **(خودا بپەرستی وەك ئەوەی ببینی، گەر تۆ ئەو نەبینیت ئەوا ئەو تۆ دەبینێت).**

وتی: هەواڵم پێ بدە دەربارەی (الساعة–هاتنی رۆژی قیامەت)؟ فەرمووی: **(پرسیارلێکراو زاناتر نییە لە پرسیارکەر)**، وتی: هەواڵم پێ بدە دەربارەی نیشانەکانی؟ فەرمووی: **(کەنیزەك سەرداری خۆی بهێنێتەدی، هەروەها پێپەتی و رووتان و هەژاران و شواکارە ببینی بینای بەرز بە ئاسماندا بکەن).**

عومەر وتی: پاشان رۆیشت، ماوەیەك مامەوە[1]، پاشان پێغەمبەر پێی فەرمووم: **(ئەی عومەر، دەزانی ئەو پرسیارەکەرە کێ بوو؟)**، وتم: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: **(ئەوە جیبریل بوو، هاتبوو دینەکەتان فێر بکات).**

٥٠– عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الْإِسْلاَمُ؟ قَالَ: **(أَنْ يُسْلِمَ قَلْبُكَ للهِ عزّ وجل، وَأَنْ يَسْلَمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِكَ وَيَدِكَ)**. قَالَ: فَأَيُّ الْإِسْلاَمِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: **(الْإِيمَانُ)**، قَالَ: وَمَا الْإِيمَانُ؟ قَالَ: **(تُؤْمِنُ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالبَعْثِ بَعْدَ المَوْتِ)**. قَالَ: فَأَيُّ الْإِيمَانِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: **(الهِجْرَةُ)**، قَالَ: فَمَا الهِجْرَةُ؟ قَالَ: **(تَهْجُرُ السُّوءَ)**. قَالَ: فَأَيُّ الهِجْرَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: **(الجِهَادُ)**، قَالَ: وَمَا الجِهَادُ؟ قَالَ: **(أَنْ تُقَاتِلَ الكُفَّارَ إِذَا لَقِيتَهُمْ)**. قَالَ: فَأَيُّ الجِهَادِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: **(مَنْ عُقِرَ جَوَادُهُ وَأُهْرِيقَ دَمُهُ)**، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(ثُمَّ عَمَلاَنِ هُمَا أَفْضَلُ الْأَعْمَالِ إِلاَّ مَنْ عَمِلَ بِمِثْلِهِمَا: حَجَّةٌ مَبْرُورَةٌ، أَوْ عُمْرَةٌ)**. [حم١٧٠٢٧]

* حديث صحيح.

لە عەمری کوڕی عەبەسەوە، وتی: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئیسلام چییە؟ فەرمووی: **(ئیسلام ئەوەیە دڵت بە خودا(عز وجل) رادەست ببێت، هەروەها موسڵمانان لە زمان و دەستت سەلامەت بن)**، پیاوەکە وتی: چ ئیسلامێك باشترینە؟ فەرمووی: **(باوەڕهێنی بە خودا و فریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەرانی، و زیندووبوونەوە لەدوای مردن)**، پیاوەکە وتی: چ ئیمانێك باشترینە؟ فەرمووی: **(کۆچ کردن)**، وتی: کۆچ کردن چییە؟ فەرمووی: **(کۆچ لە خراپە بکەی)**، وتی: چ کۆچێك

[1] واتە: کاتێکی زۆر چاوەڕوان بووم.

باشترینە؟ فەرمووی: **(جیهاد)**، وتی: جیهاد چییە؟ فەرمووی: **(دژ بە بێباوەڕان بجەنگی گەر پێیان گەیشتی)**، وتی: چ جیهادێك باشترینە؟ فەرمووی: **(ئەو کەسەی ئەسپەکەی دەکوژرێ و خوێنی دەڕژێت)**، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(پاشان دوو کار باشترین کارە مەگەر کەسێك بە هاوشێوەی ئەو دوانە کاربکات: حەجێکی مەبرور یان عومرەیەك)**.

## ١٨- دەروازەی: وەسوەسە و قسەی دەروون

**٥١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: **(إِنَّ اللهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي ما حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، ما لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَتَكَلَّمْ)**. [خ٥٢٦٩ (٢٥٢٨)/ م١٢٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خودا چاوپۆشی لە ئومەتەکەم کردووە لەوەی نەفسییان دەیڵێت، گەر نەیکەن بە کار، یان نەیکەن بە قسە)**.

**٥٢-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَسَأَلُوهُ: إِنَّا نَجِدُ فِي أَنْفُسِنَا مَا يَتَعَاظَمُ أَحَدُنَا أَنْ يَتَكَلَّمَ بِهِ، قَالَ: **(وَقَدْ وَجَدْتُمُوهُ)**؟ قالُوا: نَعَمْ، قَالَ: **(ذَاكَ صَرِيحُ الإِيمَانِ)**. [م١٣٢]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: خەڵکانێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتن و پرسیاریان لێکرد: ئێمە لە نەفسمان شتانێك دەبینینەوە یەکێك لە ئێمە لەلای قورسە بیکات بە قسە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(بەدڵنیایی ئەوەتان بینیوەتەوە؟)**، وتیان بەڵێ، فەرمووی: **(ئەوە ئیمانی ڕاشکاوە[1])**.

**٥٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَحَدَنَا يَجِدُ فِي نَفْسِهِ، يُعَرِّضُ بِالشَّيْءِ، لَأَنْ يَكُونَ حُمَمَةً أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ بِهِ، فَقَالَ: **(اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي رَدَّ كَيْدَهُ إِلَى الوَسْوَسَةِ)**. [د٥١١٢]

* صحيح.

---

[1] بە قورس زانینی ئەوەی بیکەن بە قسە ئیمانی ڕوون و ئاشکرایە.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، یەکێك لە ئێمە لە نەفسی خۆیدا شتێك دەبینێتەوە، بۆی دەخرێتە روو، گەر ببێت بە خۆڵەمێش پێیخۆشترە لەوەی بیکات بە قسە، فەرمووی: (**"الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر" حەمد بۆ ئەو خودایەی فێڵ و پیلانی ئەوی[1] گێڕاوەتەوە بۆ وەسوەسە**).

## ١٩- دەروازەی: قسەی شەیتان: کێ پەروەردگاری تۆی دروستکردووە؟

٥٤- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يَأْتِي الشَّيْطَانُ أَحَدَكُمْ فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ كَذَا، مَنْ خَلَقَ كَذَا، حَتَّى يَقُولَ: مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ؟ فَإِذَا بَلَغَهُ، فَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ وَلْيَنْتَهِ ). [خ٣٢٧٦/ م١٣٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**شەیتان بۆ یەکێك لە ئێوە دێت و دەڵێت: کێ ئەوەی دروستکردووە؟ کێ ئەوەی دروستکردووە؟ تا دەڵێت: کێ پەروەردگاری تۆی دروست کردووە؟ گەر گەیشتە ئەوە، با پەنا بە خودا بگرێت[2] و کۆتایی پێ بهێنێت**).

- وفي رواية لمسلم: (لاَ يَزَالُ النَّاسُ يَتَسَاءَلُونَ حَتَّى يُقَالَ: هَذَا، خَلَقَ اللهُ الْخَلْقَ، فَمَنْ خَلَقَ اللهَ؟ فَمَنْ وَجَدَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً، فَلْيَقُلْ: آمَنْتُ بِاللهِ ). وزاد في رواية: (ورسله).

لە ریوایەتێکی موسلیمدا هاتووە: (**بەردەوام خەڵکی دەپرسن تا دەوترێت: ئەمە خودا دروستکراوانی دروست کرد، ئەی کێ خودای دروست کردووە؟ هەر کەس شتێك لەوەی بینییەوە، با بڵێت: ئیمانم بە خودا هێناوە**)، لە ریوایەتێکی تردا ئەمەی بۆ زیاد کردووە: (**و پێغەمبەرانی[3]**).

---

[1] فێڵ و پیلانی ئەو: واتە فێڵ و پیلانی شەیتان—و
[2] واتە: بڵێت: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)—و.
[3] ئیمانم بە خودا و پێغەمبەرانی هێناوە—و

## ٢٠- دەروازەی: نووسینی چاکەکان و خراپەکان

٥٥- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فِيمَا يَرْوِي عَنْ رَبِّهِ عزّ وجل قَالَ: قَالَ: (إِنَّ اللهَ كَتَبَ الحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ ثُمَّ بَيَّنَ ذلِكَ، فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا وَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللهُ لَهُ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ، وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللهُ لَهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً). [خ٦٤٩١/ م١٣١]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەوەی لە پەروەردگارەوە(ﷻ) دەیگێڕێتەوە، وتی: پێغەمبەر فەرمووی: **(خودا چاکەکان و خراپەکانی نووسی پاشان ئەوانەی ڕۆشن کردەوە، هەرکەس ویستی چاکەیەك بکات و ئەنجامی نەدا خودا لای خۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنووسێت، گەر ئەو ویستی چاکەیەك بکات و ئەنجامی دا خودا لای خۆی دە چاکە تا حەوتسەد بەرانبەر تا زۆرێکی زۆر لە بەرانبەر بۆ ئەو دەنووسێت، هەر کەس ویستی خراپەیەك بکات و ئەنجامی نەدا خودا لای خۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنووسێت[1]، گەر ویستی خراپەیەك بکات و ئەنجامیدا خودا یەك خراپەی بۆ دەنووسێت).**

٥٦- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (يَقُولُ اللهُ: إِذَا أَرَادَ عَبْدِي أَنْ يَعْمَلَ سَيِّئَةً فَلاَ تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ حَتَّى يَعْمَلَهَا، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا بِمِثْلِهَا، وَإِنْ تَرَكَهَا مِنْ أَجْلِي فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْمَلَ حَسَنَةً فَلَمْ يَعْمَلْهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ). [خ٧٥٠١/ م١٢٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا دەفەرموێت: گەر بەندەکەم ویستی خراپەیەك بکات لەسەری مەنووسن تا ئەنجامی دەدات، گەر**

---

[1] ئەمە خراپەیەکە لەبەر خودا وازیلێهێناوە، نەك خراپەیەك دەیەوێت ئەنجامی بدات، بەڵام بۆی ڕێناکەوێت و کۆسپ و لەمپەری بۆ دروست دەبێت، وەك لە فەرموودەی (٥٦)دا هاتووە–و

ئەنجامیدا وەکو خۆی بینووسن، گەر لەپێناوی من وازیهێنا لە خراپەکە خراپەکەی بە چاکەیەك بۆ بنووسن، گەر ویستی چاکەیەك بکات و ئەنجامی نەدا بەوە چاکەیەکی بۆ بنووسن، گەر ئەنجامیدا بە دە ئەوەندە تا حەوتسەد بەرانبەر بۆی بنووسن).

٥٧- عَنْ خُرَيْمِ بْنِ فَاتِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (الْأَعْمَالُ سِتَّةٌ، وَالنَّاسُ أَرْبَعَةٌ: فَمُوجِبَتَانِ، وَمِثْلٌ بِمِثْلٍ، وَحَسَنَةٌ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، وَحَسَنَةٌ بِسَبْعِمِائَةٍ.

فَأَمَّا الْمُوجِبَتَانِ: فَمَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً دَخَلَ النَّارَ، وَأَمَّا مِثْلٌ بِمِثْلٍ: فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ حَتَّى يَشْعُرَهَا قَلْبُهُ، وَيَعْلَمَهَا اللهُ مِنْهُ، كُتِبَتْ لَهُ حَسَنَةٌ، وَمَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً كُتِبَتْ عَلَيْهِ سَيِّئَةٌ، وَمَنْ عَمِلَ حَسَنَةً فَبِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، وَمَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً فِي سَبِيلِ اللهِ فَحَسَنَةٌ بِسَبْعِمِائَةٍ.

وَأَمَّا النَّاسُ: فَمُوَسَّعٌ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا مَقْتُورٌ عَلَيْهِ فِي الْآخِرَةِ، وَمَقْتُورٌ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا مُوَسَّعٌ عَلَيْهِ فِي الْآخِرَةِ، وَمَقْتُورٌ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَمُوَسَّعٌ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ). [حم١٨٩٠٠]

* حديث حسن.

لە خورەیمی کوڕی فاتیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کارەکان شەشن و خەڵکی چوارن: دوو پێویستکەرەکە، و هاوشێوە بە هاوشێوە، و چاکە بە دە بەرانبەر، و چاکە بە حەوتسەد بەرانبەر.

دوو پێویستکەرەکە: هەر کەس بمرێت و شتێکی نەکردبێت بە هاوەڵ بۆ خودا دەچێتە بەهەشتەوە، هەر کەس بمرێت و شتێکی کردبێت بە هاوەڵی خودا دەچێتە ئاگرەوە، هاوشێوە بە هاوشێوە: هەر کەس ویستی چاکەیەك بکات تا دڵی هەستی پێکرد و خودا ئەوەی لە ئەوەوە زانی، چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت، هەر کەس خراپەیەك ئەنجام بدات خراپەیەکی لەسەر دەنوسرێت، هەر کەس چاکەیەك ئەنجام بدات بە دە بەرانبەر بۆی دەنوسرێت، هەر کەس خەرجییەك لە ڕێگەی خودا ئەنجام بدات چاکەیەك بە حەوتسەدە.

خەڵکی: هەیانە دنیای بەسەردا بەرین کراوە و دواڕۆژی لێ بەرتەسك کراوەتەوە، هەیانە دنیای لێ بەرتەسك کراوەتەوە و دواڕۆژی بەسەردا بەرین کراوە، هەیانە دنیا و دواڕۆژی لێ بەرتەسك کراونەتەوە، هەشیانە دنیا و دواڕۆژی بەسەردا بەرین کراون).

**٥٨-** (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ اللهَ لاَ يَظْلِمُ مُؤْمِناً حَسَنَةً، يُعْطَى بِهَا فِي الدُّنْيَا وَيُجْزَى بِهَا فِي الآخِرَةِ. وَأَمَّا الكَافِرُ فَيُطْعَمُ بِحَسَنَاتِ مَا عَمِلَ بِهَا للهِ فِي الدُّنْيَا، حَتَّى إِذَا أَفْضَى إِلَى الآخِرَةِ، لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَةٌ يُجْزَى بِهَا)**. [م٢٨٠٨]

(م) لە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خـودا لە پاداشتدانەوە بە چاکە ستەم لە باوەڕدار ناکات، بەو چاکەیە لە دنیا پێی دەدرێ و لە دواڕۆژ پاداشت دەدرێتەوە، کەسی بێباوەڕیش بە کۆمەڵێك چاکە لە دنیـا خـۆراك دەدرێت تا بۆ خودا لە دنیا کاریان پێ بکات، تا دەچێت بۆ دواڕۆژ، چاکەیەکی نابێت بەهۆیەوە پاداشت بدرێتەوە)**.

**٥٩-** (ق) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنُؤَاخَذُ بِمَا عَمِلْنَا فِي الجَاهِلِيَّةِ؟ قَـالَ: **(مَـنْ أَحْسَـنَ فـي الإِسْـلاَمِ لَمْ يُؤَاخَـذْ بِمَا عَمِـلَ فِي الجَاهِلِيَّةِ، وَمَنْ أَسَـاءَ فِي الإِسْلامِ أُخِذَ بِالأَوَّلِ وَالآخِرِ)**. [خ٦٩٢١/ م١٢٠]

(ق) لە ئیبن مەسعوودەوە وتی: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خـودا، ئایا بـەوەی لە سـەردەمی نـەفامی ئـەنجاممان دا لێپێچـانەوەمان لـێ دەکرێـت؟ فـەرمووی: **(هـەر کەس لە ئیسلامدا چاك و باش ئەنجام بدات لەوەی ئەنجامیداوە لە سەردەمی نەفامی لێپێچانەوەی لێ ناکرێت[1]، بەڵام هەر کەس لە ئیسلامدا خراپ بوو لەسەر یەکەمین و دواهەمین[2] لێپێچانەوەی لێ دەکرێت)**.

## ٢١- دەروازەی: هەر کەس بەر لە ئیسلامەکەی(بەر لە موسڵمان بوون) خێرێکی ئەنجامدابێت

**٦٠-** (ق) عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ قَالَ: قلت: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ أَشْيَاءَ كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا فِي الجَاهِلِيَّةِ، مِنْ صَدَقَةٍ، أَو عَتَاقَةٍ، وَصِلَةِ رَحِمٍ، فَهَلْ فِيهَا مِنْ أَجْرٍ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَسْلَمْتَ عَلَى ما سَلَفَ مِنْ خَيْرٍ)**. [خ١٤٣٦/ م١٢٣]

---

[1] واتە بەو کارانەی لە سەردەمی نەفامی ئەنجامیداوە ناگیرێت–و

[2] واتە: لەسەر یەکەمین و دواهەمین کار لێپێچانەوەی لێ دەکرێت–و

(ق) لــە حــەکیمی کــوڕی حیزامــەوە، وتــی: وتم: ئــەی پێغەمبــەری خــودا، چــی دەفەرمووی دەربارەی شتانێك ئەنجامم دەدان بۆئــەوەی لــە خراپــە رزگــارم بێــت، لــە صەدەقە کردن، یان بەندە رزگار کردن، یان سیلەی رەحم، ئایا شتێك لــە پاداشــتیان تێدا هەیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(لەو خێرە پێشینەوە موسڵمان بوویت).**

- وفي رواية لهما: أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ أَعْتَقَ فِي الجَاهِلِيَّةِ مِائَةَ رَقَبَةٍ، وَحَمَلَ عَلَى مِائَةِ بَعِيرٍ، ثُمَّ أَعْتَقَ فِي الإِسْلاَمِ مِائَةَ رَقَبَةٍ، وَحَمَلَ عَلَى مِائَةِ بَعِيرٍ، ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم... فَذَكَرَ نَحْوَهُ. [خ٢٥٣٨]

لە ریوایەتێکی تری هــەردووکیان: حــەکیمی کــوڕی حیــزام لــە ســەردەمی نەفامیــدا سەد کۆیلەی رزگار کــرد بــوو، پاشــان لــە ئیســلامدا ســەد کۆیلــەی رزگــار کــرد، ســەد حوشتری بارکرد و هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)...بەو جۆرە باسی کرد.

## ٢٢- دەروازەی: خۆکورتهەڵهێنان لەسەر فەرزەکان

**٦١-** (ق) عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ، ثَائِرَ الرَّأْسِ، يُسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ وَلاَ يُفْقَهُ مَا يَقُولُ، حَتَّى دَنَا، فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنِ الإِسْلاَمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي اليَوْمِ وَاللَّيْلَةِ)**، فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: **(لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ)**، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(وَصِيَامُ رَمَضَانَ)**، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قَالَ: **(لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ)**، قَالَ: وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الزَّكَاةَ، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: **(لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ)**، قَالَ: فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللهِ لاَ أَزِيدُ عَلَى هَذَا وَلاَ أَنْقُصُ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ)**. [خ٤٦/ م١١]

(ق) لە تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵاوە، وتــی: پیاوێــك لــە ئــەهلی نەجد هــات بــۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) قژی پــەرش و بــڵاو بــوو بــوو، لــە دوورەوە دەنگــی دەبیســترا، بەڵام نەدەزانرا چی دەڵێ، تا نزیك بوویەوە، دەستی کرد بە پرسیار کــردن دەربــارەی ئیسلام، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(پێنج نوێژ لــە شــەو و رۆژێکدا)**، پیاوەکــە

وتی: جگە لەوە شتێکی ترم لەسەرە؟ فەرمووی: **(نەخێر، مەگەر خۆبەخشانە نوێژ ئەنجام بدەی)**، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ڕۆژووی مانگی ڕەمەزن)**، وتی: جگە لەوە شتێکی ترم لەسەرە؟ فەرمووی: **(نەخێر، مەگەر خۆبەخشانە ڕۆژوو بگریت)**، وتی: پێغەمبەری خودا هەر بەو جۆرە باسی زەکاتی بۆ کرد، پیاوەکە وتی: ئایا جگە لەوە شتێکی ترم لەسەرە؟ پێغەمبەر فەرمووی: **(نەخێر، مەگەر خۆبەخشانە صەدەقە بکەی)**، وتی: پیاوەکە پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت و ئەو دەیوت: سوێند بە خودا، ئەمانە نە زیاد دەکەم، و نە کەم دەکەم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سەرفراز بووە گەر ڕاست بکات)**.

- وفي رواية لهما: (دَخَلَ الجَنَّةَ إِنْ صَدَقَ). [خ٦٩٥٦]

لە ریوایەتێکی تری هەردووکیان هاتووە: **(گەر ڕاست بکات دەچێتە بەهەشتەوە)**.

## ٢٣ -دەروازەی: ئایین ئاسانە

**٦٢-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ، وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلاَّ غَلَبَهُ، فَسَدِّدُوا وَقارِبُوا، وأَبْشِرُوا، وَاسْتَعِينُوا بِالغَدْوَةِ وَالرَّوْحَةِ وَشَيْءٍ مِنَ الدُّلْجَةِ)**. [خ٣٩]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ئایین ئاسانە، هەر کەس دین لە خۆی توندبکاتەوە بەسەریدا زاڵ دەبێت، ڕاست و دروست بن و لە ڕاستی و دروستی نزیك ببنەوە، مژدە بدەن و لە بەیانیان و ئێواران و شتێك لە کۆتایی شەو کۆمەکی وەربگرن)**.

**٦٣-** (خ) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أَمَرَهُمْ، أَمَرَهُمْ مِنَ الأَعْمَالِ بِمَا يُطِيقُونَ، قَالُوا: إِنَّا لَسْنَا كَهَيْئَتِكَ يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ اللهَ قَدْ غَفَرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، فَيَغْضَبُ حَتَّى يُعْرَفَ الغَضَبُ فِي وَجْهِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: **(إِنَّ أَتْقَاكُمْ وَأَعْلَمَكُمْ بِاللهِ أَنَا)**. [خ٢٠]

(خ) لە عائیشەوە، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێ بکردبان ئەوەندە فەرمانی بە کار پێ دەکردن لە توانای ئەواندا بێت، دەیانوت: ئەی پێغەمبەری خودا، حاڵی ئێمە وەك تۆ نییە، خودا لە گوناهی پێشین و پاشینی تۆ خۆشبووە[1]، پێغەمبەر(ﷺ) تووڕە دەبوو تا تووڕەبوونەکە لە روخساری دەبینرا، پاشان دەیفەرموو: **(من تەقوادارترین و زاناترینی ئێوەم بە خودا)**.

٦٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ اللهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ، كَمَا يَكْرَهُ أَنْ تُؤْتَى مَعْصِيَتُهُ)**. [حم٥٨٦٦]

* صحيح.

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا پێیخۆشە روخسەتەکانی ئەنجام بدرێن، وەك چۆن پێیناخۆشە یاخیبوونی ئەنجام بدرێت)**.

٦٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ اللهَ عزّ وجل يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ، كَمَا يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى عَزَائِمُهُ)**. [حب٣٥٤/مخ٣٠٤/١٢]

* إسناده صحيح.

لە لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا(ﷻ) پێیخۆشە روخسەتەکانی ئەنجام بدرێن، وەك چۆن پێیخۆشە عەزیمەتەکانی ئەنجام بدرێن)**.

٦٦- عَنْ بُرَيْدَةَ الْأَسْلَمِيِّ قَالَ: خَرَجْتُ ذَاتَ يَوْمٍ لِحَاجَةٍ، فَإِذَا أَنَا بِالنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يَمْشِي بَيْنَ يَدَيَّ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَانْطَلَقْنَا نَمْشِي جَمِيعاً، فَإِذَا نَحْنُ بَيْنَ أَيْدِينَا بِرَجُلٍ يُصَلِّي، يُكْثِرُ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَتُرَاهُ يُرَائِي)**؟ فَقُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَتَرَكَ يَدِي مِنْ

---

[1] واتە: دەیانویست لەو برە کارە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی دیاری کردبوون زۆرتر ئەنجام بدەن، دەیانوت: خودا لە گوناهی تۆ خۆشبووە، بەڵام ئێمە بەو جۆرە نین بۆیە دەبێت کاری زۆرتر ئەنجام بدەین-و

يَدِهِ، ثُمَّ جَمَعَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَجَعَلَ يُصَوِّبُهُمَا وَيَرْفَعُهُمَا وَيَقُولُ: (**عَلَيْكُمْ هَدْياً قَاصِداً، عَلَيْكُمْ هَدْياً قَاصِداً، عَلَيْكُمْ هَدْياً قَاصِداً، فَإِنَّهُ مَنْ يُشَادَّ هَذَا الدِّينَ يَغْلِبْهُ**). [حم٢٢٩٦٣]

* إسناده صحيح.

لە بورەیدەی ئەسلەمییەوە، وتی: ڕۆژێك ڕۆیشتمە دەرەوە بۆ پێویستییەك، لەناكاو بینیم پێغەمبەر(ﷺ) لە پێشمەوە دەڕوات، دەستی گرتم و كەوتینەڕێ و پێكەوە(شان بە شانی یەكتر) دەڕۆیشتین، لە ناكاو ڕێمانكەوت لە پیاوێك لە بەردەممان نوێژی دەكرد و ركوع و سوژدەی زۆری دەبرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**پێتوایە ریاكاری بكات؟**)، وتم: خودا و پێغەمبەرەكەی زاناترن، دەستی منی لە دەستی خۆی بەردا، پاشان هەردوو دەستی خۆی لێكنا و ئاماژە(ئاراستە)ی پێ دەكردن و بەرزی دەكردنەوە و دەیفەرموو: (**هیدایەتێكی میانەڕەوتان لەسەرە، هیدایەتێكی میانەڕەوتان لەسەرە، هیدایەتێكی میانەڕەوتان لەسەرە، چونكە هەر كەس ئەم دینە توند بكاتەوە بەسەریدا زاڵ دەبێت**).

## ٢٤- دەروازەی: ئایین نەصیحەتە

**٦٧-** (ق) عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى إِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ. [خ٥٧/ م٥٦]

(ق) لە جەریری كوڕی عەبدوڵاوە، وتی: بەیعەتم بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) كرد لەسەر نوێژ كردن و دانی زەكات، و نەصیحەت بۆ هەموو موسڵمانێك.

**٦٨-** (م) عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الدِّينُ النَّصِيحَةُ**) قُلْنَا: لِمَنْ؟ قَالَ: (**لِلَّهِ، وَلِكِتَابِهِ، وَلِرَسُولِهِ، وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ، وَعَامَّتِهِمْ**). [م٥٥]

(م) لە تەمیمی دارییەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(دین نەصیحەتە)**، وتمان: بۆ کێ؟ فەرمووی: **(بۆ خودا، وکتێبەکەی، وپێغەمبەرەکەی، وئیمامانی موسڵمانان، و هەموو موسڵمانان بەگشتی**[1]**)**.

## ٢٥- دەروازەی: موسڵمان و کۆچکەر

**٦٩-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللهُ عَنْهُ). [خ١٠]

(خ) لە لە عەبدولای کوڕی عەمرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(موسڵمان ئەو کەسەیە موسڵمانان لە زمان و دەستی سەلامەتن، کۆچکەریش ئەو کەسەیە کۆچی کردووە لەوەی خودا نەهی لێکردووە)**.

**٧٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (المسْلِمُ مَنْ سَلِمَ المسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالمؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ عَلَى دِمَائِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ). [ت٢٦٢٧/ ن٥٠١٠]

* حسن صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(موسڵمان ئەو کەسەیە موسڵمانان لە زمان و دەستی سەلامەتن، باوەڕداریش ئەو کەسەیە خەڵکی لەسەر خوێن و ماڵ و سامانیان بە ئەمینی دادەنێن)**.

---

[1] نەصیحەت بۆ خودا بریتییە لە باوەڕی یەکتاپەرستی و خۆشویستن و عیبادەت کردنی خودا بە تاك و تەنهایی و دوورکەوتنەوە لە حەرامکراوەکان و ئەنجامدانی فەرمان پێکراوەکان، نەصیحەت بۆ کتێبەکەی خودا: خوێندنەوە و تێڕامان و کار پێکردنی، نەصیحەت بۆ پێغەمبەر ئیمان پێهێنان و خۆشویستن و گوێڕایەڵی و شوێنکەوتنی و زیندووکردنەوەی سوننەتەکانی، نەصیحەت بۆ ئیمامانی موسڵمانان: گوێڕایەڵی کردن و سەرخستنیان تا ئەو کاتەی دینی خودا سەردەخەن و لە خزمەتی موسڵماناندا کار دەکەن، نەصیحەت بۆ هەموو موسڵمانان: فەرمان کردنە بە چاکە و نەهی کردنە لە خراپە و سەرخستن و کارکردن بۆ بەرژەوەندییەکانیان و گرتنەوەی خراپەی خۆ لەوان–و

٧١- عَنْ أَنَسِ بنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**المُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ، وَالمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ المُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ السُّوءَ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ عَبْدٌ لاَ يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ**). [حم١٢٥٦١]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (باوەڕدار ئەو کەسەیە خەڵکی بە ئەمینی دەزانن، موسڵمانیش ئەو کەسەیە موسڵمانان لە زمان و دەستی سەلامەتن، کۆچکەریش ئەو کەسەیە لە خراپە کۆچ دەکات، بەندەیەك ناچێتە بەهەشتەوە جیرانەکەی لە شەڕی ئەمین نەبێت).**

## ٢٦- دەروازەی: (بڵێ: ئیمانم بە خودا هێناوە)

٧٢- (م) عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ الثَّقَفِيِّ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! قُلْ لِي فِي الإِسْلاَمِ قَوْلاً لاَ أَسْأَلُ عَنْهُ أَحَداً بَعْدَكَ، قَالَ: (**قُلْ: آمَنْتُ بِاللهِ فَاسْتَقِمْ**). [م٣٨]

**(م) لە سوفیانی کوڕی عەبدوڵای سەقەفییەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، وتەیەکم لە ئیسلامدا پێ بفەرموو لەدوای تۆ پرسیار نەکەم لە هیچ کەس دەربارەی، فەرمووی: (بڵێ، ئیمانم بە خودا هێناوە، و ڕێك و ڕاست ڕاوەستە).**

## ٢٧- دەروازەی: ئەوەی بۆ خۆی پێیخۆشە

٧٣- (ق) عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ**). [خ١٣/ م٤٥]

**(ق) لە ئەنەسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (یەکێك لە ئێوە ئیمانی نەهێناوە تا ئەوەی بۆ خۆی پێیخۆشە بۆ براکەی پێیخۆش دەبێت).**

٧٤- وعَنْه، عَن النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِلنَّاسِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ، وَحَتَّى يُحِبَّ المَرْءَ لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ لِلَّهِ عزّ وجل). [حم١٣٨٧٥]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

هەر بەو جۆرە لە ئەنەسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(یەکێك لە ئێوە ئیمانی نەهێناوە تا ئەوەی بۆ خۆی پێیخۆشە بۆ خەڵکی پێیخۆش دەبێت، هەروەها تا کەسێکی خۆشبوێت تەنها لەبەر خودا(ﷻ) خۆشیبوێت).**

٧٥- وعَنْه، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ يَبْلُغُ العَبْدُ حَقِيْقَةَ الإِيْمَانِ، حَتَّى يُحِبَّ لِلنَّاسِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ مِنَ الخَيْرِ). [حب(٢٣٥) مخ(٧/٢٥٢٥)]

دیسان لە ئەنەسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(بەندەیەك ناگاتە راستەقینەی ئیمان، تا ئەوەی لە خێر بۆ خۆی پێیخۆشە بۆ خەڵکی پێیخۆش دەبێت).**

## ٢٨- دەروازەی: دووڕوان و سیفەتەکانیان

٧٦- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (آيَةُ المُنَافِقِ ثَلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ). [خ٣٣/ م٥٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(نیشانەی کەسی دووڕوو سێ شتە: کاتێك قسە دەکات درۆ دەکات، کاتێك بەڵێن دەدات بەڵێنشکێنی دەکات، کاتێك ئەمانەتی لا دادەنرێت ناپاکی دەکات).**

- وزاد في رواية لمسلم: (وإن صامَ وصَلَّى، وزَعَمَ أَنَّهُ مُسْلِمٌ).

لە ریوایەتێکی موسلیمدا ئەمەی زیاد کردووە: **(هەرچەند بەڕۆژوو بێت و نوێژیش بکات و بانگەشەی ئەوە بکات موسڵمانە).**

٧٧- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقاً خَالِصاً، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا: إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ). [خ٣٤/ م٥٨]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(چوار شت هەن هەر کەس ئەوانەی تێدا بێت دووڕوویەکی پاڵفتەیە، هەر کەس خەسڵەتێك لەوانەی تێدا بێت خەسڵەتێك لە دووڕوویی تێدایە تا وازیلێدەهێنێت: کاتێك ئەمانەتی لا دادەرێت ناپاکی لێ دەکات، کاتێك قسە دەکات درۆ دەکات، کاتێك پەیمان دەبەستێت غەدر(ناپاکی) لە پەیمان دەکات، کاتێك نەیاری دەکات بەدڕەفتار دەبێت[1])**.

٧٨- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ خامَةِ الزَّرْعِ، يَفِيءُ وَرَقُهُ، مِنْ حَيْثُ أَتَتْهَا الرِّيحُ تُكَفِّئُهَا، فَإِذَا سَكَنَتِ اعْتَدَلَتْ، وَكَذَلِكَ الْمُؤْمِنُ يُكَفَّأُ بِالْبَلاَءِ. وَمَثَلُ الكافِرِ كَمَثَلِ الأَرْزَةِ، صَمَّاءُ مُعْتَدِلَةٌ، حَتَّى يَقْصِمَهَا اللهُ إِذَا شَاءَ).

[خ٧٤٦٦ (٥٦٤٤)/ م٢٨٠٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(نموونەی باوەڕدار وەك خەڵفە نەمام وایە گەڵاکانی سێبەر دەکەن، لە هەر شوێنێکەوە باڕەش بێت لاری دەکاتەوە، کاتێك باڕەشەکە دامرکایەوە ڕێکدەبێتەوە، هەر بەو جۆرە باوەڕدار بە بەڵا لاردەبێتەوە، نموونەی بێباوەڕیش وەك درەختی سنەوبەر(الأَرْزَة) وایە، ڕەق و ڕێك، تا خودا هەر کات بخوازێت لە بێخی دەهێنێت)**.

- ولفظ مسلم: (مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ الزَّرْعِ، لا تَزَالُ الرِّيحُ تُمِيلُهُ، ولا يَزَالُ المؤْمِنُ يُصيبُهُ البَلاءُ. وَمَثَلُ المنَافِقِ كَمَثَلِ شَجَرَةِ الأَرْزِ، لا تَهْتَزُّ حتَّى تَسْتَحْصِدَ).

لەفزەکەی موسلیم: **(نموونەی باوەڕدار وەك رووەك وایە، بەردەوام با لاری دەکاتەوە، باوەڕداریش بەردەوام بەڵای تووشدەبێت، نموونەی کەسی دووڕووش وەك درەختی سنەوبەر وایە، نایەتە لەرزین و هەژان تا لە بێخ دێت)**.

---

[1] بەدڕەفتار دەبێت: واتە لە حەق لا دەدات-و.

**٧٩-** (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَثَلُ الْمُنَافِقِ كَمَثَلِ الشَّاةِ الْعَائِرَةِ بَيْنَ الْغَنَمَيْنِ؛ تَعِيرُ إِلَى هَذِهِ مَرَّةً، وَإِلَى هَذِهِ مَرَّةً**). [م٢٧٨٤]

[وانظر: **٣١٨٨** في كون الثناء على السلطان من النفاق.

**٣٩١٢** في النفاق والكفر].

(م) لە ئیبن عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**نموونەی کەسی دووڕوو وەك حەیوانێکی سەرلێشێواو وایە لە نێوان دوو ڕانەمەڕدا، جارێك شوێنی ئەمەیان دەکەوێت، و جارێکیش شوێنی ئەوەیان دەکەوێت**).

## ٢٩- دەروازەی: ترس لە دووڕوویی

**٨٠-** (خ) قَالَ إِبْرَاهِيمُ التَّيْمِيُّ: مَا عَرَضْتُ قَوْلِي عَلَى عَمَلِي؛ إِلاَّ خَشِيتُ أَنْ أَكُونَ مُكَذِّباً.

وَقَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: أَدْرَكْتُ ثَلاَثِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم كُلُّهُمْ يَخَافُ النِّفَاقَ عَلَى نَفْسِهِ، مَا مِنْهُمْ أَحَدٌ يَقُولُ: إِنَّهُ عَلَى إِيمَانِ جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ.

ويُذْكَرُ عَنِ الحَسَنِ البصري: مَا خَافَهُ إِلاَّ مُؤْمِنٌ، وَلاَ أَمِنَهُ إِلاَّ مُنَافِقٌ. [خ. الإيمان، باب ٣٦]

[وانظر: **٢٢٠٧** حديث حنظلة].

(خ) ئیبراهیمی تیمی وتی: هەر کات قسەم بەسەر کارمدا خستبێتەروو[١] ترساوم لەوەی بەدرۆزان بم.

ئیبن مولەیکە وتی: (**بە سی کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتم، هەموویان لە نەفسی خۆیان لە دووڕووی دەترسان، هیچ کەس لەوان نەیدەوت: ئەو لەسەر ئیمانی جیبریل و میکائیلە**).

لە حەسەنی بەصرییەوە باس دەکەن، وتی: تەنها باوەڕدار لێی دەترسێ و تەنها کەسی دووڕوو لە ئاسایشدایە لێی[٢].

---

[١] خستبێتەروو: واتە بەراوردم کردبێت لە نێوان قسە و کارمدا—و.

[٢] واتە تەنها باوەڕدار لە دووڕوویی دەترسێت و تەنها کەسی دووڕوو لە دووڕوویی ناترسێت—و.

## ٣٠- دەروازەی: بەیعەت

٨١- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: جَاءَتْ أُمَيْمَةُ بِنْتُ رُقَيْقَةَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تُبَايِعُهُ عَلَى الْإِسْلاَمِ، فَقَالَ: (**أُبَايِعُكِ عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكِي بِاللهِ شَيْئاً، وَلاَ تَسْرِقِي، وَلاَ تَزْنِي، وَلاَ تَقْتُلِي وَلَدَكِ، وَلاَ تَأْتِي بِبُهْتَانٍ تَفْتَرِينَهُ بَيْنَ يَدَيْكِ وَرِجْلَيْكِ، وَلاَ تَنُوحِي، وَلاَ تَبَرَّجِي تَبَرُّجَ الجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى**). [حم٦٨٥٠]

* صحيح لغيره.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: ئومەیمەی کچی ڕوقەیقە هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) تا لەسەر ئیسلام بەیعەتی پێ بکات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەیعەتت لێ وەردەگرم لەسەر ئەوەی شتێك نەکەی بە هاوەڵ بۆ خودا، دزی نەکەی، زینا نەکەی، منداڵی خۆت نەکوژی، بوختانێك نەهێنی لە نێوان دەست و لاقی خۆت هەڵتبەستبێت، مردوو نەلاوێنیتەوە، خۆت ڕووت و بەرەڵا نەکەی وەك ڕووتی و بەرەڵایی سەردەمی نەفامی یەکەم).**

٨٢- وعَنْه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ لاَ يُصَافِحُ النِّسَاءَ فِي البَيْعَةِ. [حم٦٩٩٨]

* صحيح، وإسناده حسن.

**هەر لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە بەیعەتدا دەستی نەدەخستە ناو دەستی ئافرەتان.**

٨٣- عن عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: مَا مَسِسْتُ فَرْجِي بِيَمِينِي مُنْذُ بَايَعْتُ بِهَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [حم١٩٩٤٣]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

[وانظر: **٣١٩٠** حديث ابن عمر.

**٣٤٠٥** حديث عوف بن مالك.

**٢٧٣١** من بايع إمامه لدنيا].

**لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە، وتی: لەو کاتەی بەیعەتم بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کردووە دەستی ڕاستم نەداوە لە عەورەتم.**

## ٣١- دەروازەی: دامەزران لەسەر ئایین

**٨٤-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، الصَّابِرُ فِيهِمْ عَلَى دِينِهِ كَالقَابِضِ عَلَى الجَمْرِ).** [ت٢٢٦٠]

* صحيح.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ڕۆژگارێك بەسەر خەڵكیدا دێت كەسی ئارامگر لەسەر دینەكەی وەك ئەو كەسە وایە پشكۆ لە مشتیدا بێت).**

## ٣٢- دەروازەی: سنوورەکانی خوا بپارێزە خوا تۆ دەپارێزێ

**٨٥-** عَن ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كُنْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْماً فَقَالَ: **(يَا غُلامُ، إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ، احْفَظِ اللهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظِ اللهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهِ، وَاعْلَمْ أَنَّ الْأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ، وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الْأَقْلاَمُ وَجَفَّتِ الصُّحُفُ).** [ت٢٥١٦]

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: ڕۆژێك لە پاشكۆی پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوار بووبووم، فەرمووی: **(ئەی غوڵام، من چەند كەلیمەیەكت فێر دەكەم: خودا بپارێزە[1] خودا تۆ دەپارێزێ، خودا بپارێزە ئەو لە بەرەی[2] تۆ دەبێت، گەر داوات كرد داوا لە خودا بكە، گەر كۆمەكیت داوا كرد كۆمەكی لە خودا داوا بكە، بزانە گەر ئومەت كۆببەنەوە لەسەر ئەوەی بە شتێك سوودت پێ بگەیەنن، سوودت پێناگەیەنن مەگەر بە شتێك خودا بۆ تۆی نووسی بێت، گەر كۆببنەوە لەسەر ئەوەی بە شتێك زیانت پێ بگەیەنن،**

---

[1] خودا بپارێزە: واتە سنوورەكانی خودا بپارێزە-و.

[2] واتە: خودا لەگەڵ تۆ دەبێت، كۆمەكیت دەكات بۆ كاری خێر و بەسەر دوژمناندا سەرتدەخات-و.

**زیانت پێ ناگەیەنن مەگەر بە شتێك خودا لەسەر تۆی نووسی بێت، قەڵەمەکان بەرزکرانەوە و لاپەڕەکان وشکبوونەوە.**

- زاد في رواية لأحمد: (تَعَرَّفْ إِلَيْهِ فِي الرَّخَاءِ يَعْرِفْكَ فِي الشِّدَّةِ... وَاعْلَمْ أَنَّ فِي الصَّبْرِ عَلَى مَا تَكْرَهُ خَيْراً كَثِيراً، وَأَنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ، وَأَنَّ الفَرَجَ مَعَ الكَرْبِ، وَأَنَّ مَعَ العُسْرِ يُسْراً).

[حم ٢٨٠١]

* صحيح.

لە ریوایەتێکی ئەحمەد ئەم زیادەیە هاتووە: **(لە کاتی خۆشیدا بیناسە لە کاتی ناخۆشیدا دەتناسێت.. بزانە لە ئارام گرتن لەسەر ئەوەی پێتناخۆشە[1] خێرێکی زۆر هەیە، سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتنە، دەروو[2] لەگەڵ تەنگانەدایە، لەگەڵ ناخۆشی خۆشی هەیە).**

## ٣٣- دەروازەی: مەزنی پاداشتی بانگەواز بۆ لای خودا

**٨٦-** عَنْ سَهْلِ بْن سَعْدٍ، عَن النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (وَاللهِ لأَنْ يَهْدِيَ اللهُ بِهُدَاكَ رَجُلاً وَاحِداً، خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ). [د ٣٦٦١]

* صحيح.

لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بە خودا، گەر خودا بە تۆ یەك پیاو هیدایەت بدات باشترە بۆت لە گەلە حوشتری سوور[3]).**

---

[1] پێتناخۆشە: واتە حەزی لێناکەی و لەسەر نەفس قورسە و لێی وەڕس و بێزارە–و.

[2] دەروو: واتە رێگەچارە–و.

[3] حوشتری سوور: لای عەرەب باشترین حوشترە–و.

## ٣٤- دەروازەی: زیادبوون و کەمبوونی ئیمان

**٨٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ الإِيْمَانَ لَيَخْلَقُ فِي جَوْفِ أَحَدِكُمْ كَمَا يَخْلَقُ الثَّوْبُ الخَلَقُ، فَاسْأَلوا اللهَ أَنْ يُجَدِّدَ الإِيْمَانَ فِي قُلُوبِكُمْ). [ك٥]

* قال الذهبي: رواته ثقات.

[وانظر: **٣٣٤٣**].

**له عەبدولاّی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئیمان لە ناوەوەی یەکێك لە ئێوە دەڕزێت[1] وەك چۆن پۆشاکی کۆن دەڕزێت، داوا لە خودا بکەن ئیمان لەناو دڵتان نوێ بکاتەوە).**

## ٣٥- دەروازەی: دابڕانی ئەم ئومەتە لەیەکتر

**٨٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (افْتَرَقَتِ اليَهُودُ عَلَى إِحْدَى أَوْ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَتَفَرَّقَتْ النَّصَارَى عَلَى إِحْدَى أَوْ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً). [د٤٥٩٦/ ت٢٦٤٠/ جه٣٩٩١]

* حسن صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (یەهوود بۆ حەفتا و یەك یان حەفتا و دوو دەستە دابەش بوون[2]، نەصاراش بۆ حەفتا و یەك یان حەفتا و دوو دەستە دابەش بوون، ئومەتەکەی من بۆ حەفتا و سێ دەستە دابەش دەبن).**

---

[1] دەڕزێت: وەرگێڕانی وشەی "يَخْلَق"ە کە فەرمانی پوان و رزانە-و.

[2] دابەش بوون: واتە ناکۆکی و جیاوازی لە دیندا کەوتە نێوانیانەوە و لەیەکتر دابڕان و یەکێتییان نەما-و.

**٨٩**– وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَتَتَّبِعُنَّ سُنَّةَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، بَاعاً بِبَاعٍ، وَذِرَاعاً بِذِرَاعٍ، وَشِبْراً بِشِبْرٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا فِي جُحْرِ ضَبٍّ، لَدَخَلْتُمْ فِيهِ**) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! اليَهُودُ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: (**فَمَنْ، إِذاً**) ؟. [جه٣٩٩٤]

* حسن صحيح.

هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**شوێنی سوننەتی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون، باڵ بە باڵ و قۆڵ بە قۆڵ و بست بە بست، تەنانەت گەر بچنە ناو کونی بزنمژەوە ئێوەش تێیدەچن**)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، مەبەستت یەهوود و نەصارایە؟ فەرمووی: (**ئەی کێیترن؟**).

**٩٠**– عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**افْتَرَقَتِ اليَهُودُ عَلَى إِحْدَى وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، فَوَاحِدَةٌ فِي الجَنَّةِ، وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ، وَافْتَرَقَتِ النَّصَارَى عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، فَإِحْدَى وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ، وَوَاحِدَةٌ فِي الجَنَّةِ. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ! لَتَفْتَرِقَنَّ أُمَّتِي عَلَى ثَلاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَاحِدَةٌ فِي الجَنَّةِ، وَثِنْتَانِ وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ**) قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَنْ هُمْ؟ قَالَ: (**الجَمَاعَةُ**). [جه٣٩٩٢]

* صحيح.

لە عەوفی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**یەهوود بۆ حەفتا و یەك دەستە دابەش بوون، یەك دانەیان لە بەهەشتدایە، و حەفتایان لە ئاگردان، نەصاراش بۆ حەفتا و دوو دەستە دابەش بوون، حەفتا و یەکیان لە ئاگردان یەك دانەیان لە بەهەشتدان، سوێند بەو کەسەی نەفسی محەمەدی بەدەستە، ئومەتەکەی من بۆ حەفتا و سێ دەستە دابەش دەبن، یەك دانەیان لە بەهەشتدایە، و حەفتا و دوویان لە ئاگردان**)، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوانە کێن؟ فەرمووی: (**کۆمەڵ**).

## ٣٦- دەروازەی: نوێکردنەوەی کاروباری ئایین

**٩١**– عَنْ أَبِي عَلْقَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ـ فِيمَا أَعْلَمُ ـ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ اللهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا**). [د٤٢٩١]

* صحيح.

لە ئەبی عەلقەمەوە، لە ئەبی هورەیرەوە –لەوەی دەیزانم[1]– لە پێغەمبەری خوداوە، فەرمووی: **(خودا لەسەر سەری هەر سەد ساڵێك کەسێك بۆ ئەم ئومەتە رەوانە دەکات کاروباری ئایینەکەی بۆ نوێ بکاتەوە)**.

**٩٢–** عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: **(إِنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى سَيُؤَيِّدُ هَذَا الدِّينَ بِأَقْوَامٍ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ)**. [حم٢٠٤٥٤]

* صحيح لغيره.

لە ئەبی بەکرەوە، لە پێغەمبەرەوە، فەرموویەتی: **(خودا(تبارك وتعالى) پشتیوانی ئەم دینە دەکات بە خەڵکانێك بەشیان نییە[2])**.

## ٣٧- دەروازەی: هەڵوەشانەوەی قوڵفەکانی ئایین

**٩٣–** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ البَاهِلِيِّ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لَتُنْقَضَنَّ عُرَى الْإِسْلَامِ عُرْوَةً عُرْوَةً، فَكُلَّمَا انْتَقَضَتْ عُرْوَةٌ تَشَبَّثَ النَّاسُ بِالَّتِي تَلِيهَا، وَأَوَّلُهُنَّ نَقْضاً الحُكْمُ، وَآخِرُهُنَّ الصَّلاَةُ)**. [حم٢٢١٦٠]

* إسناده جيد.

لە ئەبی ئومامەی باهیلییەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(دانە دانە قوڵفەکانی ئیسلام هەڵدەوەشێن، هەرکات قوڵفێك هەڵدەوەشێت خەڵکی پەنا بۆ قوڵفێکی دوای ئەو دەبەن، یەکەمین قوڵف هەڵدەوەشێت حوکمە[3] و دواهەمین قوڵف هەڵدەوەشێت بریتییە لە نوێژ)**.

---

[1] لەوەی دەیزانم: واتە وەك ئەوەی پێمگەیشتووە–و.

[2] بەشییان نییە: واتە خەڵکانێکن لای خودا بێبەشن، بەڵام خودا دەیانکات بە هۆکاری سەرخستنی دینەکەی–و.

[3] واتە: کارکردن بە حوکمەکانی خودا–و.

## ٣٨- دەروازەی: وەحی

[انظر: في بدء الوحي: **٣٥٧٦**.

وفي نزول الوحي ومدة ذلك: **٤٢٣ - ٤٢٦**.

وفي ثقل الوحي: **٦٢٧**].

## ٣٩- دەروازەی: بەرزکردنەوە و لێوردبوونەوە

[انظر: في التوكل: **٥٩٤، ٣٤٠٩**.

وفي التمائم: **٢٩١٢**].

## بەشی یەکەم

# نیشانەکانی هاتنی قیامەت

## ١- دەروازەی: نیشانەکانی هاتنی قیامەت بەگشتی

[انظر بشأن الإيمان باليوم الآخر: ٤٩].

**٩٤-** (ق) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لأُحَدِّثَنَّكُمْ حَدِيثاً سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لاَ يُحَدِّثُكُمْ بِهِ أَحَدٌ غَيْرِي: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ: أَنْ يُرْفَعَ العِلْمُ، وَيَكْثُرَ الجَهْلُ، ويَكْثُرَ الزِّنَى، وَيَكْثُرَ شُرْبُ الخَمْرِ، وَيَقِلَّ الرِّجالُ، ويَكْثُرَ النِّسَاءُ، حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً القَيِّمُ الوَاحِدُ)**. [خ٥٢٣١ (٨٠)/ م٢٦٧١]

(ق) لە ئەنەسەوە، وتی: فەرموودەیەکتان بۆ باس دەکەم لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست، هیچ کەس جگە لە من ئەو فەرموودەتان بۆ باس ناکات، گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە: زانست هەڵبگیرێت، نەزانی زۆر ببێت، زینا زۆر ببێت، خواردنەوەی عارەق زۆر ببێت، پیاو کەم ببێتەوە، ئافرەت زۆر ببێت، تا پەنجا ئافرەت یەك پیاو سەرۆکاری دەکات)**.

**٩٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقْبَضَ العِلْمُ، وَتَكْثُرَ الزَّلاَزِلُ، وَيَتَقَارَبَ الزَّمَانُ، وَتَظْهَرَ الفِتَنُ، وَيَكْثُرَ الهَرْجُ - وَهُوَ القَتْلُ القَتْلُ - حَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمُ المَالُ فَيَفِيضُ)**. [خ١٠٣٦ (٨٥)/ م١٥٧م/العلم ١١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(قیامەت نایەت تا زانست دەگیرێتەوە، و بوومەلەرزە زۆر دەبێت، و کات نزیك دەبێتەوە، و فیتنە زۆر دەبێت، "الهرج"-کە بریتییە لە کوشت و کوشتار- زۆر دەبێت تا ماڵ و سامان لەناو ئێوەدا زۆر دەبێت و لێشاو دەگرێت)**.

**٩٦**- (خ) عَنْ عَوْفِ بْنِ مالِكٍ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، وَهُوَ فِي قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ، فَقَالَ: (اعْدُدْ سِتّاً بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ: مَوْتِي، ثُمَّ فَتْحُ بَيْتِ المَقْدِسِ، ثُمَّ مُوْتَانٌ يَأْخُذُ فِيكُمْ كَقُعَاصِ الغَنَمِ، ثُمَّ اسْتِفَاضَةُ المَالِ حَتَّى يُعْطَى الرَّجُلُ مِائَةَ دِينَارٍ فَيَظَلُّ سَاخِطاً، ثُمَّ فِتْنَةٌ لاَ يَبْقَى بَيْتٌ مِنَ العَرَبِ إِلاَّ دَخَلَتْهُ، ثُمَّ هُدْنَةٌ تَكُونُ بَيْنَكُمْ وبَيْنَ بَنِي الأَصْفَرِ، فَيَغْدِرُونَ، فَيَأْتُونَكُمْ تَحْتَ ثَمَانِينَ غايَةً، تَحْتَ كُلِّ غايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفاً). [خ٣١٧٦]

(ق) لە عەوفی كوڕی مالیكەوە، وتی: لە غەزوەی تەبووك هـاتم بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ)، ئەو لە قوببەیەك لە چەرم(پێست)دا بوو، فـەرمووی: **(شـەش شـت لەبـەردەم قیامـەت بژمێرە: مردنی من، فەتحی "بيت المقدس"، پاشان قڕكردنێك وەك رانەمەڕ لـە ئێـوە دەكوژێت، پاشان ماڵ و سامانی بە لێشاو تا سەد دینـار بـە پیاوێـك دەدرێـت هێشـتا ناڕازییە، پاشان فیتنەیەك كە دەچێتە هەموو ماڵێكی عەرەبەوە، پاشان هودنەیەك لە نێوان ئێوە و "بني الأصفر-ڕۆم"، ئەوان ناپاكی لە هودنەكە دەكەن، بۆیە لەژێر هەشتا بەیداخدا بۆتان دێن، لەژێر هەر بەیداخێكدا دوازدە هەزار هەن)**.

**٩٧**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (بَادِرُوا بِالأَعْمَالِ سِتّاً: الدَّجَّالَ، وَالدُّخَانَ، وَدَابَّةَ الأَرْضِ، وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَأَمْرَ العَامَّةِ، وَخُوَيْصَّةَ أَحَدِكُمْ). [م٢٩٤٧]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(بە كۆمـەڵێك كـار دەستپێشخەری لـە شـەش شـت بكـەن: دەججـال، و دووكەڵەكـە، و دابەكـەی زەوی[1]، و هـەڵهاتنی خـۆر لـە خۆرئـاواوە، و كـارە گشـتییەكە[2]، و كـارە تایبەتەكەی هەر یەكێكتان[3])**.

---

[1] لەم ئایەتەدا ئاماژە بەو دابەیە كراوە: ﴿وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِنَ الأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لا يُوقِنُونَ﴾[ النمل: ٨٢] -و.

[2] كارە گشتییەكە: قەتادە دەڵێت: واتە: قیامەت، لە (مشارق الأنوار)دا بەو جۆرە هاتووە.

[3] كارە تایبەتەكەی هەر یەكێكتان: واتە مردنی هەر یەكێكتان.

**٩٨**– (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَدِيثاً لَمْ أَنْسَهُ بَعْدُ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِنَّ أَوَّلَ الآيَاتِ خُرُوجاً، طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَخُرُوجُ الدَّابَّةِ عَلَى النَّاسِ ضُحًى، وأَيُّهُمَا مَا كَانَتْ قَبْلَ صَاحِبَتِهَا، فَالأُخْرَى عَلَى إِثْرِهَا قَرِيباً**). [م٢٩٤١]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: فەرموودەیەکم لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لەبەرکرد هەرگیز لەبیری ناکەم، گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(یەکەمین ئایەتێك لە ئایەتەکان دەردەکەوێت هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، هاتنەدەرەوەی دابەیەك بۆ خەڵکی لە چێشتەنگاودا، کامیان پێش ئەویتریان بوو یەکەکەی تریان بەدوایدا نزیکە)**.

**٩٩**– (م) عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ الغِفَارِيِّ قَالَ: اطَّلَعَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَيْنَا وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ، فَقَالَ: (**مَا تَذَاكَرُونَ**) ؟ قَالُوا: نَذْكُرُ السَّاعَةَ، قَالَ: (**إِنَّهَا لَنْ تَقُومَ حَتَّى تَرَوْنَ قَبْلَهَا عَشْرَ آيَاتٍ**)، فَذَكَرَ الدُّخَانَ، وَالدَّجَّالَ، وَالدَّابَّةَ، وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَنُزُولَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ صلّى الله عليه وسلّم، وَيَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَثَلاَثَةَ خُسُوفٍ: خَسْفٌ بِالمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ العَرَبِ. وَآخِرُ ذَلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنَ اليَمَنِ، تَطْرُدُ النَّاسَ إِلَى مَحْشَرِهِمْ. [م٢٩٠١]

(م) لە حوزەیفەی کوڕی ئەسیدی غیفارییەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ لامان و تەماشای کردین، ئێمە بیرمان دەکردەوە، فەرمووی: **(بیر لە چی دەکەنەوە؟)** وتیان: بیر لە هاتنی قیامەت دەکەینەوە، فەرمووی: **(قیامەت نایەت تا بەر لە هاتنی دە ئایەت دەبینن)**، باسی ئەمانەی کرد: دووکەڵەکە، و دەجاڵ، و دابەکە، و هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاوە، و دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم، و یەئجووج و مەئجووج، و سێ ڕۆچوون: ڕۆچوونێك لە خۆرهەڵات و ڕۆچوونێك لە خۆرئاوا و ڕۆچوونێك لە جەزیرەی عەرەب، کۆتایی ئەوە ئاگرێکە لە یەمەن سەرهەڵدەدات، خەڵکی بەرەو شوێنی حەشریان دەردەکات.

١٠٠- عَنْ عِلْبَاءَ السُّلَمِيِّ قَالَ: قال رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ عَلَى حُثَالَةِ النَّاسِ)**. [حم١٦٠٧١]

* إسناده صحيح.

**له عیلبای سولەمییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (قیامەت بەسەر خەڵکی نەفام و شەڕەنگێزدا ڕاستدەبێتەوە).**

١٠١- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(إِنَّ أَوَّلَ الْآيَاتِ خُرُوجاً طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَخُرُوجُ الدَّابَّةِ ضُحًى، فَأَيَّتُهُمَا كَانَتْ قَبْلَ صَاحِبَتِهَا فَالْأُخْرَى عَلَى أَثَرِهَا)**.

ثُمَّ قَالَ عَبْدُ اللهِ -وَكَانَ يَقْرَأُ الكُتُبَ-: وَأَظُنُّ أُولاَهَا خُرُوجاً طُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا؛ وَذَلِكَ أَنَّهَا كُلَّمَا غَرَبَتْ أَتَتْ تَحْتَ العَرْشِ فَسَجَدَتْ، وَاسْتَأْذَنَتْ فِي الرُّجُوعِ، فَأُذِنَ لَهَا فِي الرُّجُوعِ، حَتَّى إِذَا بَدَا لِلَّهِ أَنْ تَطْلُعَ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَعَلَتْ كَمَا كَانَتْ تَفْعَلُ، أَتَتْ تَحْتَ العَرْشِ فَسَجَدَتْ، فَاسْتَأْذَنَتْ فِي الرُّجُوعِ، فَلَمْ يُرَدَّ عَلَيْهَا شَيْءٌ، ثُمَّ تَسْتَأْذِنُ فِي الرُّجُوعِ، فَلاَ يُرَدُّ عَلَيْهَا شَيْءٌ، ثُمَّ تَسْتَأْذِنُ، فَلاَ يُرَدُّ عَلَيْهَا شَيْءٌ، حَتَّى إِذَا ذَهَبَ مِنَ اللَّيْلِ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَذْهَبَ، وَعَرَفَتْ أَنَّهُ إِنْ أُذِنَ لَهَا فِي الرُّجُوعِ لَمْ تُدْرِكِ المَشْرِقَ، قَالَتْ: رَبِّ مَا أَبْعَدَ المَشْرِقَ، مَنْ لِي بِالنَّاسِ، حَتَّى إِذَا صَارَ الْأُفُقُ كَأَنَّهُ طَوْقٌ اسْتَأْذَنَتْ فِي الرُّجُوعِ، فَيُقَالُ لَهَا: مِنْ مَكَانِكِ فَاطْلُعِي، فَطَلَعَتْ عَلَى النَّاسِ مِنْ مَغْرِبِهَا. ثُمَّ تَلاَ عَبْدُ اللهِ هَذِهِ الْآيَةَ: **﴿يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا﴾** [الأنعام:١٥٨]. [حم٦٨٨١]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (یەکەمین ئایەتێك سەرهەڵدەدات هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، هاتنە دەرەوەی دابەکە لە چێشتەنگاودا، هەرکامێکیان بەر لەویتریان بوو دانەکەی تریان بەدوایدا دێت).**

پاشان عەبدوڵا-ئەو خوێنەری کتێب بوو- وتی: وا گومان دەبەم یەکەمینێك سەرهەڵدەدات هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، ئەوەش چونکە هەر کات ئاوا دەبێت دێت بۆ ژێر عەرش و سوژدە دەبات و داوای مۆڵەت دەکات بۆ گەڕانەوە، مۆڵەتی

دەدرێت بگەڕێتەوە، تا خودا بڕیار دەدات لە خۆرئاواوە هەڵبێت، بۆیە بەرز دەبێتەوە وەك جارانی پێشوو، دێت بۆ ژێر عەرش و سوژدە دەبات و داوای مۆڵەتی گەڕانەوە دەكات، شتێك وەڵامی نادرێتەوە، پاشان داوای مۆڵەتی گەڕانەوە دەكات شتێك وەڵامی ناداتەوە، تا ئەوەندەی خودا دەیەوێت لە شەو تێدەپەڕێ، خۆر دەزانێ گەر مۆڵەتی گەڕانەوەی بدرێت ناكات بە خۆرهەڵات، دەڵێت: پەروەردگار، چەند خۆرهەڵات دوورە، كێ لە جێی من خەمی خەڵك دەخوات، تا ئاسۆكان وەك تەوقیان لێ دێت داوای مۆڵەتی گەڕانەوە دەكات، پێی دەوترێت: لە جێگەی خۆت هەڵبێ، بۆیە لە خۆرئاواوە بەسەر خەڵكیدا هەڵدێت، پاشان عەبدوڵا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًاۗ﴾ [الأنعام:١٥٨].

١٠٢– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُمْطَرَ النَّاسُ مَطَراً لاَ تُكِنُّ مِنْهُ بُيُوتُ المَدَرِ، وَلاَ تُكِنُّ مِنْهُ إِلاَّ بُيُوتُ الشَّعْرِ). [حم٧٥٦٤]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(قیامەت نایەت تا خەڵكی بارانێكیان بەسەردا دەبارێ، خانووی بیناكراو بەرگری لێ ناكات، تەنهاماڵی دەواری موو بەرگری لێ دەكات).**

١٠٣– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (الآياتُ خرزٌ منظوماتٌ في سلكٍ يُقطَعُ السلكُ فيتبعُ بعضُها بعضًا). [حم٧٠٤٠/ ك٨٤٦١]

* إسناده ضعيف.

لە عەبدوڵای كوڕی عەمرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئایەتەكان(نیشانەكان) دەنكۆڵەن و لە داوێكدا هۆنراونەتەوە، گەر داوەكە بپرێت هەندێكی بە دوای هەندێكی تریدا دێت).**

**١٠٤**– وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَتَسَافَدُوا فِي الطَّرِيقِ تَسَافُدَ الحَمِيرِ**) قُلْتُ: إنَّ ذَاكَ لَكَائِنٌ؟ قَالَ: (**نَعَمْ لَيَكُونَنَّ**). [حب٦٧٦٧]

* إسناده صحيح.

هەر لە عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(قیامەت نایەت تا لەسەر ڕێگا سواری یەکتر دەبن وەك سواربوونی گوێدرێژ)**، وتم: ئەوە ڕوودەدات؟ فەرمووی: **(بەڵێ، ئەوە ڕوودەدات)**.

**١٠٥**– عَنْ خَارِجَةَ بْنِ الصَّلْتِ البُرْجَمِيِّ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ عَبْدِ اللهِ المسْجِدَ فَإذا القَوْمُ رُكُوعٌ، فَرَكَعَ، فَمَرَّ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: صَدَقَ اللهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ وَصَلَ إلى الصَّفِ، فَلَمَّا فَرَغَ سَأَلْتُهُ عَنْ قَوْلِهِ: صَدَقَ اللهُ وَرَسُولُه؟ فَقَالَ: إنَّهُ كَانَ يَقُولُ: (**لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُتَّخَذَ المَسَاجِدُ طُرُقاً، وَحَتَّى يُسَلِّمَ الرَّجُلُ عَلى الرَّجُلِ بِالمَعْرِفَةِ، وَحَتَّى تَتَّجِرَ المَرْأَةُ وَزَوْجُهَا، وَحَتَّى تَغْلُو الخَيْلُ وَالنِّسَاءُ، ثُمَّ تَرْخُصُ فَلا تَغْلُو إلى يَوْمِ القِيَامَةِ**). عبد الله هو ابن مسعود. [ك٨٥٩٨]

* قال الذهبي: صحيح.

[وانظر: ١٠٦.

وانظر: **٣٦٠٣** بشأن النار التي تحشر الناس.

وانظر: **٣٢٧٩** بشأن قرب الساعة.

وانظر: **٣٤٠٢** بشأن ضياع الأمانة].

لە خارجەی کوڕی صەلتی بورجەمییەوە، وتی: لەگەڵ عەبدوڵا ڕۆیشتینە ناو مزگەوتەوە، بینیمان دەستەیەك لە ڕکوعدان، عەبدوڵاش ڕکوعی برد، پیاوێك بە پاڵیدا گوزەری کرد و سەلامی لێکرد، عەبدوڵا وتی: خودا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو، پاشان گەیشتە ریزەکە، کاتێك تەواو بوو پرسیارم دەربارەی ئەو قسەی کرد کە وتی: خودا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو؟ وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: **(قیامەت نایەت تا مزگەوتەکان دەکرێنە ڕێگە، هەروەها تا پیاوێك بە ناسین(بە ئاشنایی) سەلام لە پیاوێکی تر دەکات[1]، هەروەها تا ئافرەت و مێردەکەی بازرگانی دەکەن،**

[1] واتە: گەر ناسراو و ئاشنای نەبێت سەلامی لێ ناکات–و.

**هەروەها تا ئەسپ و ئافرەت گران دەبن، پاشان هەرزان دەبن و تا ڕۆژی قیامەت گران نابنەوە)**، عەبدوڵا بریتییە لە ئیبن مەسعوود.

## ٢- دەروازەی: جەنگانی دوو دەستە بانگەوازەکەیان یەك بانگەوازە و دەرکەوتنی دەجالەکان

١٠٦- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَقْتَتِلَ فِئَتَانِ، فَيَكُونُ بَيْنَهُمَا مَقْتَلَةٌ عَظِيمَةٌ، دَعْوَاهُمَا وَاحِدَةٌ؛ وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ، قَرِيباً مِن ثَلاَثِينَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللهِ**). [خ٣٦٠٩ (٨٥)/ م١٥٧م/الفتن ١٧ و٨٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرییەوە(ﷺ) فەرمووی: **(قیامەت نایەت تا دوو دەستە دژ بەیەکتر دەجەنگن، لە نێوانیان کوشتارێکی گەورە ڕوودەدات، هەروەها قیامەت نایەت تا کۆمەڵێك دەجالی درۆزن ڕەوانە دەکرێن، نزیکن بە سی، هەموویان بانگەشەی ئەوە دەکەن پێغەمبەری خودان)**.

١٠٧- (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ كَذَّابِينَ**). [م٢٩٢٣]

(م) لە جابری کوڕی سەمورەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(لەبەردەم هاتنی قیامەت کۆمەڵێك درۆزن هەن)**.

١٠٨- عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَلْحَقَ قَبَائِلُ مِنْ أُمَّتِي بِالْمُشْرِكِينَ، وَحَتَّى يَعْبُدُوا الْأَوْثَانَ، وَإِنَّهُ سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي ثَلاَثُونَ كَذَّابُونَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ، وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ، لاَ نَبِيَّ بَعْدِي**). [ت٢٢١٩]

* حديث صحيح.

لە سەوبانەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(قیامەت نایەت تا چەند چەند هۆزێك لە ئومەتەکەم دەچنە ناو هاوەڵدانەرانەوە، هەروەها تا بت**

دەپەرستریَ، لە داهاتوودا لە ئومەتەکەم سی درۆزن سەرهەڵدەدەن، هەموویان بانگەشەی ئەوە دەکات پێغەمبەرن، من کۆتا پێغەمبەری پێغەمبەرانم، لەدوای من پێغەمبەر نییە).

## ٣- دەروازەی: زۆری کوشتن

١٠٩- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لاَ يَدْرِي القَاتِلُ فِي أَيِّ شَيْءٍ قَتَلَ؟ وَلاَ يَدْرِي المَقْتُولُ عَلَى أَيِّ شَيْءٍ قُتِلَ)؟. [م٢٩٠٨]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، ڕۆژگارێك بەسەر خەڵکیدا دێت بکوژ نازانێت لەپێناو چ شتێك کوشتوویەتی؟ کوژراو نازانرێت لەسەر چ شتێك کوژراوە؟)**.

١١٠- (م) وعَنْه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكْثُرَ الهَرْجُ) قَالُوا: وَمَا الهَرْجُ؟ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (القَتْلُ. القَتْلُ). [م١٥٧م/ الفتن ١٨]

(م) هەر لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(قیامەت نایەت تا (الهرج–کوشتار) زۆر دەبێت)**، وتیان: (الهرج) چییە؟، فەرمووی: **(کوشتن، کوشتن)**.

## ٤- دەروازەی: خەلیفەیەك ماڵ و سامان دابەش دەکات و نایژمێریَ

١١١- (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ خَلِيفَةٌ يَقْسِمُ المَالَ وَلاَ يَعُدُّهُ). [م٢٩١٣، ٢٩١٤]

(م) لە ئەبی سەعید و جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە ئاخر زەماندا خەلیفەیەك دێت ماڵ و سامان دابەش دەکات و نایژمریَ)**.

## ٥- دەروازەی: عێراق ڕێگری دەکات لە درهەمی

١١٢- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنَعَتِ العِرَاقُ دِرْهَمَهَا وَقَفِيزَهَا، وَمَنَعَتِ الشَّامُ مُدْيَهَا وَدِينَارَهَا، وَمَنَعَتْ مِصْرُ إِرْدَبَّهَا وَدِينَارَهَا، وَعُدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ، وَعُدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ، وَعُدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ). شَهِدَ عَلَى ذَلِكَ لَحْمُ أَبِي هُرَيْرَةَ وَدَمُهُ. [م٢٨٩٦]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(عێراق ڕێگری دەکات لە پێدانی درهەم و قەفیزی، شام ڕێگری دەکات لە مود و دیناری، مصر ڕێگری دەکات لە ئێردەب و دیناری[1]، دەگەڕێنەوە بۆ ئەو جێگەی دەستتان پێکرد، دەگەڕێنەوە بۆ ئەو جێگەی دەستتان پێکرد، دەگەڕێنەوە بۆ ئەو جێگەی دەستتان پێکرد[2])**. گۆشت و خوێنی ئەبی هورەیرە لەسەر ئەوە شایەتی دەدات[3].

## ٦- دەروازەی: پیاوێك بە کوتەکەکەی[4] دەستی خەڵکی دەداتەبەر

١١٣- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ، حَتَّى يَخْرُجَ رَجُلٌ مِنْ قَحْطَانَ، يَسُوقُ النَّاسَ بِعَصَاهُ). [خ٣٥١٧/ م٢٩١٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(قیامەت نایەت تا پیاوێك لە قەحتان پەیدا دەبێت خەڵکی بە کوتەکەکەی دەستی دەداتەبەر)**.

---

[1] مانای قەفیز(القفیز): دەفرێکی پێوانەی دەغڵ و دانە شازدە کیلۆ دەگرێت بە پێوانەی مصری، مود(المُدّ) نزیك بە نیوکیلۆیە، ئێردەب(الإردب) پێوانەیەکی مصری بووە نزیك بە ١٥٠ کیلۆگرام بۆ گەنم و ١٢٠ کیلۆگرام بۆ جۆ-و

[2] دەگەڕێنەوە بۆ ئەو جێگەی دەستتان پێکرد: واتە لاوازی رووتان لێ دەکات و ئیسلام غەریب دەبێتەوە، پارچە پارچەیی رووتان لێ دەکات و بێدەسەڵات دەبنەوە-و

[3] گۆشت و خوێنی...: ئەمە قسەی ئەبی هورەیرەیە-و.

[4] کوتەك: داری دەست یان عەسای دەست، هێمایە بۆ هێز و دەسەڵات-و.

## ٧- دەروازەی: خۆزگەخواستن بە ئەهلی گۆڕستان

١١٤– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ، فَيَقُولُ: يَا لَيْتَنِي مَكَانَهُ!**). [خ٧١١٥ (٨٥)/ م١٥٧/ الفتن ٥٣]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(قیامەت نایەت تا پیاو بە پاڵ گۆڕی پیاودا گوزەر دەکات و دەڵێت: خۆزگە من لە جێگەی ئەو بوومایە).**

١١٥– عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، يَأْتِي الرَّجُلُ القَبْرَ فَيَضْطَّجِعُ عَلَيْه فَيَقُولُ: يَا لَيْتَنِي مَكَانَ صَاحِبِهِ، مَا بِهِ حُبُّ لِقَاءِ اللهِ إلاَّ لِمَا يَرَى مِنْ شِدَّةِ البَلاءِ. [ك٨٤٠٢]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە ئیبن مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: رۆژگارێك بەسەر خەڵكدا دێت، پیاو دێت بۆ لای گۆڕ و لەسەری رادەكشێ و دەڵێ: خۆزگە من لە جێگەی ئەم خاوەن گۆڕە بوومایە، خۆشویستنی لیقای خودا نییە، جگە لەوەی دەیبینێ لە توندی و سەختی بەڵا.**

## ٨- دەروازەی: جەنگی یەهوود و تورك

١١٦– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا اليَهُودَ، حَتَّى يَقُولَ الحَجَرُ وَرَاءَهُ اليَهُودِيُّ: يَا مُسْلِمُ! هذَا يَهُودِيٌّ وَرَائِي فَاقْتُلْهُ**). [خ٢٩٢٦/ م٢٩٢٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(قیامەت نایەت تا دژ بە یەهوود دەجەنگن، تا بەرد کە لە پشتییەوە یەهوودی هەیە دەڵێ: ئەی موسڵمان، ئەمە یەهوودییە لە پشتمەوە بیکوژە).**

١١٧– (ق) وعَنْه ﷺ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا التُّرْكَ، صِغَارَ الأَعْيُنِ، حُمْرَ الوُجُوهِ، ذُلْفَ الأُنُوفِ، كَأَنَّ وُجُوهَهُمْ المَجَانُّ المُطْرَقَةُ، وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْماً نِعَالُهُمُ الشَّعْرُ**). [خ٢٩٢٨/ م٢٩١٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(قیامەت نایەت تا دژ بە تورك دەجەنگن، چاویان بچووك و روخساریان سوور و لوتیان بچووك، وەك ئەوەی روخساریان قەڵغانی قەوسكراو بێت، هەروەها قیامەت نایەت تا دژ بە خەڵكانێك دەجەنگن نەعلیان مووە).**

## ٩- دەروازەی: قیامەت هەڵدەستێت و رۆم زۆرترینی خەڵکن

**١١٨-** (م) عَنِ المُسْتَوْرِدِ القرشيّ: أنه قالَ عندَ عَمْرِو بْنِ العَاصِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(تَقُومُ السَّاعَةُ وَالرُّومُ أَكْثَرُ النَّاسِ)**. فَقَالَ لَهُ عَمْرٌو: أَبْصِرْ مَا تَقُولُ؟ قَالَ: أَقُولُ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، قَالَ: لَئِنْ قُلْتَ ذَلِكَ، إِنَّ فِيهِمْ لَخِصَالاً أَرْبَعاً: إِنَّهُمْ لأَحْلَمُ النَّاسِ عِنْدَ فِتْنَةٍ، وَأَسْرَعُهُمْ إِفَاقَةً بَعْدَ مُصِيبَةٍ، وَأَوْشَكُهُمْ كَرَّةً بَعْدَ فَرَّةٍ، وَخَيْرُهُمْ لِمِسْكِينٍ وَيَتِيمٍ وَضَعِيفٍ، وَخَامِسَةٌ حَسَنَةٌ جَمِيلَةٌ: وَأَمْنَعُهُمْ مِنْ ظُلْمِ المُلُوكِ. [م٢٨٩٨]

(م) لە مستەوریدی قورشییەوە، ئەو لای عەمری کوڕی عاص وتی: گوێم لێبوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: **(قیامەت هەڵدەستێت و رۆم زۆرترینی خەڵکن)**، عەمر پێی وت: وردبەرەوە لەوەی دەیڵێی؟ مستەورید وتی: من دەڵێم لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیستووە، عەمر وتی: گەر ئەوە دەڵێی، کەوابوو ئەوان چوار خەسڵەتیان تێدایە: حەلیمترین کەسن لە فتنەدا، خێراترینن بۆ چاکبوونەوە لەدوای موسیبەت، نزیکترینن بە هێرشبردنەوە لەدوای هەڵهاتن، باشترینن بۆ گەدا(هەژار) و بێباب و لاوازن، پێنجەمیان چاکەیەکی جوان و باشە: رێگرترینن لە ستەمی مەلیکان.

## ١٠- دەروازەی: عیبادەتی جگە لە خودا(سبحانه وتعالى)

**١١٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَضْطَرِبَ أَلَيَاتُ نِسَاءِ دَوْسٍ عَلَى ذِي الخَلَصَةِ)**، وَذُو الخَلَصَةِ: طَاغِيَةُ دَوْسٍ الَّتِي كَانُوا يَعْبُدُونَ فِي الجَاهِلِيَّةِ. [خ٧١١٦/ م٢٩٠٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەری خودا(سبحانه وتعالى) فەرمووی: **(قیامەت نایەت تا سمتی ئافرەتانی دەوس لەسەر زی خەلەصە دەلەرزێ)**، زی خەلەصە(ذي الخَلَصة): بریتی بوو لە تاغییەکەی(بتەکەی) دەوس کە لە سەردەمی نەفامیدا دەیانپەرست).

١٢٠- (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (لاَ يَذْهَبُ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ حَتَّى تُعْبَدَ اللاَّتُ وَالعُزَّى)، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنْ كُنْتُ لأَظُنُّ حِينَ أَنْزَلَ اللهُ: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ۝٣٣﴾ [التوبة: ٣٣] أَنَّ ذَلِكَ تَامّاً، قَالَ: (إِنَّهُ سَيَكُونُ مِنْ ذَلِكَ مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ يَبْعَثُ اللهُ رِيحاً طَيِّبَةً، فَتَوَفَّى كُلَّ مَنْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَيَبْقَى مَنْ لاَ خَيْرَ فِيهِ، فَيَرْجِعُونَ إِلَى دِينِ آبَائِهِمْ). [م٢٩٠٧]

(م) لە عائیشەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(شەو و ڕۆژ ناڕۆن(کۆتاییان پێنایەت) تا لات و عوززا دەپەرسترێنەوە)**، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، وا گومانم دەبرد کاتێك خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ۝٣٣﴾ [التوبة: ٣٣]، ئیتر ئەوە تێروتەواو بووە، فەرمووی: **(خودا چەندی بوێت ئەوە بەو جۆرە دەبێت، پاشان خودا بایەکی خۆش(شنەبایەك) ڕەوانە دەکات هەر کەس بە قەدەر دەنکە خەردەلێك ئیمان لە دڵیدا بێت دەمرێت، ئەوانەی خێریان تێدا نییە دەمێننەوە، و دەگەڕێنەوە سەر ئایینی باب و باپیرانیان)**.

## ١١- دەروازەی: بایەك نزیك بە قیامەت هەڵدەکات

١٢١- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ اللهَ يَبْعَثُ رِيحاً مِنَ اليَمَنِ، أَلْيَنَ مِنَ الحَرِيرِ، فَلاَ تَدَعُ أَحَداً فِي قَلْبِهِ. قَالَ أَبُو عَلْقَمَةَ: مِثْقَالُ حَبَّةٍ. وَقَالَ عَبْدُ العَزِيزِ: مِثْقَالُ ذَرَّةٍ. مِنْ إِيمَانٍ إِلاَّ قَبَضَتْهُ). [م١١٧]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا لە یەمەنـەوە بایەك هەڵدەكات، لە ئاوریشم نەرمترە، هەر كەس مسقاڵە حەببەیەك(ئەبو عەلقەمە ئەمەی وتووە)، مسقاڵە زەرەیەك (عبدالعزیز ئەمەیانی وتووە) ئیمان لە دڵیدا بێت دەیمرێنێ)**.

## ١٢- دەروازەی: لەكەمیدانی ڕووباری فورات لە چیایەك لە زێڕ

١٢٢- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(يُوشِكُ الفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ كَنْزٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَمَنْ حَضَرَهُ فَلاَ يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئاً)**. [خ٧١١٩/ م٢٨٩٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خەریكە فورات لـە كەمی دەدات لە گەنجینەیەك لە زێڕ، هەر كەس ئامادەی بوو هیچ شتێكی لێ نەبات)**.

١٢٣- (م) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(يُوشِكُ الفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ جَبَلٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَإِذَا سَمِعَ بِهِ النَّاسُ سَارُوا إِلَيْهِ، فَيَقُولُ مَنْ عِنْدَهُ: لَئِنْ تَرَكْنَا النَّاسَ يَأْخُذُونَ مِنْهُ لَيُذْهَبَنَّ بِهِ كُلِّهِ، قَالَ: فَيَقْتَتِلُونَ عَلَيْهِ، فَيُقْتَلُ مِنْ كُلِّ مِائَةٍ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ)**. [م٢٨٩٥]

(م) لە ئوبەی كوڕی كەعبەوە، وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(خەریكە فورات لە كەمی دەدات لە چیایەك لە زێڕ، كاتێك خەڵكی ئەو هەواڵە دەبیستن دەچن بۆ لای، ئەوەی لە لایەتی دەڵێ: گەر وازبهێنن خەڵكی لێی ببەن هەمووی دەبەن)**، فەرمووی: **(لەسەری بە شەڕ دێن، لە هەر سەد كەسێك نەوەد و نۆی دەكوژرێت)**.

## ١٣- دەروازەی: زۆری ماڵ و سامان و سەوزهەڵگەڕانی زەوی عەرەب

١٢٤- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمُ المَالُ، فَيَفِيضَ، حَتَّى يُهِمَّ رَبَّ المَالِ مَنْ يَقْبَلُ صَدَقَتَهُ، وَحَتَّى يَعْرِضَهُ، فَيَقُولَ الَّذِي يَعْرِضُهُ عَلَيْهِ: لاَ أَرَبَ لِي)**. [خ١٤١٢ (٨٥)/ م١٥٧/ زكاة ٦٠]

(ق) لـە ئـەبی هورەیرەوە(خـوا لێـی ڕازی بێـت) وتـی: پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: **(قیامەت نایەت تا ماڵ و سامان لە ناوتان زۆر دەبێت، دەبێتە لێشاو، تا خاوەن ماڵ و سامان خەم دایدەگرێت کێ صەدەقەکەی لێ قبووڵ بکات، تا دەیخاتە ڕوو[1]، ئەو کەسەی ماڵ و سامانەکەی بۆ خراوەتە ڕوو دەڵێ: پێویستیم پێی نییە)**.

- زاد مسلم: (وَحَتَّى تَعُودَ أَرْضُ العَرَبِ مُرُوجاً وَأَنْهَاراً).

موسلیم ئەمەی زیاد کردووە: **(تا زەوی عەرەب دەبێتە مێرگ و ڕووبار)**.

**١٢٥**- وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَعُودَ أَرْضُ العَرَبِ مُرُوجاً وَأَنْهَاراً، وَحَتَّى يَسِيرَ الرَّاكِبُ بَيْنَ العِرَاقِ وَمَكَّةَ لاَ يَخَافُ إِلاَّ ضَلاَلَ الطَّرِيقِ، وَحَتَّى يَكْثُرَ الهَرْجُ)** قَالُوا: وَمَا الهَرْجُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: **(القَتْلُ)**. [حم٨٨٣٣]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(قیامەت نایـەت تا زەوی عەرەب دەبێتە مێرگ و ڕووبار، هەروەها تا سوار لە نێوان عێراق و مەککە هاتووچۆ دەکات تەنها لە گومکردنی ڕێگەکە دەترسێت، هەروەها تـا (الهـرج) زۆر دەبێت)**، وتیان (الهرج) چییە؟ فەرمووی: **(کوشتن)**.

## ١٤- دەروازەی: دەرچوونی ئاگرێك لە زەوی حیجاز

**١٢٦**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَخْرُجَ نَارٌ مِنْ أَرْضِ الحِجَازِ، تُضِيءُ أَعْنَاقَ الإِبِلِ بِبُصْرَى)**. [خ٧١١٨/ م٢٩٠٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: **(قیامـەت نایـەت تـا ئاگرێك لە زەوی حیجاز دێتە دەرەوە، لە بوصرا ملی حوشتر ڕۆشن دەکاتەوە)**.

---

[1] دەیخاتە ڕوو: واتە داوا دەکات لە خەڵك خێر و صەدەقەکەی لێ قبووڵ بکەن-و.

**١٢٧-** عن عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**سَتَخْرُجُ نَارٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ . أَوْ مِنْ نَحْوِ بَحْرِ حَضْرَمَوْتَ . قَبْلَ يَوْمِ القِيَامَةِ تَحْشُرُ النَّاسَ**) ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: (**عَلَيْكُمْ بِالشَّامِ**). [ت٢٢١٧]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەر لە ڕۆژی قیامەت ئاگرێك لە حەزرەمەوت-یان لە دەریای حەزرەمەوت- دێتە دەرەوە خەڵکی کۆدەکاتەوە)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە چ شتێك فەرمانمان پێ دەکەی؟ فەرمووی: (ڕوو لە شام بکەن).**

## ١٥- دەروازەی: ڕۆچوونی ئەو سوپایەی ڕوو لە ماڵی خودا دەکات

**١٢٨-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَغْزُو جَيْشٌ الكَعْبَةَ، فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ**) ، قَالَتْ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! كَيْفَ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ، وَفِيهِمْ أَسْوَاقُهُمْ، ومَنْ لَيْسَ مِنْهُمْ؟ قَالَ: (**يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ، ثُمَّ يُبْعَثُونَ عَلَى نِيَّاتِهِمْ**). [خ٢١١٨/ م٢٨٨٤]

(ق) لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**سوپایەك غەزوی کەعبە دەکات، کاتێك دەگەنە زەوی بەیدا(البيداء) یەکەمین و دواهەمینیان ڕۆدەچن**) عائیشە وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن یەکەمین و دواهەمینیان ڕۆدەچن لە کاتێکدا تیایاندایە دراوەتەبەر، و کەسانێك هەن لەوان نین؟ فەرمووی: (**یەکەمین و دواهەمینیان ڕۆدەچن، پاشان لەسەر نییەتەکانیان زیندوو دەکرێنەوە**).

**١٢٩-** (م) عَنْ أُمِّ سَلمةَ ﵂ قَالتْ: قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَعُوذُ عَائِذٌ بِالبَيْتِ، فَيُبْعَثُ إِلَيْهِ بَعْثٌ، فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ خُسِفَ بِهِمْ**) ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! فَكَيْفَ بِمَنْ كَانَ كَارِهاً؟ قَالَ: (**يُخْسَفُ بِهِ مَعَهُمْ، وَلَكِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ القِيَامَةِ عَلَى نِيَّتِهِ**). [م٢٨٨٢]

(م) لە ئوم سەلەمەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **پەنابەرێك(هانابەرێك) پەنا دەبات بە بەیت، سوپایەکی بۆ رەوانە دەکرێت، کاتێك دەگەنە زەوی بەیدا(البیداء) رۆدەچن**، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، حاڵی ئەو کەسە چۆنە ناچارکراوە؟ فەرمووی: **(لەگەڵ ئەوان ئەویش رۆدەچێت، بەڵام لە رۆژی قیامەت لەسەر نییەتی خۆی زیندوو دەکرێتەوە)**.

## ١٦- دەروازەی: باسی ئیبن صەیاد

**١٣٠-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُوْدٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَمَرَرْنَا بِصِبْيَانٍ فِيهِمْ ابْنُ صَيَّادٍ، فَفَرَّ الصِّبْيَانُ وَجَلَسَ ابْنُ صَيَّادٍ، فَكَأَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَرِهَ ذلِكَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(تَرِبَتْ يَدَاكَ، أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللهِ)** ؟ فَقَالَ: لاَ، بَلْ تَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللهِ.

فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: ذَرْنِي يَا رَسُولَ اللهِ، حَتَّى أَقْتُلَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنْ يَكُنِ الَّذِي تَرَى، فَلَنْ تَسْتَطِيعَ قَتْلَهُ)**. [م٢٩٢٤]

**(م) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین، بە پاڵ کۆمەڵێك منداڵدا تێپەڕین "ئیبن صەیاد"یان تێدا بوو، منداڵەکان هەڵهاتن و ئیبن صەیاد دانیشت، وەك ئەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی لا ناخۆش بێت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (دوو دەستت خۆڵاوی بن(تربت یداك)، ئایا شایەتی دەدەی من پێغەمبەری خودام؟)**، وتی: نەخێر، بەڵکو تۆ شایەتی بدە من پێغەمبەری خودام.

عومەری کوڕی خەتاب وتی: لێمگەڕێ ئەی پێغەمبەری خودا با بیکوژم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئەو کەسە بێت دەیبینی، ناتوانی بیکوژی)**.

**١٣١-** (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: خَرَجْنَا حُجَّاجاً، أَوْ عُمَّاراً، وَمَعَنَا ابْنُ صَائِدٍ، قَالَ: فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً، فَتَفَرَّقَ النَّاسُ، وَبَقِيتُ أَنَا وَهُوَ، فَاسْتَوْحَشْتُ مِنْهُ وَحْشَةً شَدِيدَةً مِمَّا يُقَالُ عَلَيْهِ. قَالَ: وَجَاءَ بِمَتَاعِهِ فَوَضَعَهُ مَعَ مَتَاعِي، فَقُلْتُ: إِنَّ الحَرَّ شَدِيدٌ، فَلَوْ وَضَعْتَه تَحْتَ تِلْكَ الشَّجَرَةِ، قَالَ: فَفَعَلَ، قَالَ: فَرُفِعَتْ لَنَا غَنَمٌ، فَانْطَلَقَ فَجَاءَ بِعُسٍّ، فَقَالَ: اشْرَبْ، أَبَا سَعِيدٍ، فَقُلْتُ: إِنَّ

الحَرَّ شَدِيدٌ وَاللَّبَنُ حَارٌّ، مَا بِي إِلاَّ أَنِّي أَكْرَهُ أَنْ أَشْرَبَ عَنْ يَدِهِ ـ أَوْ قَالَ: آخُذَ عَنْ يَدِهِ ـ فَقَالَ: أَبَا سَعِيدٍ! لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آخُذَ حَبْلاً، فَأُعَلِّقَهُ بِشَجَرَةٍ، ثُمَّ أَخْتَنِقَ مِمَّا يَقُولُ لِيَ النَّاسُ، يَا أَبَا سَعِيدٍ! مَنْ خَفِيَ عَلَيْهِ حَدِيثُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَا خَفِيَ عَلَيْكُمْ، مَعْشَرَ الأَنْصَارِ! أَلَسْتَ مِنْ أَعْلَمِ النَّاسِ بِحَدِيثِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ أَلَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**هُوَ كَافِرٌ**) وَأَنَا مُسْلِمٌ؟ أَوَلَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**هُوَ عَقِيمٌ لاَ يُولَدُ لَهُ**) وَقَدْ تَرَكْتُ وَلَدِي بِالمَدِينَةِ؟ أَوَلَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ يَدْخُلُ المَدِينَةَ وَلاَ مَكَّةَ**) وَقَدْ أَقْبَلْتُ مِنَ المَدِينَةِ وَأَنَا أُرِيدُ مَكَّةَ؟

قَالَ أَبُو سَعِيدٍ الخُدْرِيُّ: حَتَّى كِدْتُ أَنْ أَعْذِرَهُ. ثُمَّ قَالَ: أَمَا وَاللهِ، إِنِّي لأَعْرِفُهُ، وَأَعْرِفُ مَوْلِدَهُ وَأَيْنَ هُوَ الآنَ. قَالَ: قُلْتُ لَهُ: تَبّاً لَكَ سَائِرَ اليَوْمِ. [م٢٩٢٧]

**(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: وەك حاجی یان وەك عەمرەكار كەوتینەڕێ، "ئیبن صەیاد"مان لەگەڵ بوو، ئەبو سەعید وتی: لە شوێنێك دابەزین، خەڵكی بڵاوەیان لێكرد و من و ئەو ماینەوە، وەحشەتێكی زۆر توند بەرانبەری داگیری كردم بەهۆی ئەوەی لەسەر ئەو دەترا، وتی: كەلوپەل و كۆڵ و بارەكەی هێنا و لەسەر كۆڵ و بارەكەی من داینا، وتم: گەرماكەی زۆر توندە، گەر كۆڵ و بارەكەت لەژێر ئەو درەختە دابنابایە، وتی: ئەوەی كرد[1]، وتی: ڕانە مەڕێكمان بینی، ڕۆیشت و دۆلكەیەك شیری هێنا، و وتی: بخۆرەوە، ئەی ئەبا سەعید، وتم: گەرماكەی توندە و شیریش گەرمە[2]، بەو جۆرە نەبووم تەنها پێمخۆش نەبوو لە دەستی ئەو بخۆمەوە- یان وتی: پێمخۆش نەبوو لە دەستی بگرم- ئیبن صەیاد وتی: باوكی سەعید، واملێهاتووە پەتێك ببەم و خۆم بە درەختێكدا هەڵبواسم، پاشان بخنكێم بۆ ئەو شتانەی خەڵكی دەربارەی من دەیڵێن، ئەی باوكی سەعید، هەر كەس فەرموودەی پێغەمبەری لێ شاراوە بێت ئێوەی ئەنصار لێتان شاراوە نییە، ئایا تۆ زاناترین كەس نیت بە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)؟ ئایا پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەیفەرموو: (ئەو**

---

[1] واتە كۆڵ و بارەكەی بردە ژێر درەختەكە-و.

[2] واتە: لەبەر گەرما و گەرمی شیرەكە ناخۆمەوە-و.

**کافره)**، بەڵام من موسڵمانم؟ ئایا پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەیفەرموو: **(ئەو نەزۆکە و منداڵی نابێت)**، من لە مەدینە منداڵەکەی خۆم بەجێهێڵاوە؟ ئایا پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەیفەرموو: **(ناچێتە ناو مەدینە و مەککەوە)** من لە مەدینەوە هاتووم و دەمەوێ بچم بۆ مەککە؟.

ئەبو سەعیدی خودری وتی: تا واملێهات پاساو و بیانووی بۆ بهێنمەوە، پاشان وتی: سوێند بە خودا، من دەیناسم و شوێنی لە دایکبوونی دەزانم و دەزانم ئێستا لە کوێیە، ئەبو سەعید وتی: پێم وت: تیابچی و زیانۆمەند بیت بەدرێژایی ڕۆژ.

## ١٧- دەروازەی: ئەوەی ڕوودەدات لە فەتح کردن بەر لە دەجال

**١٣٢-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، عَنْ نَافِعِ بْنِ عُتْبَةَ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي غَزْوَةٍ، قَالَ: فَأَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَوْمٌ مِنْ قِبَلِ المَغْرِبِ، عَلَيْهِمْ ثِيَابُ الصُّوفِ، فَوَافَقُوهُ عِنْدَ أَكَمَةٍ، فَإِنَّهُمْ لَقِيَامٌ وَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَاعِدٌ، قَالَ: فَقَالَتْ لِي نَفْسِي: ائْتِهِمْ، فَقُمْ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ لاَ يَغْتَالُونَهُ، قَالَ: ثُمَّ قُلْتُ: لَعَلَّهُ نَجِيٌّ مَعَهُمْ، فَأَتَيْتُهُمْ فَقُمْتُ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ، قَالَ: فَحَفِظْتُ مِنْهُ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ، أَعُدُّهُنَّ فِي يَدِي، قَالَ: **(تَغْزُونَ جَزِيرَةَ العَرَبِ فَيَفْتَحُهَا اللهُ، ثُمَّ فَارِسَ فَيَفْتَحُهَا اللهُ، ثُمَّ تَغْزُونَ الرُّومَ فَيَفْتَحُهَا اللهُ، ثُمَّ تَغْزُونَ الدَّجَّالَ فَيَفْتَحُهُ اللهُ)**.

قَالَ: فَقَالَ نَافِعٌ: يَا جَابِرُ! لاَ نَرَى الدَّجَّالَ يَخْرُجُ حَتَّى تُفْتَحَ الرُّومُ. [م٢٩٠٠]

(م) لە جابری کوڕی سەمورەوە، لە نافیعی کوڕی عوتبەوە، وتی: لە غەزوەیەك لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین، وتی: دەستەیەك لە ئاراستەی خۆرئاواوە هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پۆشاکی خورییان لەبەربوو، لە (أكمة)[1] بەیەکتر گەیشتن، ئەوان بە پێوە وەستابوون و پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتبوو، وتی: نەفسم پێی وتم: بڕۆ بۆ لایان، لە نێوان ئەوان و پێغەمبەر بوەستە نەوەك بیکوژن، وتی: پاشان وتم: لەوانەیە ئاخافتنیان لەگەڵ بکات، چووم بۆ لایان، لە نێوان ئەوان و پێغەمبەر بە پێوە

[1] أكمة: چیایەکی بچووکە.

وەستام، وتی: چوار قسەم لێوە لەبەرکرد، لە دەستمدا دیانژمێرم، فەرمووی: (**غەزوی جەزیرەی عەرەب دەکەن و خوا فەتحی دەکات، غەزوی فارس دەکەن و خوا فەتحی دەکات، پاشان غەزوی ڕۆم دەکەن و خوا فەتحی دەکات، پاشان غەزوی دەجال دەکەن و خوا فەتحی دەکات**).

وتی: نافیع وتی: ئەی جابر، دەجال نابینی بێتە دەرەوە تا ڕۆم فەتح دەبێت.

## ١٨- دەروازەی: دەرچوونی دەجال و دابەزینی عیسا

**١٣٣-** (ق) عَن ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قال: قَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم في النَّاسِ، فَأَثْنَى عَلَى اللهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ ذَكَرَ الدَّجَّالَ فَقَالَ: (**إِنِّي لأُنْذِرُكُمُوهُ، وَمَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ أَنْذَرَهُ قَوْمَهُ، لَقَدْ أَنْذَرَ نُوحٌ قَوْمَهُ، وَلكِنِّي أَقُولُ لَكُمْ فِيهِ قَوْلاً لَمْ يَقُلْهُ نَبِيٌّ لِقَوْمِهِ: تَعْلَمُونَ أَنَّهُ أَعْوَرُ، وَأَنَّ اللهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ**). [خ٣٣٣٧ (٣٠٥٧)/ م١٦٩ و١٦٩م]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا لە ناو خەڵکی ڕاستبوویەوە، سەنای خودای کرد بەوەی ئەو شایستەیەتی، پاشان باسی دەجالی کرد و فەرمووی: (**من ئێوە لە ئەو ئاگادار دەکەمەوە، هەر پێغەمبەرێك گەلەکەی خۆی لە ئەو ئاگادار کردووە، نوح گەلەکەی خۆی ئاگادار کردووە، بەڵام من قسەیەك دەربارەی ئەو بۆ ئێوە دەکەم هیچ پێغەمبەرێك بە گەلەکەی نەوتووە: بزانن ئەو چاوێکی کوێرە و خودا چاوی کوێر نییە**).

**١٣٤-** (ق) عَنْ عقبةَ بنِ عمرٍو أَبِي مسعود الأَنصاري؛ أَنه قال لِحُذَيْفَةَ: أَلاَ تُحَدِّثُنَا مَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ قالَ: إِنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ: (**إِنَّ مَعَ الدَّجَّالِ إِذَا خَرَجَ مَاءً وَنَاراً، فَأَمَّا الَّذِي يَرَى النَّاسُ أَنَّهَا النَّارُ فَمَاءٌ بَارِدٌ، وَأَمَّا الَّذِي يَرَى النَّاسُ أَنَّهُ مَاءٌ بَارِدٌ فَنَارٌ تُحْرِقُ، فَمَنْ أَدْرَكَ مِنْكُمْ فَلْيَقَعْ فِي الَّذِي يَرَى أَنَّهَا نَارٌ، فَإِنَّهُ عَذْبٌ بَارِدٌ**). [خ٣٤٥٠/ م٢٩٣٤، ٢٩٣٥]

(ق) لە عوقبەی کوڕی عەمر ئەبی مەسعوودی ئەنصارییەوە، بە حوزەیفەی وت: ئایا ئەوەی لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بیستت بۆ ئێمەی باس ناکەی؟ وتی: من گوێم

**لێبوو دەیفەرموو: (گەر دەجال هاتە دەرەوە ئاو و ئاگری پێیە، ئەوەی خەڵکی پێیوایە ئاگرە ئاوی ساردە، ئەوەش خەڵکی وا دەزانن ئاوی ساردە ئاگرێکە دەسوتێنێ، هەر کەس لە ئێوە گەیشتە ئەوە با بکەوێتە ناو ئەوەی پێیوایە ئاگرە، چونکە ئەوە سازگار و ساردە).**

**١٣٥**– (م) عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سِمْعَانَ قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الدَّجَّالَ ذَاتَ غَدَاةٍ، فَخَفَّضَ فِيهِ وَرَفَّعَ، حَتَّى ظَنَنَّاهُ فِي طَائِفَةِ النَّخْلِ، فَلَمَّا رُحْنَا إِلَيْهِ عَرَفَ ذَلِكَ فِينَا، فَقَالَ: **(مَا شَأْنُكُمْ)** ؟ قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، ذَكَرْتَ الدَّجَّالَ غَدَاةً، فَخَفَّضْتَ فِيهِ وَرَفَّعْتَ، حَتَّى ظَنَنَّاهُ فِي طَائِفَةِ النَّخْلِ، فَقَالَ: **(غَيْرُ الدَّجَّالِ أَخْوَفُنِي عَلَيْكُمْ؛ إِنْ يَخْرُجْ وَأَنَا فِيكُمْ، فَأَنَا حَجِيجُهُ دُونَكُمْ؛ وَإِنْ يَخْرُجْ وَلَسْتُ فِيكُمْ، فَامْرُؤٌ حَجِيجُ نَفْسِهِ، وَاللهُ خَلِيفَتِي عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ. إِنَّهُ شَابٌّ قَطَطٌ، عَيْنُهُ طَافِئَةٌ، كَأَنِّي أُشَبِّهُهُ بِعَبْدِ العُزَّى بْنِ قَطَنٍ، فَمَنْ أَدْرَكَهُ مِنْكُمْ؛ فَلْيَقْرَأْ عَلَيْهِ فَوَاتِحَ سُورَةِ الكَهْفِ. إِنَّهُ خَارِجٌ خَلَّةً بَيْنَ الشَّامِ وَالعِرَاقِ، فَعَاثَ يَمِيناً وَعَاثَ شِمَالاً، يَا عِبَادَ اللهِ! فَاثْبُتُوا)**.

قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَمَا لَبْثُهُ فِي الأَرْضِ؟ قَالَ: **(أَرْبَعُونَ يَوْماً، يَوْمٌ كَسَنَةٍ، وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ، وَيَوْمٌ كَجُمُعَةٍ، وَسَائِرُ أَيَّامِهِ كَأَيَّامِكُمْ)** قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! فَذَلِكَ اليَوْمُ الَّذِي كَسَنَةٍ، أَتَكْفِينَا فِيهِ صَلاَةُ يَوْمٍ؟ قَالَ: **(لاَ، اقْدُرُوا لَهُ قَدْرَهُ)**.

قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَمَا إِسْرَاعُهُ فِي الأَرْضِ؟ قَالَ: **(كَالغَيْثِ اسْتَدْبَرَتْهُ الرِّيحُ، فَيَأْتِي عَلَى القَوْمِ فَيَدْعُوهُمْ، فَيُؤْمِنُونَ بِهِ، وَيَسْتَجِيبُونَ لَهُ، فَيَأْمُرُ السَّمَاءَ فَتُمْطِرُ، وَالأَرْضَ فَتُنْبِتُ، فَتَرُوحُ عَلَيْهِمْ سَارِحَتُهُمْ، أَطْوَلَ مَا كَانَتْ ذُراً، وَأَسْبَغَهُ ضُرُوعاً، وَأَمَدَّهُ خَوَاصِرَ. ثُمَّ يَأْتِي القَوْمَ، فَيَدْعُوهُمْ، فَيَرُدُّونَ عَلَيْهِ قَوْلَهُ، فَيَنْصَرِفُ عَنْهُمْ، فَيُصْبِحُونَ مُمْحِلِينَ، لَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ شَيْءٌ مِنْ أَمْوَالِهِمْ، وَيَمُرُّ بِالخَرِبَةِ فَيَقُولُ لَهَا: أَخْرِجِي كُنُوزَكِ، فَتَتْبَعُهُ كُنُوزُهَا كَيَعَاسِيبِ النَّحْلِ. ثُمَّ يَدْعُو رَجُلاً مُمْتَلِئاً شَبَاباً، فَيَضْرِبُهُ بِالسَّيْفِ، فَيَقْطَعُهُ جَزْلَتَيْنِ رَمْيَةَ الغَرَضِ، ثُمَّ يَدْعُوهُ فَيُقْبِلُ وَيَتَهَلَّلُ وَجْهُهُ، يَضْحَكُ.**

**فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ، إِذْ بَعَثَ اللهُ المَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ، فَيَنْزِلُ عِنْدَ المَنَارَةِ البَيْضَاءِ شَرْقِيَّ دِمَشْقَ، بَيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ، وَاضِعاً كَفَّيْهِ عَلَى أَجْنِحَةِ مَلَكَيْنِ، إِذَا طَأْطَأَ رَأْسَهُ قَطَرَ، وَإِذَا رَفَعَهُ تَحَدَّرَ مِنْهُ جُمَانٌ كَاللُّؤْلُؤِ، فَلاَ يَحِلُّ لِكَافِرٍ يَجِدُ رِيحَ نَفَسِهِ إِلاَّ مَاتَ، وَنَفَسُهُ يَنْتَهِي حَيْثُ يَنْتَهِي طَرْفُهُ، فَيَطْلُبُهُ حَتَّى يُدْرِكَهُ بِبَابِ لُدٍّ، فَيَقْتُلُهُ. ثُمَّ يَأْتِي عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ قَوْمٌ قَدْ عَصَمَهُمُ اللهُ مِنْهُ، فَيَمْسَحُ عَنْ وُجُوهِهِمْ وَيُحَدِّثُهُمْ بِدَرَجَاتِهِمْ فِي الجَنَّةِ. فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَوْحَى اللهُ إِلَى عِيسَى: إِنِّي قَدْ أَخْرَجْتُ عِبَاداً لِي، لاَ يَدَانِ لأَحَدٍ بِقِتَالِهِمْ، فَحَرِّزْ عِبَادِي إِلَى الطُّورِ.**

وَيَبْعَثُ اللهُ يَأْجُوجَ ومَأْجُوجَ، وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ، فَيَمُرُّ أَوَائِلُهُمْ عَلَى بُحَيْرَةِ طَبَرِيَّةَ، فَيَشْرَبُونَ مَا فِيهَا، وَيَمُرُّ آخِرُهُمْ فَيَقُولُونَ: لَقَدْ كَانَ بِهَذِهِ مَرَّةً مَاءٌ. وَيُحْصَرُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ، حَتَّى يَكُونَ رأْسُ الثَّوْرِ لأَحَدِهِمْ خَيْراً مِنْ مِائَةِ دِينَارٍ لأَحَدِكُمُ اليَوْمَ، فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ، فَيُرْسِلُ اللهُ عَلَيْهِمُ النَّغَفَ فِي رِقَابِهِمْ، فَيُصْبِحُونَ فَرْسَى كَمَوْتِ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ.

ثُمَّ يَهْبِطُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى الأَرْضِ، فَلاَ يَجِدُونَ فِي الأَرْضِ مَوْضِعَ شِبْرٍ إِلاَّ مَلأَهُ زَهَمُهُمْ وَنَتْنُهُمْ، فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى اللهِ، فَيُرْسِلُ اللهُ طَيْراً كَأَعْنَاقِ البُخْتِ، فَتَحْمِلُهُمْ فَتَطْرَحُهُمْ حَيْثُ شَاءَ اللهُ، ثُمَّ يُرْسِلُ اللهُ مَطَراً لاَ يَكُنُّ مِنْهُ بَيْتُ مَدَرٍ وَلاَ وَبَرٍ، فَيَغْسِلُ الأَرْضَ حَتَّى يَتْرُكَهَا كَالزَّلَفَةِ، ثُمَّ يُقَالُ لِلأَرْضِ: أَنْبِتِي ثَمَرَتَكِ، وَرُدِّي بَرَكَتَكِ، فَيَوْمَئِذٍ تَأْكُلُ العِصَابَةُ مِنَ الرُّمَّانَةِ، وَيَسْتَظِلُّونَ بِقِحْفِهَا، وَيُبَارَكُ فِي الرِّسْلِ، حَتَّى أَنَّ اللِّقْحَةَ مِنَ الإِبِلِ لَتَكْفِي الفِئَامَ مِنَ النّاسِ، وَاللِّقْحَةَ مِنَ البَقَرِ لَتَكْفِي القَبِيلَةَ مِنَ النَّاسِ، وَاللِّقْحَةَ مِنَ الغَنَمِ لَتَكْفِي الفَخِذَ مِنَ النَّاسِ. فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللهُ رِيحاً طَيِّبَةً، فَتَأْخُذُهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ، فَتَقْبِضُ رُوحَ كُلِّ مُؤْمِنٍ وَكُلِّ مُسْلِمٍ، وَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ، يَتَهَارَجُونَ فِيهَا تَهَارُجَ الحُمُرِ، فَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ). [م٢٩٣٧]

(م) لە لە نەواسی کوڕی سیمعانەوە، وتی: بەیانییەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەجالی باس کرد لە شانوشکۆی دابەزاند و بەرزی کردەوە، تا وا گومانمان برد لە ناو کۆمەڵە دارخورماکەدایە، کاتێك ڕۆیشتین بۆ لای ئەوەی لە ئێمەدا زانی، و فەرمووی: **(کارتان چییە؟)** وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، بەیانییەك باسی دەجالت کرد، لە شانوشکۆت دابەزاند و بەرزت کردەوە تا وا گومانمان برد لە ناو ئەو کۆمەڵە دارخورمادا بێت، فەرمووی: **(لەسەر ئێوە جگە لە دەجال دەمترسێنێ، گەر بێتە دەرەوە و من لە ناوتان بم من بە بەڵگە بەسەریدا زاڵ دەبم نەك ئێوە، گەر هاتە دەرەوە و لەناو ئێوەدا نەبووم هەر کەس بەرگریکاری نەفسی خۆیەتی، خودا لەسەر هەموو موسڵمانێك جێنشینی منە، دەجال گەنجێکی قژلوولە، چاوێکی هاتووەتە دەرەوە، وەك ئەوەی من بە (عبد العزى بن قطن)ی بشوبهێنم، هەر کەس لە ئێوە بە ئەو گەیشت با سەرەتای سورەتی (الکهف)ی بەسەردا بخوێنێتەوە، لە ناوچەیەکی نێوان شام و عێراق دێتە دەرەوە، بە ڕاستدا فەساد بڵاوە پێ دەکات و بە چەپدا فەساد بڵاوە پێ دەکات، بەندەکانی خودا دامەزراوو بن).**

وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، چەند لە زەوی دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: **(چل ڕۆژ، ڕۆژێك بە ساڵێك، و ڕۆژێك بە مانگێك، و ڕۆژێك بە هەفتەیەك، و ڕۆژەكانی تر وەك ڕۆژەكانی ئێوە وان)**، وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەو ڕۆژەی وەك ساڵێك وایە، ئایا نوێژی ڕۆژێك بەسە بۆ ئێمە؟ فەرمووی: **(نەخێر، خەمڵاندنی بۆ بكەن)**.

وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، خێراییەكەی لە زەوی چۆنە؟ فەرمووی: **(وەك بارانێ بای لەسەر بێت، دێت بۆ لای خەڵكانێك بانگیان دەكات ئەوانیش باوەڕی پێ دەهێنن و وەڵامی دەدەنەوە، ئەویش فەرمان بە ئاسمان دەكات باران دەبارێنێ و زەوی شین دەبێت(دەڕوێنێت) ئێوارە مەڕ و ماڵاتیان دێنە بۆ لایان گۆشتن و مل ئەستوور و گوان شۆڕ و پڕ لە شیر و تێر و سكپڕ، پاشان دێت بۆ لای خەڵكانێك بانگیان دەكات، ئەوانیش بەرپەرچی دەدەنەوە، دەجال پشتیان لێ دەكات، ڕۆژیان لێ دەبێتەوە بێبارانی roویان لێ دەكات و شتێك لە ماڵ و سامانیان بەدەستەوە نابێت، بە پاڵ وێرانەدا گوزەر دەكات پێی دەڵێ: گەنجینەكانت بهێنە دەرەوە، گەنجینەكانی شوێنی دەكەون وەك پوورەی مێش هەنگ، پاشان پیاوێكی گۆشتنی لاو بانگ دەكات، بە شمشێر لێی دەدات دەیكات بە دوو پارچەوە و هەر پارچەیەكی هەڵدانی تیرێك لەویتر دوور دەخاتەوە، پاشان بانگی دەكات و ڕووی لێ دەكات و ڕووی دەگەشێتەوە و پێدەكەنێ.**

**لە كاتێكدا ئەو بەو جۆرەیە، خودا مەسیحی كوڕی مەریەم ڕەوانە دەكات، لە لای منارە سپییەكە لە خۆرهەڵاتی دیمەشق دادەبەزێت لەناو دوو پۆشاكی ڕەنگكراو، دوو لەپی دەستی لەسەر باڵی دوو فریشتە داناوە، كاتێك سەر دادەنەوێنێ دڵۆپی لێ دادەبارێ، كاتێك سەر بەرز دەكاتەوە ئاوی لێ دادەبارێ وەك مرواری، هەر بێباوەڕێك بای هەناسەی ئەو ببینێتەوە دەمرێت، هەناسەی تا چاو هانا بكات دەڕوات، بەدوای دەجالدا دەڕوات تا لە دەروازەی (لدّ)[1] دەیبینێتەوە و دەیكوژێت، پاشان كۆڵێك بۆ لای عیسای كوڕی مەریەم كە خودا ئەوانی لە دەجال پاراستووە دەست بە**

---

[1] لد: شارۆچكەیەكی نزیك (بیت المقدس)ە.

**ڕوخسارياندا دەهێنێت و باسی پلە و پايەی خۆيانيان لە بەهەشت بۆ دەكات، لە كاتێكدا ئەو بەو جۆرەيە خودا وەحی بۆ عيسا دەنێرێ: من كۆمەڵێك بەندەی خۆمم دەرهێناوە هيچ كەس ناتوانێ دژ بە ئەوان بجەنگێ، بۆيە بەندەكانم لە ئامێز بگرە بۆ كێوی "طور"[1].**

خودا ياجووج و ماجووج ڕەوانە دەكات، ئەوان لە هەموو بەرزاييەكەوە بە خێرايی دێن، پێشەنگەكانيان بە پاڵ دەرياچەی تەبەرييەدا گوزەر دەكەن و ئەوەی تێيدايە دەيخۆنەوە، ئەوانەی لەدواوەن تێدەپەڕن و دەڵێن: جاران لەم جێگە ئاوێك هەبووە، پێغەمبەر خودا، عيسا و هاوەڵانی ئابلۆقە دەدرێن، تا سەری گايەك بۆ يەكێك لەوان لە سەد دیناری ئەم ڕۆژگارەی يەكێك لە ئێوە باشترە، پێغەمبەر خودا، عيسا و هاوەڵانی لەبەر خودا دەپاڕێنەوە، بۆيە خودا كرمی نەغەف[2] ڕەوانەی گەردنيان دەكات و دەبنە نێچیر، وەك مردنی يەك كەس.

پاشان پێغەمبەر خودا، عيسا و هاوەڵانی دادەبەزن بۆ زەوی[3]، لە زەوی بستێك خاڵيايی نابينن چەوری و بۆگەنی ئەوان پڕی نەكردبێت، پێغەمبەر خودا، عيسا و هاوەڵانی لەبەر خودا دەپاڕێنەوە، خودا كۆمەڵێك باڵندە وەك ملی حوشتر ڕەوانە دەكات هەڵيان دەگرن و لەو شوێنەی خودا دەيەوێت فڕێيان دەدەن[4]، پاشان خودا بارانێك دەبارێنێ، خانووی قوڕ و خانووی موو(دەوار) ڕێگری ناكات لە داباريني، بارانەكە زەوی دەشۆرێ تا وەك ئاوێنە(يان وەك باخچە) پاكی دەكاتەوە، پاشان بە زەوی دەوترێت: بەروبوومەكانت بڕوێنە، بەرەكەتەكەت بگێڕەوە(بهێنەوە)، لەو ڕۆژگارەدا كۆمەڵێك لە هەنارێك دەخۆن و توێكڵە قۆقزەكەی دەكەن بە سێبەر و

---

[1] واتە: كۆيان بكەرەوە و بيانبە بۆ كێوی "طور" كە وەك قەڵا وايە بۆ ئەوان-و.

[2] كرمێكە لە لووتی حوشتر و مەڕدا پەيدا دەبێت.

[3] واتە لە كێوی "طور" دادەبەزن-و.

[4] واتە جەستەكانی ياجووج و ماجووج هەڵدەگرن و لەو شوێنەی خوا دياريكردووە فڕێيان دەدەن-و.

بەرەکەت دەکەوێتە ناو شیرەوە تەنانەت شیری حوشترێکی نۆسك[1] بەشی کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵکی دەکات، شیری نێون مانگایەك بەشی هۆزێك لە خەڵکی دەکات، هەروەها شیری شەکێك بەشی تیرەیەك لە خەڵکی دەکات، کاتێك ئەوان لەو دۆخەدان خودا بایەکی خۆش(شنەبایەك) رەوانە دەکات دەچێتە بن باڵیان و ڕۆحی هەموو باوەڕدار و هەموو موسڵمانێك دەکێشێت، تەنها شەڕەنگێزان لە خەڵك دەمێننەوە، وەك گوێدرێژ بەئاشکرا سواری یەکتر دەبن، قیامەت لەسەر ئەوانە هەڵدەستێت).

## ١٩- دەروازەی: چیرۆکی جەسساسە[2]

**١٣٦-** (م) عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ ـ أُخْتِ الضَّحَّاكِ بْنِ قَيْسٍ، وَكَانَتْ مِنَ المهَاجِرَاتِ الأُوَلِ ـ قَالَتْ: سَمِعْتُ نِدَاءَ المنَادِي، مُنَادِي رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، يُنَادِي: الصَّلاَةَ جَامِعَةً، فَخَرَجْتُ إِلَى المسْجِدِ، فَصَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَكُنْتُ فِي صَفِّ النِّسَاءِ الَّتِي تَلِي ظُهُورَ القَوْمِ.

فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم صَلاَتَهُ، جَلَسَ عَلَى المِنْبَرِ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقَالَ: **(لِيَلْزَمْ كُلُّ إِنْسَانٍ مُصَلاَّهُ)**، ثُمَّ قَالَ: **(أَتَدْرُونَ لِمَ جَمَعْتُكُمْ)** ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: **(إِنِّي، وَاللهِ! مَا جَمَعْتُكُمْ لِرَغْبَةٍ وَلاَ لِرَهْبَةٍ، وَلَكِنْ جَمَعْتُكُمْ، لأَنَّ تَمِيماً الدَّارِيَّ، كَانَ رَجُلاً نَصْرَانِيّاً، فَجَاءَ فَبَايَعَ وَأَسْلَمَ، وَحَدَّثَنِي حَدِيثاً وَافَقَ الَّذِي كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْ مَسِيحِ الدَّجَّالِ. حَدَّثَنِي: أَنَّهُ رَكِبَ فِي سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ، مَعَ ثَلاَثِينَ رَجُلاً مِنْ لَخْمٍ وَجُذَامَ، فَلَعِبَ بِهِمُ المَوْجُ شَهْراً فِي البَحْرِ، ثُمَّ أَرْفَؤُوا إِلَى جَزِيرَةٍ فِي البَحْرِ حَتَّى مَغْرِبِ الشَّمْسِ، فَجَلَسُوا فِي أَقْرُبِ السَّفِينَةِ، فَدَخَلُوا الجَزِيرَةَ، فَلَقِيَتْهُمْ دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرُ الشَّعْرِ، لاَ يَدْرُونَ مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ، مِنْ كَثْرَةِ الشَّعْرِ، فَقَالُوا: وَيْلَكِ! مَا أَنْتِ؟ فَقَالَتْ: أَنَا الجَسَّاسَةُ، قَالُوا: وَمَا الجَسَّاسَةُ؟ قَالَتْ: أَيُّهَا القَوْمُ! انْطَلِقُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِي الدَّيْرِ، فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالأَشْوَاقِ. قَالَ: لَمَّا سَمَّتْ لَنَا رَجُلاً فَرِقْنَا مِنْها أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً، قَالَ: فَانْطَلَقْنَا**

---

[1] حوشتری نۆسك: ئەو حوشترەیە یەکەمین جارە بەچکەی دەبێت، هەمیشە ئەو گیاندارانەی یەکەمجار بەچکەیان دەبێت شیریان کەمە—و

[2] بەو ناوە ناونراوە چونکە لە ڕێگەی جاسوسییەوە هەواڵ بۆ دەجال دەگوێزێتەوە.

سِرَاعاً، حَتَّى دَخَلْنَا الدَّيْرَ، فَإِذَا فِيهِ أَعْظَمُ إِنْسَانٍ رَأَيْنَاهُ قَطُّ خَلْقاً، وَأَشَدُّهُ وِثَاقاً، مَجْمُوعَةٌ يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ مَا بَيْنَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى كَعْبَيْهِ بِالحَدِيدِ. قُلْنَا: وَيْلَكَ! مَا أَنْتَ؟ قَالَ: قَدْ قَدَرْتُمْ عَلَى خَبَرِي، فَأَخْبِرُونِي مَا أَنْتُمْ؟ قَالُوا: نَحْنُ أُنَاسٌ مِنَ العَرَبِ، رَكِبْنَا فِي سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ، فَصَادَفْنَا البَحْرَ حِينَ اغْتَلَمَ، فَلَعِبَ بِنَا المَوْجُ شَهْراً، ثُمَّ أَرْفَأْنَا إِلَى جَزِيرَتِكَ هَذِهِ، فَجَلَسْنَا فِي أَقْرُبِهَا، فَدَخَلْنَا الجَزِيرَةَ، فَلَقِيَتْنَا دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرُ الشَّعْرِ، لاَ يُدْرَى مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ مِنْ كَثْرَةِ الشَّعْرِ؟ فَقُلْنَا: وَيْلَكِ! مَا أَنْتِ؟ فَقَالَتْ: أَنَا الجَسَّاسَةُ، قُلْنَا: وَمَا الجَسَّاسَةُ؟ قَالَتِ: اعْمِدُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِي الدَّيْرِ، فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالأَشْوَاقِ، فَأَقْبَلْنَا إِلَيْكَ سِرَاعاً، وَفَزِعْنَا مِنْهَا، وَلَمْ نَأْمَنْ أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً. فَقَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ نَخْلِ بَيْسَانَ، قُلْنَا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: أَسْأَلُكُمْ عَنْ نَخْلِهَا، هَلْ يُثْمِرُ؟ قُلْنَا لَهُ: نَعَمْ، قَالَ: أَما إِنَّهُ يُوشِكُ أَنْ لاَ تُثْمِرَ. قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ بُحَيْرَةِ الطَّبَرِيَّةِ، قُلْنَا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: هَلْ فِيهَا مَاءٌ؟ قَالُوا: هِيَ كَثِيرَةُ المَاءِ، قَالَ: أَمَا إِنَّ مَاءَهَا يُوشِكُ أَنْ يَذْهَبَ. قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ عَيْنِ زُغَرَ، قَالُوا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: هَلْ فِي العَيْنِ مَاءٌ؟ وَهَلْ يَزْرَعُ أَهْلُهَا بِمَاءِ العَيْنِ؟ قُلْنَا لَهُ: نَعَمْ، هِيَ كَثِيرَةُ المَاءِ، وَأَهْلُهَا يَزْرَعُونَ مِنْ مَائِهَا. قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ نَبِيِّ الأُمِّيِّينَ مَا فَعَلَ؟ قَالُوا: قَدْ خَرَجَ مِنْ مَكَّةَ وَنَزَلَ يَثْرِبَ، قَالَ: أَقَاتَلَهُ العَرَبُ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: كَيْفَ صَنَعَ بِهِمْ؟ فَأَخْبَرْنَاهُ أَنَّهُ قَدْ ظَهَرَ عَلَى مَنْ يَلِيهِ مِنَ العَرَبِ وَأَطَاعُوهُ، قَالَ لَهُمْ: قَدْ كَانَ ذَلِكَ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: أَمَا إِنَّ ذَاكَ خَيْرٌ لَهُمْ أَنْ يُطِيعُوهُ، وَإِنِّي مُخْبِرُكُمْ عَنِّي: إِنِّي أَنَا المَسِيحُ، وَإِنِّي أُوشِكُ أَنْ يُؤْذَنَ لِي فِي الخُرُوجِ، فَأَخْرُجُ فَأَسِيرُ فِي الأَرْضِ، فَلاَ أَدَعُ قَرْيَةً إِلاَّ هَبَطْتُهَا فِي أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، غَيْرَ مَكَّةَ وَطَيْبَةَ، فَهُمَا مُحَرَّمَتَانِ عَلَيَّ، كِلْتَاهُمَا، كُلَّمَا أَرَدْتُ أَن أَدْخُلَ وَاحِدَةً، أَوْ وَاحِداً مِنْهُمَا، اسْتَقْبَلَنِي مَلَكٌ بِيَدِهِ السَّيْفُ صَلْتاً، يَصُدُّنِي عَنْهَا، وَإِنَّ عَلَى كُلِّ نَقْبٍ مِنْهَا مَلاَئِكَةً يَحْرُسُونَهَا).

قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَطَعَنَ بِمِخْصَرَتِهِ فِي المِنْبَرِ: (هَذِهِ طَيْبَةُ، هَذِهِ طَيْبَةُ، هَذِهِ طَيْبَةُ) ـ يَعْنِي: المدِينَةَ ـ؛ (أَلاَ هَلْ كُنْتُ حَدَّثْتُكُمْ ذَلِكَ) ؟ فَقَالَ النَّاسُ: نَعَمْ، (فَإِنَّهُ أَعْجَبَنِي حَدِيثُ تَمِيمٍ، أَنَّهُ وَافَقَ الَّذِي كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْهُ وَعَنِ المَدِينَةِ وَمَكَّةَ، أَلاَ إِنَّهُ فِي بَحْرِ الشَّامِ أَوْ بَحْرِ اليَمَنِ، لاَ بَلْ مِنْ قِبَلِ المَشْرِقِ مَا هُوَ، مِنْ قِبَلِ المَشْرِقِ مَا هُوَ، مِنْ قِبَلِ المَشْرِقِ مَا هُوَ) وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى المشْرِقِ. قَالَتْ: فَحَفِظْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [م٢٩٤٢]

(م) لە فاتیمەی کچی قەیسەوە–خوشکی زەححاکی کوڕی قەیس– ئەو یەکێك بوو لە کۆچکەرە پێشەنگەکان، وتی: گوێم لە بانگی بانگەر بوو، بانگکەری پێغەمبەری خودا(ﷺ)، بانگی دەکرد: "الصلاة جامعة"، منیش چوومە دەرەوە بۆ مزگەوت، لەگەڵ

پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژم كرد، لە ریزی ئەو ئافرەتانە بووم لە پشتەوەی پیاوان وەستابوون، كاتێك پێغەمبەر(ﷺ) نوێژەكەی تەواو كرد، لەسەر مینبەر دانیشت و ئەو پێدەكەنی، و فەرمووی: **(با هەر كەسێك لە جێ نوێژی خۆی دابنیشێ)**، پاشان فەرمووی: **(دەزانن بۆچی ئێوەم كۆكردەوە؟)**، وتیان: خودا و پێغەمبەرەكەی زاناترن، فەرمووی: **(سوێند بە خودا، من ئێوەم بۆ رەغبەت و رەهبەت(هاندان و ترساندن) كۆنەكردووەتەوە، بەڵام ئێوەم كۆكردەوە، چونكە تەمیمی داری پێشتر پیاوێكی نەصرانی بوو، هات و بەیعەتی دا و موسڵمان بوو، قسانێكی بۆ باس كردم تەبایە لەگەڵ ئەوەی دەربارەی مەسیحی دەجال بۆم باس كردوون.**

**بۆی باس كردم: لەگەڵ سی پیاو لە "لەخم و جوزام" سواری كەشتییەكی دەریایی بوون، مانگێك شەپۆل لە دەریا یاری پێكردوون، پاشان لەناو دەریا پەنا بۆ دوورگەیەك دەبەن لە خۆرئاوا، لە بەلەمەكانی كەشتییەكەدا دادەنیشن و دەچنە دوورگەكەوە[1]، گیاندارێكی تووكنی "موو زۆر" پێیان دەگات، لەبەر زۆری موو پێشەوەی لە دواوەی جیاناكەنەوە، پێی دەڵێن: هاوار بە حاڵت، تۆ چیت؟ گیاندارەكە دەڵێ: من جەسساسەم، دەپرسن: جەسساسە چییە؟ دەڵێت: خەڵكینە بچن بۆ لای ئەو پیاوە لەو دێرەدا، ئەو تامەزرۆی هەواڵی ئێوەیە، وتی: كاتێك ناوی پیاوێكی لا هێناین لە گیاندارەكە ترساین شەیتان بێت، دەڵێت: بەپەلە ڕۆیشتین تا گەیشتینە دەیرەكە و چووینە ژوورەوە، مرۆڤێكی زۆر زەبەلاحمان بینی، هەرگیز دروستكراوی وامان نەبینی بوو، جەستەیەكی گەورە، بە توندترین شێوە كۆت و بەند كرابوو، هەردوو دەستی لە گەردنیدا كۆكرابوونەوە و بە زنجیری ئاسنین لەگەڵ دوو ئەژنۆ بۆ دوو قولاپێی كۆت و بەند كرابوون، وتمان: هاوار بە حاڵت: تۆ كێی؟**

---

[1] بە سروشت گەر شوێنەكە بەندەر نەبێت كەشتی ناتوانێ بچێت بۆ ڕۆخی دەریاكە لەبەر كێشان بە زەوی ڕۆخی دەریاكە، بۆیە دەبێ سواری بەلەم ببن و روو لە كەناری دەریاكە بكەن–و.

وتی: توانیتان هەواڵی من بزانن[1]، ئێستا هەواڵم پێ بدەن ئێوە کێن؟ وتیان: ئێمە خەڵکانێکین لە عەرەب، سواری کەشتییەکی دەریایی بووین، کاتی هەڵچوون ڕێمانکەوت لە دەریا، مانگێك شەپۆل یاری پێکردین، پاشان پەنامان برد بۆ ئەم دوورگەی تۆ، لەسەر بەلەمەکانی ناو کەشییەکە دانیشتین و هاتینە ناو دوورگەکەوە، گیاندارێکی تووکنی موو زۆرمان پێگەیشت، لەبەر زۆری موو پێش و پاشی جیانەدەکرایەوە، پێمان وت: هاوار بە حاڵت! تۆ چیت؟ وتی: من جەسساسەم، وتمان: جەسساسە چییە؟ وتی: بڕۆن بۆ لای ئەو پیاوە لەو دێرە، ئەو تامەزرۆیە بە هەواڵی ئێوە، ئێمەش بەپەلە ڕوومان لێکردی و لەو گیاندارە ترساین، دڵنیانەبووین لەوەی شەیتان نەبێت.

پیاوەکە وتی: هەواڵم پێ بدەن دەربارەی دارخورماکانی بەیسان[2]، وتمان: دەربارەی چ شتێکی دەپرسی؟ وتی: پرسیاری دارخورماکانی دەکەم، ئایا بەردەدەن؟ پێمان وت: بەڵێ، وتی: خەریکە بەرنەدەن، وتی: هەواڵم پێ بدەن دەربارەی دەریاچەی تەبەرییە، وتمان: دەربارەی چ شتێکی دەپرسی؟ وتی: ئاوی تێدا ماوە؟ وتیان: ئاوی زۆرە، وتی: خەریکە ئاوەکەی بڕوات و نەمێنێت، وتی: هەواڵم پێ بدەن دەربارەی "عَيْن زُغَرَ"[3]، وتمان: دەربارەی چ شتێکی دەپرسی؟ وتی: لە چاوگەکەی ئاو هەیە؟ ئایا خەڵکەکەی بە ئاوی چاوگەکە کشتوکاڵ دەکەن؟ پێمان وت: بەڵێ، ئاوی زۆرە و خەڵکەکەی بە ئاوی چاوگەکەی کشتوکاڵ دەکەن.

وتی: هەواڵم پێ بدەن دەربارەی پێغەمبەری ئومییەکان چی کردووە؟ وتیان: لە مەککە دەرچووە و لە یەسریب نیشتەجێ بووە، وتی: ئایا عەرەب دژ بە ئەو جەنگاون؟ وتمان: بەڵێ، وتی: چی بە عەرەب کردووە؟ هەواڵمان پێدا ئەو سەرکەوتووە بەسەر ئەوانیتر لە عەرەب و گوێڕایەڵی لێ دەکەن، پێی وتن: ئایا ئەوە

---

[1] واتە توانیتان شوێن و جێگەی من بدۆزنەوە ـ و.

[2] بەیسان: گوندێکە لە شام.

[3] شارۆچکەیەکی ناسراوە لە ڕووی قیبلەی شامەوە.

**ڕوویداوە؟ وتمان: بەڵێ، وتی: ئەوە بۆ ئەوان خێرە گوێڕایەڵی لێ بکەن، منیش هەواڵی خۆم بە ئێوە دەدەم:**

**من مەسیحم[1]، ها خەریکە مۆڵەتم بدرێت بە چوونەدەرەوە، دەچمە دەرەوە و بە زەویدا دەگەڕێم، لە چل شەودا ئاوەدانییەك نییە لێی دانەبەزم[2]، جگە لە مەککە و تەیبە[3]، ئەو دوانە -هەردووك- لەسەر من حەرامن، هەرکات بمەوێ بچمە یەکێکیان، یان یەکێك لەو دوانە، فریشتەیەك کە شمشێرێکی هەڵکێشراوی بەدەستەوەیە ڕووبەڕووم دێت، لەسەر هەر کەلەبەرێکی کۆمەڵێك فریشتە هەن پارێزگاری لێ دەکەن).**

فاتیمە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) -لە مینبەرەکەدا کێشای بە کەلەکەی خۆیدا- فەرمووی: **(ئەوە تەیبەیە، ئەوە تەیبەیە، ئەوە تەیبەیە)** -واتە: مەدینە- **(ئایا ئەوەم بۆ باس کردن؟)**، خەڵکەکە وتیان: بەڵێ، **(قسەکانی تەمیم جێگەی سەرنجم بوون، قسەکانی ئەو لەگەڵ ئەوەی من بۆم باسکردن دەربارەی مەسیحی دەجال و مەدینە و مەککە تەبابوون، دەزانن ئەو[4] لە دەریای شام یان دەریای یەمەنە، نەخێر لە ئاراستەی خۆرهەڵاتەوەیە، لە ئاراستەی خۆرهەڵاتەوەیە، لە ئاراستەی خۆرهەڵاتەوەیە)**، بەدەست ئاماژەی بۆ خۆرهەڵات کرد، فاتیمە وتی: ئەمەم لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لەبەرکرد.

## ٢٠- دەروازەی: دابەزینی عیسا(علیه السلام)

**١٣٧-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَماً مُقْسِطاً، فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلَ الخِنْزِيرَ، وَيَضَعَ الجِزْيَةَ، وَيَفِيضَ المَالُ حَتَّى لاَ يَقْبَلَهُ أَحَدٌ)**. [خ٢٢٢٢، م١٥٥]

---

(١) مەبەست مەسیحی دەجالە-و.

(٢) واتە: ئاوەدانییەك نییە تێینەچم-و.

(٣) تەیبە(طَيبة): واتە مەدینە-و.

(٤) ئەو: واتە دەجال-و.

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە نزیکە کوڕەکەی مەریەم وەك حەکەمێکی دادپەروەر[1] دابەزێت بۆ ناوتان، خاچ بشکێنێ، و بەراز بکوژێ، و جزییە دابنێ و ماڵ و سامان ببێت بە لێشاو تا هیچ کەس وەرینەگرێت).**

- زاد في رواية لهما: (حَتَّى تَكُونَ السَّجْدَةُ الوَاحِدَةُ خَيْراً مِنَ الدُّنْيَا وَما فِيهَا). ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاقْرَؤُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾﴾ [النساء: ١٥]. [خ٣٤٤٨]

لە ڕیوایەتێکی تری هەردووکیان ئەمەیان زیاد کردووە: **(تا تەنها یەك سوژدە باشترە لە دنیا و ئەوەی لە دنیادایە)**. پاشان ئەبوهورەیرە وتی: گەر پێتانخۆشە بخوێننەوە: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾﴾ [النساء: ١٥].

- وفي رواية لهما: (كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ ابْنُ مَرْيَمَ فِيكُمْ، وَإِمامُكُمْ مِنْكُمْ). [خ٣٤٤٩]

هەروەها لە ڕیوایەتێکی تری هەردووکیان: **(دەبێ ئێوە چۆن بن گەر کوڕەکەی مەریەم دابەزی بۆ ناوتان و ئیمامەکەتان لە خۆتان بێت)**.

**١٣٨**– عَنْ مُجَمِّعِ بْنِ جَارِيَةَ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (يَقْتُلُ ابْنُ مَرْيَمَ الدَّجَّالَ بِبَابِ لُدِّ). [ت٢٢٤٤]

* صحيح.

لە موجەمیعی کوڕی جاریەی ئەنصارییەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(کوڕەکەی مەریەم لە دەروازەی "لُدّ"[2] دەجال دەکوژێت)**.

---

[1] حەکەمێکی دادپەروەر: واتە دەسەڵاتدارێکی دادپەروەر.

[2] لد: شارۆچکەیەکی نزیك (بيت المقدس)ە.

**١٣٩**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ ـ يَعْنِي: عِيسَى ـ وَإِنَّهُ نَازِلٌ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَاعْرِفُوهُ، رَجُلٌ مَرْبُوعٌ، إِلَى الحُمْرَةِ وَالبَيَاضِ، بَيْنَ مُمَصَّرَتَيْنِ، كَأَنَّ رَأْسَهُ يَقْطُرُ، وَإِنْ لَمْ يُصِبْهُ بَلَلٌ، فَيُقَاتِلُ النَّاسَ عَلَى الإِسْلاَمِ، فَيَدُقُّ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلُ الخِنْزِيرَ، وَيَضَعُ الجِزْيَةَ، وَيُهْلِكُ اللهُ فِي زَمَانِهِ المِلَلَ كُلَّهَا إِلاَّ الإِسْلاَمَ، وَيُهْلِكُ المَسِيحَ الدَّجَّالَ، فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، ثُمَّ يُتَوَفَّى فَيُصَلِّي عَلَيْهِ المُسْلِمُونَ). [د٤٣٢٤]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لە نێوان من و ئەو–واتە: عیسا– پێغەمبەر بوونی نییە، ئەو دادەبەزێت، گەر دابەزی بیناسن، پیاوێکی بالاّ مامناوەند، ڕەنگی بۆ لای سوور و سپی دەڕوانێ، لە ناو دوو پۆشاکی ڕەنگکراو بە زەرد، وەك ئەوەی سەری بتنۆکێ هەرچەند تەڕی تووش نەبووە، لەسەر ئیسلام دژ بە خەڵکی دەجەنگێ، خاچ ورد دەکات، و بەراز دەکوژێ، و جیزیە دادەنێ، لە سەردەمی ئەودا هەموو میللەتان[1] تیادەچن جگە لە ئیسلام، مەسیحی دەجال تیادەبات، چل ساڵ لە زەوی دەمێنێتەوە، پاشان دەمرێ و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن).**

## ٢١- دەروازەی: هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە

**١٤٠**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَإِذَا طَلَعَتْ فَرَآهَا النَّاسُ آمَنُوا أَجْمَعُونَ، فَذلِكَ حِينَ: ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا﴾ [الأنعام:١٥٨]. وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ نَشَرَ الرَّجُلاَنِ ثَوْبَهُمَا بَيْنَهُمَا فَلاَ يَتَبَايَعَانِهِ، وَلاَ يَطْوِيَانِهِ. وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدِ انْصَرَفَ الرَّجُلُ بِلَبَنِ لِقْحَتِهِ فَلاَ يَطْعَمُهُ. وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَهُوَ يَلِيطُ حَوْضَهُ فَلاَ يَسْقِي فِيهِ. وَلَتَقومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ رَفَعَ أُكْلَتَهُ إِلَى فِيهِ فَلاَ يَطْعَمُهَا). [خ٦٥٠٦ (٨٥)، م١٥٧ و٢٩٥٤]

---

[1] هەموو میللەتان (المِلل كلها): واتە هەموو ئایین و مەزهەبەکان–و.

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:
**(قیامەت نایەت تا خۆر لە خۆرئاوە هەڵدێت، کاتێك هەڵدێت و خەڵکی دەیبینن هەموو ئیمان دەهێنن، ئەوەش ئەو کاتەیە: ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَـٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَـٰنِهَا خَيْرًا﴾** [الأنعام:١٥٨]. **قیامەت هەڵدەستێ دوو پیاو کاڵاکانیان لە نێوان خۆیان داناوە بەیەکتری نافرۆشن و نایپێچنەوە[١]، قیامەت هەڵدەستێت پیاوێك شیری حوشترەکەی دۆشیوە و تامی ناکات[٢]، قیامەت هەڵدەستێت ئەو کونی حەوزەکەی تەنیوە و ئاوی تێدا نادات[٣]، قیامەت هەڵدەستێ و پاروەکەی بردووە بۆ دەمی و تامی ناکات.**

## ٢٢- دەروازەی: نزیکبوونەوەی کات(الزمان)

١٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَقَارَبَ الزَّمَانُ، فَتَكُونَ السَّنَةُ كَالشَّهْرِ، وَيَكُونَ الشَّهْرُ كَالجُمُعَةِ، وَتَكُونَ الجُمُعَةُ كَاليَوْمِ، وَيَكُونَ اليَوْمُ كَالسَّاعَةِ، وَتَكُونَ السَّاعَةُ كَاحْتِرَاقِ السَّعَفَةِ الخُوصَةِ). [حم٣ ١٠٩٤]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:
**(قیامەت ڕاستنابێتەوە تا کات لەیەکتر نزیك دەبێتەوە،ساڵ وەك مانگی لێ دێت، مانگ وەك هەفتەی لێ دێت، هەفتە وەك ڕۆژی لێ دێت، ڕۆژ وەك سەعاتی لێ دێت، سەعات وەك سوتاندنی پەلکی گەڵای دارخورمای لێ دێت).**

---

[١] واتە فریاناکەون کاڵاکانیان بپێچنەوە-و.
[٢] واتە: پیاناگات لێی بخواتەوە-و.
[٣] واتە: فریاناکەوێت ئاژەڵەکانی یان باخەکەی بە ئاوی حەوزەکە ئاو بدات-و.

## ٢٣- دەروازەی: قسەی دڕندە و شتانی تر

١٤٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُكَلِّمَ السِّبَاعُ الإِنْسَ، وَحَتَّى تُكَلِّمَ الرَّجُلَ عَذَبَةُ سَوْطِهِ وَشِرَاكُ نَعْلِهِ، وَتُخْبِرَهُ فَخِذُهُ بِمَا أَحْدَثَ أَهْلُهُ مِنْ بَعْدِهِ). [ت٢١٨١]

* صحيح.

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، قیامەت راستنابێتەوە تا دڕندە لەگەڵ مرۆڤ قسە دەکات، هەروەها تا سەری قەمچییەکەی و زوانەی نەعلەکەی قسە لەگەڵ پیاو دەکات، ران(فَخِذ)ی هەواڵی پێ دەدات لەدوای ئەو خانەوادەکەی چی کردووە).**

## ٢٤- دەروازەی: دابەی زەوی(دابة الأرض)

١٤٣- عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ حُذَيْفَةَ، فَذَكَرْتُ الدَّابَّةَ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ ﷺ: إِنَّهَا تَخْرُجُ ثَلاثَ خَرَجَاتٍ فِي بَعْضِ البَوَادِي ثُمَّ تَكْمُنُ، ثُمَّ تَخْرُجُ فِي بَعْضِ القُرَى حَتَّى يُذْعَرُوا وَحَتَّى تُهْرِيقَ فِيهَا الأُمَرَاءُ الدِّمَاءَ ثُمَّ تَكْمُنُ، قَالَ: فَبَيْنَمَا النَّاسُ عِنْدَ أَعْظَمِ المَسَاجِدِ وَأَفْضَلِهَا وَأَشْرَفِها - حَتَّى قُلْنَا: المَسْجِدُ الحَرَامُ، وَمَا سَمَّاهُ - إِذِ ارْتَفَعَتِ الأَرْضُ وَيَهْرُبُ النَّاسُ، وَيَبْقَى عَامَّةٌ مِنَ المُسْلِمِينَ يَقُولُونَ: إِنَّهُ لَنْ يُنْجِيَنَا مِنْ أَمْرِ اللهِ شَيْءٌ، فَتَخْرُجُ فَتَجْلُو وُجُوهَهُمْ حَتَّى تَجْعَلَها كَالْكَوَاكِبِ الدُّرِّيَّةِ وَتَتْبَعُ النَّاسُ جِيْرَانٌ فِي الرِّبَاعِ شُرَكَاءُ فِي الأَمْوَالِ وَأَصْحَابٌ فِي الإِسْلاَمِ. [ك٨٤٩١]

* قال الذهبي: على شرطهما.

لە ئەبی توفەیلەوە، وتی: لای حوزەیفە دانیشتبووین، باسی دابەکەم کرد، حوزەیفە(خوا لێی رازی بێت) وتی: ئەو دابە سێ هاتنەدەرەوەی هەیە، لە هەندێ دەشت و سارا[1]، پاشان بزر دەبێت، ئەوجا لە هەندێ گوند و ئاوەدانی دێتە دەرەوە

(1) واتە: لە هەندێ دەشت و سارا دەردەکەوێت و دێتە دەرەوە—و.

تا خەڵکەکە تووشی ترسان(تۆقان) دێن، هەروەها تا دەسەڵاتداران خوێنی تێدا دەڕێژن، پاشان بزر دەبێت، وتی: لە کاتێکدا خەڵکی لای مەزنترین و باشترین و بالاترین مزگەوتن-تا وتمان "مسجد الحرام"ە، بەلام ئەو ناوی نەهێنا- زەوی بەرزدەبێتەوە و خەڵك هەڵدێن، گشتێك لە موسڵمانان دەمێننەوە و دەڵێن: هیچ شتێك لە فەرمانی خودا ئێمە رزگار ناکات، دابەکە دێتە دەرەوە روویان پرشنگدار دەکات تا وەك هەسارەی پرشنگداری لێ دێت، خەڵکی بەدوایدا دەبنە جیران لە شوێنی نیشتەجێبوون و هاوبەش لە ماڵ و سامان و هاوەڵ لە ئیسلامدا.

**١٤٤**- عَنْ أَبِي هريرة: أنَّ رسول الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**تَخرُجُ الدَّابَّةُ ومعَها خاتمُ سُلَيْمانَ بنِ داودَ، وعَصا موسى بنِ عمرانَ، عليهِما السَّلامُ، فتجلو وجهَ المؤمنِ بالعَصا، وتخطِمُ أنفَ الكافرِ بالخاتمِ، حتَّى أنَّ أَهْلَ الحواءِ ليجتَمعونَ، فيقولُ هذا: يا مؤمِنُ! ويقولُ هذا: يا كافِرُ**).

[ت٣١٨٧/ جه٤٠٦٦]

* ضعيف.

لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**دابەکە دێتە دەرەوە و خاتەمەکەی سولەیمانی کوڕی داود و عەساکەی موسای کوڕی عیمران(علیهما السلام) لە لایە، رووی باوەڕدار بە عەساکە رۆشن دەکاتەوە، و لووتی بێباوەڕیش بە خاتەمەکە مۆر دەکات، تەنانەت ئەهلی سەرچاوەیەك لە ناو کۆدەبنەوە، ئەمەیان دەڵێ: ئەی باوەڕدار، ئەوەیان دەڵێ: ئەی بێباوەڕ**).

## ٢٥- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی یاجووج و ماجووج هاتووە

**١٤٥**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**تُفْتَحُ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ، فَيَخْرُجُونَ كَمَا قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾**[الأنبياء:٩٦] **فَيَعُمُّونَ الأَرْضَ، وَيَنْحَازُ مِنْهُمْ المُسْلِمُونَ، حَتَّى تَصِيرَ بَقِيَّةُ المُسْلِمِينَ فِي مَدَائِنِهِمْ وَحُصُونِهِمْ، وَيَضُمُّونَ إِلَيْهِمْ مَوَاشِيَهُمْ، حَتَّى إِنَّهُمْ لَيَمُرُّونَ بِالنَّهَرِ فَيَشْرَبُونَهُ حَتَّى مَا يَذَرُونَ فِيهِ شَيْئاً، فَيَمُرُّ آخِرُهُمْ عَلَى أَثَرِهِمْ، فَيَقُولُ قَائِلُهُمْ: لَقَدْ كَانَ بِهَذَا المَكَانِ مَرَّةً، مَاءٌ! وَيَظْهَرُونَ عَلَى الأَرْضِ،**

فَيَقُولُ قَائِلُهُمْ: هَؤُلاَءِ أَهْلُ الْأَرْضِ قَدْ فَرَغْنَا مِنْهُمْ، وَلَنُنَازِلَنَّ أَهْلَ السَّمَاءِ، حَتَّى إِنَّ أَحَدَهُمْ لَيَهُزُّ حَرْبَتَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَتَرْجِعُ مُخَضَّبَةً بِالدَّمِ، فَيَقُولُونَ: قَدْ قَتَلْنَا أَهْلَ السَّمَاءِ! فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ، إِذْ بَعَثَ اللهُ دَوَابَّ كَنَغَفِ الجَرَادِ، فَتَأْخُذُ بِأَعْنَاقِهِمْ فَيَمُوتُونَ مَوْتَ الجَرَادِ، يَرْكَبُ بَعْضُهُمْ بَعْضاً. فَيُصْبِحُ الْمُسْلِمُونَ لاَ يَسْمَعُونَ لَهُمْ حِسّاً، فَيَقُولُونَ: مَنْ رَجُلٌ يَشْرِي نَفْسَهُ، وَيَنْظُرُ مَا فَعَلُوا؟ فَيَنْزِلُ مِنْهُمْ رَجُلٌ قَدْ وَطَّنَ نَفْسَهُ عَلَى أَنْ يَقْتُلُوهُ، فَيَجِدُهُمْ مَوْتَى، فَيُنَادِيهِمْ: أَلاَ أَبْشِرُوا! فَقَدْ هَلَكَ عَدُوُّكُمْ، فَيَخْرُجُ النَّاسُ، وَيُخْلُونَ سَبِيلَ مَوَاشِيهِمْ، فَمَا يَكُونُ لَهُمْ رَعْيٌ إِلاَّ لُحُومُهُمْ، فَتَشْكَرُ عَلَيْهَا؛ كَأَحْسَنِ مَا شَكِرَتْ مِنْ نَبَاتٍ أَصَابَتْهُ قَطُّ). [جـ٩ه٤٠٧]

* حسن صحيح.

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(یاجووج و ماجووج دەکرێنەوە[١] و دێنەدەرەوە، وەك خودا(سبحانە وتعالى) دەفەرموێت: ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾[الأنبياء:٩٦]، هەموو زەوی دەگرنەوە، موسڵمانان خۆیان لەوان قایم دەکەن، تا ئەوانەی ماونەتەوە لە موسڵمانان دەچنە ناو شار و قەڵاکانیان و مەڕ و ماڵاتیان تەك خۆیان دەکەن، بە پاڵ رووباردا گوزەر دەکەن و دەیخۆنەوە تا هیچ شتێکی تێدا بەجێناهێڵن، دواییەنکەیان بەدوای ئەواندا تێدەپەڕێ و دەڵێت: جاران لەم شوێنەدا ئاو هەبووە، دەست بەسەر زەویدا دەگرن، یەکێك لەوان دەڵێت: ئەوانە ئەهلی زەوی بوون و کۆتاییمان پێ هێنان، با دژ بە ئەهلی ئاسمان بجەنگین، تەنانەت یەکێك لەوان نێزەکەی بەرەو ئاسمان رادەوەشێنێ[٢]، دەگەڕێتەوە و بە خوێن سوور بووە، بۆیە دەڵێن: ئەهلی ئاسمانمان کوشت، لە کاتێکدا ئەوان بەو جۆرەن خودا گیاندارێك وەك کرمی لووتی حوشتر و مەڕ رەوانە دەکات و دەداتە ملیان و وەك کوللە دەمرن، هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا دەکەون، موسڵمانان رۆژیان لێ دەبێتەوە و هەست بەوان ناکەن، بۆیە دەڵێن: چ پیاوێك خۆی دەکرێتەوە**

---

[١] دەکرێنەوە: واتە سەدەکەی زیلقەڕنەین کون دەبێت و یاجووج و ماجووج دەرگایان بە روودا دەکرێتەوە و دێنە دەرەوە—و.

[٢] رادەوەشێنێ(یهز): واتە بەرەو ئاسمان هەڵدەدەن—و.

**و بڕوات و بزانیٚ چی دەکەن؟ پیاوێك لەوان دادەبەزیٚ خۆی داناوە ئەوان بیکوژن، بەڵام دەبینیٚ هەموو مردوون، بانگیان لیٚ دەکات[1]، مژدەتان لیٚ بێت، دوژمنەکەتان تیاچووە، بۆیە خەڵکی دێنە دەرەوە و مەڕ و ماڵاتیان بەرەڵا دەکەن، جگە لە گۆشتی یاجووج و ماجووج لەوەڕگا نییە بۆ مەڕ و ماڵات، بۆیە لەسەریان قەڵەو دەبن وەك باشترین رووەکیك لەسەری لەوەڕا بێت).**

**١٤٦**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ يَحْفِرُونَ كُلَّ يَوْمٍ، حَتَّى إِذَا كَادُوا يَرَوْنَ شُعَاعَ الشَّمْسِ، قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمْ: ارْجِعُوا فَسَنَحْفِرُهُ غَداً، فَيُعِيدُهُ اللهُ أَشَدَّ مَا كَانَ. حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ مُدَّتُهُمْ، وَأَرَادَ اللهُ أَنْ يَبْعَثَهُمْ عَلَى النَّاسِ، حَفَرُوا، حَتَّى إِذَا كَادُوا يَرَوْنَ شُعَاعَ الشَّمْسِ، قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمْ: ارْجِعُوا، فَسَتَحْفِرُونَهُ غَداً، إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى، وَاسْتَثْنَوْا، فَيَعُودُونَ إِلَيْهِ، وَهُوَ كَهَيْئَتِهِ حِينَ تَرَكُوهُ، فَيَحْفِرُونَهُ وَيَخْرُجُونَ عَلَى النَّاسِ فَيُنْشِفُونَ الْمَاءَ، وَيَتَحَصَّنُ النَّاسُ مِنْهُمْ فِي حُصُونِهِمْ، فَيَرْمُونَ بِسِهَامِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ، فَتَرْجِعُ عَلَيْهَا الدَّمُ الَّذِي اجْفَظَّ. فَيَقُولُونَ: قَهَرْنَا أَهْلَ الْأَرْضِ، وَعَلَوْنَا أَهْلَ السَّمَاءِ! فَيَبْعَثُ اللهُ نَغَفاً فِي أَقْفَائِهِمْ، فَيَقْتُلُهُمْ بِهَا**).

قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّ دَوَابَّ الْأَرْضِ لَتَسْمَنُ وَتَشْكَرُ شَكَراً مِنْ لُحُومِهِمْ**) واللفظ لابن ماجه.　　　　[ت٣١٥٣/ جه٤٠٨٠]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەموو ڕۆژیٚ یاجووج سەدەکە هەڵدەکۆڵن، تا ها خەریکە تیشکی خۆر ببینن، ئەو کەسەی لەسەریانە[2] دەڵێت: بگەڕێنەوە، سبەی هەڵیدەکۆڵین(کونی دەکەین)، خودا سەدەکە توندتر و قایمتر دەکات، تا دەگاتە ماوەی دیاریکراویان و خودا دەیەوێت رەوانەی سەر خەڵکیان بکات، هەڵدەکۆڵن[3] تا ها خەریکە تیشکی خۆر ببینن ئەو کەسەی کە**

---

[1] بانگیان لیٚ دەکات: واتە بانگ لە باوەڕداران دەکات–و.

[2] لەسەریانە: واتە: سەرۆك و گەورەی ئەوانە–و.

[3] هەڵدەکۆڵن: واتە: سەدەکە هەڵدەکۆڵن–و.

**لەسەریانە دەڵێ: بگەڕێنەوە، سبەینێ کونی دەکەین گەر خودا(سبحانه وتعالى) بیەوێت، "إن شاء الله"یان بەکارهێنا، دەگەڕێنەوە بۆ لای سەدەکە دەبینن بەو جۆرەیە کە وازیان لێ هێنا، دەست بە هەڵکۆڵینی دەکەن و دێنە دەرەوە بۆ سەر خەڵك، ئاو وشك دەکەن، خەڵکی دەچنە قەڵا و قوڵلەکانیان و خۆیان لەوان دەپارێزن، تیرەکانیان هەڵدەدەن بۆ ئاسمان و دەگەڕێنەوە و دەبینن لە خوێن هەڵژەنراون، بۆیە دەڵێن: ئەهلی زەویمان بەزاند و بەسەر ئەهلی ئاسماندا سەرکەوتین، خودا کرمی لووتی حوشتر و مەڕ ڕەوانەی پشت ملیان دەکات و بەوە دەیانکوژێت).**

پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، لە گۆشتی ئەوان ئاژەڵانی زەوی قەڵەو دەبن و زیاد دەکەن)** لەفزەکە بۆ ئیبن ماجە دەگەڕێتەوە.

## ٢٦- دەروازەی: مەهدی

**١٤٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مسعود، عَن النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لَوْ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ يَوْمٌ، لَطَوَّلَ اللهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ، حَتَّى يَبْعَثَ فِيهِ رَجُلاً مِنِّي . أَوْ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي .، يُوَاطِئُ اسْمُهُ اسْمِي، وَاسْمَ أَبِيهِ اسْمَ أَبِي، يَمْلَأُ الْأَرْضَ قِسْطاً وَعَدْلاً كَمَا مُلِئَتْ ظُلْماً وَجَوْراً).** [د٤٢٨٢/ ت٢٢٣٠]

* حسن صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر لە دنیا تەنها یەك ڕۆژ مابێت خودا ئەو ڕۆژە درێژ دەکات، تا خودا تیایدا پیاوێك لە من-یان لە ئال و بەیتم- ڕەوانە دەکات، ناوی لەگەڵ ناوی من تەبایە و ناوی باوکی لەگەڵ ناوی باوکم تەبایە، زەوی پڕ دەکات لە ڕێکی و ڕاستی و دادپەروەری وەك چۆن پڕ بووە بە ستەم و زۆرداری).**

**١٤٨-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(الْمَهْدِيُّ مِنْ عِتْرَتِي، مِنْ وَلَدِ فَاطِمَةَ).** [د٤٢٨٤/ جه٤٠٨٦]

* صحيح.

لە ئوم سەلەمەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(مەهدی لە نەوەی منە، لە کوڕی فاتیمە).**

١٤٩– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَخْرُجُ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ:** **السُّفْيَانِيُّ، فِي عُمْقِ دِمَشْقَ، وَعَامَّةُ مَنْ يَتْبَعُهُ مِنْ كَلْبٍ، فَيَقْتُلُ حَتَّى يَبْقُرَ بُطُونَ النِّسَاءِ وَيَقْتُلَ الصِّبْيَانَ، فَتَجْمَعَ لَهُمْ قَيْسُ فَيَقْتُلُهَا حَتَّى لا يَمْنَعَ ذَنَبٌ تَلْعَةً، وَيَخْرُجُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي فِي الحَرَّةِ فَيَبْلُغُ السُّفْيَانِيَّ، فَيَبْعَثُ إِلَيْهِ جُنْداً مِنْ جُنْدِهِ فَيَهْزِمُهُمْ، فَيَسِيرُ إِلَيْهِ السُّفْيَانِيُّ بِمَنْ مَعَهُ حَتَّى إِذَا صَارَ بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ خُسِفَ بِهِمْ فَلا يَنْجُو مِنْهُمْ إِلاَّ المُخْبِرُ عَنْهُمْ**). [ك٨٥٨٦]

* قال الذهبي: على شرطهما.

لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە قوڵایی دیمەشق پیاوێك سەرهەڵدەدات پێی دەوترێت سوفیانی، بەزۆری ئەوانەی شوێنی دەکەون لە کەلبە[1]، دەست بە کوشتن دەکات تا سکی ئافرەت هەڵدەدڕێت و منداڵ دەکوژێت، قەیس بۆی کۆدەبنەوە و دەیانکوژێت تا هیچ شت خۆی لەبەر ناگرێت، پیاوێك لە ئال و بەیتم لە "الحرة" سەرهەڵدەدات، هەواڵەکەی دەگات بە سوفیانی، بۆیە کۆمەڵێك لە سەربازەکانی خۆی بۆ ڕەوانە دەکات، دەیانبەزێنێت[2]، بۆیە سوفیانی بەوانی لەگەڵ ئەون بۆی دەچێت، تا دەگەنە زەوی "بیداء" ڕۆدەچن، تەنها یەك هەواڵدەر لەوان ڕزگاری دەبێت).**

١٥٠– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**يَخْرُجُ فِي آخِرِ أُمَّتِي المَهْدِيُّ، يَسْقِيهِ اللهُ الغَيْثَ، وَتُخْرِجُ الأَرْضُ نَبَاتَهَا، وَيُعْطِي المَالَ صِحَاحاً، وَتَكْثُرُ المَاشِيَةُ، وَتَعْظُمُ الأمةُ، يَعِيشُ سَبْعاً أَوْ ثَمَانِياً . يَعْنِي حِجَجاً**). [ك٨٦٧٣]

* قال الذهبي: صحيح.

---

[1] کەلب: ناوی تیرەیەکە–و.

[2] دەیانبەزێنێت: واتە ئەو پیاوەی لە ئال و بەیتی پێغەمبەرە(ﷺ) پیاوەکانی سوفیانی دەبەزێنێت–و.

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە کۆتاییەکانی ئوممەتم مەهدی سەرهەڵدەدات، خودا بارانی بۆ دەبارێنێ و زەوی رووەکی خۆی دەڕوێنێت و ماڵ و سامان بە راستی و دروستی دەبەخشێت، مەڕ و ماڵات زۆر دەبن، ئوممەت گەورە و مەزن دەبێت، حەوت یان هەشت–حەوت هەشت ساڵ– دەژی).**

## ٢٧- دەروازەی: مەسخ[1] و ڕۆچوون لەبەردەم هاتنی قیامەت

**١٥١**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكُونَ فِي أُمَّتِي خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ**). [حب٦٧٥٩]

* إسناده حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(قیامەت نایەت تا لە ئوممەتەکەمدا ڕۆچوون و مەسخ و بەردەباران ڕوودەدات).**

## ٢٨- دەروازەی: هەڵگرتنی قورئان

**١٥٢**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: يُسرى عَلى كِتَابِ اللهِ فَيُرْفَعُ إلى السَّمَاءِ، فَلا يُصْبِحُ فِي الأَرْضِ آيَةٌ مِنَ القُرْآنِ، وَلا مِنَ التَّوْرَاةِ والإِنْجِيلِ، وَلا الزَّبُورِ، وَيُنْتَزَعُ مِنْ قُلوبِ الرِّجَالِ فَيُصْبِحُونَ وَلا يَدْرُونَ مَا هُو. [ك٨٥٤٤]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: شەوێك بەسەر قورئاندا دێت بەرزدەکرێتەوە بۆ ئاسمان، بۆ بەیانی ئایەتێك لە قورئان لە زەوی نامێنێت، هەر بەو**

[1] مەسخ: گۆڕینی شێوە بۆ شێوەی ناشیرین–و.

جـۆره لــه تــەورات و ئینجیــل، بەهــەمان شــێوه لــه زەبــووریش، لــه دڵــی پیــاوان دەردەهێنرێت و رۆژیان لێ دەبێتەوه نازانن قورئان چییه.

## ٢٩- دەروازەی: رەوانەکردن

[انظر في قرب الساعة: **٣٢٧٩**.

وانظر من علامات الساعة اتباع الأمم السابقة: **٨٤٣**.

وانظر بشأن الدابة: **٢٣، ٩٧- ٩٩**].

# بەشی دووەم

## سیفەتی قیامەت

### ١- دەروازەی: بەرپابوونی قیامەت لەسەر خراپترینی خەڵك

**١٥٣-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُوْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، قَالَ: **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ عَلَى شِرَارِ النَّاسِ)**. [م٢٩٤٩]

**(م) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: (قیامەت تەنها لەسەر خراپترین خەڵك بەرپادەبێت).**

**١٥٤-** (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لاَ يُقَالَ فِي الأَرْضِ: اللهُ، اللهُ)**. [م١٤٨]

**(م) لە ئەنەسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (قیامەت بەرپانابێت تا لە زەوی بوترێت: الله، الله).**

**١٥٥-** عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ اليَمَانِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكُونَ أَسْعَدَ النَّاسِ بِالدُّنْيَا لُكَعُ ابْنُ لُكَعٍ)**. [ت٢٢٠٩]

* صحيح.

**لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (قیامەت بەرپا نابێت تا بەختەوەرترین کەس بە دونیا دەبێتە گەمژەی کوڕی گەمژە).**

### ٢- دەروازەی: باسی نەفخی صور و ئەوەی دەکەوێتە نێوان دوو نەفخەکە

**١٥٦-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ)**، قَالَ: أَرْبَعُونَ يَوْماً؟ قَالَ: أَبَيْتُ، قَالَ: أَرْبَعُونَ شَهْراً؟ قَالَ: أَبَيْتُ، قَالَ:

أَرْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالَ: (ثُمَّ يُنْزِلُ اللهُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً، فَيَنْبُتُونَ كما يَنْبُتُ البَقْلُ، لَيْسَ مِنَ الْإِنْسَانِ شَيْءٌ إِلاَّ يَبْلَى، إِلاَّ عَظْماً وَاحِداً وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ، وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الخَلْقُ يَوْمَ القِيَامَةِ). [خ٤٩٣٥، (٤٨١٤)/ م٢٩٥٥]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوەی دەکەوێتە نێوان دوو نەفخەکە چلە)**، وتی: چل ڕۆژ؟ فەرمووی: **(نامەوێ[1])**، وتی: چل مانگ؟ فەرمووی: **(نامەوێ)**، وتی: چل ساڵ؟ فەرمووی: **(نامەوێ)**. فەرمووی: **(پاشان خودا لە ئاسمانەوە ئاوێك دادەبەزێنێت، دەڕوێن(زیندوودەبنەوە) وەك چۆن گژوگیا دەڕوێت، هەموو جەستەی مرۆڤ دەڕزێت(دەپوێت) جگە لە یەك ئێسك کە بریتییە لە "عَجْبُ الذَنَب"[2] لەوەوە لە ڕۆژی قیامەت دروستکراوان پێکدێنەوە)**.

**١٥٧**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(الصُّورُ قَرْنٌ يُنْفَخُ فِيهِ)**. [د٤٧٤٢/ ت٢٤٣٠/ مي٢٨٤٠]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (صور شاخێکە فووی پیادا دەکرێت).**

**١٥٨**– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدري قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(كَيْفَ أَنْعَمُ، وَصَاحِبُ القَرْنِ قَدْ التَقَمَ القَرْنَ، وَاسْتَمَعَ الْإِذْنَ، مَتَى يُؤْمَرُ بِالنَّفْخِ؛ فَيَنْفُخُ)**، فَكَأَنَّ ذَلِكَ ثَقُلَ عَلَى أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ لَهُمْ: **(قُولُوا: حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الوَكِيلُ، عَلَى اللهِ تَوَكَّلْنَا)**. [ت٢٤٣١]

* صحيح.

---

[1] واتە: نامەوێ پێداگرانە بڵێم چل ڕۆژ و یەکلای بکەمەوە.

[2] ئەو پارچە ئێسکە وردەی دەکەوێتە کۆتایی ئێسکی حەوز، "عجم"یشی پێ دەوترێت، ئەوە یەکەمین ئێسکە لە ئادەمیزادا دروست دەبێت، هەر ئەوەش لە مرۆڤ دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی دروستکردنی لێ پێکبێتەوە.

لە ئـەبی سـەعیدی خودرییـەوە، وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: **(چۆن خۆشیدەبینم! لە کاتێکدا هاوەڵی شاخەکە[1] شاخەکەی بە دەمەوە گرتووە، و گوێی هەڵداوە بۆ مۆڵەت[2]، کەی بە فووکردن فەرمانی پێکرا فووی پیادا دەکات)**، وەك ئەوەی ئەوە لەسەر هـاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) قـورس بووبێـت، بۆیـە پێـی فـەرموون: **(بڵێن: "حسبنا الله ونعم الوكيل، على الله توكلنا-خودامان بەسـە و ئـەو باشـترین وەکیلە، تەوەکولمان لەسەر خودایە")**.

١٥٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ طَرْفَ صَاحِبِ الصُّورِ مُذْ وُكِّلَ بِهِ مُسْتَعِدٌّ، يَنْظُرُ نَحْوَ العَرْشِ مَخَافَةَ أَنْ يُؤْمَرَ قَبْلَ أَنْ يَرْتَدَّ إِلَيْهِ طَرْفُهُ، كَأَنَّ عَيْنَيهِ كَوْكَبَانِ دُرِّيَّانِ)**. [ك٨٦٧٦]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتـی: پێغەمبەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: **(لەو کاتەوەی هاوەڵی صورەکە[3] ڕاسپێرراوە بەو صورە سەرنجی ڕوو لە عەرشە، لە ترسی ئەوەی نەبادا بەر لە چاوترووکانی فەرمانی پێ بکرێت، چاوەکانی وەك ئەوەی دوو هەسارەی پرشنگدار بن)**.

## ٣- دەروازەی: سیفەتی خۆر و مانگ

١٦٠- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(الشَّمْسُ وَالقَمَرُ مُكَوَّرَانِ يَوْمَ القِيَامَةِ)**. [خ٣٢٠٠]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لـە پێغەمبـەرەوە(ﷺ)، فـەرمووی: **(لە ڕۆژی قیامەت خۆر و مانگ خڕکراون)**.

---

[1] هاوەڵی شاخەکە: ئەو فریشتەی شاخەکە(الصور)ی بە دەمەوە گرتووە و دەیەوێت فـووی پیادا بکات-و.

[2] واتە: گوێی هەڵداوە خودا مۆڵەتی بدات و فووی پیادا بکات-و.

[3] هاوەڵی صورەکە: ئەو فریشتەی شاخەکەی بە دەمەوە گرتووە تا فووی پیادا بکات-و.

## ٤- دەروازەی: زەوی لە ڕۆژی قیامەت

١٦١- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(يَقْبِضُ اللهُ الأَرْضَ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَيَطْوِي السَّمَاءَ بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا المَلِكُ، أَيْنَ مُلُوكُ الأَرْضِ)**. [خ٧٣٨٢، (٤٨١٢)/ م٢٧٨٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(لە ڕۆژی قیامەت زەوی لە مشتی خودادایە و بە راستی خۆی ئاسمان دەپێچێتەوە، پاشان دەفەرموێت: من مەلیکم، مەلیکانی زەوی لە کوێن؟)**.

١٦٢- (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ﴾ [إبراهيم:٤٨]، فَأَيْنَ يَكُونُ النَّاسُ يَوْمَئِذٍ يَا رَسُولَ اللهِ؟! فَقَالَ: **(عَلَى الصِّرَاطِ)**. [م٢٧٩١]

(م) لە عائیشەوە، وتی: دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ﴾ [إبراهيم:٤٨]، پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد و وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، لەو ڕۆژەدا خەڵکی لە کوێن؟ فەرمووی: **(لەسەر سیراتن)**.

## ٥- دەروازەی: دەربارەی حەشر

١٦٣- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلاَثِ طَرَائِقَ: رَاغِبِينَ رَاهِبِينَ، وَاثْنَانِ عَلَى بَعِيرٍ، وَثَلاَثَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَأَرْبَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ. وَتَحْشُرُ بَقِيَّتَهُمُ النَّارُ، تَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا، وَتَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا، وَتُصْبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا، وَتُمْسِي مَعَهُمْ حَيْثُ أَمْسَوْا)**. [خ٦٥٢٢/ م٢٨٦١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خەڵکی بە سێ ڕێگە حەشر دەکرێن: بە حەز و ترسەوە، دوان لەسەر حوشترێك، سیان لەسەر حوشرێك، چوار لەسەر حوشترێك، دە لەسەر حوشترێك، ئەوەی ماوەتەوە ئاگر کۆیاندەکاتەوە، لە هەر کوێ پاڵدەدەنەوە لەگەڵیاندایە، شەو لە کوێ**

**دەمێننەوە لەگەڵیاندایە، لە کوێ ڕۆژیان لێ دەبێتەوە لەگەڵیاندایە، لە کوێ ئێوارەیان بەسەردا دێت لەگەڵیاندایە).**

**١٦٤-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(تُحْشَرُونَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً)**. قَالَتْ عائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ؟ فَقَالَ: **(الأَمْرُ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يُهِمَّهُمْ ذَاكِ)**. [خ٦٥٢٧/ م٢٨٥٩]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بەپێی پەتی و بە ڕووتی و خەتەنە نەکراوی حەشر دەکرێن)**، عائیشە وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، پیاو و ژن تەماشای یەکتر دەکەن؟ فەرمووی: **(کارەکە لەوە سەخت و توندترە، ئەوە خەریکیان بکات[1])**.

**١٦٥-** (ق) عَن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(تُحْشَرُونَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ وَعْدًا عَلَيْنَآ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾** [الأنبياء:١٠٤]، **فَأَوَّلُ مَنْ يُكْسى إِبْرَاهِيمُ)**. [خ٣٤٤٧، م٢٨٦٠]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بەپێی پەتی و بە ڕووتی و خەتەنە نەکراوی حەشر دەکرێن)**، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ وَعْدًا عَلَيْنَآ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ [الأنبياء:١٠٤]، **(یەکەمین کەسێك پۆشتە دەکرێتەوە بریتییە لە ئیبراهیم)**.

**١٦٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ العَالَمِينَ مِقْدَارَ نِصْفِ يَوْمٍ مِنْ خمسينَ ألفِ سنةٍ، يُهَوَّنُ ذلكَ عَلَى المُؤمنينَ كَتَدَلِّي الشَّمْسِ لِلغروبِ إلى أَنْ تَغْرُبَ)**. [حب٧٣٣٣]

* إسناده صحيح على شرط البخاري.

---

[1] واتە: ئەوە داگیریان بکات

لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(بڕی نیو ڕۆژ لە پەنجا هەزار ساڵ خەڵکی بۆ پەروەردگاری جیهانان دەوەستن، ئەوە لەسەر باوەڕداران ئاسان دەبێت وەك شۆڕبوونەوەی خۆر بۆ ئاوابوون تا ئاوا دەبێت)**.

## ٦- دەروازەی: سیفەتی زەوی مەحشەر

**١٦٧-** (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ القِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ، كَقُرْصَةِ نَقِيٍّ). قالَ سَهْلٌ أَوْ غَيْرُهُ: لَيْسَ فِيهَا مَعْلَمٌ لأَحَدٍ. [خ٦٥٢١/ م٢٧٩٠]

(ق) لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(لە ڕۆژی قیامەت خەڵکی لەسەر زەوییەکی سپی مەیلەو سوور حەشر دەکرێن، وەك کولێرەی ئاردی سپی)**.

سەهل یان کەسێکی تر جگە لە ئەو وتی: بۆ هیچ کەس مەشخەڵ و نیشانەیەك لە زەوی بوونی نییە.

## ٧- دەروازەی: ترس و تۆقانی ڕۆژی قیامەت

**١٦٨-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (﴿يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ۝٦﴾ [المطففين: ٦]، حَتَّى يَغِيبَ أَحَدُهُمْ فِي رَشْحِهِ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ). [خ٤٩٣٨/ م٢٨٦٢]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (﴿يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ۝٦﴾ [المطففين: ٦] **-ڕۆژێك خەڵکی بۆ پەروەردگاری جیهانان بە پێوە دەوەستن، تا یەکێك لەوان لە ئارەقەی خۆیدا تا نیوەی دوو گوێی نوقم دەبێت)**.

**١٦٩**– (م) عَنْ سُلَيْمِ بْنِ عَامِرٍ، حَدَّثَنِي المِقْدَادُ بْنُ الأَسْوَدِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**تُدْنَى الشَّمْسُ يَوْمَ القِيَامَةِ مِنَ الخَلْقِ، حَتَّى تَكُونَ مِنْهُمْ كَمِقْدَارِ مِيلٍ**).

قَالَ سُلَيْمُ بْنُ عَامِرٍ: فَوَاللهِ مَا أَدْرِي مَا يَعْنِي بِالمِيلِ؛ أَمَسَافَةَ الأَرْضِ، أَمِ المِيلَ الَّذِي تُكْتَحَلُ بِهِ العَيْنُ؟

قَالَ: (**فَيَكُونُ النَّاسُ عَلى قَدْرِ أَعْمَالِهِمْ فِي العَرَقِ: فَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى كَعْبَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى حَقْوَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يُلْجِمُهُ العَرَقُ إلجاماً**).

قَالَ: وَأَشَارَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِيَدِهِ إِلَى فِيهِ. [م٢٨٦٤]

(م) لە سولەیمی کوڕی عامیرەوە، میقدادی کوڕی ئەسوەد بۆی باس کردم و وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**لە ڕۆژی قیامەت زەوی لە خەڵك نزیك دەبێتەوە، تا بڕی میلێك لێیانەوە دوورە**).

سولەیم وتی: سوێند بە خودا، نازانم مەبەستی چییە بە میل، ئایا میلی دووری زەوی، یان میلی ڕشتنی چاو!

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**خەڵكی لە ئارەقەكردنەوەدا بەپێی كارەكانیانن: هەیانە تا قولاپییەتی، هەیانە تا ئەژنۆیەتی، هەیانە تا ناوقەدی، هەشیانە ئارەق لەغاوی دەكات**).

وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە دەستی ئاماژەی كرد بۆ دەمی خۆی.

## ٨- دەروازەی: شفاعەت و مەقامی مەحموود

**١٧٠**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِلَحْمٍ، فَرُفِعَ إِلَيْهِ الذِّرَاعُ، وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ، فَنَهَسَ مِنْهَا نَهْسَةً، ثُمَّ قالَ: (**أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَهَلْ تَدْرُونَ مِمَّ ذلِكَ؟ يَجْمَعُ اللهُ النَّاسَ الأَوَّلِينَ وَالآخَرِينَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، يُسْمِعُهُمُ الدَّاعِي وَيَنْفُذُهُمُ البَصَرُ، وَتَدْنُو الشَّمْسُ، فَيَبْلُغُ النَّاسَ مِنَ الغَمِّ وَالكَرْبِ مَا لاَ يُطِيقُونَ وَلاَ يَحْتَمِلُونَ، فَيَقُولُ النَّاسُ: أَلاَ تَرَوْنَ مَا قَدْ بَلَغَكُمْ؟ أَلاَ تَنْظُرُونَ مَنْ يَشْفَعُ لَكُمْ إِلَى رَبِّكُمْ؟ فَيَقُولُ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ: عَلَيْكُمْ بِآدَمَ.**

**فَيَأْتُونَ آدَمَ عليه السلام، فَيَقُولُونَ لَهُ: أَنْتَ أَبُو البَشَرِ، خَلَقَكَ اللهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَمَرَ المَلاَئِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ، أَلاَ تَرَى إِلَى ما**

قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ آدَمُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ نَهَانِي عَنِ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُهُ، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى نُوحٍ.

فَيَأْتُونَ نُوحاً، فَيَقُولُونَ: يَا نُوحُ، إِنَّكَ أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ، وَقَدْ سَمَّاكَ اللهُ عَبْداً شَكُوراً، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى ما نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ رَبِّي عزّ وجل قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، ولَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ قَدْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ دَعَوْتُهَا عَلَى قَوْمِي، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى إِبْرَاهِيمَ.

فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ، فَيَقُولُونَ: يَا إِبْرَاهِيمُ، أَنْتَ نَبِيُّ اللهِ وَخَلِيلُهُ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ لَهُمْ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنِّي قَدْ كُنْتُ كَذَبْتُ ثَلاَثَ كَذَبَاتٍ –فَذَكَرَهُنَّ أَبُو حَيَّانَ في الحَدِيثِ– نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُوسى.

فَيَأْتُونَ مُوسى، فَيَقُولُونَ: يَا مُوسى، أَنْتَ رَسُولُ اللهِ، فَضَّلَكَ اللهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلاَمِهِ عَلَى النَّاسِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلا تَرَى إِلَى ما نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنِّي قَدْ قَتَلْتُ نَفْساً لَمْ أُومَرْ بِقَتْلِهَا، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى عِيسى.

فَيَأْتُونَ عِيسى، فَيَقُولُونَ: يَا عِيسى، أَنْتَ رَسُولُ اللهِ، وَكَلِمَتُهُ أَلقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ، وَكَلَّمْتَ النَّاسَ فِي المَهْدِ صَبِيّاً، اشْفَعْ لَنَا، أَلاَ تَرَى إِلَى ما نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ عِيسى: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ قَطُّ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ –وَلَمْ يَذْكُرْ ذَنْباً– نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم.

فَيَأْتُونَ مُحَمَّداً صلّى الله عليه وسلّم، فَيَقُولُونَ: يَا مُحَمَّدُ! أَنْتَ رَسُولُ اللهِ، وَخَاتَمُ الأَنْبِيَاءِ، وَقَدْ غَفَرَ اللهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَأَنْطَلِقُ فَآتِي تَحْتَ العَرْشِ، فَأَقَعُ سَاجِداً لِرَبِّي عزّ وجل، ثُمَّ يَفْتَحُ اللهُ عَلَيَّ مِنْ مَحَامِدِهِ وَحُسْنِ الثَّنَاءِ عَلَيْهِ شَيْئاً لَمْ يَفْتَحْهُ عَلَى أَحَدٍ قَبْلِي، ثُمَّ يُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ! ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأَقُولُ: أُمَّتِي يَا رَبِّ! أُمَّتِي يَا رَبِّ! فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ! أَدْخِلْ مِنْ أُمَّتِكَ مَنْ لاَ حِسَابَ عَلَيْهِمْ مِنَ البَابِ الأَيْمَنِ مِنْ أَبْوَابِ الجَنَّةِ، وَهُمْ شُرَكَاءُ النَّاسِ فِيمَا سِوَى ذلِكَ مِنَ الأَبْوَابِ، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! إِنَّ مَا بَيْنَ المِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الجَنَّةِ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَحِمْيَرَ، أَوْ: كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَبُصْرَى). [خ٤٧١٢ (٣٣٤٠)/ م١٩٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: گۆشت هێنـرا بـۆ پێغەمبـەری خودا(ﷺ)، دەستێكیان دایە دەستی، حەزی لە گۆشتی دەست بوو، بە ددانی شتێكی لێ كردەوە، پاشان فەرمووی: **(من لە ڕۆژی قیامەت سەرداری خەڵكم، دەزانن ئەوە لە چییەوەیە؟ خودا پێشینەكان و پاشینەكان لە یەك شوێنی تەخت و بەرین كۆدەكاتەوە، بانگكەر پێیان دەبیستێ و چاو هانایان دەكات، خۆر نزم دەبێتەوە، خەڵكی دەگەنە خەم و پەژارە و تەنگانەیەك لە توانا بەدەرە و ناتوانن شان بدەنە ژێری، خـەڵكی دەڵێن: دەبینن چیتان بەسەرهاتووە؟ ئایـا وردنابنـەوە كەسـێك لای پـەروەردگار شفاعەتتان بۆ بكات؟ هەندێ لە خەڵكی بە هەندێكی تر دەڵێن: بڕۆن بۆ لای ئادەم.**

**دێن بۆ لای ئادەم(علیە السلام) و پێی دەڵێن: تۆ باوكی مرۆڤی، خودا بە دەستی خۆی تۆی دروست كرد و لە ڕۆحی خۆی پەبەردا كردی، و فەرمانی كرد فریشتەكان سوژدەت بـۆ ببـەن، لای پـەروەردگارت شـفاعەتمان بـۆ بكـە، نـابینی ئێمـە لـە چ حاڵێكداین؟ ئادەم دەڵێ: لە ئەمڕۆدا پەروەردگار بە تووڕەبوونێك تووڕە بووە پێشتر بە نموونەی ئەوە تووڕە نەبووە، ئەو نەهی لێكردم لە درەختەكە، بەڵام لەو یاخی بووم، خۆم، خۆم، خۆم، بڕۆن بۆ لای كەسێكی تر، بڕۆن بۆ لای نوح.**

**دێن بۆ لای نوح و دەڵێن: ئەی نوح، تۆ یەكەمین پێغەمبەری بۆ ئـەهلی زەوی، خودا تۆی بە "بەندەكەیەكی شوكركار" ناوبردووە، لای پەروەردگارت شفاعەتمان بۆ بكە، نابینی ئێمە لە چ حاڵێكداین؟ ئەویش دەڵێت: پەروەردگارم(ﷻ) بە تووڕەبوونێك تووڕە بووە پێشتر بە نموونەی ئەوە تووڕە نەبووە، دوای ئەمەش بە نموونەی ئەم تووڕەبوونە تووڕە نابێت، من دوعایەكم هەبوو كردم لە گەلەكەم، خۆم، خۆم، خۆم، بڕۆن بۆ لای كەسێكی تر، بڕۆن بۆ لای ئیبراهیم.**

**دێن بۆ لای ئیبراهیم، و دەڵێن: ئەی ئیبراهیم، تۆ پێغەمبەر و خەلیلی خودای لە ئەهلی زەوی، لای پەروەردگارت شفاعەتمان بۆ بكە، نابینی ئێمە لە چ حاڵێكداین؟ ئەویش پێیان دەڵێ: پەروەردگارم بە تووڕەبوونێك تووڕە بووە پێشتر بە نموونەی ئەوە تووڕە نەبووە، دوای ئەمەش بە نموونەی ئەم تووڕەبوونە تووڕە نابێت، من سێ درۆم كردووە**–ئەبو حەییان لە فەرموودەكەدا باسـی كـردوون– **خـۆم، خـۆم، خـۆم، بڕۆن بۆ لای كەسێكی تر، بڕۆن بۆ لای موسا.**

دێن بۆ لای موسا، و دەڵێن: ئەی موسا، تۆ پێغەمبەری خودای، خودا بە پەیامەکان و بە کەلامی خۆی تۆی فەزڵداوە بەسەر خەڵکیدا، لای پەروەردگارت شفاعەتمان بۆ بکە، نابینی ئێمە لە چ حاڵێکداین؟ ئەویش پێیان دەڵێ: پەروەردگارم بە تووڕەبوونێك تووڕە بووە پێشتر بە نموونەی ئەوە تووڕە نەبووە، دوای ئەمەش بە نموونەی ئەم تووڕەبوونە تووڕە نابێت، من نەفسێکم کوشت فەرمان نەکرابوو بە کوشتنی، خۆم، خۆم، خۆم، بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر، بڕۆن بۆ لای عیسا.

دێن بۆ لای عیسا و دەڵێن: ئەی عیسا، تۆ پێغەمبەری خودای، ئەو کەلیمە بووی هەڵیدا بۆ مەریەم و ڕۆحێك بووی لە ئەوەوە، لە لانکە و وەك منداڵ قسەت لەگەڵ خەڵکی کرد، شفاعەتمان بۆ بکە، نابینی ئێمە لە چ دۆخێکداین؟ ئەویش پێیان دەڵێ: پەروەردگارم بە تووڕەبوونێك تووڕە بووە پێشتر بە نموونەی ئەوە تووڕە نەبووە، دوای ئەمەش بە نموونەی ئەم تووڕەبوونە تووڕە نابێت-باسی گوناهی خۆی نەکرد[1]- خۆم، خۆم، خۆم، بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر، بڕۆن بۆ لای محەمەد(ﷺ).

دێن بۆ لای محەمەد(ﷺ) و دەڵێن: ئەی محەمەد، تۆ پێغەمبەری خودای، و دوایین پێغەمبەری، خودا لە گوناهی پێشین و پاشینت خۆشبووە، لای پەروەردگارت شفاعەتمان بۆ بکە، نابینی ئێمە لە چ حاڵێکداین؟ دەڕۆم و دەچم بۆ ژێر عەرش، سوژدەیەك بۆ پەروەردگارم(ﷻ) دەبەم، پاشان خودا شتێك لە حەمدەکان و جوانی سەنا بە ڕوومدا دەکاتەوە کە پێشتر بە ڕووی کەسدا نەیکردووەتەوە، پاشان دەوترێت: ئەی محەمەد، سەرت بەرز بکەرەوە، داوا بکە پێتدەدرێت، شفاعەت بکە تکات وەردەگیرێت، سەرم بەرزدەکەمەوە و دەڵێم: ئومەتەکەم، ئەی پەروەردگار، ئومەتەکەم، ئەی پەروەردگار، دەوترێت: ئەی محەمەد، ئەو کەسانەی حسابیان لەسەر نییە لە ئومەتەکەت لە دەرگای لای ڕاست-لە دەرگاکانی بەهەشت- ببە ژوورەوە، جگە لەو دەرگایە دەرگاکانی تر خەڵکی تیایدا بەشدارن، سوێند بەو

---

[1] چونکە عیسا(علیه السلام) بە پاکی و بێگوناهی دروستکرا بوو، خودا بە مەریەم(علیها السلام) دەفەرموێت: ﴿لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا﴾[ مريم: ١٩].

**کەسەی نەفسی منی بەدەستە، لە نێوان دوو لای دەرگاکانی بەهەشت وەك نێوان مەککە و حیمەیرە، یان وەك نێوان مەککە و بوصرایە).**

- والذي في مسلم: (بَيْنَ مَكَّةَ وَهَجَرٍ).

**ئەوەی لە موسلیمدا هاتووە (لە نێوان مەککە و هەجەر)ە.**

**١٧١**– عَـنْ أَنَـسِ بْنِ مَالِكٍ، عَن النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**شَفَاعَتِي لِأَهْلِ الْكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي**). [د٤٧٣٩/ ت٢٤٣٥]

* صحيح.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(شفاعەتی مـن بـۆ ئەهلی گوناهە گەورەکانە لە ئومەتەکەم).**

**١٧٢**– عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَتَانِي آتٍ مِنْ عِنْدِ رَبِّي، فَخَيَّرَنِي بَيْنَ أَنْ يُدْخِلَ نِصْفَ أُمَّتِي الْجَنَّةَ، وَبَيْنَ الشَّفَاعَةِ؛ فَاخْتَرْتُ الشَّفَاعَةَ، وَهِيَ لِمَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً**). [ت٢٤٤١/ جه٤٣١٧]

* صحيح.

لە عەوفی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هاتوویەك لای پەروەردگارەوە هات بۆ لام، سەرپشکی کردم لە نێوان ئەوەی نیوەی ئومەتەکەم ببرێنە بەهەشتەوە یان شفاعەت، من شفاعەتم هەڵبژارد، ئەوەش بۆ کەسێکە بمرێت و شتێك لە هاوەڵی بۆ خودا بڕیار نەدابێت).**

## ٩- دەروازەی: جیاکردنەوەی نوێنەرانی ئاگر

**١٧٣**– (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدري قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَقُولُ اللهُ: يَا آدَمُ! فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ، قَالَ: يَقُولُ: أَخْرِجْ بَعْثَ النَّارِ، قَالَ: وَمَا بَعْثُ النَّارِ؟ قَالَ: مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ، فَذَاكَ حِينَ يَشِيبُ الصَّغِيرُ، وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا،**

وَتَرَى النَّاسَ سَكْرَى وَمَا هُمْ بِسَكْرَى، وَلكِنَّ عَذَابَ اللهِ شَدِيدٌ). فَاشْتَدَّ ذلِكَ عَلَيْهِمْ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! أَيُّنَا ذلِكَ الرَّجُلُ؟ قَالَ: (أَبْشِرُوا، فَإِنَّ مِنْ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ أَلْفاً وَمِنْكُمْ رَجُلاً، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! إِنِّي لأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الجَنَّةِ). قَالَ: فَحَمِدْنَا اللهَ وَكَبَّرْنَا، ثُمَّ قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! إِنِّي لأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْلِ الجَنَّةِ، إِنَّ مَثَلَكُمْ فِي الأُمَمِ كَمَثَلِ الشَّعْرَةِ البَيْضَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ، أَوْ كَالرَّقْمَةِ فِي ذِرَاعِ الحِمَارِ). [خ٦٥٣٠ (٣٣٤٨)/ م٢٢٢]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا دەفەرموێت: ئەی ئادەم، ئەویش دەڵێ: "لبيك وسعديك والخير في يديك"، فەرمووی: دەفەرموێت: نوێنەری ئاگر جیابكەرەوە، ئادەم دەڵێ: نوێنەرانی ئاگر چەندن؟ دەفەرموێ: لە هەزار كەس نۆسەد و نەوەد و نۆ، ئەوەش كاتێكە منداڵ پیر دەبێت، و هەموو خاوەن سكێك[1] بەرەكەی خۆی دەخات، خەڵكی دەبینی سەرخۆشن، بەڵام ئەوان سەرخۆش نین، بەڵكو سزای خودا توند و زۆرە[2])**، ئەوە لەسەر هاوەڵان زۆر توند بوو و وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، دەبێ كێ لە ئێمە ئەو پیاوە بێت؟ فەرمووی: **(مژدەتان لێ بێت، لە یاجووج و ماجووج هەزار و لە ئێوە یەك پیاو)**، پاشان فەرمووی: **(سوێند بەو كەسەی نەفسی منی بەدەستە، من رجام وایە ئێوە سێیەكی ئەهلی بەهەشت بن)**، وتی حەمدی خودامان كرد و "الله أكبر"مان كرد، پاشان فەرمووی: **(سوێند بەو كەسەی نەفسی منی بەدەستە، من رجام وایە ئێوە نیوەی ئەهلی بەهەشت بن، نموونەی ئێوە لە ئومەتان وەك تاڵە موویەكی سپی وایە لە جەستەی گایەكی رەشدا، یان وەك بازنەیەك[3] لە دەستی گوێدرێژدا)**.

---

[1] هەموو خاوەن سكێك(كل ذات حمل): واتە مرۆڤ و گیانداران كە بەچكەیان لە سكدایە—و.

[2] ئاماژەیە بەم ئایەتە: ﴿وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ﴾ [الحج: ٢] —و.

[3] مەبەست: نیشانەیەكی بازنەییە، سپی یان هەر رەنگێكی تر، لە دەستی گیاندارەكەدا—و.

## ١٠- دەروازەی: بارمتەی موسڵمانان بە ژمارەیان لە خەڵکانی تر

١٧٤- (م) عَنْ أَبِي مُوسَى قالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ، دَفَعَ اللهُ عزّ وجل إِلَى كُلِّ مُسْلِمٍ يَهُودِيّاً أَوْ نَصْرَانِيّاً، فَيَقُولُ**: هذَا فِكَاكُكَ مِنَ النَّارِ). [م٢٧٦٧]

(م) لە ئەبی موساوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کاتێك ڕۆژی قیامەت دێت خودا(ﷻ) یەهوودییەك یان نەصرانییەك بە دانە بە دانەی موسڵمانان دەدات و دەفەرموێت: ئەمە بارمتە(ڕزگارکەر)ی تۆیە لە ئاگر).**

١٧٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ هَذِهِ الْأُمَّةَ مَرْحُومَةٌ، عَذَابُهَا بِأَيْدِيهَا، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ دُفِعَ إِلَى كُلِّ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ رَجُلٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَيُقَالُ**: هَذَا فِدَاؤُكَ مِنَ النَّارِ). [جه٤٢٩٢]

* صحيح.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەم ئومەتە ڕەحمپێکراوە، سزاکەی بە دەستی خۆیەتی، کاتێك ڕۆژی قیامەت دێت بە هەر پیاوێکی موسڵمان هاوەڵدانەرێك دەدرێت و دەوترێت: ئەمە فیدای تۆیە لە ئاگر).**

## ١١- دەروازەی: حساب و وەرگرتنەوەی مافە پێشێلکراوەکان

١٧٦- (ق) عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ المازِنِيّ قالَ: بَيْنَما أَنَا أَمْشِي مَعَ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما آخِذٌ بِيَدِهِ، إذ عَرَضَ رَجُلٌ فَقَالَ: كَيْفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي النَّجْوَى؟ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِنَّ اللهَ يُدْنِي الْمُؤْمِنَ، فَيَضَعُ عَلَيْهِ كَنَفَهُ وَيَسْتُرُهُ، فَيَقُولُ**: أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ أَيْ رَبِّ! حَتَّى إِذَا قَرَّرَهُ بِذُنُوبِهِ، وَرَأَى فِي نَفْسِهِ أَنَّهُ هَلَكَ، قَالَ: سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا، وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ، فَيُعْطَى كِتَابَ حَسَنَاتِهِ. وَأَمَّا الكافِرُ وَالمُنَافِقُ، فَيَقُولُ الأَشْهَادُ: ﴿هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [هود:١٨]). [خ٢٤٤١/ م٢٧٦٨]

(ق) لە صەفوانی کوڕی موحریزی مازینییەوە، وتی: لە کاتێکدا من لەگەڵ ئیبن عومەر دەڕۆیشتم و دەستی گرتبووم، پیاوێك پەیدا بوو و وتی: دەربارەی چپە[1] چۆنت بیستووە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ ئیبن عومەر وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(خودا باوەڕدار نزیك دەکاتەوە و داپۆشینی خۆی بەسەردا دەدات و دەیدەپۆشێت، و دەفەرموێت: ئایا فلان گوناهت لەبیرە؟ ئایا فیسارە گوناهت لەبیرە؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، ئەی پەروەردگار، تا بە هەموو گوناهەکان دان پیادانانی پێ دەکات، لە نەفسی خۆی وا دەبینێ تیاچووە، وتی: لە دنیا لەسەر تۆ پۆشیم و ئەمڕۆش لێتخۆش دەبم، بۆیە نووسراوی چاکەکانی دەدرێتە دەست، بەڵام کەسی بێباوەڕ و دووڕوو شایەتەکان دەڵێن:** ﴿هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [هود:١٨]).

**١٧٧**- (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا خَلَصَ المُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ حُبِسُوا بِقَنْطَرَةٍ بَيْنَ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيَتَقَاصُّونَ مَظَالِمَ كانَتْ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيَا حَتَّى إِذَا نُقُّوا وَهُذِّبُوا، أُذِنَ لَهُمْ بِدُخُولِ الجَنَّةِ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم بِيَدِهِ! لأَحَدُهُمْ بِمَسْكَنِهِ فِي الجَنَّةِ أَدَلُّ بِمَنْزِلِهِ كانَ فِي الدُّنْيَا). [خ٢٤٤٠]

(خ) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، فەرمووی: **(کاتێك باوەڕداران لە ئاگر ڕزگاریان دەبێت لە ڕاڕەوێك[2] بەند دەکرێن، تۆڵەی مافە پێشێلکراوەکانی نێوانیان لە دنیا لەیەکتر وەردەگرنەوە، تا پاك دەکرێنەوە و پاڵفتە دەکرێن، مۆڵەتیان پێ دەدرێت بە چوونە ناو بەهەشت، سوێند بەو کەسەی نەفسی محەمەدی بە دەستە، هەریەك لەوانە بە شوێن و جێگەی خۆی لە بەهەشت شارەزاترە لە شوێن و جێگەی لە دنیا).**

---

[1] چپە(النجوى) بریتییە لە ئاخافتن بە نهێنی، لێرەدا مەبەست ئەوەیە: لە قیامەت لە نێوان خودا(سبحانه وتعالى) و بەندەکەی ڕوودەدات.

[2] ئەوەی دەردەکەوێت ئەوە بەرێکی پردی سیراتە ئەوەی دەکەوێتە لای بەهەشتەوە.

١٧٨- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (أَتَدْرُونَ مَا الْمُفْلِسُ)؟ قَالُوا: الْمُفْلِسُ فِينَا مَنْ لاَ دِرْهَمَ لَهُ وَلاَ مَتَاعَ، فَقَالَ: (إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي، يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِصَلاَةٍ وَصِيَامٍ وَزَكَاةٍ، وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ هَذَا، وَقَذَفَ هَذَا، وَأَكَلَ مَالَ هذَا، وَسَفَكَ دَمَ هَذَا، وَضَرَبَ هَذَا، فَيُعْطَى هذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ، قَبْلَ أَنْ يُقْضَى مَا عَلَيْهِ، أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ، ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ). [م٢٥٨١]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دەزانن مایەپووچ(المفلس) کێیە)**؟ وتیان: مایەپووچ لەناو ئێمەدا ئەو کەسەیە درهەم و شتومەکی نییە، فەرمووی: **(مایەپووچ لە ئومەتەکەم ئەو کەسەیە لە ڕۆژی قیامەت نوێژ و ڕۆژوو و زەکاتی لەگەڵ خۆی هێناوە، بەڵام جنێوی بەم کەسە داوە، و تۆمەتی بۆ ئەو کەسە دروستکردووە، و ماڵی ئەمەی خواردووە و خوێنی ئەوەی ڕێژاوە، و لەم کەسەی داوە، لە چاکەکانی بەم کەسە دەدرێت و بەو کەسە دەدرێت، کاتێک چاکەکانی تەواو دەبن بەرلەوەی ئەوەی لەسەریەتی وەربگیرێتەوە لە گوناهەکانی ئەوانە وەردەگیرێت و هەڵدەدرێتە سەر ئەم، پاشان هەڵدەدرێتە ناو ئاگرەوە.**

١٧٩- (م) وعَنْه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لَتُؤَدُّنَّ الْحُقُوقَ إِلَى أَهْلِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، حَتَّى يُقَادَ لِلشَّاةِ الْجَلْحَاءِ مِنَ الشَّاةِ الْقَرْنَاءِ). [م٢٥٨٢]

(م) هەر لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە ڕۆژی قیامەت مافەکان دەگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان، تا تۆڵەی بەرانی شاخدار لە بەرانی بێ شاخ وەردەگیرێتەوە).**

١٨٠- (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَضَحِكَ فَقَالَ: (هَلْ تَدْرُونَ مِمَّ أَضْحَكُ) ؟ قَالَ: قُلْنَا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: (مِنْ مُخَاطَبَةِ الْعَبْدِ رَبَّهُ. يَقُولُ: يَا رَبِّ! أَلَمْ تُجِرْنِي مِنَ الظُّلْمِ؟ قَالَ: يَقُولُ: بَلَى. قَالَ: فَيَقُولُ: فَإِنِّي لا أُجِيزُ عَلَى نَفْسِي إِلاَّ شَاهِداً مِنِّي. قَالَ: فَيَقُولُ: كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ شَهِيداً، وَبِالْكِرَامِ الْكَاتِبِينَ شُهُوداً. قَالَ: فَيُخْتَمُ عَلَى فِيهِ، فَيُقَالُ لأَرْكَانِهِ: انْطِقِي، قَالَ: فَتَنْطِقُ بِأَعْمَالِهِ، قَالَ: ثُمَّ يُخَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَلاَمِ. قَالَ: فَيَقُولُ: بُعْداً لَكُنَّ وَسُحْقاً، فَعَنْكُنَّ كُنْتُ أُنَاضِلُ). [م٢٩٦٩]

(م) لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە، وتی: لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین، پێكەنی و فەرمووی: **(دەزانن بە چی پێدەكەنم؟)** وتی: وتمان: خودا و پێغەمبەرەكەی زاناترن، فەرمووی: **(لە قسە كردنی بەندەیەك لەگەڵ پەروەردگاری، دەڵێت: ئەی پەروەردگار، لە ستەم پەنات نەداوم؟)** فەرمووی: **(خودا دەفەرموێت: بـا)** فـەرمووی: **(بەندەكـە دەڵێت: من لەسەر خۆم تەنها شایەتێكم قبووڵە لە خودی خۆم بێت)**، فەرمووی: **(خودا دەفەرموێت: ئەمڕۆ نەفسی خۆت و فریشتەی نووسەرە بەڕێزەكان[1] بەسە وەك شایەت بەسەر تۆوە)**، فەرمووی: **(مۆر لە دەمی دەدرێت، و بە ئەندامەكانی دەوترێت: قسە بكەن)**، فەرمووی: **(ئەندامەكانی بە كاروكردەوەكانی دێنە گۆ)**، فەرمووی: **(پاشان لە نێوان خۆی و قسەی ئەندامەكان تەنها دەخرێتەوە)**، فەرمووی: **(دەڵێت: نەفرەت لە ئێوە و تیاچوون بۆ ئێوە، من لەپێناو ئێوە بەرگریم دەكەم)**.

**١٨١**– عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ القِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ: عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ؟ وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَ فَعَلَ؟ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ؟ وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَ أَبْلاَهُ؟). [ت٢٤١٧/ مي٥٥٤]

* صحيح.

لە ئەبی بەرزەی ئەسلەمییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە ڕۆژی قیامەت دوو پێی بەندەیەك هەڵناگیرێن[2] تا پرسیاری لێ دەكرێت: دەربارەی تەمەنی لە چیدا بەسەری برد؟ دەربارەی زانستەكەی چ كارێكی پێ ئەنجامدا؟ دەربارەی ماڵ و سامانەكەی لە كوێوە بەدەستی هێنا و لە چیدا خەرجی كرد؟ دەربارەی جەستەی لە چیدا بەختی كرد؟)**.

**١٨٢**– عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ حُوسِبَ عُذِّبَ). [ت٣٣٣٨]

* صحيح بما قبله.

لە ئەنەسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(هەركەس موحاسەبە بكرێت سزادراوە)**.

---

[1] فریشتە نووسەرە بەڕێزەكان مەبەست پێیان "الكرام الكاتبين"ە–و.

[2] دوو پێی بەندەیەك هەڵناگیرێن: واتە ناهێڵن بڕوات تا ئەو پرسیارانەی لێ دەكرێت–و.

**١٨٣-** عن عَائِشَةَ قالت: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَن الحِسَابِ اليَسِيرِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الحِسَابُ اليَسِيرُ؟ فَقَالَ: (**الرَّجُلُ تُعْرَضُ عَلَيْهِ ذُنُوبُهُ، ثُمَّ يُتَجَاوَزُ لَهُ عَنْهَا، إِنَّهُ مَنْ نُوقِشَ الحِسَابَ هَلَكَ، وَلاَ يُصِيبُ عَبْداً شَوْكَةٌ فَمَا فَوْقَهَا؛ إِلاَّ قَاصَّ اللهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ**). [حم٢٥٥١٥] [ك١٩٠]

* إسناده قوي. وقال الذهبي: على شرط مسلم.

[وانظر: **٣١٤** من نوقش الحساب يهلك.

وانظر: **٣٢٢٤** أول ما يقضى في الدماء.

وانظر: **٣١٤٦** في التحلل من المظالم].

**له عائیشەوە، وتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی "الحساب الیسیر–حیسابی ئاسان[1]"، فەرمووی: (پیاو[2] گوناهەکانی بۆ دەخرێنە ڕوو، پاشان چاوپۆشی لێ دەکرێت بۆی، هەر کەس چستوجۆی لێپێچانەوەی لەگەڵ بکرێت تیاچووە، هەر بەندەیەك لە دڕکێکەوە تا گەورەتر لەوەی تووشهاتبێت خودا لە گوناهەکانی پێ کەم دەکاتەوە).**

## ١٢- دەروازەی: پەڕینەوە بەسەر پردی سیراتدا

**١٨٤-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أُنَاسٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ القِيَامَةِ؟ فَقَالَ: (**هَلْ تُضَارُّونَ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ**)، قالُوا: لاَ، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (**هَلْ تُضَارُّونَ فِي القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ لَيْسَ دُونَهُ سَحَابٌ**)، قالُوا: لاَ، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (**فَإِنَّكُمْ تَرَوْنَهُ يَوْمَ القِيَامَةِ كَذلِكَ، يَجْمَعُ اللهُ النَّاسَ، فَيَقُولُ: مَنْ كانَ يَعْبُدُ شَيْئاً فَلْيَتَّبِعْهُ، فَيَتْبَعُ مَنْ كانَ يَعْبُدُ الشَّمْسَ، وَيَتْبَعُ مَنْ كانَ يَعْبُدُ القَمَرَ، وَيَتَّبِعُ مَنْ كانَ يَعْبُدُ الطَّوَاغِيتَ، وَتَبْقَى هذِهِ الأُمَّةُ فِيهَا مُنَافِقُوهَا، فَيَأْتِيهِمُ اللهُ فِي غَيْرِ الصُّورَةِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: نَعُوذُ بِاللهِ مِنْكَ، هذَا**

---

[1] **پیاو: واتە مرۆڤ–و**

[2] **ئاماژەیە بە ئایەتی:** ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَاباً يَسِيراً﴾ [الانشقاق: ٨] –و

مَكانُنَا حَتَّى يَأْتِيَنَا رَبُّنَا، فَإِذَا أَتَانَا رَبُّنَا عَرَفْنَاهُ، فَيَأْتِيهِمُ اللهُ في الصُّورةِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنَا فَيَتْبَعُونَهُ، ويُضْرَبُ جِسْرُ جَهَنَّمَ).

قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يُجِيزُ، وَدُعاءُ الرُّسُلِ يَوْمَئِذٍ: اللَّهُمَّ! سَلِّمْ سَلِّمْ، وَبِهِ كَلالِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، أَمَا رَأَيْتُمْ شَوْكَ السَّعْدَانِ) ؟ قالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، غَيْرَ أَنَّهَا لاَ يَعْلَمُ قَدْرَ عِظَمِهَا إِلاَّ اللهُ، فَتَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ، مِنْهُمُ المُوبَقُ بِعَمَلِهِ وَمِنْهُمُ المُخَرْدَلُ، ثُمَّ يَنْجُو، حَتَّى إِذَا فَرَغَ اللهُ مِنَ القَضَاءِ بَيْنَ عِبَادِهِ، وَأَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ مِنَ النَّارِ مَنْ أَرَادَ أَن يُخْرِجَ، مِمَّنْ كانَ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَمَرَ المَلاَئِكَةَ أَنْ يُخْرِجُوهُمْ، فَيَعْرِفُونَهُمْ بِعَلاَمَةِ آثارِ السُّجُودِ، وَحَرَّمَ اللهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ مِنِ ابْنِ آدَمَ أَثَرَ السُّجُودِ، فيُخْرِجُونَهُمْ قَدْ امْتُحِشُوا، فيُصَبُّ عَلَيْهِمْ ماءٌ يُقَالُ لَهُ: ماءُ الحَيَاةِ، فَيَنْبُتُونَ نَبَاتَ الحِبَّةِ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ.

وَيَبْقى رَجُلٌ مُقْبِلٌ بِوَجْهِهِ عَلَى النَّارِ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! قَدْ قَشَبَنِي رِيحُهَا، وَأَحْرَقَنِي ذَكاؤُهَا، فاصْرِفْ وَجْهِي عَنِ النَّارِ، فَلاَ يَزَالُ يَدْعُو اللهَ، فَيَقُولُ: لَعَلَّكَ إِنْ أَعْطَيْتُكَ أَنْ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ، فَيَقُولُ: لاَ، وَعِزَّتِكَ! لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهُ، فَيَصْرِفُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ. ثُمَّ يَقُولُ بَعْدَ ذلِكَ: يَا رَبِّ! قَرِّبْنِي إِلَى بَابِ الجَنَّةِ، فَيَقُولُ: أَلَيْسَ قَدْ زَعَمْتَ أَنْ لاَ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ، وَيْلَكَ ابْنَ ادَمَ مَا أَغْدَرَكَ! فَلاَ يَزَالُ يَدْعُو، فَيَقُولُ: لَعَلِّي إِنْ أَعْطَيْتُكَ ذلِكَ تَسْأَلُنِي غَيْرَهُ، فَيَقُولُ: لاَ، وَعِزَّتِكَ! لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهُ، فَيُعْطِي اللهَ مِنْ عُهُودٍ وَمَوَاثِيقَ أَنْ لاَ يَسْأَلَهُ غَيْرَهُ، فَيُقَرِّبُهُ إِلَى بَابِ الجَنَّةِ، فَإِذَا رَأَى ما فِيهَا سَكَتَ ما شَاءَ اللهُ أَنْ يَسْكُتَ. ثُمَّ يَقُولُ: رَبِّ أَدْخِلْنِي الجَنَّةَ، ثُمَّ يَقُولُ: أَوَلَيْسَ قَدْ زَعَمْتَ أَنْ لاَ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ، وَيْلَكَ يَا ابْنَ آدَمَ! ما أَغْدَرَكَ!

فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! لاَ تَجْعَلْنِي أَشْقَى خَلْقِكَ، فَلاَ يَزَالُ يَدْعُو حَتَّى يَضْحَكَ، فَإِذَا ضَحِكَ مِنْهُ أَذِنَ لَهُ بِالدُّخُولِ فِيهَا، فَإِذَا دَخَلَ فِيهَا قِيلَ: تَمَنَّ مِنْ كَذَا، فَيَتَمَنَّى، ثُمَّ يُقَالُ لَهُ: تَمَنَّ مِنْ كَذَا، فَيَتَمَنَّى، حَتَّى تَنْقَطِعَ بِهِ الأَمانِيُّ، فَيَقُولُ لَهُ: هذَا لَكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ).

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَذلِكَ الرَّجُل آخِرُ أَهْلِ الجَنَّةِ دُخُولاً.

قَالَ عطاء: وأَبُو سَعِيدٍ الخُدْرِيُّ جالِسٌ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ لاَ يُغَيِّرُ عَلَيْهِ شَيْئاً مِنْ حَدِيثِهِ، حتَّى انتهى إلى قَوْلِهِ: (هذَا لَكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ). قالَ أَبُو سَعِيدٍ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (هذَا لَكَ وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ). قالَ أَبُو هُرَيْرَةَ حَفِظْتُ: (مِثْلُهُ مَعَهُ). [خ٦٥٧٣، ٦٥٧٤ (٨٠٦)/ م١٨٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: خەڵکانێك وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا لە ڕۆژی قیامەت پەروەردگارمان دەبینین؟ فەرمووی: **(ئایا ناکۆکی و کێبەرکێتان هەیە لە خۆر**[1] **هەور داینەپۆشیبێت؟)**، وتیان نەخێر، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: **(ئایا ناکۆکی و کێبەرکێتان هەیە لە مانگی چواردە هەور داینەپۆشی بێت)**، وتیان: نەخێر، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: **(ئێوە لە ڕۆژی قیامەت بەو جۆرە دەیبینن**[2] **، خودا خەڵکی کۆدەکاتەوە و دەفەرموێت: هەر کەس هەر شتێکی پەرستووە با شوێنی بکەوێت، ئەو کەسەی خۆری پەرستبێت شوێنی دەکەوێت، ئەو کەسەی مانگی پەرستبێت شوێنی دەکەوێت، ئەو کەسەی تاغووتەکانی پەرستبێت شوێنیان دەکەوێت، ئەم ئومەتە دەمێنێتەوە و دووڕووەکانیشی لەناودان، خودا لە شێوەیەکی تر جیا لەو شێوەی ئەوان دەیزانن دێت بۆ لایان**[3] **و دەفەرموێت: من پەروەردگاری ئێوەم، ئەوانیش دەڵێن: پەنا دەگرین بە خودا لە تۆ، ئەمە شوێن و جێمانە تا پەروەردگارمان دێت بۆ لامان، گەر پەروەردگارمان هات بۆ لامان دەیناسینەوە، خودا لەو شێوەی ئەوان دەیناسن دێت بۆ لایان و دەفەرموێت: من پەروەردگاری ئێوەم، ئەوانیش دەڵێن: تۆ پەروەردگاری ئێمەی، بۆیە شوێنی دەکەون، پردی دۆزەخ رادەخرێت**[4]**)**.

پێغەمبەری خودا فەرمووی: **(من یەکەمین کەسم لەسەری دەپەڕێمەوە، دوعای پێغەمبەران لەو ڕۆژەدا: خودایە، سەلامەت بکە، سەلامەت بکە، قولاپی پێوەیە وەك دڕکی پەیکوڵ، دڕکی پەیکوڵتان نەبینیوە؟)**، وتیان: با، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: **(ئەوانە وەك دڕکی پەیکوڵ وان، جگە لەوەی بڕی گەورەییەکەیان تەنها خودا دەیزانێت، خەڵکی بە کاروکردەوەکانیان پڕ دەدەن، هەیانە بە کارەکەی تیاچووە،**

---

[1] لە خۆر: واتە: لە بوونی خۆر–و

[2] بەو جۆرە دەیبینن: واتە: بەو جۆرە و بێ شك و گومان خودا دەبینن–و

[3] ئەو شێوە جیاوازە ئەوەیە دووڕوان خوایان پێ ناسیوە، بەڵام باوەڕداران بەو جۆرە خودایان نەناسیوە، بۆیە دواجار خودا بە شێوە دێت بۆ لایان ناسیویانە–و

[4] واتە: پردی سیرات بەسەر دۆزەخدا رادەخرێت.

هەیانە دەگەوزێ و پاشان ڕزگاری دەبێ، تا خودا لە بڕیاردانی نێوان بەندەکان دەبێتەوە و دەیەوێت ئەوانەی لە ئاگردان دەریهێنێت، ئەوانەی شایەتیان داوە "لا إله إلا الله"، فەرمان بە فریشتەکان دەکات دەریانبهێنن، ئەوانیش بە نیشانەی ئاساری سوژدە دەیانناسنەوە، خودا لە ئاگری حەرام کردووە ئەسەری سوژدەی ئادەمیزاد بسوتێنێ، دەریاندەهێنن و ئەوان سوتاون، ئاو دەکەن بەسەریاندا، پێی دەوترێت ئاوی زیندەگی، وەك دەنکە تۆو لە لێواری سێلاو سەوز دەبنەوە.

پیاوێك دەمێنێتەوە لە ئاگردا بە ڕوودا کەوتووە، دەڵێت: پەروەردگار، بۆنی ئاگر ژەهراوی کردووم و منی تیابردووە و کڵپە و بڵێسەکەی منی سووتاندووە، ڕووم لە ئاگر وەربگێڕە، بەردەوام داوا لە خودا دەکات، خودا پێی دەفەرموێ: لەوانەیە گەر ئەو داوایەت جێبەجێ بکەم داوای شتی ترم لێ بکەی، دەڵێت: نا، بە عیززەتت، داوای شتی ترت لێ ناکەم، خودا ڕووی لە ئاگر وەردەگێڕێ، لەدوای ئەوە دەڵێت: ئەی پەروەردگار، لە دەرگای بەهەشت نزیکم بکەرەوە، خودا دەفەرموێت: بۆ مەگەر تۆ نەتوت داوای هیچ شتێکی ترت لێ ناکەم، وەیل بە حاڵت ئەی ئادەمیزاد، چەند بە غەدری! بەردەوام داوا دەکات، خودا دەفەرموێ: لەوانەیە گەر داواکەت جێبەجێ بکەم داوای شتی ترم لێ بکەی، دەڵێت: نا، بە عیززەتت، داوای شتی ترت لێ ناکەم، پەیمان و بەڵێن دەدات بە خودا داوای هیچ شتێکی تری لێ نەکات، خودا ئەو لە دەرگای بەهەشت نزیك دەکاتەوە، کاتێك دەبینێ چی لە بەهەشتدایە، چەندە خودا بخوازێت ئەو بێدەنگ دەبێت، پاشان دەڵێ: پەروەردگار، بمخە ناو بەهەشتەوە، پاشان خودا پێی دەفەرموێ: بۆ مەگەر تۆ نەتوت داوای هیچ شتێکی ترت لێ ناکەم، وەیل بە حاڵت، ئەی ئادەمیزاد چەند بە غەدری!

ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگار، من مەکە بە بەدبەخترین دروستکراوت، بەردەوام داوا دەکات تا خودا پێدەکەنێ، کاتێك پێی پێ دەکەنێ مۆڵەتی چوونە ناو بەهەشتی دەدات، کاتێك دەچێتە ژوورەوە دەوترێت: ئاوات بخوازە بۆ ئەوە، ئەویش ئاوات دەخوازێت، پاشان پێی دەوترێت: ئاوات بخوازە بۆ ئەوە، ئەویش ئاوات دەخوازێت، تا هەموو ئاواتەکانی دێنەدی، پێی دەفەرموێت: ئەمە بۆ تۆ و ئەوەندەی تریش لەگەڵی).

ئەبو هورەیرە وتی: ئەو پیاوە دوایین کەسە دەچێتە ناو بەهەشتەوە.

عەتا دەڵێت: ئەبو سەعیدی خودری لەگەڵ ئەبو هورەیرە دانیشتبوو شتێك لە فەرموودەکەی لە گێڕانەوەکەی ئەبی هورەیرە نەگۆڕی، تا گەیشتە ئەو بەشەی فەرموودەکەی پێغەمبەر: (**ئەمە بۆ تۆ و ئەوەندەی تریش لەگەڵی**)، ئەبو سەعید وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو فەرمووی: (**ئەمە بۆ تۆ و دە ئەوەندەی تریش لەگەڵی**)، ئەبو هورەیرە وتی: من ئاوام لەبەرکردووە (**ئەوەندەی تریش لەگەڵی**).

- ولفظ مسلم -وهو رواية عند البخاري-: (**فَيُضْرَبُ الصِّراطُ بين ظَهرانَيْ جهنَّم، فأكونُ أنا وأمتي أولَ مَنْ يُجِيزُ، ولا يتكلمُ يومئذٍ إلا الرُّسُلُ ودعوى الرسل يومئذٍ: اللّهم! سلِّمْ سَلِّم..**). [خ٨٠٦]

گوزارشتەکەی موسلیم-کە لای بوخاری ریوایەتێکە-: (**پردی سیرات بەسەر دوو بەرو پشتی دۆزەخدا رادەکێشرێت، من و ئومەتەکەم یەکەمینین لە پەڕینەوە، لەو رۆژەدا تەنها پێغەمبەران قسە دەکەن و دوعای پێغەمبەران لەو رۆژەدا: خودایە، سەلامەت بکە، خودایە سەلامەت بکە..**).

**١٨٥**- عن أَنَسٍ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَشْفَعَ لِي يَوْمَ القِيَامَةِ، فَقَالَ: (**أَنَا فَاعِلٌ**)، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! فَأَيْنَ أَطْلُبُكَ؟ قَالَ: (**اطْلُبْنِي أَوَّلَ مَا تَطْلُبُنِي عَلَى الصِّرَاطِ**)، قَالَ: قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَلقَكَ عَلَى الصِّرَاطِ؟ قَالَ: (**فَاطْلُبْنِي عِنْدَ المِيزَانِ**)، قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَلقَكَ عِنْدَ المِيزَانِ؟ قَالَ: (**فَاطْلُبْنِي عِنْدَ الحَوْضِ، فَإِنِّي لاَ أُخْطِئُ هَذِهِ الثَّلاَثَ المَوَاطِنَ**). [ت٢٤٣٣]

* صحيح.

لە ئەنەسەوە، وتی: داوام لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد لە رۆژی قیامەت شفاعەتم بۆ بکات، فەرمووی: (**ئەو کارە دەکەم**)، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، لە کوێ لەدووت بگەڕێم، فەرمووی: (**یەکەمجار لەسەر پردی سیرات لەدووم بگەڕێ**)، دەڵێ: وتم: ئەی ئەگەر لەسەر سیرات بە تۆ نەگەیشتم؟ فەرمووی: (**لای ترازووەکە لەدووم بگەڕێ**)، وتم: ئەی ئەگەر لای ترازووەکە بە تۆ نەگەیشتم؟ فەرمووی: (**لای حەوزەکە لەدووم بگەڕێ، من لەم سێ شوێنە دەبینرێمەوە**).

**١٨٦**– عن أبي سَعِيدٍ قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يُوضَعُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ جَهَنَّمَ، عَلَى حَسَكٍ كَحَسَكِ السَّعْدَانِ، ثُمَّ يَسْتَجِيزُ النَّاسُ، فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ، وَمَخْدُوجٌ بِهِ، ثُمَّ نَاجٍ، وَمُحْتَبَسٌ بِهِ، وَمَنْكُوسٌ فِيهَا**). [جه٤٢٨٠]

* صحيح.

**لە ئەبی سەعیدەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (سیرات بەسەر دوو بەر و پشتی دۆزەخدا رادەخرێت، لەسەر قولاپ وەك درکی پەیکوڵ، پاشان خەڵکی بەسەریدا دەپەڕنەوە، هەیانە رزگاری دەبێت و سەلامەت بووە، هەیانە بەو قولاپانە گۆشتی لێ دەبێتەوە، پاشان رزگاری دەبێت، هەشیانە پێیانەوە بەند دەبێت و بەسەردا(سەرەوژێر) بۆ ناو ئاگر بەردەبێتەوە).**

**١٨٧**– عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: إِنَّ خَلِيلِي صلّى الله عليه وسلّم عَهِدَ إِلَيَّ أَنَّ دُونَ جِسْرِ جَهَنَّمَ طَرِيقاً ذَا دَحْضٍ وَمَزِلَّةٍ، وَإِنَّا نَأْتِي عَلَيْهِ وَفِي أَحْمَالِنَا اقْتِدَارٌ. وفي لفظ: وَفِي أَحْمَالِنَا اضْطِمارٌ. أَحْرَى أَنْ نَنْجُوَ عَنْ أَنْ نَأْتِيَ عَلَيْهِ وَنَحْنُ مَوَاقِيرُ. [حم٢١٤١٦]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**لە ئەبی زەڕەوە، وتی: خۆشەویستم وەسێتی بۆ کردم: لەسەر پردی دۆزەخ رێگەیەکی هەڵدێر و خلیسك هەیە، گەر ئێمە بێین بۆ سەری و کۆڵەکانمان مامناوەند بێت–لە گوزارەیەکی تردا: کۆڵەکانمان سووك بێت– ئەگەری رزگاربوونمان زۆرترە تا بە کۆڵێکەوە بێین و نقابین[1].**

**١٨٨**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿**يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ**﴾[الحديد:١٢]، قَالَ: يُؤْتَوْنَ نُورَهُمْ عَلَى قَدْرِ أَعْمَالِهِمْ، مِنْهُمْ مَنْ نُورُهُ مِثْلُ الْجَبَلِ، وأَدْنَاهُمْ نُوراً مَنْ نُورُه عَلى إِبْهَامِهِ، يَطْفَأُ مَرَّةً وَيَتَّقِدُ أُخْرَى. [ك٣٧٨٥]

* قال الذهبي: على شرط البخاري.

---

(1) نقابین: واتە قورس بووبین–و.

لـە عەبـدوڵای كـوڕی مەسـعوودەوە(خوا لێـی ڕازی بێـت) دەربـارەی فـەرموودەی خودا(ﷻ): ﴿يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ﴾ [الحديد:١٢]، وتـی: بـەپێی بـڕی كـارە چاكەكانیان نووریان پێ دەدرێت، هەیانـە نوورەكـەی وەك چیایەكە، كـەمترین نـوور نووری كەسێكە لەسەر پەنجەیەتی، جارێك دەكوژێتەوە و جارێك پێدەبێتەوە.

## ١٣- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی حەوزەكە هاتووە

١٨٩- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قال: قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (حَوْضِي مَسِيرَةُ شَهْرٍ، ماؤُهُ أَبْيَضُ مِنَ اللَّبَنِ، وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ المِسْكِ، وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهَا فَلاَ يَظْمَأُ أَبَداً). [خ٦٥٧٩/ م٢٢٩٢]

(ق) لـە عەبـدوڵای كـوڕی عـەمرەوە، وتــی: پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: **(بـەرینی حەوزەكەم مانگە ڕێیەكە، ئاوەكەی لە شیر سپیترە، بۆنەكەی لە میسك خۆشترە، جامی ئاوخواردنەوەكانی وەك ئەستێرەكانی ئاسمانن، هەر كـەس لێـی بخواتـەوە هەرگیز تینووی نابێت).**

١٩٠- (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنِّي عَلَى الحَوْضِ حَتَّى أَنْظُرَ مَنْ يَرِدُ عَلَيَّ مِنْكُمْ، وَسَيُؤْخَذُ نَاسٌ دُونِي، فَأَقُولُ: يَا رَبِّ مِنِّي وَمِنْ أُمَّتِي، فَيُقَالُ: هَلْ شَعَرْتَ ما عَمِلُوا بَعْدَكَ؟ واللهِ ما بَرِحُوا يَرْجِعُونَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ). [خ٦٥٩٣/ م٢٢٩٣]

(ق) لە ئەسمای كچی ئەبی بەكرەوە(خوایان لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(من لەسەر حەوزەكەم تا چاوەڕوان بم كێ لە ئێوە دێت بۆ لام، خەڵكانێك لە من دادەبڕێنرێن، منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگار، ئەوانە لە من و لە ئومەتی منن، دەوترێت: دەزانی دوای تۆ ئەوانە چییان كرد؟ سوێند بە خودا ئێوارەیان بەسەردا نەهات پاشگەزبوونەوە).**

**١٩١**– (م) عَنْ عائشة قَالتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ، وَهُوَ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ أَصْحَابِهِ: **(إِنِّي عَلَى الحَوْضِ أَنْتَظِرُ مَنْ يَرِدُ عَلَيَّ مِنْكُمْ، فَوَاللهِ لَيُقْتَطَعَنَّ دُونِي رِجَالٌ، فَلأَقُولَنَّ: أَيْ رَبِّ مِنِّي وَمِنْ أُمَّتِي، فَيَقُولُ: إِنَّكَ لاَ تَدْرِي مَا عَمِلُوا بَعْدَكَ، مَا زَالُوا يَرْجِعُونَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ)**. [م٢٢٩٤]

(م) لە عائیشەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو–کە لە ناو هاوەڵانیدا بوو– دەیفەرموو: **(من لەسەر حەوزەکەم، چاوەڕوان کێ لە ئێوە دێت بۆ لام، سوێند بە خودا پیاوانێك لە من دادەبڕێنرێن، منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگار، ئەوانە لە من و لە ئوممەتی منن، دەفەرموێت: تۆ نازانی ئەمانە لەدوای تۆ چییان کرد، بەردەوام پاشگەزدەبوونەوە)**.

**١٩٢**– (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا آنِيَةُ الحَوْضِ؟ قَالَ: **(وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لآنِيَتُهُ أَكْثَرُ مِنْ عَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ وَكَوَاكِبِهَا؛ أَلاَ فِي اللَّيْلَةِ المُظْلِمَةِ المُصْحِيَةِ، آنِيَةُ الجَنَّةِ مَنْ شَرِبَ مِنْهَا لَمْ يَظْمَأْ آخِرَ مَا عَلَيْهِ، يَشْخُبُ فِيهِ مِيزَابَانِ مِنَ الجَنَّةِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهُ لَمْ يَظْمَأْ، عَرْضُهُ مِثْلُ طُولِهِ، مَا بَيْنَ عَمَّانَ إِلَى أَيْلَةَ، مَاؤُهُ أَشَدُّ بَيَاضاً مِنَ اللَّبَنِ، وَأَحْلَى مِنَ العَسَلِ)**. [م٢٣٠٠]

(م) لە ئەبی زەڕەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، کوپ و دەفری حەوزەکە چییە و چۆنە؟ فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی محەمەدی بەدەستە، دەفر و کوپەکانی لە هەسارە و ئەستێرەکانی ئاسمان زۆرترن، دەزانی شەوێکی تاریکی بێ هەور ئەستێرەکانی وەك دەفرەکانی بەهەشتن، هەر کەس لێی بخواتەوە بۆ هەتاهەتا تینوی نابێت، دوو پلوسك لە بەهەشتەوە دەڕژێنە ناوی، هەرکەس لێیان بخواتەوە تینووی نابێت، پانتاییەکەی وەك درێژییەکەی وایە، لە نێوان عەممان بۆ ئەیله[1]، ئاوەکەی لە شیر سپیتر و لە هەنگوین شیرینترە)**.

---

[1] لە ئێستادا (أيلة) بریتییە لە شاری عەقەبە.

## ١٤- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی "العَرْض" هاتووە

١٩٣- عَنْ أَبِي مُوسَى الأشعَرِيِّ قالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يُعرَضُ النَّاسُ يومَ القيامةِ ثلاثَ عرضاتٍ: فأمَّا عَرضتانِ، فجدالٌ، ومعاذيرُ، وأمَّا العَرضَةُ الثَّالثةُ، فعندَ ذلِكَ تطيرُ الصُّحفُ في الأيدي، فآخِذٌ بيَمينِهِ، وآخذٌ بشِمالِهِ) [ت٢٤٢٥م/ جه٤٢٧٧]

* ضعيف

[وانظر: ٩٧٨].

**لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە ڕۆژی قیامەت خەڵکی بە سێ خستنەڕوو(عرض) دەخرێنە ڕوو: دوو خستنەڕوویان بریتییە لە "موجادەلە" و "پاساو بیانوو"، خستنەڕووی سێیەم، لەوبارەدا لاپەڕەکان دەفڕن بۆ ناو دەستەکان، هەیانە بە دەستی ڕاست دەیگرێت و هەشیانە بە دەستی چەپ).**

## ١٥- دەروازەی: ترازوو و باسی بیتاقەکە

١٩٤- عن عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ اللهَ سَيُخَلِّصُ رَجُلاً مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُؤوسِ الخَلاَئِقِ يَوْمَ القِيَامَةِ، فَيَنْشُرُ عَلَيْهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ سِجِلاً، كُلُّ سِجِلٍّ مِثْلُ مَدِّ البَصَرِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئاً؟ أَظَلَمَكَ كَتَبَتِي الحَافِظُونَ؟ فَيَقُولُ: لاَ، يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: أَفَلَكَ عُذْرٌ؟ فَيَقُولُ: لاَ، يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: بَلَى، إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَةً، فَإِنَّهُ لاَ ظُلْمَ عَلَيْكَ اليَوْمَ، فَتَخْرُجُ بِطَاقَةٌ فِيهَا: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فَيَقُولُ: احْضُرْ وَزْنَكَ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! مَا هَذِهِ البِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلاَّتِ؟ فَقَالَ: إِنَّكَ لاَ تُظْلَمُ، قَالَ: فَتُوضَعُ السِّجِلاَّتُ فِي كَفَّةٍ وَالبِطَاقَةُ فِي كَفَّةٍ، فَطَاشَتِ السِّجِلاَّتُ وَثَقُلَتِ البِطَاقَةُ، فَلاَ يَثْقُلُ مَعَ اسْمِ اللهِ شَيْءٌ). [ت٢٦٣٩/ جه٤٣٠٠]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە ڕۆژی قیامەت خودا پیاوێك لە ئومەتەکەم لەسەر سەری هەموو دروستکراوان ڕزگار دەکات کە نەوەد و نۆ تۆماری[1] بەسەردا کراونەتەوە، هەر تۆمارێك تا چاو هانابکات، پاشان**

---

[1] تۆمار: سِجِل-و.

**دەفەرموێت: ئایا شتێك لەمانە نەریٚ دەكەی؟ ئایا نووسەرانی تۆماركردن ستەمیان لە تۆ كردووە؟ دەڵێت: نەخێر، ئەی پەروەردگار، دەفەرموێت: ئایا پاساو و بیانوویەكت هەیە؟ دەڵێت: نەخێر، دەفەرموێت: با، تۆ چاكەیەكت لای ئێمە هەیە، چونكە ئەمڕۆ ستەم لەسەر تۆ نییە، بیتاقەیەك دێتە دەرەوە تیایدا نووسراوە: "أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله")، دەفەرموێت: كێشانەی خۆت ئامادە بكە، دەڵێت: ئەی پەروەردگار، ئەم بیتاقەیە چییە بەرانبەر ئەم هەموو تۆمارە؟ فەرمووی: تۆ ستەمت لیٚ ناكرێت، پێغەمبەر فەرمووی: تۆمارەكان لە تایەكی ترازووەكەدا دادەنرێن و بیتاقەكە لە تایەكی تر، تۆمارەكان دەچن بە ئاسماندا و بیتاقەكە قورس دەبێت، لەگەڵ ناوی خودا هیچ شتێك قورس نابێت).**

## ١٦- دەروازەی: یەكەمین ئومەتێك حسابی لەگەڵ دەكرێت

١٩٥– عَن ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (نَحْنُ آخِرُ الْأُمَمِ، وَأَوَّلُ مَنْ يُحَاسَبُ، يُقَالُ: أَيْنَ الْأُمَّةُ الْأُمِّيَّةُ وَنَبِيُّهَا؟ فَنَحْنُ الْآخِرُونَ الْأَوَّلُونَ).　　　[جه٤٢٩٠]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ئێمە دواین ئومەتین و یەكەمینین حسابمان لەگەڵ دەكرێت، دەوترێت: ئومەتە ئومییەكە و پێغەمبەرەكەی لە كوێن؟ ئێمە پاشینی[1] پێشەنگین).**

## ١٧- دەروازەی: ئەهلی فەترە

١٩٦– عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ سَرِيعٍ؛ أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (أَرْبَعَةٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: رَجُلٌ أَصَمُّ لاَ يَسْمَعُ شَيْئاً، وَرَجُلٌ أَحْمَقُ، وَرَجُلٌ هَرِمٌ، وَرَجُلٌ مَاتَ فِي فَتْرَةٍ، فَأَمَّا الْأَصَمُّ فَيَقُولُ: رَبِّ! لَقَدْ جَاءَ الْإِسْلاَمُ وَمَا أَسْمَعُ شَيْئاً، وَأَمَّا الْأَحْمَقُ فَيَقُولُ: رَبِّ! لَقَدْ جَاءَ الْإِسْلاَمُ وَالصِّبْيَانُ

[1] پاشین: دواین(الآخرون)–و.

يَحْذِفُونِي بِالبَعْرِ، وَأَمَّا الهَرِمُ فَيَقُولُ: رَبِّي! لَقَدْ جَاءَ الْإِسْلاَمُ وَمَا أَعْقِلُ شَيْئاً، وَأَمَّا الَّذِي مَاتَ فِي الفَتْرَةِ فَيَقُولُ: رَبِّ مَا أَتَانِي لَكَ رَسُولٌ، فَيَأْخُذُ مَوَاثِيقَهُمْ لَيُطِيعُنَّهُ، فَيُرْسِلُ إِلَيْهِمْ أَنِ ادْخُلُوا النَّارَ. قَالَ: فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْ دَخَلُوهَا لَكَانَتْ عَلَيْهِمْ بَرْداً وَسَلاَماً). [حم١٦٣٠١]

* حديث حسن، وإسناده ضعيف.

لە ئەسوەدی کوڕی سەریعەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(چوار کەس لە ڕۆژی قیامەت: پیاوێکی کەڕ کە هیچ نابیستێ، و پیاوێکی گەمژە، و پیاوێکی پیر، و پیاوێك لە فەترەدا مردبێت، کەڕەکە دەڵێت: پەروەردگار، ئیسلام هات و من هیچم نەدەبیست، گەمژەکە دەڵێت: پەروەردگار، ئیسلام هات و منداڵان پیسی ئاژەڵانیان[1] تێدەگرتم، پیرەکەش دەڵێت: پەروەردگار، ئیسلام هات و من شتێکم نەدەزانەوت، ئەو کەسەش لە فەترەدا مردووە دەڵێت: پەروەردگار، لە تۆوە بۆ لای من پێغەمبەرێك نەهات، تا پەیمانیان لێ وەربگیرێت گوێڕایەڵی بن، بۆیان ڕەوانە دەکرێت بچنە ناو ئاگرەوە، سوێند بەو کەسەی نەفسی محەمەدی بەدەستە گەر بچنە ناو ئاگرەوە لەسەر ئەوان فێنکی و سەلامەتییە).**

---

[1] پیسی ئاژەڵان: پشقل و سەنێر-و.

## بەشی سێیەم

## فەرمووده دەربارەی بەهەشت و ئاگر

### ١- دەروازەی: بەهەشت بە ناڕەحەتی و ناخۆشی داپۆشراوە(دەورەدراوە)

**١٩٧-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(حُجِبَتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ، وَحُجِبَتِ الجَنَّةُ بِالمكارِهِ)**.. [خ٦٤٨٧، م٢٨٢٣]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئاگر بە حەزەکان داپۆشراوە، و بەهەشتیش بە ناخۆشییەکان داپۆشراوە)**.

**١٩٨-** (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(حُفَّتِ الجَنَّةُ بِالمكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ)**. [م٢٨٢٢]

(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، فەرمووی: **(بەهەشت بە ناخۆشی دەورە دراوە، ئاگریش بە حەزەکان دەورە دراوە)**.

**١٩٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لَمَّا خَلَقَ اللهُ الجَنَّةَ وَالنَّارَ، أَرْسَلَ جِبْرِيلَ إِلَى الجَنَّةِ، فَقَالَ: انْظُرْ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعْدَدْتُ لِأَهْلِهَا فِيهَا، قَالَ: فَجَاءَهَا وَنَظَرَ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعَدَّ اللهُ لِأَهْلِهَا فِيهَا، قَالَ: فَرَجَعَ إِلَيْهِ، قَالَ: فَوَعِزَّتِكَ لاَ يَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ إِلاَّ دَخَلَهَا، فَأَمَرَ بِهَا فَحُفَّتْ بِالمكَارِهِ، فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهَا، فَانْظُرْ إِلَى مَا أَعْدَدْتُ لِأَهْلِهَا فِيهَا، قَالَ: فَرَجَعَ إِلَيْهَا، فَإِذَا هِيَ قَدْ حُفَّتْ بِالمكَارِهِ، فَرَجَعَ إِلَيْهِ فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لَقَدْ خِفْتُ أَنْ لاَ يَدْخُلَهَا أَحَدٌ.**

**قَالَ: اذْهَبْ إِلَى النَّارِ، فَانْظُرْ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعْدَدْتُ لِأَهْلِهَا فِيهَا، فَإِذَا هِيَ يَرْكَبُ بَعْضُهَا بَعْضاً، فَرَجَعَ إِلَيْهِ فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لاَ يَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ فَيَدْخُلَهَا، فَأَمَرَ بِهَا فَحُفَّتْ بِالشَّهَوَاتِ، فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهَا فَرَجَعَ إِلَيْهَا فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ لاَ يَنْجُوَ مِنْهَا أَحَدٌ إِلاَّ دَخَلَهَا)**. اللفظ للترمذي. [د٤٧٤٤/ ت٢٥٦٠/ ن٣٧٧٢]

* حسن صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە، فەرمووی: (کاتێك خودا بەهەشت و ئاگری دروست کرد، جیبریلی ڕەوانەی لای بەهەشت کرد، فەرمووی: بەهەشت و ئەوەی تیایدا ئامادەم کردووە بۆ ئەهلی بەهەشت تەماشا بکە، فەرمووی: ئەویش دێت بۆ لای و بەهەشت و ئەوەی ئامادەی کردووە بۆ ئەهلی بەهەشت تەماشا دەکات، فەرمووی: دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا و دەڵێ: بە عیززەتت هەر کەس ناوی ببیستێ[1] دەچێتە ناویەوە، فەرمان دەکات بە ناڕەحەتی و ناخۆشی دەورە دەدرێت، دەفەرموێت: بگەڕێوە بۆ لای و وردبەرەوە بزانە تیایدا چیم ئامادە کردووە بۆ ئەهلەکەی، فەرمووی: دەگەڕێتەوە بۆ لای بەهەشت، دەبینێ بە ناڕەحەتی و ناخۆشی دەورە دراوە، دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا و دەڵێت: بە عیززەتت ترسام هیچ کەس نەچێتە ناویەوە[2].

فەرمووی: بڕۆ بۆ لای ئاگر، ئاگر و ئەوەی تیایدا ئامادەم کردووە بۆ ئەهلی ئاگر تەماشا بکە، دەبینێ هەندێکی لەسەر هەندێکی ترە، دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا و دەڵێت: بە عیززەتت هەر کەس ناوی ببیستێ ناچێتە ناویەوە، فەرمان دەکات و بە حەزەکان ئابڵۆقە دەدرێ، فەرمووی: بگەڕێوە بۆ لای، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ لای، دەڵێت: بە عیززەتت ترسام هیچ کەس لێی ڕزگار نەبێت و هەموو بچنە ناویەوە).

## ٢- دەروازەی: بینینی شوێنی خۆ لە بەهەشت و لە ئاگر لەلایەن مرۆڤەوە

٢٠٠- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ يَدْخُلُ أَحَدٌ الجَنَّةَ، إِلاَّ أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ لَوْ أَسَاءَ، لِيَزْدَادَ شُكْراً، وَلاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ، إِلاَّ أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنَ الجَنَّةِ لَوْ أَحْسَنَ، لِيَكُونَ عَلَيْهِ حَسْرَةً). [خ٦٥٦٩]

---

[1] واتە: هەرکەس ناوی بەهەشت ببیستێ کاری بۆ دەکات و دەچێتە ناویەوە –و.

[2] واتە: بۆ گەیشتن بە بەهەشت دەبێ ئەو ناخۆشییانە ببڕێت، ئەوەش ماندووبوون و شەکەتی و ئازاری تێدایە –و.

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هیچ کەس ناچێتە ناو بەهەشتەوە تا شوێنی خۆی لە ئاگر پێ نیشان دەدرێت گەر خراپەی کردبێت، بۆئەوەی شوکر زیاد بکات، هەروەها هیچ کەس ناچێتە ناو ئاگرەوە تا شوێنی خۆی لە بەهەشت پێ نیشان دەدرێت گەر چاکەی کردبێت، بۆئەوەی ببێتە حەسرەت لەسەری)**.

## ٣- دەروازەی: نزیکی بەهەشت و ئاگر

**٢٠١-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعود ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(الجَنَّةُ أَقْرَبُ إِلَى أَحَدِكُمْ مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ، وَالنَّارُ مِثْلُ ذلِكَ)**. [خ٦٤٨٨]

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(بەهەشت نزیکترە لە بەشی سەرەوەی نەعلی یەکێك لە ئێوە، ئاگریش بەهەمان شێوە)**.

**٢٠٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَا رَأَيْتُ مِثْلَ النَّارِ نَامَ هَارِبُهَا، وَلاَ مِثْلَ الجَنَّةِ نَامَ طَالِبُهَا)**. [ت٢٦٠١]

* حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(نموونەی ئاگرم نەبینیوە هەڵهاتوو لێی خەوتبێت، نموونەی بەهەشتم نەبینیوە داواکار بۆی خەوتبێت)**.

## ٤- دەروازەی: بەهەشت و ئاگر کەوتنە موجادەلە

**٢٠٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(تَحَاجَّتِ الجَنَّةُ وَالنَّارُ، فَقَالَتِ النَّارُ: أُوثِرْتُ بِالمُتَكَبِّرِينَ وَالمُتَجَبِّرِينَ، وَقَالَتِ الجَنَّةُ: ما لِي لاَ يَدْخُلُنِي إِلاَّ ضُعَفَاءُ النّاسِ وَسَقَطُهُمْ؟ قالَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لِلْجَنَّةِ: أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ منْ عِبَادِي، وَقَالَ لِلنَّارِ: إِنَّمَا أَنْتِ عَذَابِي أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي، وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا مِلْؤُهَا، فَأَمَّا النَّارُ: فَلاَ تَمْتَلِئُ**

حَتَّى يَضَعَ رِجْلَهُ فَتَقُولُ: قَطِ قَطِ قَطِ، فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، وَلاَ يَظْلِمُ اللهُ مِنْ خَلْقِهِ أَحَداً، وَأَمَّا الجَنَّةُ: فَإِنَّ اللهَ عزّ وجل يُنْشِئُ لَهَا خَلْقاً). [خ٤٨٥٠ (٤٨٤٩)/ م٢٨٤٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(بەهەشت و ئاگر کەوتنە موجادەلە، ئاگر وتی: تایبەتکراوم بە خۆبەزلزانان و ملهوڕان، بەهەشت وتی: چیمە، تەنها لاوازان و پەراوێزخراوان دێنە ناومەوە؟ خودا(تبارك وتعالى) بە بەهەشتی فەرموو: تۆ ڕەحمەتی منی و بە تۆ ڕەحم بە هەر کەس دەکەم لە بەندەکانم بمەوێ، بە ئاگری فەرموو: تۆ سزای منی، بە تۆ سزای هەر کەس دەدەم لە بەندەکانم بخوازم، بۆ هەریەك لەو دوانە پڕبوون هەیە، ئاگر: پڕ نابێت تا لاقی خۆی تێدەخات، ئەوکات ئاگر دەڵێ: بەسمە، بەسمە، بەسمە، لەویادا پڕ دەبێت و هەندێکی دەچێتەوە سەر هەندێکی تری[1]، خودا ستەم لە هیچ کام لە دروستکراوانی ناکات، بەهەشتیش: خودا(ﷻ) دروستکراوی بۆ بەدیدەهێنێت).**

## ٥- دەروازەی: زۆرینەی ئەهلی بەهەشت و زۆرینەی ئەهلی ئاگر

**٢٠٤-** (ق) عَنْ أُسَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (قُمْتُ عَلَى بَابِ الجَنَّةِ، فَكَانَ عامَّةَ مَنْ دَخَلَهَا المَسَاكِينُ، وَأَصْحَابُ الجَدِّ مَحْبُوسُونَ، غَيْرَ أَنَّ أَصْحَابَ النَّارِ قَدْ أُمِرَ بِهِمْ إِلَى النَّارِ، وَقُمْتُ عَلَى بَابِ النَّارِ فَإِذَا عامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا النِّسَاءُ). [خ٥١٩٦/ م٢٧٣٦]

(ق) لە ئوسامەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(لە بەردەم دەرگای بەهەشت وەستام، زۆرینەی ئەوانەی دەچنە ناو بەهەشت هەژارانن، خاوەن پلە و پایەکان بەندکراون، وەلێ هاوەڵانی ئاگر فەرمانیان پێکراوە بۆ ناو ئاگر، لە بەردەم دەرگای ئاگر وەستام بینیم زۆرینەی ئەوانی دەچنە ناویەوە ئافرەتانن).**

**٢٠٥-** (خ) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (اطَّلَعْتُ فِي الجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الفُقَرَاءَ، وَاطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ). [خ٣٢٤١]

---

[1] دێتەوەیەك و کۆ دەبێتەوە و لەسەر ئەوانەی تیایدان یەکانگیر دەبێت و لەیەکدەداتەوە.

(خ) لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە، لـە پێغەمبـەرەوە(ﷺ) فـەرمووی: تەماشـای بەهەشتم کرد بینیم زۆرینەی ئەهلەکەی هەژارانن، تەماشای ئاگرم کرد بینیم زۆرینەی ئەهلەکەی ئافرەتانن.

٢٠٦- (م) عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ المجَاشِعِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ ذَاتَ يَوْمٍ فِي خُطْبَتِهِ: (أَلاَ إِنَّ رَبِّي أَمَرَنِي أَنْ أُعَلِّمَكُمْ مَا جَهِلْتُمْ مِمَّا عَلَّمَنِي يَوْمِي هَذَا، كُلُّ مَالٍ نَحَلْتُهُ عَبْداً حَلاَلٌ، وَإِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ، وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ، وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ مَا أَحْلَلْتُ لَهُمْ، وَأَمَرَتْهُمْ أَنْ يُشْرِكُوا بِي مَا لَمْ أُنْزِلْ بِهِ سُلْطَاناً. وَإِنَّ اللهَ نَظَرَ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ فَمَقَتَهُمْ، عَرَبَهُمْ وَعَجَمَهُمْ؛ إِلاَّ بَقَايَا مِنْ أَهْلِ الكِتَابِ.

وقَالَ: إِنَّمَا بَعَثْتُكَ لأَبْتَلِيَكَ وَأَبْتَلِيَ بِكَ، وَأَنْزَلْتُ عَلَيْكَ كِتَاباً لاَ يَغْسِلُهُ المَاءُ، تَقْرَؤُهُ نَائِماً وَيَقْظَانَ. وَإِنَّ اللهَ أَمَرَنِي أَنْ أُحَرِّقَ قُرَيْشاً، فَقُلْتُ: رَبِّ! إِذاً يَثْلَغُوا رَأْسِي فَيَدَعُوهُ خُبْزَةً. قَالَ: اسْتَخْرِجْهُمْ كَمَا اسْتَخْرَجُوكَ، وَاغْزُهُمْ نُغْزِكَ، وَأَنْفِقْ فَسَنُنْفِقُ عَلَيْكَ، وَابْعَثْ جَيْشاً نَبْعَثْ خَمْسَةً مِثْلَهُ، وَقَاتِلْ بِمَنْ أَطَاعَكَ مَنْ عَصَاكَ.

قَالَ: وَأَهْلُ الجَنَّةِ ثَلاَثَةٌ: ذو سُلْطَانٍ مُقْسِطٌ مُتَصَدِّقٌ مُوَفَّقٌ. وَرَجُلٌ رَحِيمٌ رَقِيقُ القَلْبِ لِكُلِّ ذِي قُرْبَى وَمُسْلِمٍ. وَعَفِيفٌ مُتَعَفِّفٌ ذو عِيَالٍ.

قَالَ: وَأَهْلُ النَّارِ خَمْسَةٌ: الضَّعِيفُ الَّذِي لاَ زَبْرَ لَهُ، الَّذِينَ هُمْ فِيكُمْ تَبَعاً لاَ يَتْبَعُونَ أَهْلاً وَلاَ مَالاً، وَالخَائِنُ الَّذِي لاَ يَخْفَى لَهُ طَمَعٌ، وَإِنْ دَقَّ إِلاَّ خَانَهُ، وَرَجُلٌ لاَ يُصْبِحُ وَلاَ يُمْسِي إِلاَّ وَهُوَ يُخَادِعُكَ عَنْ أَهْلِكَ وَمَالِكَ). وَذَكَرَ البُخْلَ أَوِ الكَذِبَ، (وَالشِّنْظِيرُ الفَحَّاشُ). [م٢٨٦٥]

(م) لە عیازی کوڕی حیمـاری موجاشـیعییەوە: ڕۆژێـك پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) لـە وتارەکەیدا فەرمووی: **(دەزانن پەروەردگارم فەرمانی پێ کردووم ئەوەی ئێوە نایزانن فێرتان بکەم لەوەی ئەمڕۆ فێری کردووم: هەر ماڵێکم بە بەندەیەك دابێت بۆ ئـەو حەڵاڵە، من هەموو بەندەکانم بە پاکی دروستکردووە، شەیتانەکان دێن بۆ لایان و لە دینەکەیان لایاندەدەن و ئەوەی بـۆم حـەڵاڵ کـردوون لەسـەریان حـەرام دەکـەن، فەرمانیان پێ دەکەن هاوەڵم بۆ دابنێن بە شتانێك هیچ بەڵگە و بورهانێکیان لەسەر**

دانەبەزیوە، خودا تەماشای ئەهلی زەوی کرد و ڕقـی لـێ هـەڵگرتن بـە عـەرەب و عەجەمەوە، جگە لە پاشماوەیەك لە ئەهلی کیتاب[1].

فەرمووی: من تۆم ڕەوانە کردووە بۆئەوەی تاقیتبکەمەوە و بە تۆ خەڵکانی تر تاقیبکەمەوە، کتێبێکم بۆ سەر دابەزاندووی ئاو نایشۆرێتەوە، بە خەوتووی و بـە ئاگاهایی دەیخوێنی، خودا فەرمانی پێ کردم قورەیش بسوتێنم، وتم: پەروەردگار، کەوابوو، سەرم دەهاڕن و وەك نانێکی لێ دەکەن، فەرمووی: وەدەریان بـنێ وەك چۆن تۆیان بەدەرنا، غەزویان بکە ئێمە کۆکیت دەکەین، خەرج بکە ئێمە لەسەر تۆ خەرج دەکەین، سوپایەك ڕەوانە بکە پێنج ئەوەندەی ئەو سوپا ڕەوانـە دەکـەین، بەوانەی گوێڕایەڵیت لێ دەکەن دژ بەوانە بجەنگە لێت یاخی دەبن.

فــەرمووی: ئــەهلی بەهەشــت ســیانن: خــاوەن دەســەلاتێکی دادپــەروەری صەدەقەکاری کۆمەککراو، پیاوێکی بە بەزەیی دڵ نەرم بۆ هەموو خزم و کەسوکار و موسڵمانێك، هەروەها کەسێکی پاکی خۆ بە پاکڕاگری خاوەن خێزان.

ئەهلی ئاگریش پێنجن: لاواز کە ئـەقڵێکی نییـە لـە خراپـە بیگێڕێتـەوە، ئەوانـەی شوێنکەوتەی ئێوەن و نە خانەوادە پێکدەهێنن و نە ماڵ و سامان بەدەست دەهێنن، ناپاك کە چاوتێبڕین—با ورد و بچووکیش بێت— لە ئەو شاراوە نییە و ناپاکی لێ دەکات، پیاوێکیش بەیانیان و ئێواران لە خانەوادە و ماڵ و سامانەکەت فریـوت دەدات) باسـی "دەستنوقاوی یان درۆ"یشی کرد، (هەروەها کەسێکی بەدڕەفتاری زمان پیس).

■ زاد في رواية: (وَإِنَّ اللهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا حَتَّى لاَ يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ، وَلاَ يَبْغِي أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ).

لە ریوایەتێکدا ئەمە زیاد کراوە: (خودا وەحی بۆ ڕەوانە کردم تەوازوع بنوێنن تا هیچ کەس شانازی نەکات بەسەر هیچ کەسی تردا، و هیچ کەس دەستدرێژی نەکاتە سەر هیچ کەسی تر).

---

[1] ئەمە ڕق لێبوونە بەرلە ڕەوانەکردنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووە.

## ٦- دەروازەی: دەربارەی خۆشییەکانی بەهەشت و سزای ئاگر

٢٠٧- (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يُؤْتَى بِأَنْعَمِ أَهْلِ الدُّنْيَا، مِنْ أَهْلِ النَّارِ، يَوْمَ القِيَامَةِ، فَيُصْبَغُ فِي النَّارِ صَبْغَةً، ثُمَّ يُقَالُ: يَا ابْنَ آدَمَ! هَلْ رَأَيْتَ خَيْراً قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ نَعِيمٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لاَ، وَاللهِ! يا رَبِّ! وَيُؤْتَى بِأَشَدِّ النَّاسِ بُؤْساً فِي الدُّنْيَا، مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، فَيُصْبَغُ صَبْغَةً فِي الجَنَّةِ، فَيُقَالُ لَهُ: يَا ابْنَ آدَمَ! هَلْ رَأَيْتَ بُؤْساً قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ شِدَّةٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لاَ وَاللهِ! يَا رَبِّ! مَا مَرَّ بِي بُؤْسٌ قَطُّ، وَلاَ رَأَيْتُ شِدَّةً قَطُّ). [م٢٨٠٧]

(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە ڕۆژی قیامەت خۆشگوزەرانترینی ئەهلی دنیا دەهێنرێت، ئەو لە ئەهلی ئاگرە، جارێك لە ئاگر هەڵدەژەنرێت، پاشان دەوترێت: ئەی ئادەمیزاد، ئایا هەرگیز خێرێکت بینیوە؟ هەرگیز خۆشییەك بەسەر تۆدا تێپەڕیوە؟ دەڵێت: نەخێر، سوێند بە خودا، ئەی پەروەردگار، بەدبەختترین لە خەڵکی دنیا کە ئەهلی بەهەشتە دەهێنرێت و جارێك لە بەهەشت هەڵدەژەنرێت، پێی دەوترێت: ئەی ئادەمیزاد، ئایا هەرگیز ناخۆشییەکت بینیوە؟ ئایا هەرگیز تەنگانەیەك بەسەر تۆدا تێپەڕیوە؟ دەڵێت: نەخێر، سوێند بە خودا، ئەی پەروەردگار، هەرگیز ناخۆشی بەسەرمدا تێنەپەڕیوە و هەرگیز تەنگانەم نەبینیوە).**

## ٧- دەروازەی: بانگ دەدرێت: (نەمری بەبێ مردن)

٢٠٨- (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدْرِيِّ ﷺ قالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يُؤْتَى بِالمَوْتِ كَهَيْئَةِ كَبْشٍ أَمْلَحَ، فَيُنَادِي مُنَادٍ: يَا أَهْلَ الجَنَّةِ، فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرونَ، فَيَقُولُ: هَلْ تعْرِفُونَ هَذا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، هـذَا المَوْتُ، وَكُلُّهُمْ قَدْ رَآهُ. ثُمَّ يُنَادِي: يَا أَهْلَ النَّارِ، فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ، فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هذَا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، هـذَا المَوْتُ، وَكُلُّهُمْ قَدْ رَآهُ، فَيُذْبَحُ. ثُمَّ يَقُولُ: يَا أَهْلَ الجَنَّةِ خُلُودٌ فَلاَ مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ النَّارِ خُلُودٌ فَلاَ مَوْتَ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ﴾ وهؤُلاءِ فِي غَفْلَةٍ أَهْلُ الدُّنْيَا. ﴿وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ [مريم:٣٩]).

[خ٤٧٣٠/ م٢٨٤٩]

(ق) لــە ئــەبی ســەعیدی خودرییــەوە(خوا لێــی رازی بێــت)، وتــی: پێغەمبــەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(مردن لە شێوەی بەرانێکی مارۆدا دەهێنرێت، بانگکەرێك بانگ دەکات: ئەی ئەهلی بەهەشت، ئەوانیش سەر بەرز دەکەنـەوە و تەماشـا دەکـەن، دەڵێت: ئایا دەزانن ئەمە چییە؟ دەڵێن: بـەڵێ، ئـەوە مردنە(مەرگـە)، هـەموویان بینیویانە[1]، پاشان بانگ دەکات: ئەی ئەهلی ئاگر، هەموو سەر بەرز دەکەنەوە و تەماشا دەکەن، دەڵێت: دەزانن ئەمە چییە؟ دەڵێن: بەڵێ، ئەوە مردنە، هەموویان بینیویانە، بەرانەکە سەردەبڕێت، پاشان دەڵێ: ئەی ئەهلی بەهەشت، نەمری بەبێ مردن، ئەی ئەهلی ئاگر، نەمری بەبێ مردن، پاشان پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەم ئایەتـەی خوێندەوە: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ﴾، ئەوانە ئەهلی دنیان و لە بێئاگاییەکدان، ﴿وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾** [مريم:٣٩]**)**.

## ٨- دەروازەی: بۆ هەموو مرۆڤێك دوو مەنزڵ هەن

**٢٠٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ لَهُ مَنْزِلاَنِ: مَنْزِلٌ فِي الجَنَّةِ، وَمَنْزِلٌ فِي النَّارِ، فَإِذَا مَاتَ، فَدَخَلَ النَّارَ، وَرِثَ أَهْلُ الجَنَّةِ مَنْزِلَهُ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ﴾ الآية [المؤمنون: ١٠] ). [جه ٤٣٤١]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەریەك لە ئێوە دوو مەنزڵی هەیە: مەنزڵێك لە بەهەشت و مەنزڵێك لە ئاگر، کاتێك دەمرێ و دەچێتە ناو ئاگرەوە ئەهلی بەهەشت مەنزڵەکەی بـە مـیرات دەگـرن، ئـەوەش فەرموودەکـەی خودایە(سبحانە وتعالى): ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ﴾** [المؤمنون: ١٠]**)**.

---

[1] واتە: هەموویان مردنیان بینیوە–و.

## بەشی چوارەم

## سزای ئەهلی ئاگر

### ١- دەروازەی: توندی گەرمی ئاگری دۆزەخ

**٢١٠**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**نَارُكُمْ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءاً مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ**). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنْ كانَتْ لَكَافِيَةً، قَالَ: (**فُضِّلَتْ عَلَيْهِنَّ بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءاً، كُلُّهُنَّ مِثْلُ حَرِّهَا**). [خ٣٢٦٥، م٢٨٤٣]

(ق) لە **ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئاگرەکەی ئێوە بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ)**، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، ئاگرەکەی ئێمە بەسە بۆ سزا، فەرمووی: (**بە شەست و نۆ بەش(پلە) بەسەر ئاگرەکەی ئێوەدا زاڵ بووە[١]، هەریەك لەوانە[٢] وەك ئاگرەکەی ئێوەیە**).

**٢١١**- (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ مسعودٍ قالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لَهَا سَبْعُونَ أَلْفَ زِمَامٍ، مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَجُرُّونَهَا**). [م٢٨٤٢]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**لەو ڕۆژەدا دۆزەخ دەهێنرێت حەفتا هەزار زنجیر(ڕەشۆ)ی هەیە، لەگەڵ هەر زنجیرێك(ڕەشۆیەك) حەفتا هەزار فریشتە ڕایدەکێشن**).

---

[١] واتە: توندی و گەرمی ئاگری دۆزەخ شەست و نۆ ئەوەندەی ئاگری دنیایە-و.

[٢] هەریەك لەوانە: واتە: هەریەك لەو شەست و نۆ پلەی ئاگری دۆزەخ، هەموویان خراونەتە سەر یەکتر و ئاگری دۆزەخیان پێکهێناوە-و.

**٢١٢-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذْ سَمِعَ وَجْبَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**تَدْرُونَ مَا هَذَا**) ؟ قَالَ: قُلْنَا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: (**هَذَا حَجَرٌ رُمِيَ بِهِ فِي النَّارِ مُنْذُ سَبْعِينَ خَرِيفاً، فَهُوَ يَهْوِي فِي النَّارِ الآنَ، حَتَّى انْتَهَى إِلَى قَعْرِهَا**). [م٢٨٤٤]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین، لەناکاو گوێی لە دەنگی بەربوونەوەیەك بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**دەزانن ئەوە چی بوو؟**)، وتی: وتمان: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: (**ئەوە بەردێك بوو ماوەی حەفتا پایزە[1] هەڵدراوەتە ناو ئاگرەوە، ئەو تا ئێستا بە ئاگردا شۆڕدەبوویەوە هەتا گەیشتە بن و بێخی ئاگرەکە**).

## ٢- دەروازەی: قسەی ئاگر: (هل من مزيد-ئایا زیاتر و زۆرتر هەیە)

**٢١٣-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تَزَالُ جَهَنَّمُ تَقُولُ: هَلْ مِنْ مَزِيدٍ؟ حَتَّى يَضَعَ رَبُّ العِزَّةِ فِيهَا قَدَمَهُ، فَتَقُولُ: قَطِ قَطِ وَعِزَّتِكَ، وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ**). [خ٦٦٦١، (٤٨٤٨)/ م٢٨٤٨]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**بەردەوام دۆزەخ دەڵێت: ئایا زۆرتر و زیاتر هەیە؟ تا "رب العزة" پێی خۆی تێدەکات[2]، ئەوکات دەڵێ: بە عیززەتت، بەسمە، بەسمە، هەندێکی بەسەر هەندێکی تریدا دێتەوە یەك**).

- وزاد في رواية لهما: (**وَلاَ تَزَالُ الجَنَّةُ تَفْضُلُ، حَتَّى يُنْشِىءَ اللهُ لَهَا خَلْقاً، فَيُسْكِنَهُمْ فَضْلَ الجَنَّةِ**). [خ٧٣٨٤]

لە ریوایەتێکی تری هەردووکیاندا ئەمە زیاد کراوە: (**بەردەوام بەهەشت زۆر و بەرینە تا خودا دروستکراوی بۆ دروست دەکات و نیشتەجێی ئەو زۆری و زیادەی بەهەشتیان دەکات**).

---

[1] حەفتا پایز: واتە: حەفتا ساڵ-و.

[2] تەماشای فەرموودەی(٢٠٣) بکە.

## ٣- دەروازەی: ڕۆشنکردنەوەی حاڵی بێباوەڕ لە ئاگردا

**٢١٤-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**ضِرْسُ الكَافِرِ، أَوْ نَابُ الكَافِرِ، مِثْلُ أُحُدٍ. وَغِلَظُ جِلْدِهِ مَسِيرَةُ ثَلاَثٍ**). [م٢٨٥١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ددانی یان کەڵبەی کەسی بێباوەڕ وەك چیای ئوحودە، ئەستووری پێستی سێ ڕۆژ ڕێگەیە**[1]).

## ٤- دەروازەی: ساناترین(ئاسانترین) سزا لەسە ئەهلی ئاگر

**٢١٥-** (ق) عَنِ النعمانِ بْنِ بشير قال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَرَجُلٌ، تُوضَعُ فِي أَخْمَصِ قَدَمَيْهِ جَمْرَةٌ، يَغْلِي مِنْهَا دِمَاغُهُ**). [خ٦٥٦١/ م٢١٣]

(ق) لە نیعمانی کوڕی بەشیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**ساناترین(ئاسانترین) سزای ئەهلی ئاگر لە ڕۆژی قیامەت سزای پیاوێکە پشکۆیەك لەژێر دوو پێی دادەنرێت بەهۆیەوە دەماغی دەکوڵێت**).

**٢١٦-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**يَقُولُ اللهُ تَعَالَى لأَهْوَنِ أَهْلِ النَّارِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ: لَوْ أَنَّ لَكَ مَا فِي الأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ أَكُنْتَ تَفْتَدِي بِهِ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيَقُولُ: أَرَدْتُ مِنْكَ أَهْوَنَ مِنْ هذَا، وَأَنْتَ فِي صُلْبِ آدَمَ: أَنْ لاَ تُشْرِكَ بِي شَيْئاً، فَأَبَيْتَ إِلاَّ أَنْ تُشْرِكَ بِي**). [خ٦٥٥٧ (٣٣٣٤)/ م٢٨٠٥]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**خودا(سبحانه وتعالى) لە ڕۆژی قیامەت بە کەسێك -کە ئاسانترین سزای**

---

[1] فەرموودەکە دەفەرموێت: (مسیره ثلاث)، نەیفەرمووە: سێ ڕۆژ، یان سێ هەفتە، یان سێ مانگ، یان سێ ساڵ، کاتێك ژمارەیەك بەتەنها دێت بەبێ ناونانی (ڕۆژ و هەفتە و مانگ و ساڵ) لەپێشترە هەڵبدرێتە سەر ڕۆژ، چونکە باوترینە -و.

ئەهلی ئاگری هەیە- دەفەرموێت: گەر هەموو ئەو شتانەی هەتبوون لە زەوی لە دەستی تۆدا بن، ئایا دەیانكەی بە فیدای ئەم سزایە؟ دەڵێت: بەڵێ، دەفەرموێت: من كەمتر لەوەم لە تۆ دەویست، تۆ لە پشتی ئادەمدا بووی: شتێك مەكە بە هاوەڵی من، بەلام تۆ تەنها هاوەڵدانانت بۆ من دەویست).

## ٥- دەروازەی: دەستەیەك پاشگەزبوونەوە

٢١٧- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ إِذَا زُمْرَةٌ، حَتَّى إِذَا عَرَفْتُهُمْ خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَيْنِي وَبَيْنِهِمْ، فَقَالَ: هَلُمَّ، فَقُلْتُ: أَيْنَ؟ قَالَ: إِلَى النَّارِ وَاللهِ، قُلْتُ: وَمَا شَأْنُهُمْ؟ قَالَ: إِنَّهُمْ ارْتَدُّوا بَعْدَكَ عَلَى أَدْبَارِهِمُ القَهْقَرَى. ثُمَّ إِذَا زُمْرَةٌ، حَتَّى إِذَا عَرَفْتُهُمْ خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَيْنِي وَبَيْنِهِمْ، فَقَالَ: هَلُمَّ، قُلْتُ: أَيْنَ؟ قَالَ: إِلَى النَّارِ وَاللهِ، قُلْتُ: مَا شَأْنُهُمْ؟ قَالَ: إِنَّهُمْ ارْتَدُّوا بَعْدَكَ عَلَى أَدْبَارِهِمُ القَهْقَرَى، فَلاَ أُرَاهُ يَخْلُصُ مِنْهُمْ إِلاَّ مِثْلُ هَمَلِ النَّعَمِ).

[خ٦٥٨٧]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (من خەوتبووم، بینیم كۆمەڵێك، تا من ئەوانم ناسییەوە، پیاوێك لە نێوان من و ئەوان هاتە دەرەوە و وتی: وەرن، وتم: بۆ كوێ؟ وتی: سوێند بە خودا بۆ ئاگر، وتم: ئەوان چییان كردووە؟ وتی: ئەوان لەدوای تۆ پاشگەزبوونەوە و بەرەو دوا وەرچەرخان، پاشان دەستەیەكی تر، تا من ئەوانم ناسییەوە، پیاوێك لە نێوان من و ئەوان هاتە دەرەوە، وتی: وەرن، وتم: بۆ كوێ؟ وتی: سوێند بە خودا بۆ ئاگر، وتم: ئەوان چییان كردووە؟ وتی: ئەوان لەدوای تۆ پاشگەزبوونەوە و بەرەو دوا وەرچەرخان، من نابینم یەكێك لەوان ڕزگاری ببێت مەگەر وەك ئاژەڵی بەرەڵا كراو و پشتگوێخراو[1]).

---

[1] ئاژەڵی بەرەڵاكراو و پشتگوێخراو زۆر كەم لە تیاچوون ڕزگاریان دەبێت.

## ٦- دەروازەی: هۆشداری لە ئاگر

**٢١٨-** عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَخْطُبُ فَقَالَ: (**أَنْذَرْتُكُمْ النَّارَ، أَنْذَرْتُكُمْ النَّارَ، أَنْذَرْتُكُمْ النَّارَ**)، فَمَا زَالَ يَقُولُهَا حَتَّى لَوْ كَانَ فِي مَقَامِي هَذَا لَسَمِعَهُ أَهْلُ السُّوقِ، حَتَّى سَقَطَتْ خَمِيصَةٌ كَانَتْ عَلَيْهِ عِنْدَ رِجْلَيْهِ. [مي٢٨٥٤]

* إسناده جيد.

**لە نیعمانی کوڕی بەشیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو وتاری دەدا و دەیفەرموو: (لە ئاگر ئێوە دەترسێنم، لە ئاگر ئێوە دەترسێنم، لە ئاگر ئێوە دەترسێنم) بەردەوام ئەوەی دووبارە دەکردەوە، تەنانەت گەر لەم شوێنەی من بوایە ئەهلی بازاڕ دەیانبیست، تا پۆشاکەکەی سەرشانی بۆ لای لاقەکانی بەربوویەوە.**

# بەشی پێنجەم

## سیفەتی بەهەشت و خستنەڕووی ئەهلی بەهەشت

### ١- دەروازەی: یەکەمین کەس لە دەروازەی بەهەشت دەدات

٢١٩- (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَنَا أَكْثَرُ الأَنْبِيَاءِ تَبَعاً يَوْمَ القِيَامَةِ، وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ يَقْرَعُ بَابَ الجَنَّةِ**).

(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە ڕۆژی قیامەت من لە هەموو پێغەمبەران زیاتر شوێنکەوتووم هەیە، من یەکەمین کەسێکم لە دەرگای بەهەشت دەدەم).**

- وفي رواية: (أَنَا أَوَّلُ شَفِيعٍ فِي الجَنَّةِ، لَمْ يُصَدَّقْ نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ مَا صُدِّقْتُ، وَإِنَّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيّاً مَا يُصَدِّقُهُ مِنْ أُمَّتِهِ إِلاَّ رَجُلٌ وَاحِدٌ). [م١٩٦]

لە ڕیوایەتێکی تردا: **(من یەکەمین تکاکارم لە بەهەشت، هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران بە قەدەر من بەڕاست نەزانراوە، پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران هەیە لە ئومەتەکەی تەنها یەك پیاو بەڕاستی زانیوە).**

### ٢- دەروازەی: خۆشییەکانی بەهەشت بە خاتیرەی دڵی مرۆڤدا گوزەریان نەکردووە

٢٢٠- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ: مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، ذُخْراً، بَلْهَ مَا أُطْلِعْتُمْ عَلَيْهِ**). ثُمَّ قَرَأَ: ﴿**فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ**﴾ [السجدة: ١٧]. [خ٤٧٨٠ (٣٢٤٤)/ م٢٨٢٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): **(خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: بۆ بەندە صاڵحەکانم شتانێکم ئامادە کردووە: چاو نەیبینیون، گوێ نەیبیستوون، و بە خاتیرەی دڵی مرۆڤدا گوزەریان نەکردووە، هەموو ئەوانە گەنجینەکراون (و هەڵگیراون، وازبهێنن لەوەی ئێوەی لێ ئاگادار دەکەم[1])**، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ۝﴾ [السجدة: ١٧]

## ٣- دەروازەی: درەختێك لە بەهەشتدا سێبەرەکەی سەد ساڵ ڕێگەیە

**٢٢١-** (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ فِي الجَنَّةِ لَشَجَرَةً، يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عامٍ لاَ يَقْطَعُهَا)**. [خ٦٥٥٢/ م٢٨٢٧]

(ق) لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(لە بەهەشتدا درەختێك هەیە سوار سەد ساڵ بە ژێر سێبەرەکەیدا دەڕوات نایبڕێت)**. {خ٦٥٥٢/م٢٨٢٧}.

## ٤- دەروازەی: بازاڕی بەهەشت

**٢٢٢-** (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ فِي الجَنَّةِ لَسُوقاً، يَأْتُونَهَا كُلَّ جُمُعَةٍ فَتَهُبُّ رِيحُ الشَّمَالِ فَتَحْثُو فِي وُجُوهِهِمْ وَثِيَابِهِمْ، فَيَزْدَادُونَ حُسْناً وَجَمَالاً، فَيَرْجِعُونَ إِلَى أَهْلِيهِمْ وَقَدِ ازْدَادُوا حُسْناً وَجَمَالاً، فَيَقُولُ لَهُمْ أَهْلُوهُمْ: وَاللهِ! لَقَدِ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنَا حُسْناً وَجَمَالاً، فَيَقُولُونَ: وَأَنْتُمْ، وَاللهِ! لَقَدِ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنَا حُسْناً وَجَمَالاً)**. [م٢٨٣٣]

(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە بەهەشت بازاڕێك هەیە، هەموو جومعەیەك دێن بۆ ناوی، بای باکوور هەڵدەکات و دەدات لە**

---

[1] واتە: ئەوەی ئێوە لێی ئاگادار نین زۆرتر و زیاترە لەوەی من ئێوەم لێ ئاگادار کردووە.

ڕوخسار و پۆشاکیان و جوانی و نازدارییان زیاد دەکات، بۆیە دەگەڕێنەوە بۆ لای خانەوادەکانیان و جوانی و نازدارییان زیادی کردووە، خانەوادەکانیان پێیان دەڵێن: سوێند بە خودا، لەدوای ئێمە جوانی و نازداریتان زیادی کردووە، ئەوانیش دەڵێن: سوێند بە خودا، ئێوەش هەروەها، لەدوای ئێمە جوانی و نازداریتان زیادی کردبووە).

## ٥- دەروازەی: سیفەتی خێمەکانی بەهەشت

٢٢٣- (ق) عَنْ أَبِي موسى الأَشْعَرِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّ فِي الجَنَّةِ خَيْمَةً مِنْ لُؤْلُؤَةٍ مُجَوَّفَةٍ، عَرْضُهَا سِتونَ مِيلاً، فِي كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنْهَا أَهْلٌ مَا يَرَوْنَ الآخَرِينَ، يَطُوفُ عَلَيْهِمُ المؤْمِنُونَ. وَجَنَّتَانِ مِنْ فِضَّةٍ، آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَجَنَّتَانِ مِنْ كَذَا، آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا. وَمَا بَيْنَ القَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلاَّ رِدَاءُ الكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ). [خ٤٨٧٩، ٤٨٨٠/م١٨٠، ٢٨٣٨]

(ق) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(لە بەهەشت خێمەیەك هەیە لە مرواری ناوبۆش، پانتاییەکەی شەست میلە، لە هەر گۆشەیەکییەوە خانەوادەیەك[1] هەن یەکتر نابینن، باوەڕداران بەسەر ئەو خانەوادانەدا دەگەڕێن، هەروەها دوو بەهەشت هەن لە زیو، دەفرەکان و ئەوانەی تیایاندان، دوو بەهەشتیش لە زێڕ، دەفرەکان و ئەوانەی تیایاندان، لە نێوان ئەهلی بەهەشت و تەماشاکردنی پەروەردگاریان لە بەهەشتی عەدن تەنها پۆشاکی مەزنی و گەورەیی هەیە لەسەر ڕوخساری خودا).**

## ٦- دەروازەی: ڕوباری کەوسەر

٢٢٤- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (سَيْحَانُ وَجَيْحَانُ، وَالفُرَاتُ وَالنِّيلُ، كُلٌّ مِنْ أَنْهَارِ الجَنَّةِ). [م٢٨٣٩]

---

[1] هاوسەر و منداڵ و خزمەتکار-و.

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ڕوباری سەیحان و جەیحان[1]، و فورات و نیل، هەموو لە ڕوبارەکانی بەهەشتن).**

**٢٢٥-** (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَمَّا عُرِجَ بِالنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى السَّمَاءِ، قالَ: **(أَتَيْتُ عَلَى نَهَرٍ حافَتَاهُ قِبَابُ اللُّؤْلُؤِ مُجَوَّفاً، فَقُلْتُ: ما هذَا يا جِبْرِيلُ؟ قالَ: هذَا الكَوْثَرُ).** [خ٤٩٦٤ (٣٥٧٠)]

(خ) لە ئەنەسەوە، وتی: کاتێك میعراج بە پێغەمبەر(ﷺ) کرا بۆ ئاسمان، فەرمووی: **(هاتمە سەر ڕوبارێك قەراغەکانی قوببەی مرواری ناوبۆش بوو، وتم: ئەی جیبریل ئەمە چییە؟ فەرموووی: ئەمە کەوسەرە).**

- وفي رواية قالَ: (هذَا الكَوْثَرُ الَّذي أَعْطَاكَ رَبُّكَ، فَإِذَا طِينُهُ -أَوْ طِيبُهُ- مِسْكٌ أَذْفَرُ). [خ٦٥٨١]

لە ڕیوایەتێکی تردا، فەرمووی: **(ئەمە کەوسەرە کە پەروەردگار بە تۆی بەخشیوە، بینیم قوڕەکەی[2] -یان بۆنە خۆشەکەی- میسکی ئەزفەرە).**

## ٨- دەروازەی: دەروازەکانی بەهەشت

**٢٢٦-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللهِ، نُودِيَ مِنْ أَبْوَابِ الجَنَّةِ: يَا عَبْدَ اللهِ هذَا خَيْرٌ، فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلاَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلاَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الجِهَادِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِنْ بابِ الرَّيَّانِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ).**

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەرکەس لە ڕێگەی خودا جووتێك[3] خەرج بکات لە دەروازەکانی بەهەشتەوە بانگ**

---

[1] سەیحان و جەیحان: دوو ڕوبارن لە تورکیا-و.

[2] قوڕەکەی: مەبەست خاکەکەیەتی-و.

[3] جووتێك: واتە دوو درهەم، یان دوو دینار، یان دوو شت-و.

دەکرێت: ئەی بەندەی خودا، ئەم دەروازە باشترینە[1]، هەرکەس لە ئەهلی نوێژ بێت لە دەروازەی نوێژەوە بانگ دەکرێت، هەر کەس لە ئەهلی جیهاد بێت لە دەروازەی جیهادەوە بانگ دەکرێت، هەر کەس لە ئەهلی ڕۆژوو بێت لە دەروازەی "رەییان"ەوە[2] بانگ دەکرێت، هەر کەس لە ئەهلی صەدەقە بێت لە دەروازەی صەدەقەوە بانگ دەکرێت).

- فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللهِ، مَا عَلَى مَنْ دُعِيَ مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ، فَهَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ كُلِّهَا؟ قَالَ: (نَعَمْ، وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ). [خ١٨٩٧/ م١٠٢٧]

ئەبوبەکر فەرمووی(خوا لێی ڕازی بێت): باوك و دایکم فیدات بێت، چی پێویستە لەسەر کەسێك لە هەموو ئەو دەرگانەوە بانگ بکرێت، ئایا کەسێك هەیە لە هەموو ئەو دەرگانەوە بانگ بکرێت؟ فەرمووی: (بەڵێ، ڕجام وایە تۆ لەو کەسانە بیت).

## ٩- دەروازەی: سیفەتی چاندنی بەهەشت

٢٢٧- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَوْماً يُحَدِّثُ، وَعِنْدَهُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ البَادِيَةِ: (أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ اسْتَأْذَنَ رَبَّهُ فِي الزَّرْعِ، فَقَالَ لَهُ: أَلَسْتَ فِيمَا شِئْتَ؟ قَالَ: بَلَى، ولكِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَزْرَعَ، قَالَ: فَبَذَرَ، فَبَادَرَ الطَّرْفَ نَبَاتُهُ وَاسْتِوَاؤُهُ وَاسْتِحْصَادُهُ، فَكَانَ أَمْثَالَ الجِبَالِ، فَيَقُولُ اللهُ: دُونَكَ يَا ابْنَ آدَمَ، فَإِنَّهُ لاَ يُشْبِعُكَ شَيْءٌ). فَقَالَ الأَعْرَابِيُّ: وَاللهِ لاَ تَجِدُهُ إِلاَّ قُرَشِيّاً أَوْ أَنْصَارِيّاً، فَإِنَّهُمْ أَصْحَابُ زَرْعٍ، وَأَمَّا نَحْنُ فَلَسْنَا بِأَصْحَابِ زَرْعٍ، فَضَحِكَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٢٣٤٨]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) فەرموودەی دەفەرموو، پیاوێکی دەشتەکی[3] لەلا بوو، فەرمووی: (پیاوێك لە ئەهلی بەهەشت لە

---

[1] یان ئەم دەروازەیە خێرێکە لە خێرەکان–و.

[2] ڕیّان: مانای پاراوی هەیە، لە خواردنەوەکانی بەهەشت پاراو دەبێت–و.

[3] دەشتەکی: واتە سارانشین–و.

**پەروەردگاری داوای مۆڵەتی چاندنی کرد، پێی فەرموو: بۆچی تۆ لە جێگەیەك نیت هەرچی بخوازی بۆت هەبێت؟ وتی: با، بەڵام پێمخۆشە بچێنم و بروێنم، فەرمووی: تۆوی چاند، بە چاوتروکانێك ڕووەکەکەی سەوز بوو و پێگەیشت و کاتی دروێنەی هات، وەك نموونەی چیاکان، خودا دەفەرموێت: بگرە، ئەوەش بۆ تۆ، ئەی ئادەمیزاد، تۆ هیچ شتێك تێرت ناکات)**، ئەعرابییەکە وتی: سوێند بە خودا، ئەو کابرایە یان قورەیشییە، یان ئەنصاری، ئەوانە خاوەن کشتوکاڵن، بەڵام ئێمە[1] خاوەن کشتوکاڵ نین، پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی.

## ١٠- دەروازەی: یەکەمین کۆمەڵ دچنە بەهەشتەوە

**٢٢٨-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أَشَدِّ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّمَاءِ إِضَاءَةً، لاَ يَبُولُونَ وَلاَ يَتَغَوَّطُونَ، وَلا يَتْفِلُونَ وَلاَ يَمْتَخِطُونَ، أَمْشَاطُهُمُ الذَّهَبُ، وَرَشْحُهُمُ المِسْكُ، وَمَجَامِرُهُمُ الأَلُوَّةُ -الأَلَنْجُوجُ، عُودُ الطِّيبِ- وَأَزْوَاجُهُمُ الحُورُ العِينُ، عَلَى خَلْقِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ آدَمَ، سِتُّونَ ذِرَاعاً فِي السَّمَاءِ). [خ٣٣٢٧، (٣٢٤٥)/ م٢٨٣٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(یەکەمین کۆمەڵێك دەچنە بەهەشتەوە لە شێوەی مانگی چواردەدان، پاشان ئەوانەی بەدوایاندا دێن وەك درەوشاوەترین هەسارەی پرشنگدار لە ڕۆشنیدا، نە میز دەکەن و نە پیسی، نە تف و بەڵغەمیان هەیە، شانەکانیان[2] لە زێڕە، و بۆنی ئارەقەیان میسکە، بوخریان ئولوەیە[3]، هاوسەرەکانیان حۆرلعەین، لەسەر شێوەی یەك پیاو، لەسەر شێوەی باوکیان ئادەم، شەست باڵ بە ئاسماندا بالآیانە)**.

---

[1] ئێمە: مەبەستی خەڵکی کۆچەری و سارانشینە-و.

[2] مەبەست شانەی داهێنانی پرچی سەرە-و.

[3] ئولووە(الألوّة): چیلکەیەکی هندییە بۆ بۆنی خۆش دەسوتێنرێت.

## ١١- حەفتا هەزار کەس دەچنە بەهەشتەوە لەسەر شێوەی مانگ

**٢٢٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**يَدْخُلُ الجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي زُمْرَةٌ هُمْ سَبْعُونَ أَلْفاً، تُضِيءُ وُجُوهُهُمْ إِضَاءَةَ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ**). وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقَامَ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ الأَسَدِيُّ يَرْفَعُ نَمِرَةً عَلَيْهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ! اجْعَلْهُ مِنْهُمْ**)، ثُمَّ قَامَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: (**سَبَقَكَ عُكَّاشَةُ**).	[خ٦٥٤٢ (٥٨١١)، م٢١٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(دەستەیەك لە ئومەتەکەم دەچنە بەهەشتەوە ئەوان حەفتا هەزارن، رخساریان وەك مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە)**، ئەبو هورەیرە وتی: عوکاشەی کوڕی میحصەنی ئەسەدی هەستایە سەر پێ و پۆشاکێکی ڕەش و سپی لەبەر بوو بەرزی کردەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، داوا لە خودا بکە من لەوان بم، فەرمووی: **(خودایە، لەگەڵ ئەوان بێت)**، پاشان پیاوێك لە ئەنصار هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، داوا لە خودا بکە من لەوان بم، فەرمووی: **(عوکاشە پێشتکەوت)**.

## ١٢- دەروازەی: حەفتا هەزار کەس بەبێ حساب دەچنە بەهەشتەوە

**٢٣٠-** (م) عَنْ عِمْرَانَ قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَدْخُلُ الجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعُونَ أَلْفاً بِغَيْرِ حِسَابٍ**) قَالُوا: وَمَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**هُمُ الَّذِينَ لاَ يَكْتَوُونَ وَلاَ يَسْتَرْقُونَ، وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ**).	[م٢١٨]

(م) لە عیمرانەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە ئومەتەکەم حەفتا هەزار کەس بەبێ حساب دەچنە بەهەشتەوە)**، وتیان: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری

خودا؟ فەرمووی: **(ئەوانە کەسانێکن داخکردن[1] ناکەن و داوا لە خەڵکی ناکەن روقیەیان[2] بۆ بکەن، و تەوەکولیان لەسەر پەروەردگاریانە)**.

## ١٣- دەروازەی: ئەم ئومەتە نیوەی ئەهلی بەهەشتە

**٢٣١-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مَسْعُودٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي قُبَّةٍ، فَقَالَ: (أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الجَنَّةِ) ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قالَ: (أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الجَنَّةِ)؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قالَ: (أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْلِ الجَنَّةِ) ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ! إِنِّي لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الجَنَّةِ، وَذلِكَ أَنَّ الجَنَّةَ لاَ يَدْخُلُهَا إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَمَا أَنْتُمْ فِي أَهْلِ الشِّرْكِ إِلاَّ كَالشَّعْرَةِ البَيْضَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ، أَوْ كَالشَّعْرَةِ السَّوْدَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَحْمَرِ). [خ٦٥٢٨/ م٢٢١]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: لە قوببەیەکدا[3] لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، فەرمووی: **(ئایا رازی دەبن چارەکێکی ئەهلی بەهەشت بن؟)**، وتمان: بەڵێ، فەرمووی: **(رازی دەبن سێیەکی ئەهلی بەهەشت بن؟)**، وتمان: بەڵێ، فەرمووی: **(رازی دەبن نیوەی ئەهلی بەهەشت بن؟)**، وتمان: بەڵێ، فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی محەمەدی بەدەستە، من رجام وایە ئێوە نیوەی ئەهلی بەهەشت بن، چونکە تەنها نەفسێکی موسڵمان دەچێتە بەهەشتەوە، ئێوە لەناو ئەهلی هاوەڵدانان وەك موویەکی سپی وان لە پێستی گایەکی رەشدا، یان وەك موویەکی رەش لە پێستی گایەکی سووردا)**.

---

[1] داخکردن: رێگەیەکی کۆنە لە چارەسەری برین بە گەرم کردنی پارچە ئاسنێك و دانانی لەسەر دەمی برینەکە–و.

[2] روقیيه: نوشتە و هەر رێگەیەکی تر لە کاریگەری رۆحی بۆ چارەسەری نەخۆشی و ئازار–و.

[3] قوببە: خێمە یان دەوار یاخود بینایەکی قەوسکراو بە خشت–و.

## ١٤- دەروازەی: ئەهلی ژوورەکان

**٢٣٢-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ أَهْلَ الجَنَّةِ يَتَرَاءَوْنَ أَهْلَ الغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ، كما تَتَرَاءَوْنَ الكَوْكَبَ الدُّرِّيَّ الغابِرَ فِي الأُفُقِ مِنَ المَشْرِقِ أَوِ المَغْرِبِ، لِتَفَاضُلِ ما بَيْنَهُمْ**). قالوا: يَا رَسُولَ اللهِ، تِلْكَ مَنَازِلُ الأَنْبِيَاءِ لاَ يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ؟ قَالَ: (**بَلَى، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! رِجالٌ آمَنُوا بِاللهِ وَصَدَّقُوا المُرْسَلِينَ**). [خ٣٢٥٦/ م٢٨٣١]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**ئەهلی بەهەشت تەماشای ئەهلی ژوورەکان دەکەن لەسەر سەریان، وەك چۆن تەماشای هەسارەیەکی پرشنگداری ئاوابوو دەکەن لە ئاسۆکانەوە یان لە خۆرئاواوە، لەبەر بالأبەندی[1] نێوانیان**)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوانە شوێن و جێگەی پێغەمبەرانن و تەنها ئەوان دەیگەنێ؟ فەرمووی: (**بۆ نە، سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، کۆمەڵێك پیاوێك ئیمانیان بە خودا هێنا و پێغەمبەرانیان بەڕاست زانی**).

**٢٣٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ فِي الجَنَّةِ غُرْفَةً يُرَى ظَاهِرُهَا مِنْ بَاطِنِهَا وَبَاطِنُهَا مِنْ ظَاهِرِهَا**)، فَقَالَ أَبُو مُوسَى الْأَشْعَرِيُّ: لِمَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**لِمَنْ أَلاَنَ الكَلاَمَ، وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ، وَبَاتَ لِلَّهِ قَائِماً وَالنَّاسُ نِيَامٌ**). [حم٦٦١٥/ ك٢٧٠]

* قال الذهبي: على شرطهما.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**لە بەهەشت ژوور هەیە لە ناوەوە دەرەوە دەبینی، و لە دەرەوە ناوەوە دەبینی**)، ئەبو موسای ئەشعەری وتی: ئەوە بۆ کێیە، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: (**بۆ کەسێك قسەی نەرم و نیانە، وخۆراك دەبەخشێ، و بۆ خودا بە شەو راستدەبێتەوە و خەڵکی نووستوون**).

---

[1] بالأبەندی نێوانیان: واتە لەبەر جیاوازی پلە و پایەیان-و.

## ١٥- دەروازەی: تەسبیحاتی ئەهلی بەهەشت

**٢٣٤-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَأْكُلُ أَهْلُ الجَنَّةِ فِيهَا وَيَشْرَبُونَ، وَلاَ يَتَغَوَّطُونَ وَلاَ يَمْتَخِطُونَ وَلاَ يَبُولُونَ، وَلَكِنْ طَعَامُهُمْ ذَاكَ جُشَاءٌ كَرَشْحِ المِسْكِ، يُلْهَمُونَ التَّسْبِيحَ وَالحَمْدَ، كَمَا يُلْهَمُونَ النَّفَسَ**). [م٢٨٣٥]

(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئەهلی بەهەشت لە بەهەشت دەخۆن و دەخۆنەوە، پیسی ناکەن و چڵم و بەڵغەمیان نییە و میز ناکەن، بەڵام پاشماوەی خۆراکیان قوڕقێنەیەکە وەك هاڵاوی میسك، تەسبیح و حەمدیان ئیلهام دەکرێت، وەك چۆن هەناسەدانیان ئیلهام دەکرێت**).

## ١٦- دەروازەی: بەردەوامی خۆشییەکانی ئەهلی بەهەشت

**٢٣٥-** (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ وَأَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**يُنَادِي مُنَادٍ: إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَصِحُّوا فَلاَ تَسْقَمُوا أَبداً، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَحْيَوْا فَلاَ تَمُوتُوا أَبَداً، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَشِبُّوا فَلاَ تَهْرَمُوا أَبَداً، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَنْعَمُوا فَلاَ تَبْأَسُوا أَبَداً**)، فَذَلِكَ قَوْلُهُ عزّ وجل: ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ [الأعراف:٤٦]. [م٢٨٣٧]

(م) لە ئەبی سەعدی خودری و ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**بانگکەرێك بانگ دەکات: بۆ ئێوە هەیە لەشساغ(ساغڵەم) بن و هەرگیز نەخۆش نەکەون، بۆ ئێوە هەیە بژین و هەرگیز نەمرن، بۆ ئێوە هەیە گەنج بن و هەرگیز پیر نەبن، بۆ ئێوە هەیە خۆشی وەربگرن و هەرگیز مەینەتی رووتان لێ نەکات**)، ئەوەش فەرموودەکەی خودایە(ﷻ):﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ [الأعراف:٤٦].

## ١٧- دەروازەی: خەڵکانێك دڵیان وەك دڵی باڵندەیە

**٢٣٦-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**يَدْخُلُ الجَنَّةَ أَقْوَامٌ أَفْئِدَتُهُمْ مِثْلُ أَفْئِدَةِ الطَّيْرِ**). [م٢٨٤٠]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(کۆمەڵێك خەڵك دەچنە بەهەشتەوە دڵیان وەك دڵی باڵندەیە[1])**.

## ١٨- دەروازەی: ئەوانەی بە شفاعەت لە ئاگر دێنە دەرەوە

**٢٣٧-** (خ) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**يَخْرُجُ قَوْمٌ مِنَ النَّارِ بِشَفَاعَةِ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم فَيَدْخُلُونَ الجَنَّةَ، يُسَمَّوْنَ الجَهَنَّمِيِّينَ**). [خ٦٥٦٦]

(خ) لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(کۆمەڵێك بە شفاعەتی محەمەد(ﷺ) لە ئاگر دێنە دەرەوە و دەچنە بەهەشتەوە، پێیان دەوترێت: دۆزەخییەکان)**.

## ١٩- دەروازەی: دەرهێنانی یەکتاپەرستان لە ئاگر

**٢٣٨-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ، وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ، يَقُولُ اللهُ: مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَأَخْرِجُوهُ، فَيَخْرُجُونَ قَدِ امْتُحِشُوا وَعَادُوا حُمَماً، فَيُلْقَوْنَ فِي نَهَرِ الحَيَاةِ، فَيَنْبُتُونَ كَما تَنْبُتُ الحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ - أَوْ قَالَ: حَمِيَّةِ السَّيْلِ - وَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: أَلَمْ تَرَوْا أَنَّهَا تَخْرُجُ صَفْرَاءَ مُلْتَوِيَةً**). [خ٦٥٦٠ (٢٢)، م١٨٤]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(کاتێك ئەهلی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوە و ئەهلی ئاگر دەچنە ئاگرەوە، خودا دەفەرموێت: هەر کەس لە دڵیدا مسقاڵە خەردەلێك[2] ئیمان هەیە بیهێننە دەرەوە، دێنە**

---

[1] وتراوە: شوبهاندنەکەی بە دڵی باڵندە لە نەرمی و ناسکیدا، وتراویشە لە ترس و هەیبەتدا.

[2] مسقاڵە خەردەلێك: کێشی دەنکە خەردەلێك-و.

دەرەوە و سووتاون و وەك خەڵوزیان لێهاتووە، هەڵدەدرێنە ناو ڕووباری ژیانەوە، سەوزدەبنەوە و دەڕوێنەوە وەك چۆن دەنکە تۆو لە قەراغ سێلاودا-یان لە دەوروبەری لافاودا- دەڕوێ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نابینن زەرد و لوولخواردوو دێتە دەرەوە).

**٢٣٩**- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا خَلَصَ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَمِنُوا، فَمَا مُجَادَلَةُ أَحَدِكُمْ لِصَاحِبِهِ فِي الْحَقِّ يَكُونُ لَهُ فِي الدُّنْيَا بِأَشَدَّ مُجَادَلَةً لَهُ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لِرَبِّهِمْ فِي إِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ أُدْخِلُوا النَّارَ.

قَالَ: يَقُولُونَ: رَبَّنَا، إِخْوَانُنَا كَانُوا يُصَلُّونَ مَعَنَا وَيَصُومُونَ مَعَنَا وَيَحُجُّونَ مَعَنَا فَأَدْخَلْتَهُمُ النَّارَ؟ قَالَ فَيَقُولُ: اذْهَبُوا فَأَخْرِجُوا مَنْ عَرَفْتُمْ، فَيَأْتُونَهُمْ، فَيَعْرِفُونَهُمْ بِصُوَرِهِمْ، لاَ تَأْكُلُ النَّارُ صُوَرَهُمْ، فَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ النَّارُ إِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ إِلَى كَعْبَيْهِ، فَيُخْرِجُونَهُمْ فَيَقُولُونَ: رَبَّنَا أَخْرَجْنَا مَنْ أَمَرْتَنَا، ثُمَّ يَقُولُ: أَخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ دِينَارٍ مِنَ الْإِيمَانِ، ثُمَّ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ نِصْفِ دِينَارٍ، حَتَّى يَقُولَ: مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ).

قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْ بِهَذَا فَلْيَقْرَأْ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا۝﴾ [النساء: ٤٠].

قَالَ: (فَيَقُولُونَ: رَبَّنَا قَدْ أَخْرَجْنَا مَنْ أَمَرْتَنَا فَلَمْ يَبْقَ فِي النَّارِ أَحَدٌ فِيهِ خَيْرٌ، قَالَ: ثُمَّ يَقُولُ اللهُ: شَفَعَتِ الْمَلاَئِكَةُ وَشَفَعَ الْأَنْبِيَاءُ وَشَفَعَ الْمُؤْمِنُونَ، وَبَقِيَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ، قَالَ: فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنَ النَّارِ ـ أَوْ قَالَ: قَبْضَتَيْنِ ـ نَاسٌ لَمْ يَعْمَلُوا لِلَّهِ خَيْراً قَطُّ، قَدْ احْتَرَقُوا حَتَّى صَارُوا حُمَماً، قَالَ: فَيُؤْتَى بِهِمْ إِلَى مَاءٍ يُقَالُ لَهُ مَاءُ الْحَيَاةِ، فَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ، فَيَخْرُجُونَ مِنْ أَجْسَادِهِمْ مِثْلَ اللُّؤْلُؤِ، فِي أَعْنَاقِهِمْ الْخَاتَمُ: عُتَقَاءُ اللهِ، قَالَ: فَيُقَالُ لَهُمْ: ادْخُلُوا الْجَنَّةَ، فَمَا تَمَنَّيْتُمْ أَوْ رَأَيْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَهُوَ لَكُمْ عِنْدِي أَفْضَلُ مِنْ هَذَا، قَالَ: فَيَقُولُونَ: رَبَّنَا وَمَا أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ قَالَ فَيَقُولُ: رِضَائِي عَلَيْكُمْ فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ أَبَداً). [حم١١٨٩٨]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

هەر لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کە لە ڕۆژی قیامەت باوەڕداران ڕزگاریان دەبێت و دەکەونە ئاسایشەوە، موجادەلەی یەکێك لە ئێوە لە دنیا بۆ هاوەڵەکەی لە حەقدا[1] توندتر نییە لە موجادەلەی باوەڕداران لەگەڵ پەروەردگار دەربارەی براکانیان کە خراونەتە ناو ئاگرەوە.**

**باوەڕداران دەڵێن: پەروەردگار، براکانمان لەگەڵمان نوێژیان دەکرد و لەگەڵمان ڕۆژوویان دەگرت و لەگەڵمان حەجیان دەکرد تۆ ئەوانت بردە ناو ئاگرەوە؟ فەرمووی: خودا دەفەرمویّ: بڕۆن هەر کەس دەناسن دەریبهێنن، ئەوانیش دێن بۆ لایان و بە شێوەیاندا دەیانناسنەوە، ئاگر شێوەیان ناخوات، هەیانە ئاگر تا نیوەی لاقەکانی گرتووە، هەیان تا قولاپێکانی گرتووە، دەریاندەهێنن و دەڵێن: پەروەردگار، ئەوانەم دەرهێنا فەرمانت پێ کردبووین، پاشان خودا دەفەرموێت: هەر کەس کێشی دینارێك ئیمان لە دڵیدایە دەریبهێنن، پاشان هەر کەس کێشی نیو دینار لە دڵیدایە، تا دەفەرمویّ: هەر کەس لە دڵی مسقاڵە زەڕەیەك لە ئیمان بوونی هەیە).**

ئەبو سەعید وتی: هەر کەس ئەمە بەڕاست نازانێت با ئەم ئایەتە بخوێنێتەوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾ [النساء: ٤٠].

فەرمووی: **(دەڵێن: پەروەردگار، ئەوانەم دەرهێنا فەرمانت پێ کردبووین، کەسێك لە ئاگردا نەماوە خێرێکی تێدا بێت، پاشان خودا دەفەرموێت: فریشە شفاعەتی کرد، و پێغەمبەران شفاعەتیان کرد، و باوەڕداران شفاعەتیان کرد، "أرحم الراحمين"[2] ماوەتەوە، فەرمووی: مشتێك-یان فەرمووی دوو مشت- لە ئاگر خەڵك دەردەهێنێت کە هەرگیز خێریان ئەنجام نەداوە، سووتاون تا بوون بە خەڵوز، فەرمووی: دەهێنرێن بۆ ئاوێك پێی دەوترێت ئاوی ژیان[3]، لەو ئاوە دەکرێت بەسەریاندا و دەڕوێنەوە وەك**

---

[1] واتە: موجادەلە کردنی یەکێك لە ئێوە بۆ بەرگری کردن لە هاوەڵەکەی لە حەقدا-و.

[2] واتە: خودای "أرحم الراحمين" ماوە شفاعەت بکات، شفاعەتی خودا داباراندنی بەخشندەیی و میهرەبانی خۆیەتی، ئەگینا خودا تکا لە کەس ناکات بۆ لێخۆشبوونی لە بەندەکان-و.

[3] ئاوی ژیان: یان ئاوی زیندەگی-و.

چۆن دەنکە تۆو لە قەراغ سێڵاودا دەڕوێت، لە جەستەیان-وەك مرواری- دێنە دەرەوە، لە گەردنیاندا مۆرێك هەیە: ڕزگارکروانی خودا[1]، فەرمووی: پێیان دەوترێت: بڕۆنە ناو بەهەشتەوە، ئەو شتانەی ئاواتتان بۆ خواست یان بینیتان بۆ ئێوە لە لای لەوەش من باشتر هەیە، فەرمووی: دەڵێن: پەروەردگار، چ شتێك لەمە باشترە؟ فەرمووی: دەفەرموێت: ڕازیبوونی من لەسەر ئێوە، بۆ هەتاهەتا لێتان زویر نابم).

## ٢٠- دەروازەی: دوایین کەسێك دەچێتە بەهەشتەوە

٢٤٠- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنِّي لأَعْلَمُ آخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجاً مِنْهَا، وَآخِرَ أَهْلِ الجَنَّةِ دُخُولاً، رَجُلٌ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ حَبْواً، فَيَقُولُ اللهُ: اذْهَبْ فادْخُلِ الجَنَّةَ، فَيَأْتِيهَا، فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلأَى، فَيَرْجِعُ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا مَلأَى، فَيَقُولُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الجَنَّةَ، فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلأَى، فَيَرْجِعُ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا ملأَى، فَيَقُولُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الجَنَّةَ، فَإِنَّ لَكَ مِثْلَ الدُّنْيَا وَعَشَرَةَ أَمْثَالِهَا ـ أَوْ: إِنَّ لَكَ مِثْلَ عَشَرَةِ أَمْثَالِ الدُّنْيَا ـ فَيَقُولُ: أَتَسْخَرُ مِنِّي ـ أَوْ: تَضْحَكُ مِنِّي ـ وأَنْتَ المَلِكُ!). فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ، وَكَانَ يُقَالُ: ذَلِكَ أَدْنَىَ أَهْلِ الجَنَّةِ مَنْزِلَةً. [خ٦٥٧١/ م١٨٦]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دوایین کەسێك لە ئاگر دێتە دەرەوە و دوایین کەسێك لە ئەهلی بەهەشت دەچێتە بەهەشتەوە من دەیناسم، پیاوێك بە گاوەڵکێ لە ئاگر دێتە دەرەوە، خودا دەفەرموێت: بڕۆ و بچۆرە ناو بەهەشت، ئەویش دێت بۆ بەهەشت، وا خەیاڵ دەکات بەهەشت پڕبووە، دەگەڕێتەوە و دەڵێت: ئەی پەروەردگار، بەهەشتم بینی پڕ بوو، خودا دەفەرموێت: بڕۆ و بچۆرە ناو بەهەشتەوە، ئەویش دێت بۆ بەهەشت، وا خەیاڵ دەکات بەهەشت پڕبووە، دەگەڕێتەوە و دەڵێت: ئەی پەروەردگار، بەهەشتم بینی پڕ بوو، خودا دەفەرموێت: بڕۆ و بچۆرە ناو بەهەشتەوە، هاوتای دنیا-یان دە ئەوەندەی

[1] واتە: لێی نوسراوە: ڕزگارکراوانی خودا-و.

**هاوشێوەی دنیا– بۆ تۆیە، کەسەکە دەڵێت: گاڵتەم پێ دەکەی–یان پێم پێدەکەنی– لە کاتێکدا تۆ مەلیکی)**، پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی پێکەنی تا ددانەکانی تەنیشتی دەرکەوتن، دەوترا: ئەوە کەمترین پلە و پایەی ئەهلی بەهەشتە.

٢٤١– (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ أَرْبَعَةٌ فَيُعْرَضُونَ عَلَى اللهِ، فَيَلْتَفِتُ أَحَدُهُمْ، فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ إِذْ أَخْرَجْتَنِي مِنْهَا فَلاَ تُعِدْنِي فِيهَا، فَيُنْجِيهِ اللهُ مِنْهَا). [م١٩٢]

(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(چوار لە ئاگر دەردەهێنرێن و دەهێنرێن بۆ لای خودا، یەکێکیان لادەکاتەوە و دەڵێت: ئەی پەروەردگار، کە منت لە ئاگر دەرهێنا مەمگێڕەوە بۆ ناو ئاگر، بۆیە خودا لە ئاگر رزگاری دەکات)**.

## ٢١– دەروازەی: ڕەزامەندی خودا لەسەر ئەهلی بەهەشت

٢٤٢– (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَقُولُ لأَهْلِ الجَنَّةِ: يَا أَهْلَ الجَنَّةِ، فَيَقُولُونَ: لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ، فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: وَما لَنَا لاَ نَرْضَى وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا ما لَمْ تُعْطِ أَحَداً مِنْ خَلْقِكَ، فَيَقُولُ: أَنَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذلِكَ، قالُوا: يَا رَبِّ، وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذلِكَ؟ فَيَقُولُ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوانِي، فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَداً). [خ٦٥٤٩/ م٢٨٢٩]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا تبارك وتعالى بە ئەهلی بەهەشت دەفەرموێت: ئەی ئەهلی بەهەشت، ئەوانیش دەڵێن: "لبيك ربنا وسعديك"، دەفەرموێت: ئایا ڕازی بوون؟ ئەوانیش دەڵێن: بۆچی ڕازی نابین، لە کاتێکدا شتانێکت بە ئێمە داوە بە هیچ یەکێك لە دروستکراوانت نەبەخشیوە، خودا دەفەرموێت: باشتر لەوەش بە ئێوە دەبەخشم، دەڵێن: بۆچی چ شتێك لەمە باشترە؟ دەفەرموێت: ڕیزوانی خۆم بەسەر ئێوەدا دادەبارێنم و لەدوای ئەوە بەهەتاهەتایی لێتان زویر نابم)**.

## ٢٢- دەروازەی: باوەڕداران لە دوارۆژ پەروەردگاریان(سبحانه) دەبینن

٢٤٣- (م) عَنْ صُهَيْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ، قَالَ: يَقُولُ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: تُرِيدُونَ شَيْئاً أَزِيدُكُمْ؟ فَيَقُولُونَ: أَلَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنَا؟ أَلَمْ تُدْخِلْنَا الجَنَّةَ وَتُنَجِّنَا مِنَ النَّارِ؟ قَالَ: فَيَكْشِفُ الحِجَابَ، فَمَا أُعْطُوا شَيْئاً أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَى رَبِّهِمْ عزّ وجل). [م١٨١]

(م) لە سوهەیبەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(کاتێک ئەهلی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوە، فەرمووی: خودا تبارك وتعالى دەفەرموێت: شتێکتان دەوێ بۆتان زیاد بکەم؟ ئەوانیش دەڵێن: ئایا روخسارت سپی نەکردینەوە؟ ئایا ئێمەت نەبردە بەهەشتەوە و لە ئاگر رزگارت نەکردین؟ فەرمووی: خودا پەردە لادەدات، هیچ شتێکیان پێ نەدراوە لە بینینی پەروەردگاریان(ﷻ) لایان خۆشتر بێت)**.

## ٢٣- دەروازەی: پلەکانی بەهەشت

٢٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (فِي الجَنَّةِ مِائَةُ دَرَجَةٍ، مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ مِائَةُ عَامٍ). [ت٢٥٢٩]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە بەهەشت سەد پلە هەیە، نێوان هەردوو پلەیەك سەد ساڵە)**.

٢٤٥- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (فِي الجَنَّةِ مِائَةُ دَرَجَةٍ، مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، وَالفِرْدَوْسُ أَعْلاَهَا دَرَجَةً، وَمِنْهَا تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الجَنَّةِ الْأَرْبَعَةُ، وَمِنْ فَوْقِهَا يَكُونُ العَرْشُ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللهَ فَسَلُوهُ الفِرْدَوْسَ). [ت٢٥٣١]

لە عوبادەی کوڕی صامتەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە بەهەشت سەد پلە هەیە، نێوان هەردوو پلەیەك وەك نێوانی ئاسمان و زەوییە، فیردەوس بالاترین**

**پلەیە، لەوێوە چوار ڕووبارەکەی بەهەشت هەڵدەقوڵێن، سەرەوەی بریتییە لە عەرش، گەر داواتان لە خودا کرد داوای فیردەوسی لێ بکەن).**

## ٢٤- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی بەهەشت و ئەهلی بەهەشت هاتووە

**٢٤٦-** عن سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَن النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لَوْ أَنَّ مَا يُقِلُّ ظُفُرٌ مِمَّا فِي الجَنَّةِ بَدَا، لَتَزَخْرَفَتْ لَهُ مَا بَيْنَ خَوَافِقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَلَوْ أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ اطَّلَعَ فَبَدَا أَسَاوِرُهُ، لَطَمَسَ ضَوْءَ الشَّمْسِ كَمَا تَطْمِسُ الشَّمْسُ ضَوْءَ النُّجُومِ**). [ت٢٥٣٨]

* صحيح.

لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**گەر بڕی نینۆکێك لەوەی لە بەهەشتدایە دەربکەوێت ئەوەی لە نێوان ئاسۆی ئاسمانەکان و زەویدان بۆی دەڕازێنەوە، گەر پیاوێك لە ئەهلی بەهەشت دەربکەوێت و دەستەوانەکانی دەربکەون ڕۆشنایی خۆر دەکوژێنێتەوە[1] وەك چۆن خۆر ڕۆشنایی ئەستێرەکان دەکوژێنێتەوە**).

**٢٤٧-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَوْضِعُ سَوْطٍ فِي الجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا**). [جه٤٣٣٠]

* صحيح.

لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**شوێنی قەمچییەك لە بەهەشت باشتر و چاکترە لە دنیا و ئەوەی تیایدایە**).

---

[1] یان دەسڕێتەوە-و.

**٢٤٨**– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(يُبْعَثُ أَهْلُ الجَنَّةِ عَلى صُورَةِ آدَمَ، فِي مِيْلادِ ثَلاثٍ وثَلاثِينَ سَنَةٍ، جُرْداً مُرْداً مُكَحَّلينَ، ثُمَّ يُذْهَبُ بِهِمْ إِلى شَجَرَةٍ فِي الجَنَّةِ، فيُكتبونَ فِيها، لا تَبْلَى ثِيَابُهُمْ، وَلا يَفْنَى شَبَابُهُم)**. [مخ٧/٢٧١٦]

* إسناده صحيح.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەهلی بەهەشت لە شێوەی ئادەمدا زیندوو دەکرێنەوە، لە تەمەنی سی و سێ ساڵی، جەستە بێ موو و روخسار بێ ریش و چاوڕژاو، پاشان دەیانبەن بۆ لای درەختێك لە بەهەشت تیایدا دەنوسرێن، پۆشاکەکانیان ناڕزێن و گەنجێتییان بەسەر ناچێت)**.

## ١- دەروازەی: ئیمان بە خێر و شەڕی قەدەر

**٢٤٩**– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، حَتَّى يَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَهُ، وَأَنَّ مَا أَخْطَأَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ)**. [ت٢١٤٤]

* صحيح.

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەندەیەك باوەڕدار نییە تا ئیمان دەهێنێت بە خێر و شەڕی قەدەر، تا دەزانێت ئەوەی تووشی دەبێت نەدەکرا تووشی نەبێت، ئەوەش تووشی نابێت نەدەکرا تووشی ببێت).**

**٢٥٠**– عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِأَرْبَعٍ: يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، بَعَثَنِي بِالحَقِّ، وَيُؤْمِنُ بِالمَوْتِ، وَيُؤْمِنُ بِالبَعْثِ بَعْدَ المَوْتِ، وَيُؤْمِنُ بِالقَدَرِ)**. [ت٢١٤٥/ جه٨١]

* صحيح.

**لە عەلییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەندەیەك ئیمان ناهێنێت تا ئیمان بە چوار[1] دەهێنێت: شایەتی بدات خودا تاك و تەنهایە و من پێغەمبەری خودام و خودا بە حەق ڕەوانەی کردووم، باوەڕی بە مردن هەبێت، باوەڕی بە زیندووبوونەوەی دوای مردن هەبێت، و باوەڕی بە قەدەر هەبێت).**

**٢٥١**– عَن عَبْدِ الله بْنِ فَيْروز الدَّيْلَمِيِّ قَالَ: أَتَيْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ فَقُلْتُ لَهُ: وَقَعَ فِي نَفْسِي شَيْءٌ مِنَ القَدَرِ، فَحَدِّثْنِي بِشَيْءٍ لَعَلَّ اللهَ أَنْ يُذْهِبَهُ مِنْ قَلْبِي، فقَالَ: لَوْ أَنَّ اللهَ عَذَّبَ أَهْلَ سَمَاوَاتِهِ وَأَهْلَ أَرْضِهِ، عَذَّبَهُمْ وَهُوَ غَيْرُ ظَالِمٍ لَهُمْ، وَلَوْ رَحِمَهُمْ كَانَتْ رَحْمَتُهُ خَيْراً لَهُمْ مِنْ أَعْمَالِهِمْ، وَلَوْ أَنْفَقْتَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَباً فِي سَبِيلِ اللهِ، مَا قَبِلَهُ اللهُ مِنْكَ حَتَّى تُؤْمِنَ بِالقَدَرِ، وَتَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَأَنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، وَلَوْ مُتَّ عَلَى غَيْرِ هَذَا لَدَخَلْتَ النَّارَ.

---

[1] **بە چوار: واتە: بە چوار شت–و.**

قَالَ: ثُمَّ أَتَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ، فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ، قَالَ: ثُمَّ أَتَيْتُ حُذَيْفَةَ بْنَ اليَمَانِ، فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ، قَالَ: ثُمَّ أَتَيْتُ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ فَحَدَّثَنِي عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مِثْلَ ذَلِكَ. [د٤٦٩٩/ جه٧٧]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی فەیروزی دەیلەمییەوە، وتی: هاتم بۆ لای ئوبەی کوڕی کەعب و پێم وت: شتێك دەربارەی قەدەر کەوتووەتە نەفسمەوە[1]، باسی شتێکم بۆ بکە بەڵکو خودا لە دڵم دەریبکات، وتی: گەر خودا سزای ئەهلی ئاسمانەکان و ئەهلی زەوییەکەی بدات سزای داون و ئەو ستەمی لێ نەکردوون، گەر بەزەیيان پێ بکات بەزەییەکەی لە کارەکانیان بۆ ئەوان باشترە، گەر بە نموونەی چیای ئوحد زێڕ لە ڕێگەی خودا خەرج بکەی خودا لێت قبووڵ ناکات تا ئیمان بە قەدەر دەهێنی و دەزانیت ئەوەی تووشت هاتووە نەدەبوا توشت نەبێت، گەر لەسەر شتێکی تر جگە لەمە بمریت دەچیتە ناو ئاگرەوە.**

**وتی: پاشان هاتم بۆ لای عەبدوڵای کوڕی مەسعوود هەمان شتی وت، وتی: پاشان هاتم بۆ لای حوزەیفەی کوڕی یەمان هەمان شتی وت، وتی: پاشان هاتم بۆ لای زەیدی کوڕی سابیت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەمان شتی بۆ باس کردم.**

**٢٥٢-** عن عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ أنه قال لِابْنِهِ: يَا بُنَيَّ إِنَّكَ لَنْ تَجِدَ طَعْمَ حَقِيقَةِ الْإِيمَانِ حَتَّى تَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَمَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللهُ الْقَلَمَ، فَقَالَ لَهُ: اكْتُبْ، قَالَ: رَبِّ، وَمَاذَا أَكْتُبُ؟ قَالَ: اكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ**). يَا بُنَيَّ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَنْ مَاتَ عَلَى غَيْرِ هَذَا فَلَيْسَ مِنِّي**). [د٤٧٠٠/ ت٢١٥٥، ٣٣١٩]

* صحيح.

**لە عوبادەی کوڕی صامتەوە بە کوڕەکەی خۆی وت: کوڕی خۆم، تۆ چێژی ڕاستەقینەی ئیمان نابینییەوە تا دەزانی ئەوەی تووشت دەبێت نەدەکرا تووشت**

---

[1] **کەوتووتە نەفسمەوە: واتە: کەوتووتە ناخمەوە-و.**

نەبێت، ئەوەش تووشت نابێت نەدەکرا تووشت ببێت، گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(یەکەمین شتێك خودا دروستی کرد قەڵەم بوو، پێی فەرموو: بنووسە، وتی: پەروەردگار چی بنووسم؟ فەرمووی: بڕ و ئەندازەی هەموو شت بنووسە تا قیامەت هەڵدەستێ)**، کوڕی خۆم، من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس لەسەر شتێکی تر جگە لەمە بمرێت لە من نییە)**.

## ٢- دەروازەی: سەرەتای خەلق(دروستکردن)

**٢٥٣**- (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (خُلِقَتِ الْمَلاَئِكَةُ مِنْ نُورٍ، وَخُلِقَ الجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ، وَخُلِقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ). [م٢٩٩٦]

(م) لە عائیشەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(فریشتە لە نوور دروستکراون، جنۆکە لە بڵێسەی ئاگر دروستکراون، ئادەمیش لەوە دروستکراوە بۆتان وەسف کراوە[1])**.

**٢٥٤**- (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لَمَّا صَوَّرَ اللهُ آدَمَ فِي الجَنَّةِ تَرَكَهُ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَتْرُكَهُ، فَجَعَلَ إِبْلِيسُ يُطِيفُ بِهِ، يَنْظُرُ مَا هُوَ، فَلَمَّا رَآهُ أَجْوَفَ عَرَفَ أَنَّهُ خُلِقَ خَلْقاً لاَ يَتَمَالَكُ). [م٢٦١١]

(م) لە ئەنەسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کاتێك خودا لە بەهەشت شێوەی بە ئادەم بەخشی، خودا چەند بخوازێت وازیلێهێنا، ئیبلیس بە دەوریدا دەسوڕایەوە، وردەبوویەوە ئەمە چییە، کاتێك بینی ناوەکەی بۆش بوو زانی بە دروستکردنێك دروستکراوە خۆی پێ ناگیرێت[2])**.

---

[1] واتە: لە خاك دروستکراوە-و.

[2] واتە: لەبەردەم حەزەکان خۆی پێ ناگیرێت-د.

**٢٥٥**– عن أبي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ اللهَ خَلَقَ آدَمَ مِنْ قَبْضَةٍ قَبَضَهَا مِنْ جَمِيعِ الْأَرْضِ، فَجَاءَ بَنُو آدَمَ عَلَى قَدْرِ الْأَرْضِ: جَاءَ مِنْهُمْ الْأَحْمَرُ، وَالْأَبْيَضُ، وَالْأَسْوَدُ، وَبَيْنَ ذَلِكَ، وَالسَّهْلُ وَالْحَزْنُ، وَالْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ)**. [د٤٦٩٣/ ت٢٩٥٥]

* صحيح.

**لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودا ئادەمی دروست كرد لە مشتێك[1] كە لە هەموو زەوی گرتبوو، ئادەمیزاد بەپێی زەوی هاتوون، سوور، و سپی، و رەش و نێوان ئەوانەیان[2] لێوە هاتووە، هەر بەو جۆرە ئاسان و سەخت، و پیس و پاك).**

**٢٥٦**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لَمَّا خَلَقَ اللهُ آدَمَ وَنَفَخَ فِيهِ الرُّوحَ، عَطَسَ، فَقَالَ: الحَمْدُ لِلَّهِ، فَحَمِدَ اللهَ بِإِذْنِهِ، فَقَالَ لَهُ رَبُّهُ: يَرْحَمُكَ اللهُ يَا آدَمُ! اذْهَبْ إِلَى أُولَئِكَ المَلَائِكَةِ . إِلَى مَلإٍ مِنْهُمْ جُلُوسٍ . فَقُلْ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، قَالُوا: وَعَلَيْكَ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى رَبِّهِ، فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ بَنِيكَ بَيْنَهُمْ. فَقَالَ اللهُ لَهُ وَيَدَاهُ مَقْبُوضَتَانِ: اخْتَرْ أَيَّهُمَا شِئْتَ، قَالَ: اخْتَرْتُ يَمِينَ رَبِّي . وَكِلْتَا يَدَيْ رَبِّي يَمِينٌ مُبَارَكَةٌ . ثُمَّ بَسَطَهَا فَإِذَا فِيهَا آدَمُ وَذُرِّيَّتُهُ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ مَا هَؤُلَاءِ؟ فَقَالَ: هَؤُلَاءِ ذُرِّيَّتُكَ، فَإِذَا كُلُّ إِنْسَانٍ مَكْتُوبٌ عُمْرُهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ، فَإِذَا فِيهِمْ رَجُلٌ أَضْوَؤُهُمْ . أَوْ مِنْ أَضْوَئِهِمْ . قَالَ: يَا رَبِّ! مَنْ هَذَا؟ قَالَ: هَذَا ابْنُكَ دَاوُدُ قَدْ كَتَبْتُ لَهُ عُمْرَ أَرْبَعِينَ سَنَةً، قَالَ: يَا رَبِّ! زِدْهُ فِي عُمْرِهِ، قَالَ: ذَاكَ الَّذِي كَتَبْتُ لَهُ. قَالَ: أَيْ رَبِّ، فَإِنِّي قَدْ جَعَلْتُ لَهُ مِنْ عُمْرِي سِتِّينَ سَنَةً، قَالَ: أَنْتَ وَذَاكَ. قَالَ: ثُمَّ أُسْكِنَ الجَنَّةَ مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ أُهْبِطَ مِنْهَا، فَكَانَ آدَمُ يَعُدُّ لِنَفْسِهِ، قَالَ: فَأَتَاهُ مَلَكُ المَوْتِ، فَقَالَ لَهُ آدَمُ: قَدْ عَجَّلْتَ، قَدْ كُتِبَ لِي أَلْفُ سَنَةٍ. قَالَ: بَلَى وَلَكِنَّكَ جَعَلْتَ لِابْنِكَ دَاوُدَ سِتِّينَ سَنَةً، فَجَحَدَ فَجَحَدَتْ ذُرِّيَّتُهُ، وَنَسِيَ فَنَسِيَتْ ذُرِّيَّتُهُ. قَالَ: فَمِنْ يَوْمِئِذٍ أُمِرَ بِالكِتَابِ وَالشُّهُودِ)**. [ت٣٣٦٨]

* حسن صحيح.

[وانظر: **٢٠٩٠** ذكر العرش.

وانظر: **٣٥٤١** في خلق آدم].

---

[1] **لە مشتێك: واتە: لە مشتێك خاك–و.**

[2] **واتە: تێكەڵ كردنی رەنگی سوور و سپی و رەش–و.**

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کاتێك خودا ئادەمی دروست کرد و ڕۆحی بەبەردا کرد، پژمی و وتی: (الحمد لله)، ئەو بە مۆڵەتی خودا حەمدی خودای کرد، پەروەردگاری پێی فەرموو: خوا رەحمت پێ بکات، ئەی ئادەم، برۆ بۆ لای ئەو فریشتانە-بۆ لای کۆمەڵێك لەوان کە دانیشتبوون- پێیان بڵێ: (السلام علیکم)، ئەوانیش وتیان: (وعلیك السلام ورحمة الله)، پاشان گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری، پێی فەرموو: ئەوە سڵاوی خۆت و سڵاوی ڕۆڵەکانی تۆیە لە نێوان خۆیان، خودا-کە هەردوو دەستی داخستبوو- پێی فەرموو: کامیانت گەرەکە هەڵیبژێرە، وتی[1]: دەستی راستی پەروەردگارم هەڵبژارد-هەردوو دەستی پەروەردگارم راست و فەڕارە- پاشان کردییەوە[2] بینی ئادەم و نەوەکانی ئادەمی تێدایە، وتی[3]: ئەی پەروەردگار، ئەوانە چین؟ فەرمووی: ئەوانە نەوەکانی تۆن، بینی هەر مرۆڤێك تەمەنەکەی لە نێوچاوانی نووسراوە، بینی پیاوێك لە هەموویان گەشاوەتر بوو، وتی: پەروەردگار، ئەمە کێیە؟ فەرمووی: ئەوە کوڕی خۆت داودە، چل ساڵ تەمەنم بۆ نووسیوە، وتی: ئەی پەروەردگار، لە تەمەنی بۆ زیاد بکە، فەرمووی: ئەوەم بۆ نووسیوە، وتی: ئەی پەروەردگار، من لە تەمەنی خۆم بۆی دەکەم بە شەست ساڵ، فەرمووی: تۆ ئەوەت بۆ هەیە، فەرمووی[4]: پاشان چەند خودا بخوازێت لە بەهەشت نیشتەجێ کرا، پاشان لە بەهەشت دابەزی، ئادەم ڕۆژەکانی تەمەنی خۆی دەژمارد، فەرمووی[5]: فریشتەی گیانکێشان هات بۆ لای، ئادەم پێی فەرموو: پەلەت کردووە، هەزار ساڵم بۆ نووسراوە، وتی: بەڵێ، وایە، بەڵام تەمەنی کوڕەکەی خۆت داود کرد بە شەست ساڵ، ئادەم نەرێی ئەوەی کرد، بۆیە نەوەکانیشی ملێچییان کرد، ئەو لەبیری چوو و نەوەکانیشی لەبیریانچوو، وتی: لەو ڕۆژەوە فەرمان کرا بە نووسین و شایەت).

---

[1] واتە: ئادەم وتی-و.

[2] واتە پەروەردگار دەستی راستی خۆی کردەوە-و.

[3] ئادەم وتی-و.

[4] واتە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی-و.

[5] واتە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی-و.

## ٣- دەروازەی: شەیتان و تووشکردنی خەڵکی بە فیتنە

**٢٥٧-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ إِبْلِيسَ يَضَعُ عَرْشَهُ عَلَى الْمَاءِ، ثُمَّ يَبْعَثُ سَرَايَاهُ، فَأَدْنَاهُمْ مِنْهُ مَنْزِلَةً أَعْظَمُهُمْ فِتْنَةً، يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ: فَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا، فَيَقُولُ: مَا صَنَعْتَ شَيْئاً. قَالَ: ثُمَّ يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ: مَا تَرَكْتُهُ حَتَّى فَرَّقْتُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ امْرَأَتِهِ، قَالَ: فَيُدْنِيهِ مِنْهُ وَيَقُولُ: نِعْمَ أَنْتَ). [م٢٨١٣]

(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئیبلیس عەرشەکەی خۆی لەسەر ئاو دادەنێت، پاشان سرییەکانی ڕەوانە دەکات، نزیکترین کەسیان لە ئەوەوە ئەوەیانە فتنەکەی مەزنترە، یەکێك لەوان دێت و پێی دەڵێ: ئەوە و ئەوەم کرد، پێی دەڵێ: تۆ هیچت نەکردووە، پاشان یەکێکی تریان دێت و دەڵێت: وازملێنەهێنا تا لە ژنەکەیم جیاکردەوە، فەرمووی: لە خۆی نزیك دەکاتەوە و دەڵێت: تۆ باشترینی)**.

**٢٥٨-** (م) وعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ أَيِسَ أَنْ يَعْبُدَهُ الْمُصَلُّونَ فِي جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَلَكِنْ فِي التَّحْرِيشِ بَيْنَهُمْ). [م٢٨١٢]

(م) هەر لە جابرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(شەیتان لەوە بێهیوا بووە نوێژگەران لە جەزیرەی عەرەب بیپەرستن، بەڵام نانەوەی پشێونکەی[١] نێوانیان)**.

**٢٥٩-** عَنْ سَبْرَةَ بْنِ أَبِي فَاكِهٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ الشَّيْطَانَ قَعَدَ لِابْنِ آدَمَ بِأَطْرُقِهِ، فَقَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الْإِسْلَامِ، فَقَالَ: تُسْلِمُ وَتَذَرُ دِينَكَ وَدِينَ آبَائِكَ وَآبَاءِ أَبِيكَ؟ فَعَصَاهُ فَأَسْلَمَ. ثُمَّ قَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الْهِجْرَةِ، فَقَالَ: تُهَاجِرُ وَتَدَعُ أَرْضَكَ وَسَمَاءَكَ، وَإِنَّمَا مَثَلُ الْمُهَاجِرِ كَمَثَلِ الفَرَسِ فِي الطِّوَلِ؟ فَعَصَاهُ فَهَاجَرَ. ثُمَّ قَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الْجِهَادِ فَقَالَ: تُجَاهِدُ، فَهُوَ جَهْدُ النَّفْسِ وَالْمَالِ، فَتُقَاتِلُ فَتُقْتَلُ، فَتُنْكَحُ الْمَرْأَةُ وَيُقْسَمُ الْمَالُ؟ فَعَصَاهُ فَجَاهَدَ).

---

[١] پشێونکە: ناکۆکی و نەیاری –و.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ، كَانَ حَقّاً عَلَى اللهِ عزّ وجل أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، وَمَنْ قُتِلَ كَانَ حَقّاً عَلَى اللهِ عزّ وجل أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، وَإِنْ غَرِقَ كَانَ حَقّاً عَلَى اللهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، أَوْ وَقَصَتْهُ دَابَّتُهُ كَانَ حَقّاً عَلَى اللهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ). [ن٣١٣٤]

* صحيح.

[وانظر: **٣٧٧٧** في إسلام شيطان النبي صلّى الله عليه وسلّم.

وانظر: **١٨٧١**، **٣٤٠٨** في أن الشيطان يجري من ابن آدم مجرى الدم].

لە سەبرەی کوڕی ئەبی فاکیهەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(شەیتان لەسەر ڕێگەکانی ئادەمیزاد دانیشتووە، لەسەر ڕێگەی ئیسلام بۆی دانیشتووە و دەڵێت: موسڵمان دەبیت و ئایینی خۆت و ئایینی باب و باپیرانت بەجێدەهێڵیت؟ کەسەکە لێی یاخی دەبێت و موسڵمان دەبێت، پاشان لەسەر ڕێگەی کۆچ بۆی دادەنیشێت و دەڵێت: کۆچ دەکەی و زەوی و ئاسمانی خۆت بەجێدەهێڵی؟ نموونەی کەسی کۆچکەر وەك نموونەی ئەسپ وایە بە پەت و مێخزنجیری درێژەوە، لێی یاخی دەبێت و کۆچ دەکات، پاشان لەسەر ڕێگەی جیهاد بۆی دادەنیشێت و دەڵێت: جیهاد دەکەی، ئەوە شەکەتی نەفس و تیابردنی ماڵ و سامانە، دەجەنگی و دەکوژرێی و ژنەکەت شوو دەکات و ماڵ و سامانەکەت بەش دەکەن؟ لێی یاخی دەبێت و جیهاد دەکات).**

پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس ئەوەی کرد حەقە لەسەر خودا(عز وجل) بیباتە بەهەشتەوە، هەر کەس کوژرا حەقە لەسەر خودا بیباتە بەهەشتەوە، گەر لە ئاودا نوقم بوو حەقە لەسەر خودا بیباتە بەهەشتەوە، ولاخەکەی گازی لێ بگرێت حەقە لەسەر خودا بیباتە بەهەشتەوە).**

## ٤- دەروازەی: دروستبوونی ئادەمیزاد لە سکی دایکدا

**٢٦٠**- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَهْوَ الصَّادِقُ المَصْدُوقُ: (إِنَّ خَلْقَ أَحَدِكُمْ يُجْمَعُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوماً وَأَرْبَعِينَ لَيْلَةً، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَهُ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَهُ، ثُمَّ يُبْعَثُ إِلَيْهِ المَلَكُ، فَيُؤْذَنُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ، فَيَكْتُبُ: رِزْقَهُ، وَأَجَلَهُ، وَعَمَلَهُ، وَشَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ، ثُمَّ يَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ حَتَّى لاَ يَكُونَ

بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ إِلاَّ ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُ النَّارَ. وَإِن أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، حَتَّى مَا يَكُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ إِلاَّ ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الكِتَابُ، فَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا). [خ٧٤٥٤ (٣٢٠٨)، م٢٦٤٣]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ)–کە "الصادق المصدوق"[1]ە– بۆی باس کردین: **(دروستبوونی یەکێك لە ئێوە لە سکی دایکدا چل رۆژ و چل شەو دەمێنێتەوە[2]، پاشان بەهەمان شێوە[3] دەبێتە نووساو(علقة)، پاشان بە هەمان شێوە دەبێتە جواو(مضغة)، پاشان فریشتەیەکی بۆ رەوانە دەکرێت، مۆڵەتی چوار وشەی پێ دەدرێت، ئەویش: رۆزییەکەی، و وادەی مردنەکەی، و کارەکەی: بەدبەخت یان بەختەوەری، بۆ دەنووسێت، پاشان رۆحی دەکرێت بەبەردا، یەکێك لە ئێوە بە کاری ئەهلی بەهەشت کار دەکات تا لە نێوان ئەو و بەهەشت باڵێك دەمێنێت، نووسراوی لێ پێش دەکەوێ و بە کاری ئەهلی ئاگر کار دەکات و دەچێتە ناو ئاگرەوە، یەکێك لە ئێوە بە کاری ئەهلی ئاگر کار دەکات تا لە نێوان ئەو و ئاگر تەنها باڵێك دەمێنێت نووسراوی لێ پێشدەکەوێت و بە کاری ئەهلی بەهەشت کار دەکات و دەچێتە بەهەشتەوە).**

**٢٦١**– (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّ اللهَ وَكَّلَ بِالرَّحِمِ مَلَكاً، يَقُولُ: يَا رَبِّ نُطْفَةٌ، يَا رَبِّ عَلَقَةٌ، يَا رَبِّ مُضْغَةٌ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقْضِيَ خَلْقَهُ قَالَ: أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى؟ شَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ؟ فَمَا الرِّزْقُ وَالأَجَلُ؟ فَيُكْتَبُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ). [خ٣١٨/ م٢٦٤٦]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خودا فریشتەیەکی بە رەحم تایبەت کردووە، دەڵێت: ئەی پەروەردگار نوتفەیە، ئەی پەروەردگار،**

---

[1] "الصادق المصدوق": کەسێکی راستگۆیە و خودا و خەڵکیش بە راستگۆی دەزانن–و.

[2] واتە: چل شەو و چل رۆژ بە نوتفەیی دەمێنێتەوە–و.

[3] بە هەمان شێوە: واتە چل شەو و چل رۆژی تر–و.

**نووساو(علقة)یە، ئەی پەروەردگار، جواو(مضغة)یە، گەر ویستی دروستکردنەکەی تەواو بکات دەڵێ: ئایا نێر بێت یان مێ؟ ئایا بەدبەخت بێت یان بەختەوەر؟ ڕۆزی و وادەی مردنەکەی چەندە و چۆنە؟ هەموو ئەوانە لە سکی دایکدا دەنوسرێن).**

## ٥- دەروازەی: نووسینی وادەی مردن و ڕۆزی

**٢٦٢-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ: اللَّهُمَّ! مَتِّعْنِي بِزَوْجِي رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَبِأَبِي أَبِي سُفْيَانَ، وَبِأَخِي مُعَاوِيَةَ. فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّكِ سَأَلْتِ اللهَ لآجَالٍ مَضْرُوبَةٍ، وَآثَارٍ مَوْطُوءَةٍ، وَأَرْزَاقٍ مَقْسُومَةٍ، لاَ يُعَجِّلُ شَيْئاً مِنْهَا قَبْلَ حِلِّهِ، وَلاَ يُؤَخِّرُ مِنْهَا شَيْئاً بَعْدَ حِلِّهِ، وَلَوْ سَأَلْتِ اللهَ أَنْ يُعَافِيَكِ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ، وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ، لَكَانَ خَيْراً لَكِ)**. قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! القِرَدَةُ وَالخَنَازِيرُ هِيَ مِمَّا مُسِخَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ اللهَ عزّ وجل لَمْ يُهْلِكْ قَوْماً، أَوْ يُعَذِّبْ قَوْماً، فَيَجْعَلَ لَهُمْ نَسْلاً، وَإِنَّ القِرَدَةَ وَالخَنَازِيرَ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ)**. [م٢٦٦٣]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: ئوم حەبیبە وتی: خودایە، بەهرەمەندم بکە[1] بە هاوسەرەکەم پێغەمبەری خودا(ﷺ)، بە باوکم ئەبی سوفیان، بە براکەم موعاویە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: **(تۆ داوای وادەی مردنی بڕاوە و ئاساری ڕاخراو و ڕۆزی دابەشکراوت لە خودا کردووە، شتێك لەوانە بەر لە هاتنی پێش ناخات، و شتێك لەوانە لەدوای هاتنی دواناخات، گەر داوات لە خودا بکردبایە لە سزای ئاگر و سزای گۆڕ بتپارێزێ بۆ تۆ باشتر بوو)**. وتی: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، مەیموون و بەراز لەوانە بوون مەسخکران؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(خودا کۆمەڵێکی تیانەبردووە یان کۆمەڵێکی سزانەداوە نەوەیان بۆ بهێڵێتەوە، مەیموون و بەراز بەر لەو مەسخکردنە هەبوون).**

---

[1] بەهرەمەندم بکە: واتە مەرگیان نەبینم و هەمیشە لە خێر و خۆشیدا بیانبینم-و.

## ٦- دەروازەی: (هەموو لەدایکبوویەك لەسەر فیترەت لەدایك دەبێت)

**٢٦٣**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (ما مِنْ مَوْلُودٍ إلاَّ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كما تُنْتَجُ البَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ)، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا﴾ الآيَةَ [الروم: ٣٠].
[خ١٣٥٩ (١٣٥٨)/ م٢٦٥٨]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەموو لەدایکبوویەك**[١] **لەسەر فیترەت لەدایك دەبێت، ئەوە باوك و دایكن دەیکەن بە یەهوودی، یان دەیکەن بە نەصرانی، یان دەیکەن بە مەجووسی، هەروەك چۆن ئاژەڵان ئاژەڵی ئەندام تەواو بەرهەم دەهێنن، ئایا هەستتان کردووە گوێبڕاوێکیان لێوە پەیدا بێت)**، پاشان ئەبو هورەیرە(خوا لێی رازی بێت) ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا﴾[الروم: ٣٠].

## ٧- دەروازەی: (خودا زاناترە بەوەی ئەوان ئەنجامی دەدەن)

**٢٦٤**– (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ أَوْلاَدِ المشْرِكِينَ، فَقَالَ: (اللهُ، إِذْ خَلَقَهُمْ، أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ). [خ١٣٨٣/ م٢٦٦٠]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا دەربارەی منداڵی هاوەڵدانەران، فەرمووی: **(کاتێك خودا ئەوانی دروست کرد زاناتر بوو بەوەی ئەوان ئەنجامی دەدەن)**.

---

[١] لەدایکبوو(مولود): واتە منداڵ–و.

## ٨- دەروازەی: قەڵەم وشکەوە بوو بەوەی تۆ تووشتدێت

**٢٦٥-** (ق) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَيُعْرَفُ أَهْلُ الجَنَّةِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**). قَالَ: فَلِمَ يَعْمَلُ العَامِلُونَ؟ قَالَ: (**كُلٌّ يَعْمَلُ لِمَا خُلِقَ لَهُ، أَوْ لِمَا يُيَسَّرُ لَهُ**). [خ٦٥٩٦/ م٢٦٤٩]

**(ق) لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە، وتی: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا ئەهلی بەهەشت لە ئەهلی ئاگر دەناسرێنەوە[1]؟ (یان: ئایا ئەهلی بەهەشت لە ئەهلی ئاگر جیاکراونەتەوە؟) فەرمووی: (هەریەك كار دەكات بۆئەوەی لەپێناوی دروستكراوە، یان بۆ ئەوەی بۆی ئاسان دەكرێت).**

**٢٦٦-** (م) عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ الدِّيَلِيِّ قَالَ: قَالَ لِي عِمْرَانُ بْنُ الحُصَيْنِ: أَرَأَيْتَ مَا يَعْمَلُ النَّاسُ اليَوْمَ وَيَكْدَحُونَ فِيهِ، أَشَيْءٌ قُضِيَ عَلَيْهِمْ وَمَضَى عَلَيْهِمْ مِنْ قَدَرٍ مَا سَبَقَ؟ أَوْ فِيمَا يُسْتَقْبَلُونَ بِهِ مِمَّا أَتَاهُمْ بِهِ نَبِيُّهُمْ، وَثَبَتَتِ الحُجَّةُ عَلَيْهِمْ؟ فَقُلْتُ: بَلْ شَيْءٌ قُضِيَ عَلَيْهِمْ، وَمَضَى عَلَيْهِمْ. قَالَ فَقَالَ: أَفَلاَ يَكُونُ ظُلْماً؟ قَالَ: فَفَزِعْتُ مِنْ ذَلِكَ فَزَعاً شَدِيداً، وَقُلْتُ: كُلُّ شَيْءٍ خَلْقُ اللهِ وَمِلْكُ يَدِهِ، فَلاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ.

فَقَالَ لِي: يَرْحَمُكَ اللهُ! إِنِّي لَمْ أُرِدْ بِمَا سَأَلْتُكَ إِلاَّ لأَحْزُرَ عَقْلَكَ، إِنَّ رَجُلَيْنِ مِنْ مُزَيْنَةَ أَتَيَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالاَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ مَا يَعْمَلُ النَّاسُ اليَوْمَ، وَيَكْدَحُونَ فِيهِ، أَشَيْءٌ قُضِيَ عَلَيْهِمْ وَمَضَى فِيهِمْ مِنْ قَدَرٍ قد سَبَقَ، أَوْ فِيمَا يُسْتَقْبَلُونَ بِهِ مِمَّا أَتَاهُمْ بِهِ نَبِيُّهُمْ، وَثَبَتَتِ الحُجَّةُ عَلَيْهِمْ؟ فَقَالَ: (**لاَ، بَلْ شَيْءٌ قُضِيَ عَلَيْهِمْ وَمَضَى فِيهِمْ وَتَصْدِيقُ ذَلِكَ فِي كِتَابِ اللهِ عزّ وجل: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ۝﴾**[الشمس: ٧- ٨]). [م٢٦٥٠]

**(م) لە ئەبی ئەسوەدی دیئەلییەوە، وتی: عیمرانی کوڕی حوصەین پێی وتم: ئەوەی ئەمڕۆ خەڵکی ئەنجامی دەدەن و خۆیانی تێدا ماندوو دەکەن دەبینی، ئایا شتێکە بەسەریاندا سەپاوە و بەسەریاندا گوزەری کردووە لە قەدەرێکەوە**

---

[1] واتە: ئایا ئەهلی بەهەشت لە ئەهلی ئاگر جیاکراونەتەوە؟-و.

پێشکەوتووە؟ یان لەوەی بەهۆیەوە روویان لێ دەکرێت لەوەی پێغەمبەرەکەیان بۆ ئەوانی هێناوە و بەڵگە بەسەریاندا جێگیر بووە؟ وتم: بەڵکو شتێکە بەسەریاندا سەپاوە و بەسەریاندا گوزەری کردووە، وتی: عیمران وتی: ئایا ئەوە نابێتە ستەم؟ وتی: لەوەوە ترسێکی گەورە ترس رووی لێکردم و وتم: هەرچی شتە دروستکراوی خودا و موڵکی دەستی ئەون، خودا پرسیاری لێ ناکرێت لەوەی ئەنجامی دەدات ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

پێی وتم: رەحمەتی خودات لێ بێت، من بەوەی پرسیارم لێکردی تەنها ویستم ئەقڵت تاقیبکەمەوە، دوو پیاو لە موزەینە هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوەی ئەمڕۆ خەڵکی ئەنجامی دەدەن و خۆیانی تێدا ماندوو دەکەن، ئایا شتێکە بەسەریاندا سەپاوە و بەسەریاندا گوزەری کردووە لە قەدەرێکەوە پێشکەوتووە؟ یان لەوەی رووبەڕوویان دەکرێتەوە لەوەی پێغەمبەرەکەیان بۆ ئەوانی هێناوە و بەڵگە بەسەریاندا جێگیر بووە؟ فەرمووی: **(نەخێر، بەڵکو شتێکە بەسەریاندا سەپاوە و بەناویاندا گوزەری کردووە، تەصدیقی ئەوەش لە کتێبەکەی خودادایە(عز وجل): ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا۝ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا۝﴾**[الشمس: ٧- ٨]).

**٢٦٧–** (م) عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ المُؤْمِنِينَ قَالَتْ: دُعِيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى جَنَازَةِ صَبِيٍّ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! طوبَى لِهَذَا، عُصْفُورٌ مِنْ عَصَافِيرِ الجَنَّةِ! لَمْ يَعْمَلِ السُّوءَ وَلَمْ يُدْرِكْهُ. قَالَ: **(أَوَ غَيْرَ ذَلِكَ، يَا عَائِشَةُ إِنَّ اللهَ خَلَقَ لِلْجَنَّةِ أَهْلاً، خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ، وَخَلَقَ لِلنَّارِ أَهْلاً، خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ)**. [م٢٦٦٢]

(م) لە دایکی باوەڕدارانەوە، عائیشە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بانگکرا بۆ جەنازەی منداڵێك لە ئەنصار، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، خۆشبەختی بۆ ئەو منداڵە، چۆلەکەیەك لە چۆلەکەکانی بەهەشت، خراپەی ئەنجام نەداوە و نەگەیشت بە خراپە، پێغەمبەر فەرمووی: **(یان شتێکی ترە، ئەی عائیشە، خودا ئەهلی بۆ بەهەشت دروستکردووە، ئەوانی بۆ بەهەشت دروستکردووە و هێشتا لە پشتی**

باوکاندا بوون، ئەهلی بۆ ئاگریش دروستکردووە، ئەوانی بۆ ئاگر دروستکردووە و هێشتا لە پشتی باوکاندا بوون).

**٢٦٨**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ اللهَ عزّ وجل خَلَقَ خَلْقَهُ فِي ظُلْمَةٍ، فَأَلقَى عَلَيْهِمْ مِنْ نُورِهِ، فَمَنْ أَصَابَهُ مِنْ ذَلِكَ النُّورِ اهْتَدَى، وَمَنْ أَخْطَأَهُ ضَلَّ، فَلِذَلِكَ أَقُولُ: جَفَّ القَلَمُ عَلَى عِلْمِ اللهِ). [ت٢٦٤٢]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(خودا(عز وجل) دروستکراوانی لە تاریکی دروست کرد، لە نووری خۆی هەڵدایە سەریان، هەر کەس لەو نوورەی بەرکەوتبێت هیدایەت وەردەگرێت، هەر کەس ئەو نوورەی بەرنەکەوتبێت گومڕا و سەرلێشێواو دەبێت، بۆیە دەڵێم: قەڵەم[1] لەسەر زانستی خودا وشکبوویەوە).**

**٢٦٩**- عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ﴾ [هود:١٠٥]، سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ! فَعَلَى مَا نَعْمَلُ؟ عَلَى شَيْءٍ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ، أَوْ عَلَى شَيْءٍ لَمْ يُفْرَغْ مِنْهُ؟ قَالَ: (بَلْ عَلَى شَيْءٍ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ، وَجَرَتْ بِهِ الْأَقْلاَمُ، يَا عُمَرُ! وَلَكِنْ كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ). [ت٣١١١]

* صحيح.

لە عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ﴾ [هود:١٠٥]، پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد و وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر وایە ئێمە لەسەر چ شتێك کار دەکەین؟ لەسەر شتێك بڕاوەتەوە، یان لەسەر

[1] قەڵەم: واتە مەرەکەبی ئەو قەڵەمەی زانستی ئەزەلی خودای بە دروستکراوان نووسییەوە-و.

شتێك نەبڕاوەتەوە؟ فەرمووی: **(بەڵکو لەسەر شتێك بڕاوەتەوە و قەڵەم پێی جاری بووە، ئەی عومەر، بەڵام هەر کەس ئاسانکراوە[1] بۆ ئەوەی بۆی دروستبووە).**

**٢٧٠-** عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ، وَإِنَّهُ لَمَكْتُوبٌ فِي الكِتَابِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَإِذَا كَانَ قَبْلَ مَوْتِهِ تَحَوَّلَ فَعَمِلَ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَمَاتَ فَدَخَلَ النَّارَ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّهُ لَمَكْتُوبٌ فِي الكِتَابِ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، فَإِذَا كَانَ قَبْلَ مَوْتِهِ تَحَوَّلَ فَعَمِلَ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ فَمَاتَ فَدَخَلَهَا).** [حم٢٤٧٦٢، ٢٤٧٦٧]

* إسناده صحيح، رجاله رجال الصحيح.

[وانظر: **١٦٦٢** (لا أدري ـ وأنا رسول الله ـ ما يفعل بي)].

له عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(پیاو بە کاری ئەهلی بەهەشت کار دەکات، ئەو لە نووسراودا[2] لە ئەهلی ئاگر نووسراوە، کاتێ دەگاتە پێش مردن دەگۆڕێت و بە کاری ئەهلی ئاگر کار دەکات و دەمرێت و دەچێتە ئاگرەوە، هەروەها پیاو بە کاری ئەهلی ئاگر کار دەکات و ئەو لە نووسراودا بە ئەهلی بەهەشت نووسراوە، کاتێ دەگاتە پێش مردن دەگۆڕێت و بە کاری ئەهلی بەهەشت کار دەکات و دەمرێت و دەچێتە بەهەشتەوە).**

## ٩- دەروازەی: هەموو شتێك بە قەدەرە

**٢٧١-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(كَتَبَ اللهُ مَقَادِيرَ الخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ. قَالَ: وَعَرْشُهُ عَلَى المَاءِ).** [م٢٦٥٣]

---

[1] واتە: هەر کەس زانست و ویستی پێدراوە و رێگەی بۆ رۆشن کراوەتەوە-و.

[2] واتە: لە زانستی ئەزەلی خودادا کە لە نوسراوێکدا نوسراوە و لای خۆی(سبحانە وتعالی) هەڵیگرتووە-و.

(م) لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(بەر لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بە پەنجا هەزار ساڵ خودا بڕ و ئەندازەکانی دروستکراوانی دیاری کرد، فەرمووی: عەرشەکەشی لەسەر ئاو بوو).**

**٢٧٢**– (م) عَنْ طَاوُسٍ أَنَّهُ قَالَ: أَدْرَكْتُ نَاساً مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُونَ: كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَرٍ. قَالَ: وَسَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَرٍ، حَتَّى العَجْزُ وَالكَيْسُ، أَوِ الكَيْسُ وَالعَجْزُ).** [م٢٦٥٥]

(م) لە تاووسەوە، وتی: بە خەڵکانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتم دەیانوت: هەموو شتێك بە قەدەرە، وتی: هەروەها گوێم لە عەبدوڵای کوڕی عومەر بوو دەیوت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەموو شتێك بە قەدەرە، تەنانەت دەستەوسانی و زیرەکی و دانایی[1]، یان زیرەکی و دانایی و دەستەوسانی).**

**٢٧٣**– عَنْ أَبِي خِزَامَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَرَأَيْتَ رُقًى نَسْتَرْقِيهَا، وَدَوَاءً نَتَدَاوَى بِهِ، وَتُقَاةً نَتَّقِيهَا، هَلْ تَرُدُّ مِنْ قَدَرِ اللهِ شَيْئاً؟ قَالَ: **(هِيَ مِنْ قَدَرِ اللهِ).** [ت٢٠٦٥، ٢١٤٨/ جه٣٤٣٧]

* حديث حسن.

لە ئەبی حیزامەوە، لە باوکییەوە، وتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، روقییەت پێ چۆنە کە ئێمە ئەنجامی دەدەین، و دەوایەکە خۆمانی پێ چارەسەر دەکەین و خۆپارێزییەکە خۆمانی پێ دەپارێزین، ئایا شتێك لە قەدەری خودا دەگێڕنەوە؟ فەرمووی: **(ئەوانەش لە قەدەری خودان).**

---

[1] دەستەوسانی: بێتوانایی یان دەستەوسانی لە ئەنجامدانی تاعەت، دەبێ لێرەدا "زیرەکی و دانایی" دژی "دەستەوسانی" بێت، کەوابوو "زیرەکی و دانایی" مانای: چالاکی و گورجوگۆڵی و لێزانی دەگەیەنێت.

**٢٧٤**– عَنْ أَنَسٍ قَالَ: خَدَمْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عَشْرَ سِنِينَ، فَمَا بَعَثَنِي فِي حَاجَةٍ لَمْ تَتَهَيَّأْ إِلاَّ قَالَ: (**لَوْ قُضِيَ لَكَانَ، أَوْ لَوْ قُدِّرَ لَكَانَ**). [حب٧١٧٩]

* إسناده صحيح على شرطهما.

**لە ئەنەسەوە، وتی: دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خودام(ﷺ) کرد، هەرکات منی ناردبێت بۆ پێویستییەك و فەراهەم نەبووبێت فەرموویەتی: (گەر بڕیاری لێ بدرابا دەبوو، یان گەر قەدەری پێ بکرابا دەبوو).**

**٢٧٥**– عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ قَالَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، رُقًى كُنَّا نَسْتَرْقِي بِهَا، وَأَدْوِيَةٌ كُنَّا نَتَدَاوَى بِهَا هَلْ تَرُدُّ مِنْ قَدَرِ اللهِ تَعَالَى؟ قَالَ: (**هُو مِنْ قَدَرِ اللهِ**). [ك٨٧، ٧٤٣١]

* قال الذهبي، على شرطهما.

**لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ڕوقییە کە ئەنجامی دەدەین، و دەوایەك خۆمانی پێ تەداوی دەکەین، ئایا لە قەدەری خودا(سبحانە وتعالی) دەگێڕنەوە؟ فەرمووی: (ئەوەش لە قەدەری خودایە).**

## ١٠- دەروازەی: دەستوەردان و تاوتوێ کردنی خودا(سبحانە وتعالی) بۆ دڵان

**٢٧٦**– (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِنَّ قُلُوبَ بَنِي آدَمَ كُلَّهَا بَيْنَ إِ أُصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ، كَقَلْبٍ وَاحِدٍ، يُصَرِّفُهُ حَيْثُ يَشَاءُ**)، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**اللَّهُمَّ مُصَرِّفَ القُلُوبِ صَرِّفْ قُلُوبَنَا عَلَى طَاعَتِكَ**). [م٢٦٥٤]

**(م) لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (دڵی هەموو ئادەمیزادان لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی ڕەحماندان، وەك یەك دڵ، چۆن بخوازێت بەو جۆرە هەڵیان دەسوڕێنێت)، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (أللهم مصرف القلوب صرف قلوبنا علی طاعتك–ئەی تاوتوێکاری دڵان لەسەر تاعەتی خۆت دڵمان تاوتوێ بکە).**

**٢٧٧**- عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ: **(يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ)**، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! آمَنَّا بِكَ، وَبِمَا جِئْتَ بِهِ، فَهَلْ تَخَافُ عَلَيْنَا؟ قَالَ: **(نَعَمْ، إِنَّ الْقُلُوبَ بَيْنَ إِصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ اللهِ، يُقَلِّبُهَا كَيْفَ يَشَاءُ)**. [ت٢١٤٠/جه٣٨٣٤]

* صحيح.

لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) زۆر دەیفەرموو: **(یا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك–ئەی وەرچەرخێنەری دڵان دڵم لەسەر دینەکەت دابمەزرێنە)**، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئیمانمان هێناوە بە تۆ و بەوەی هێناوتە، ئایا بۆ ئێمە دەترسی[1]؟ فەرمووی: **(بەڵێ، دڵ لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی خودادایە، چۆن بخوازێت بەو جۆرە تاوتوێی دەکات و وەریدەچەرخێنێ)**.

## ١١- دەروازەی: ئەوەی لەسەر ئادەمیزاد قەدەر کراوە لە زینا

**٢٧٨**- (ق) عَن ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: ما رَأَيْتُ شَيْئاً أَشْبَهَ بِاللَّمَمِ مِمَّا قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ اللهَ كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنَ الزِّنَى، أَدْرَكَ ذلِكَ لاَ مَحَالَةَ، فَزِنَى العَيْنِ النَّظَرُ، وَزِنَى اللِّسَانِ المَنْطِقُ، وَالنَّفْسُ تَتَمَنَّى وَتَشْتَهِي، وَالفَرَجُ يُصَدِّقُ ذلِكَ كُلَّهُ أَوْ يُكَذِّبُهُ)**.

[خ٦٢٤٣/ م٢٦٥٧]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: هیچ شتێکم نەبینیوە بە **"اللمم–گوناهی بچووک"** بچێت لەوەی ئەبو هورەیرە وتی: لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): **(خودا بەشی زینای لەسەر ئادەمیزاد نووسیوە، بێشك هەردەبێت پێی بگات، زینای چاو نەزەرە، و زینای زمان قسەیە، و نەفس ئاوات دەخوازێ و حەز دەکات، داوێن هەموو ئەوانە بەڕاست دەگێڕێت یان بەدرۆیان دەخاتەوە.**

[1] واتە: ئایا لە سەرئەنجامی خراپ دەترسی بۆ ئێمە؟–و.

## ١٢- دەروازەی: بەڵگەهێنانەوەی ئادەم و موسا لەسەر یەکتر(علیهما السلام)

**٢٧٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**اِحْتَجَّ آدَمُ وَمُوسى، فَقَالَ لَهُ مُوسى: يَا آدَمُ أَنْتَ أَبُونَا خَيَّبْتَنَا وأَخْرَجْتَنَا مِنَ الجَنَّةِ، قَالَ لَهُ آدَمُ: يَا مُوسى اصْطَفَاكَ اللهُ بِكِلاَمِهِ، وَخَطَّ لَكَ بِيَدِهِ، أَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدَّرَهُ اللهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً؟ فَحَجَّ آدَمُ مُوسى، فَحَجَّ آدَمُ مُوسى**)، ثَلاَثاً. [خ٦٦١٤ (٣٤٠٩)/ م٢٦٥٢]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (ئادەم و موسا بەڵگەیان لەسەر یەکتر هێنایەوە، موسا فەرمووی: ئەی ئادەم، تۆ باوکی ئێمە بووی، ئێمەت زیانۆمەند کرد و لە بەهەشت بەدەرتناین، ئادەم پێی فەرموو: ئەی موسا، خودا تۆی بە کەلامی خۆی هەڵبژارد، بە دەستی خۆی بۆی نووسیت، ئایا لەسەر کارێك لۆمەم دەکەی خودا لەسەر من-چل ساڵ بەرلەوەی دروستم بکات- قەدەری کردبوو؟ ئادەم بەڵگەی لەسەر موسا راستکردەوە)**، سێ جار.

- وفِي رواية لمسلم: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى عليه السلام عِنْدَ رَبِّهِمَا، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى؛ قَالَ مُوسَى: أَنْتَ آدَمُ الَّذِي خَلَقَكَ اللهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَسْجَدَ لَكَ مَلاَئِكَتَهُ، وَأَسْكَنَكَ فِي جَنَّتِهِ، ثُمَّ أَهْبَطْتَ النَّاسَ بِخَطِيئَتِكَ إِلَى الأَرْضِ؟ فَقَالَ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى الَّذِي اصْطَفَاكَ اللهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلاَمِهِ، وَأَعْطَاكَ الأَلْوَاحَ فِيهَا تِبْيَانُ كُلِّ شَيْءٍ، وَقَرَّبَكَ نَجِيّاً، فَبِكَمْ وَجَدْتَ اللهَ كَتَبَ التَّوْرَاةَ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ؟ قَالَ مُوسَى: بِأَرْبَعِينَ عَاماً. قَالَ آدَمُ: فَهَلْ وَجَدْتَ فِيهَا: ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ﴾** [طه: ١٢١]؟ قَالَ: نعَمْ. قَالَ: أَفَتَلُومُنِي عَلَى أَنْ عَمِلْتُ عَمَلاً كَتَبَهُ اللهُ عَلَيَّ أَنْ أَعْمَلَهُ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً) ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى**).

لە ریوایەتێکی موسلیمدا، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئادەم و موسا لای پەروەردگاریان بەڵگەیان لەسەر یەکتر هێنایەوە، ئادەم بەڵگەی لەسەر موسا راستکردەوە، موسا فەرمووی: تۆ ئەو ئادەمەی خودا بە دەستی خۆی دروستی کرد و لە رۆحی خۆی[1] کرد بە بەر تۆدا، و سوژدەی بە فریشتەکان برد بۆ تۆ و لە**

---

[1] واتە: لە رۆحێك لە لای خۆی.

بەهەشتی خۆی تۆی نیشتەجێ کرد، پاشان بە هەڵەکەت[1] خەڵکیت بۆ زەوی دابەزاند؟ ئادەم فەرمووی: تۆ ئەو موسای خودا بە پەیامی خۆی و بە کەلامی خۆی هەڵیبژاردی، لەوحەکانی[2] بە تۆ دا کە روونکردنەوەی هەموو شتێکیان تێدا بوو، بە ئاخافتن تۆی نزیك کردەوە، بەر لەوەی من[3] دروستبکرێم بە چەند ساڵ پێشتر خودا تەوراتی نووسی بوو؟ موسا فەرمووی: بە چل ساڵ، ئادەم فەرمووی: ئایا لە تەوراتدا ئەمەت بینی: ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ﴾ [طه:١٢١] ؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: ئایا تۆ لۆمەی من دەکەی لەسەر کارێك خودا بە چل ساڵ بەرلەوەی دروستم بکات لەسەر من نووسی بووی؟)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئادەم بەڵگەی لەسەر موسا راستکردەوە).

## ١٣- دەروازەی: کار بە سەرئەنجامەکەیەتی[4]

٢٨٠- (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم التَقَى هُوَ وَالمشْرِكُونَ فَاقْتَتَلُوا، فَلَمَّا مالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إلى عَسْكَرِهِ، وَمالَ الآخَرُونَ إِلَى عَسْكَرِهِمْ، وَفِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلٌ، لاَ يَدَعُ لَهُمْ شَاذَّةً وَلاَ فَاذَّةً إِلاَّ اتَّبَعَهَا يَضْرِبُهَا بِسَيْفِهِ، فَقَالُوا: ما أَجْزَأَ مِنَّا اليَوْمَ أَحَدٌ كما أَجْزَأَ فُلانٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَمَا إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ).

فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ القَوْمِ: أَنَا صَاحِبُهُ، قَالَ: فَخَرَجَ مَعَهُ كُلَّمَا وَقَفَ وَقَفَ مَعَهُ، وَإِذَا أَسْرَعَ أَسْرَعَ مَعَهُ، قَالَ: فَجُرِحَ الرَّجُلُ جُرْحاً شَدِيداً، فَاسْتَعْجَلَ المَوْتَ، فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ بِالأَرْضِ، وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ، ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَى سَيْفِهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللهِ، قَالَ: (وَما ذَاكَ)؟ قَالَ: الرَّجُلُ الَّذِي ذَكَرْتَ آنِفاً أَنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَأَعْظَمَ النَّاسُ

[1] واتە: بە خواردنی بەری درەختەکە-و.

[2] واتە: لەوحەکانی تەورات-و.

[3] واتە: بەر لە ئادەم-و.

[4] واتە: کار بە کۆتاییەکەیەتی، ئایا چاکە یان خراپ-و.

ذلِكَ، فَقُلْتُ: أَنَا لَكُمْ بِهِ، فَخَرَجْتُ فِي طَلَبِهِ، ثُمَّ جُرِحَ جُرْحاً شَدِيداً، فَاسْتَعْجَلَ المَوْتَ، فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ فِي الأَرْضِ، وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ، ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَيْهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عِنْدَ ذلِكَ: (**إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الجَنَّةِ، فِيما يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ، فِيما يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ**). [خ٢٨٩٨/ م١١٢]

(ق) لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هاوەڵدانەران بەیەکترگەیشتن و دژ بەیەکتر جەنگان، کاتێك پێغەمبەری خودا هاتەوە بۆ سەربازگەکەی، و ئەوانیش ڕۆیشتنەوە بۆ سەربازگەکەیان، لەناو هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێك هەبوو هەر کەس لە هاوەڵدانەران ڕووبەڕووی دەبووەوە بە شمشێرەکەی دەیکوشت، وتیان: ئەمڕۆ هیچ کەس لە ئێمە بە ئەندازەی فلآن بوێر نەبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئەو لە ئەهلی ئاگرە**).

پیاوێك لە خەڵکەکە وتی: من هاوەڵی دەکەم، وتی: لەگەڵی ڕۆیشتە دەرەوە، کە ئەو دەوەستا لەگەڵی دەوەستا، کە ئەو هێرشی دەبرد هێرشی لەگەڵ دەبرد، وتی: پیاوەکە بە برینێکی زۆر بریندار بوو، بۆیە پەلەی کرد بۆ مردن و مسکی شمشێرەکەی نایە زەوی و نووکەکەی خستە نێوان دوو مەمکی و خۆیدا بەسەر شمشێرەکەدا و خۆی کوشت، پیاوەکە[1] هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خودای، پێغەمبەر فەرمووی: (**چی بووە؟**)، وتی: ئەو پیاوەی ئێستا باست کرد لە ئەهلی ئاگرە و خەڵکی ئەوەیان لا گەورە بوو[2]، وتم: من لەگەڵی دەبم، لەگەڵی چوومە دەرەوە و پاشان بە برینێکی توند و زۆر بریندار بوو و پەلەی لە مردن کرد و مسکی شمشێرەکەی نایە زەوی و نووکەکەی نایە نێوان دوو مەمکی و خۆیدا بەسەردا و خۆی کوشت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەو بارەدا فەرمووی: (**پیاو بە کاری ئەهلی بەهەشت کار دەکات—لەوەی بۆ خەڵکی دەردەکەوێت— کەچی لە ئەهلی ئاگرە، هەروەها پیاو بە کاری ئەهلی ئاگر کار دەکات—لەوەی بۆ خەڵکی دەردەکەوێت— کەچی ئەو لە ئەهلی بەهەشتە**).

---

[1] واتە: ئەو پیاوەی چاودێری کەسە ئازاکەی دەکرد—و.

[2] واتە: قسەکەیان لا قورس بوو ئەو پیاوە ئازا و تێکۆشەرە ئەهلی ئاگر بێت—و.

**٢٨١**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ الزَّمَنَ الطَّوِيلَ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ، ثُمَّ يُخْتَمُ لَهُ عَمَلُهُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ. وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ الزَّمَنَ الطَّوِيلَ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، ثُمَّ يُخْتَمُ لَهُ عَمَلُهُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ**). [م٢٦٥١]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**پیاو[1] ماوەیەكی دووروودرێژ بە كاری ئەهلی بەهەشت كار دەكات، پاشان كارەكەی بە كاری ئەهلی ئاگر كۆتایی پێ دەهێنرێت، هەروەها پیاو ماوەیەكی دووروودرێژ بە كاری ئەهلی ئاگر كار دەكات پاشان بە كاری ئەهلی بەهەشت كارەكەی كۆتایی پێ دەهێنرێت**).

**٢٨٢**– عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ البُرْهَةَ مِنْ عُمُرِهِ بِالعَمَلِ الَّذِي لَوْ مَاتَ عَلَيْهِ دَخَلَ الجَنَّةَ، فَإِذَا كَانَ قَبْلَ مَوْتِهِ تَحَوَّلَ فَعَمِلَ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ فَمَاتَ فَدَخَلَ النَّارَ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ البُرْهَةَ مِنْ عُمُرِهِ بِالعَمَلِ الَّذِي لَوْ مَاتَ عَلَيْهِ دَخَلَ النَّارَ، فَإِذَا كَانَ قَبْلَ مَوْتِهِ تَحَوَّلَ فَعَمِلَ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ فَمَاتَ فَدَخَلَ الجَنَّةَ**). [حم١٣٦٩٥]

لە ئەنەسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**پیاو ماوەیەك لە تەمەنی بە كارێك كار دەكات گەر لەسەری بمردبا دەچووە بەهەشتەوە، كە دەگاتە بەر لە مردنەكەی دەگۆڕێت و بە كاری ئەهلی ئاگر كار دەكات و دەمرێت و دەچێتە ئاگرەوە، هەروەها پیاو ماوەیەك لە تەمەنی بە كارێك كار دەكات گەر لەسەری بمردبا دەچووە ئاگرەوە، كە دەگاتە بەر لە مردنەكەی دەگۆڕێت و بە كاری ئەهلی بەهەشت كار دەكات و دەمرێت و دەچێتە بەهەشتەوە**).

- وزاد في رواية في أوله: (**لاَ عَلَيْكُمْ أَنْ لاَ تَعْجَبُوا بِأَحَدٍ، حَتَّى تَنْظُرُوا بِمَ يُخْتَمُ لَهُ**). [حم١٢٢١٤]
* إسناده صحيح على شرط مسلم.

لە ریوایەتێكدا ئەمە لە سەرەتاكەیەوە زیاد كراوە: (**هیچتان لەسەر نییە بە كەسێك سەرسام نەبن، تا وردەبنەوە بە چی بۆی كۆتایی دێت**).

---

[1] پیاو: واتە: مرۆڤ ـو.

## ١٤- دەروازەی: مرۆڤ لەو شوێنە دەمرێت بۆی نووسراوە

**٢٨٣-** عَنْ مَطَرِ بْنِ عُكَامِسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا قَضَى اللهُ لِعَبْدٍ أَنْ يَمُوتَ بِأَرْضٍ، جَعَلَ لَهُ إِلَيْهَا حَاجَةً). [ت٢١٤٦]

* صحيح.

له مەتەری کوڕی عوکامیسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر خودا بڕیاریدا بەندەیەك لە زەوییەك بمرێت، بۆ ئەو کەسە لەو شوێنە پێویستییەك دروست دەکات[١]).**

## ١٥- دەروازەی: رازیبوون بە قەزای خودا

**٢٨٤-** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مِن سعادةِ ابنِ آدمَ رِضاه بما قَضى اللهُ له، ومِن شقاوةِ ابنِ آدمَ تَرْكُه استخارةَ اللهِ، ومِن شقاوةِ ابنِ آدمَ سَخَطُه بما قضى اللهُ له.). [ت٢١٥١]

* ضعيف.

[وانظر: ٣٤٠٦].

له سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە بەختەوەری ئادەمیزاد رازیبوونییەتی بەوەی خودا قەزای بۆ کردووە[٢]، لە بەدبەختی ئادەمیزادیش وازهێنانییەتی لە ئیستیخارەی خودا[٣]، هەروەها لە بەدبەختی ئادەمیزاد ناڕازیبوونییەتی بەوەی خودا بڕیاری بۆ داوە[٤]).**

---

[١] واتە: بۆ ئەو بەندە پێویستییەك لەو زەوییە دروست دەکات بۆئەوەی بچێت بە دەم پێویستییەکەیەوە و لەو شوێنە بمرێت کە بۆی دیاریکراوە-و.

[٢] قەزای بۆ کردووە واتە: بڕیاری بۆ داوە-و.

[٣] دوو رکات نوێژ بکات و دوعای ئیستیخارە بخوێنێت و داوا لە خودا بکات ئەو کارەکەی بۆ هەڵببژێرێت-و.

[٤] واتە: ئیمان بە قەزا و قەدەر و رازیبوون بەوەی لە خوداوە بەسەر ئەودا تێدەپەڕێ-و.

## ١٦- دەروازەی: تەنها دوعا قەدەر دەگێڕێتەوە

**٢٨٥**– عَنْ سَلْمَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ يَرُدُّ القَضَاءَ إِلاَّ الدُّعَاءُ، وَلاَ يَزِيدُ فِي العُمْرِ إِلاَّ البِرُّ**). [ت٢١٣٩]

* حسن.

له سه‌لمانه‌وه، وتی: پێغه‌مبه‌ری خودا(ﷺ) فه‌رمووی: **(ته‌نها دوعا قه‌زا ده‌گێڕێته‌وه، ته‌نها چاكه‌ش ته‌مه‌ن زیاد ده‌كات).**

**٢٨٦**– عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: لا ينفع الحذر من القدر، ولكن الله يمحو بالدعاء ما يشاء من القدر. [ك٣٣٣٣]

* قال الذهبي: صحيح.

**له ئیبن عه‌باسه‌وه(خوایان لێی رازی بێت) وتی: خۆپارێزی له قه‌ده‌ر سوودی نییه، به‌ڵام خودا چه‌ند بخوازێت به دوعا له قه‌ده‌ر ده‌سڕێته‌وه.**

## ١٧- دەروازەی: بەربوونەوە بۆ ناو پیری و ئەفتادەیی

**٢٨٧**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مُثِّلَ ابْنُ آدَمَ، وَإِلَى جَنْبِهِ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ مَنِيَّةً، إِنْ أَخْطَأَتْهُ المَنَايَا وَقَعَ فِي الهَرَمِ حَتَّى يَمُوتَ**). [ت٢١٥٠]

* حسن.

له عه‌بدوڵای كوڕی شه‌خیره‌وه، له پێغه‌مبه‌ره‌وه(ﷺ) فه‌رمووی: **(ئاده‌میزاد خولقێنراوه و نه‌وه‌د و نۆ تیابه‌ری له ته‌نیشته‌وه‌یه، گه‌ر تیابه‌ره‌كان[1] نه‌یپێكن ده‌كه‌وێته ناو پیرییه‌وه تا ده‌مرێت).**

---

[1] تیابه‌ره‌كان: واته هۆیه‌كانی مردن–و.

## ١٨- دەروازەی: نەهی کردن لە ڕۆچوون لەناو قەدەردا

**٢٨٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَنَحْنُ نَتَنَازَعُ فِي القَدَرِ، فَغَضِبَ، حَتَّى احْمَرَّ وَجْهُهُ، حَتَّى كَأَنَّمَا فُقِئَ فِي وَجْنَتَيْهِ الرُّمَّانُ، فَقَالَ: (**أَبِهَذَا أُمِرْتُمْ، أَمْ بِهَذَا أُرْسِلْتُ إِلَيْكُمْ؟ إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ حِينَ تَنَازَعُوا فِي هَذَا الأَمْرِ، عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ، أَلاَّ تَتَنَازَعُوا فِيهِ**). [ت٢١٣٣]

* حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ لامان و ئێمە لەسەر قەدەر ناکۆکیمان بوو، ئەو تووڕە بوو تا روخساری سوور هەڵگەڕا، تا وەك ئەوەی هەنار بەسەر دوو گۆنایدا تەقیبێت، فەرمووی: (**ئایا بەمە فەرمانتان پێکرا، ئایە بەمەمەوە من رەوانەی لای ئێوە کراوم؟ ئەوانەی پێش ئێوە تیاچوون کاتێك لەم کاروبارەدا[1] ناکۆکییان هەبوو، لەسەرتان پێویست دەکەم[2] تیایدا ناکۆك مەبن**).

**٢٨٩-** عَنْ عبدِ اللهِ بنِ عَمْرٍو قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى أَصْحَابِهِ وَهُمْ يَخْتَصِمُونَ فِي القَدَرِ، فَكَأَنَّمَا يُفْقَأُ فِي وَجْهِهِ حَبُّ الرُّمَّانِ مِنَ الغَضَبِ، فَقَالَ: (**بِهَذَا أُمِرْتُمْ، أَوَ لِهَذَا خُلِقْتُمْ؟ تَضْرِبُونَ القُرْآنَ بَعْضَهُ بِبَعْضٍ، بِهَذَا هَلَكَتِ الأُمَمُ قَبْلَكُمْ**).

قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو: مَا غَبَطْتُ نَفْسِي بِمَجْلِسٍ تَخَلَّفْتُ فِيهِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَا غَبَطْتُ نَفْسِي بِذَلِكَ المجْلِسِ، وَتَخَلُّفِي عَنْهُ. [جه٨٥]

* حسن صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ لای هاوەڵانی ئەوان، دەربارەی قەدەر ناکۆکییان هەبوو، لە تووڕەیی وەك ئەوەی دەنکە

---

[1] واتە: سوور هەڵگەڕابوو-و.

[2] واتە: پێداگری دەکەم لەسەرتان-و.

هەنار بەسەر روخساریدا دەقیبێت[1]، فەرمووی: **(بەمە فەرمانتان پێكرا، یان بۆ ئەمە ئێوە خولقێنران؟ هەندێ لە قورئان بە هەندێكی تریدا دەكێشن[2]؟ ئومەتانی پێش ئێوە بەمە تیاچوون).**

عەبدوڵای كوڕی عەمر وتی: خۆشحاڵ نیم لە مەجلیسێك دواكەوتبم وەك خۆشحاڵیم بە دواكەوتن لەو مەجلیسەی پێغەمبەری خودا و نەچوونم بۆی.. [3]

**٢٩٠**– عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ وَهُوَ عَلى المِنْبَرِ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يَزَالُ أَمْرُ هَذهِ الأُمَّةِ مُوَائِماً –أَوْ مُقَارِباً– مَا لَمْ يَتَكَلَّمُوا فِي الوِلْدَانِ والقَدَرِ).** [حب٦٧٢٤/ ك٩٣]

* إسناده صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە، ئەو لەسەر مینبەر بوو وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فـەرمووی: **(بەردەوام كاروباری ئەم ئومەتە تەبایە–نزیكە– گەر دەربارەی منداڵ[4] و قەدەر قسە نەكەن ).**

## ١٩- دەروازەی: ئەوەی هاتووە دەربارەی بەدرۆزانانی قەدەر

**٢٩١**– عَن ابْنِ عُمَرَ، عَن النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(القَدَرِيَّةُ مَجُوسُ هَذِهِ الأُمَّةِ، إِنْ مَرِضُوا فَلاَ تَعُودُوهُمْ، وَإِنْ مَاتُوا فَلاَ تَشْهَدُوهُمْ).** [د٤٦٩١]

* حسن.

---

[1] واتە: بەر لە ئادەم–و.

[2] واتە: هەریەكێك بە قورئان بەڵگە بۆ بۆچوونەكەی خۆی دەهێنێتەوە و بەڵگەی كەسەكەی تری پێ دەباتە دواوە–و.

[3] واتـە: خۆشـحاڵ بـووم مـن یـەكێك نـەبووم لـەو كەسـانەی لـەو مەجلیسـەدا بـوون و بـە ناكۆكییەكانیان دەربارەی قەدەر پێغەمبەریان توورە كرد–و.

[4] واتە: منداڵی هاوەڵدانەران، ئایا لە بەهەشتدان یان لە ئاگردان؟

لە ئیبن عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(قەدەرییەكان مەجووسی ئەم ئومەتەن، گەر نەخۆشكەوتن مەچن بۆ سەردانیان، گەر مردن لەسەریان ئامادە مەبن).**

**٢٩٢–** عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ لاِبْنِ عُمَرَ صَدِيقٌ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ يُكَاتِبُهُ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ: إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ تَكَلَّمْتَ فِي شَيْءٍ مِنَ القَدَرِ، فَإِيَّاكَ أَنْ تَكْتُبَ إِلَيَّ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(إِنَّهُ سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي أَقْوَامٌ يُكَذِّبُونَ بِالقَدَرِ)**. [د٤٦١٣]

* حسن.

لە نافیعەوە، وتی: ئیبن عومەر هاوڕێیەكی هەبوو لە ئەهلی شام نامەی بۆ دەنووسی، عەبدوڵای كوڕی عومەر بۆی نووسی: پێمگەیشتووە دەربارەی شتێك لە قەدەر قسەت كردووە، ئاگادارت دەكەمەوە نامەم بۆ نەنووسیت، چونكە من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(دەستەگەلێك[1] لە ئومەتەكەم سەرهەڵدەدەن قەدەر بە درۆ دەزانن).**

**٢٩٣–** عَنْ طَاوس قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما وَمَعَنَا رَجُلٌ مِنَ القَدَرِيَّةِ فَقُلْتُ: إِنَّ أُناساً يَقُولُونَ: لا قَدَرَ، قَالَ: أَوَفِي القَوْمِ أَحَدٌ مِنْهُمْ؟ قُلْتَ: لَوْ كَانَ مَا كُنْتَ تَصْنَعُ بِهِ؟ قَالَ: لَوْ كَانَ فِيْهِمْ أَحَدٌ مِنْهُمْ لَأَخَذْتُ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ قَرَأْتُ عَلَيْهِ آيَةَ كَذَا وَكَذا ﴿**وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِي ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا**﴾ [الإسراء: ٤]. [ك٣٣٧٢]

* قال الذهبي: على شرطهما.

لە تاووسەوە، وتی: لای ئیبن عەباس(خوایان لێ رازی بێت) بووم پیاوێك لە قەدەرییەكانم لەگەڵ بوو، وتم: خەڵكانێك دەڵێن: قەدەر نییە، وتی: ئایا لەو دەستەیە یەكێكیان ئامادەیە؟ وتم: گەر ئامادە بێت چی لێ دەكەی؟ وتی: گەر یەكێك

[1] واتە: خەڵكانێك–و.

لەوان لەناو ئەواندایە سەری دەگرم و پاشان ئایەتی ئەوە و ئەوەی بەسەردا دەخوێنمەوە: ﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِي ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا﴾ [الإسراء: ٤] [(١)].

---

[(١)] لە مانای وشەی (قضينا)ەوە تێدەگەین ئەو دوو جۆرە ئیفسادە لە (الكتاب)دا لەسەر بەنی ئیسرائیل نووسرابوون، بۆیە ئیبن عەباس ئەم ئایەتە دەکاتە بەڵگەی قەدەر و دەیەوێت بەسەر ئەو کابرا قەدەرییەدا بیخوێنێتەوە، واتە ئایەتەکە تەنها هەواڵدان نییە، بەڵکو قەدەر و نووسینە، ئەمەش مانای دەرچوونی بەنی ئیسرائیل ناگەیەنێت لە بەرپرسیارێتی بەردەم کارە خراپەکانیان، چونکە خودا ستەم لە بەندەکانی ناکات و ئەوان کەسبی کارە خراپەکان دەکەن ـ و.

## ١- دەروازەی: فیقھ لە دیندا

**٢٩٤-** (ق) عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، وَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ وَاللهُ يُعْطِي، وَلَنْ تَزَالَ هذِهِ الأُمَّةُ قَائِمَةً عَلَى أَمْرِ اللهِ، لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ، حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ). [خ٧١/ م١٠٣٧]

**(ق) لە موعاویەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هەر كەس خودا خێری بۆی بوێت لە دین تێیدەگەیەنێت[1]، من دابەشكار(قاسم)م و خودا پێدەدات(يُعطي)، بەردەوام ئەم ئومەتە لەسەر ئەمری خودا راوەستاوە، ئەوانەی سەرپێچییان لێ دەكەن زیانیان پێ ناگەیەنن، تا ئەمری خودا دێت).**

**٢٩٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ). [جه٢٢٠]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر كەس خودا خێری بۆی بوێت لە دین تێیدەگەیەنێت)).**

**٢٩٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (النَّاسُ مَعَادِنُ، فَخِيَارُهُمْ فِي الجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الإِسْلاَمِ إِذَا فَقُهُوا). [حم١٤٩٤٥]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (خەڵكی كانزان، باشترینیان لە سەردەمی نەفامیدا باشترینیانە لە ئیسلامدا گەر تێبگەن).**

**٢٩٧-** عَنْ أَبِي سَعِيْدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: أَصْحَابُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا جَلَسُوا كَانَ حَدِيثُهُمْ يَعْنِي الفِقْهَ، إِلاَّ أَنْ يَقْرَأَ رَجُلٌ سُورَةً، أَوْ يَأْمُرَ رَجُلاً بِقِرَاءَةِ سُورَةٍ. [ك٣٢٢]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

---

[1] واتە: تێگەیشتنی لە دین پێ دەبەخشێت-و.

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کە دادەنیشتن قسەی ئەوان پەیوەست بوو بە فیقهەوە مەگەر پیاوێك سورەتێکی بخوێندبایە، یان فەرمانی بە پیاوێك دەکرد سورەتێك بخوێنێت.

## ٢- دەروازەی: فەزڵی زانست و فێرکردن

**٢٩٨**- (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الأَشْعَرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللهُ بِهِ مِنَ الهُدَى وَالعِلْمِ، كَمَثَلِ الغَيْثِ الكَثِيرِ أَصَابَ أَرْضاً: فَكَانَ مِنْهَا نَقِيَّةٌ، قَبِلَتِ المَاءَ، فَأَنْبَتَتِ الكَلأَ والعُشْبَ الكَثِيرَ، وَكَانَتْ مِنْهَا أَجَادِبُ، أَمْسَكَتِ المَاءَ، فَنَفَعَ اللهُ بِهَا النَّاسَ، فَشَرِبُوا وَسَقَوْا وَزَرَعُوا، وَأَصَابَتْ مِنْهَا طَائِفَةً أُخْرَى، إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لاَ تُمْسِكُ مَاءً، وَلاَ تُنْبِتُ كَلأً، فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقُهَ فِي دِينِ اللهِ، ونَفَعَهُ مَا بَعَثَنِي اللهُ بِهِ فَعَلِمَ وَعَلَّمَ، وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْساً، وَلَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ**). [خ٧٩/ م٢٢٨٢]

(ق) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**نموونەی ئەوەی خودا منی پێ ڕەوانە کردووە لە هیدایەت و زانست، وەك بارانێکی زۆر وایە بەسەر زەوییەکدا دادەبارێ: هەندێ لەو خاکە پاکە و ئاوەکە وەردەگرێت و دواتر لەوەڕگا و گژوگیای زۆر دەڕوێنێت، هەیانە ڕەقە ئاوەکە دەگرێت و خودا بەهۆیەوە سوود بە خەڵکی دەگەیەنێت، بۆیە لێی دەخۆنەوە و ئاو دەدەن و کشتوکاڵ دەکەن، هەروەها لەو بارانە تووشی هەندێك خاکی تر دەبێت کە کڕێنە، نە ئاو هەڵدەگرێت و نە لەوەڕگا دەڕوێنێت، ئەوەش**[1] **نموونەی ئەو کەسەیە لە دینی خودا حاڵی دەبێت و ئەوەی خودا منی پێ ڕەوانە کردووە سوودی پێ دەگەیەنێت، فێردەبێت و کەسانی**

[1] واتە: ئەو سێ نموونە: یەکەمیان: نموونەی زانایەکە زانستەکە وەردەگرێت و لێی تێدەگات و فیقهی لێ دەردەهێنێت، واتە زانایەکی موجتەهیدە، یاخود ئەهلی دیرایەیە(أهل الدراية)، دووەمیان نموونەی کەسێکە زانستەکەی هەڵگرتووە و دەیگەیەنێت بەبێ ئەوەی لە زانستەکە هەڵهێنجان بکات، واتە کەسەکە لە ئەهلی ڕیوایەیە(أهل الرواية)، سێیەمیان نموونەی ئەو کەسەیە زانستەکە وەردەگرێت و سوودی لێ نابینێت-و.

تر فێردەکات، هەروەها نموونەی ئەو کەسەی بەوە سەری بەرزنابێتەوە، و هیدایەتی خودا –کە منی پێ رەوانە کراوە– قبووڵ ناکات).

**٢٩٩**– عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّهُ لَيَسْتَغْفِرُ لِلْعَالِمِ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ، حَتَّى الحِيتَانِ فِي البَحْرِ). [جه٢٣٩]

* صحيح.

له ئەبی دەرداوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(ئەوانەی لە ئاسمانەکانن و ئەوانەی لە زەویدان داوای لێخۆشبوون بۆ زانا دەکەن، تەنانەت حوتەکانی دەریاش).**

**٣٠٠**– عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (خَيْرُ مَا يُخَلِّفُ الرَّجُلُ مِنْ بَعْدِهِ ثَلاَثٌ: وَلَدٌ صَالِحٌ يَدْعُو لَهُ، وَصَدَقَةٌ تَجْرِي يَبْلُغُهُ أَجْرُهَا، وَعِلْمٌ يُعْمَلُ بِهِ مِنْ بَعْدِهِ). [جه٢٤١]

* صحيح

لە ئەبی قەتادەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(باشترین شتێك پیاو لەدوای خۆی بەجێیدەهێڵێت سیانە[1]: منداڵێکی صاڵح دوعای بۆ بکات، صەدەقەیەك جاری بێت و پاداشتەکەی پێ بگات، زانستێك لەدوای ئەو کاری پێ بکرێت).**

**٣٠١**– عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ للهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ غَدَا إِلى المَسْجِدِ لا يُرِيْدُ إِلاَّ لِيَتَعَلَّمَ خَيْراً أَوْ يُعَلِّمَهُ، كَانَ لَهُ أَجْرُ مُعْتَمِرٍ تَامّ العُمْرَةِ، فَمَنْ رَاحَ إِلَى المَسْجِدِ لا يُرِيْدُ إِلاَّ لِيَتَعَلَّمَ خَيْراً أَوْ يُعَلِّمَهُ، فَلَهُ أَجْرُ حَاجٍ تَامّ الحِجَّةِ). [ك٣١١]

* قال الذهبي: على شرط البخاري.

لە ئەبی ئومامەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بەیانییەکەی رووی لە مزگەوت کرد و تەنها دەیویست خێرێك فێرببێت یان خێرێك فێربکات، پاداشتی عومرەکارێکی هەیە تەواوترین عومرەی ئەنجام دابێت، هەر کەس**

[1] واتە: سێ شتە –و.

**ئێوارەکەی رووی لە مزگەوت کرد و تەنها دەیویست خێرێك فێرببێت یـان خێرێـك فێربکات پاداشتی حەجکەرێکی هەیە تەواوترین حەجی ئەنجام دابێت).**

**٣٠٢**– عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْهُومَانِ لا يَشْبَعَانِ: مَنْهُومٌ فِي عِلْمٍ لا يَشْبَعُ، وَمَنْهُومٌ فِي دُنْيا لا يَشْبَعُ**). [ك٣١٢]

* قال الذهبي: على شرطهما.

لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دوو تامەزرۆ و چلێس تێر نابن: تامەزرۆیەك لە زانستدا تێر نابێت، چلێسێکیش لە دنیا تێرنابێت).**

**٣٠٣**– عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**فَضْلُ العِلْمِ خَيْرٌ مِنْ فَضْلِ العِبَادةِ، وَخَيْرُ دِيْنِكُمُ الوَرَعُ**). [ك٣١٧]

لە حوزەیفەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فـەرمووی: **(فـەزڵی زانسـت زۆرتـر و چاکترە لە فەزڵی عیبادەت، باشترینی دینی ئێوەش بریتییە لە وەرع).**

## ٣- دەروازەی: (ئایەتێکیش بێت لە منەوە بیگەیەنە)

**٣٠٤**– (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيةً، وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ**). [خ٣٤٦١]

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئایەتێکیش بێت لە منەوە بیگەیەنە، دەربارەی بەنی ئیسرائیل قسە بکەن حەرەجی تێدا نییە**[1]**، هەر کەس بەئەنقەست درۆ بەدەم منەوە بکات با شوێنی خۆی لە ئاگر خۆشبکات).**

---

(١) دەربارەی بەنی ئیسرائیل قسە بکەن حەرەجی تێدا نییە: مالیك دەڵێت: مەبەستەکە دروستی قسەکردنە دەربارەیان بە شتێك کە کارێکی باشە، بەڵام ئەوەی درۆکەی دەزانرێت باس ناکرێت، شافیعی دەڵێت: ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) رێگە نادات بە قسەکردن بە درۆ، بۆیە ماناکە: دەربارەی بەنی ئیسرائیل قسە بکەن بە شتانێك دەزانن درۆ نییە.

**٣٠٥**- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**نَضَّرَ اللهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثاً، فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ، فَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ إِلَى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ، وَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ لَيْسَ بِفَقِيهٍ**). [د٣٦٦٠/ ت٢٦٥٦/ جه٢٣٠/ مي٢٣٥]

* صحيح.

لە زەیدی کوڕی سابیتەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(خوا رووی کەسێك سوور بکات قسەیەك لە ئێمەوە دەبیستێ و لەبەری دەکات و دەیپارێزێت تا دەیگەیەنێت، لەوانەیە هەڵگری فیقهێك بە فەقیهتر لە ئەو بگەیەنێت، لەوانەیە هەڵگری فیقهێك بۆ خۆی فەقیە نەبێت).**

**٣٠٦**- عَـنْ مُعَـاوِيَـةَ الْقُشَـيْرِيِّ قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِ صـلّى الله عليـه وسـلّم: (**أَلاَ لِيُبَلِّـغِ الشَّاهِدُ الغَائِبَ**). [جه٢٣٤]

* صحيح.

لە موعاویەی قوشەیرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئاگادارتان دەکەمەوە، با ئەو کەسەی ئامادەیە بیگەیەنێت بەوانەی ئامادە نین).**

**٣٠٧**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**تَسْمَعُونَ، وَيُسْمَعُ مِنْكُمْ، وَيُسْمَعُ مِمَّنْ سَمِعَ مِنْكُمْ**). [د٣٦٥٩]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئێوە دەبیستن، و لە ئێوەوە دەبیسترێت، و لەوانەوە لە ئێوەیان بیستووە دەبیسترێت[1]).**

## ٤- دەروازەی: تاوانی درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٠٨**- (ق) عَنْ علي قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تَكْذِبُوا عَلَيَّ، فَإِنَّهُ مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ فَلْيَلِجِ النَّارَ**). [خ١٠٦/ م١ مقدمة]

---

[1] ئەم فەرموودە شەرعییەتدانە بە سەنەدی گواستنەوەی زانست–و.

(ق) لە عەلییەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(درۆ بە دەم منەوە مەکەن، چونکە هەر کەس درۆ بەدەم منەوە بکات با بچێتە ناو ئاگرەوە).**

**٣٠٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ). [خ١١٠/ م٣ مقدمة]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەرکەس بە ئەنقەست درۆ بەدەم منەوە بکات با شوێنی خۆی لە ئاگر خۆشبکات).**

**٣١٠-** (م) عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ حَدَّثَ عَنِّي حَدِيثاً، وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ كَذِبٌ، فَهُوَ أَحَدُ الكَاذِبَيْنِ). [المقدمة: باب (١)/ جه٣٩]

(م) لە سەمورەی کوڕی جوندەبەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس قسەیەك لە منەوە باس بکات[١]، ئەو بزانێت ئەو قسە درۆیە، ئەوا ئەو یەکێکە لە درۆزانان).**

## ٥- دەروازەی: خۆزگەخواستن بە زانست

**٣١١-** (ق) عَنْ عَبدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللهُ مَالاً فَسُلِّطَ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الحَقِّ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللهُ الحِكْمَةَ فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا). [خ٧٣/ م٨١٦]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(حەسوودی بردن تەنها لە دواندا دروستە: پیاوێك خودا ماڵ و سامانێکی پێداوە و زاڵی کردووە بەسەر تیابردنیدا[٢]) بە حەق، پیاوێکیش خودا حیکمەتی پێداوە و قەزاوەتی پێ دەکات[٣]) و خەڵکی پێ فێر دەکات[٤])).**

---

[١] واتە: بگێڕێتەوە-و.

[٢] تیابردنیدا: واتە خەرجکردنیدا-و.

[٣] قەزاوەتی پێ دەکات: واتە: بڕیاری پێ دەردەکات-و.

[٤] واتە: حیکمەت دەبێتە کاڵای باڵای کەسەکە، دانایانە بڕیار دەردەکات و مامەڵە دەکات، بە زمان و بە کردار خەڵکیش بەو زانست و حیکمەتە فێر دەکات-و.

## ٦- دەروازەی: فێرکردن بە خستنەڕووی پرسیار

**٣١٢-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً لاَ يَسْقُطُ وَرَقُهَا، وَهِيَ مَثَلُ الْمُسْلِمِ، حَدِّثُونِي مَا هِيَ)**، فَوَقَعَ النَّاسُ فِي شَجَرِ البَادِيَةِ، وَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ، قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَاسْتَحْيَيْتُ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! أَخْبِرْنَا بِهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(هِيَ النَّخْلَةُ)**. قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَحَدَّثْتُ أَبِي بِمَا وَقَعَ فِي نَفْسِي، فَقَالَ: لأَنْ تَكُونَ قُلْتَهَا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يَكُونَ لِي كَذَا وَكَذَا. [خ١٣١ (٦١)/ م٢٨١١]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە درەختان درەختێك هەیە گەڵاکانی ناوەرێن، ئەو درەختە نموونەی موسڵمانە، بۆم باس بکەن ئەو درەختە کامەیە؟)**، خەڵکی کەوتنە ناو باسکردنی درەختی دەشت و سارا، کەوتە ناخمەوە ئەو درەختە دارخورما بێت، عەبدوڵا دەڵێت: شەرمم کرد، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، هەواڵمان پێ بدە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوە دارخورمایە)**، عەبدوڵا دەڵێت: ئەوەی کەوتە ناخمەوە بۆ باوکمم باس کرد، وتی: گەر بوتبایە لام خۆشتر بوو لەوەی ئەوە و ئەوەم هەبوایە.

## ٧- دەروازەی: دانیشتن بۆ گوێگرتن لە زانست

**٣١٣-** (ق) عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ فِي المَسْجِدِ وَالنَّاسُ مَعَهُ، إِذْ أَقْبَلَ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ، فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَذَهَبَ وَاحِدٌ، قَالَ: فَوَقَفَا عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا: فَرَأَى فُرْجَةً فِي الحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا، وَأَمَّا الآخَرُ: فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ، وَأَمَّا الثَّالِثُ: فَأَدْبَرَ ذَاهِباً. فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(أَلاَ أُخْبِرُكُمْ عَنِ النَّفَرِ الثَّلاَثَةِ؟ أَمَّا أَحَدُهُمْ فَأَوَى إِلَى اللهِ فَآوَاهُ اللهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَاسْتَحْيَا فَاسْتَحْيَا اللهُ مِنْهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَأَعْرَضَ فَأَعْرَضَ اللهُ عَنْهُ)**. [خ٦٦/ م٢١٧٦]

(ق) لە ئەبی واقیدی لەیسییەوە: لە کاتێکدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مزگەوت دانیشتبوو و خەڵکی لەگەڵ بوون، سێ کەس هاتن، دوانیان روویان لە پێغەمبەری

خودا(ﷺ) کرد و ئەویتریان ڕۆیشت، وتی: ئەو دوانە لەسەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەستان، یەکێکیان: نێوانێکی لە ئەڵقەی دانیشتنەکەدا بینیەوە و تیایدا دانیشت، ئەویتریان لە دوای ئەوانەوە دانیشت، ئەوەی سێیەمیش پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەواو بوو فەرمووی: **(دەتانەوێ دەربارەی ئەو سێ کەسە هەواڵتان پێ بدەم؟ یەکێکیان ڕووی لە خودا کرد و خوداش ڕووی لە ئەو کرد، یەکێکی تریان شەرمی کرد و خوداش شەرمی لە ئەو کرد، ئەوەکەی تریان پشتی هەڵکرد و خوداش پشتی لە ئەو کرد).**

## ٨- دەروازەی: دڵنیابوونەوە لە زانست

**٣١٤-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ: أَنَّها كَانَتْ لاَ تَسْمَعُ شَيْئاً لاَ تَعْرِفُهُ، إِلاَّ رَاجَعَتْ فِيهِ حَتَّى تَعْرِفَهُ، وأَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ حُوسِبَ عُذِّبَ)، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: أَوَ لَيْسَ يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا﴾[الانشقاق: ٨]، قَالَتْ: فَقَالَ: (إِنَّمَا ذَلِكَ العَرْضُ، وَلكِنْ: مَنْ نُوقِشَ الحِسَابَ يَهْلِكْ). [خ١٠٣/ م٢٨٧٦]

(ق) لە عائیشەوە -هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)- ئەو هەر شتێکی ببیستبایە و نەیزانیبایە پێداچوونەوەی بۆ دەکرد تا دەیزانی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس موحاسەبە بکرێت سزادراوە)**، عائیشە وتی: منیش وتم: ئەی خودا(سبحانە وتعالی) نافەرموێ: ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا﴾[الانشقاق: ٨]، عائیشە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوە بریتییە لە "العرض"[1]، بەڵام هەر کەس حسابی لەگەڵ بکرێت تیادەچێت).**

---

[1] "العرض": بریتییە لە خستنەڕووی کار و کردەوەکان و دابەش کردنی نووسراوەکان، گەر کەسێك نووسراوەکەی بدرێتە دەستی ڕاستی محاسەبەیەکی سووك و ئاسان دەکرێت، ئایەتەکەی پێش ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەری: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ ۝ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا﴾[ الانشقاق: ٧-٨]، ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) باسی دەکات پێش دابەش کردنی نووسراوەکانە و کاتی پرسیار و وەڵام و لێپێچانەوەیە لەسەر گەورە و بچووکی کاروکردەوەکان، خودا زاناترە -و.

**٣١٥-** (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ مَعَ النَّبِيِ صلّى الله عليه وسلّم فِي المسْجِدِ، دَخَلَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ، فَأَنَاخَهُ فِي المسْجِدِ، ثُمَّ عَقَلَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُمْ: أَيُّكُمْ مُحَمَّدٌ؟ وَالنَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مُتَّكِئٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ، فَقُلْنَا: هذَا الرَّجُلُ الأَبْيَضُ المتَّكِئُ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: ابْنَ عَبْدِ المطَّلِبِ؟ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**قَدْ أَجَبْتُكَ**)، فَقَالَ الرَّجُلُ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: إِنِّي سَائِلُكَ فَمُشَدِّدٌ عَلَيْكَ فِي المسْأَلَةِ، فَلاَ تَجِدْ عَلَيَّ فِي نَفْسِكَ، فَقَالَ: (**سَلْ عَمَّا بَدَا لَكَ**) ؟ فَقَالَ: أَسْأَلُكَ بِرَبِّكَ وَرَبِّ مَنْ قَبْلَكَ، آللهُ أَرْسَلَكَ إِلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ؟ فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ نَعَمْ**). قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللهِ! آللهُ أَمَرَكَ أَنْ نُصَلِّيَ الصَّلَوَاتِ الخَمْسَ فِي اليَوْمِ وَاللَّيْلَةِ؟ قَالَ: (**اللَّهُمَّ نَعَمْ**). قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللهِ! آللهُ أَمَرَكَ أَنْ نَصُومَ هذَا الشَّهْرَ مِنَ السَّنَةِ؟ قَالَ: (**اللَّهُمَّ نَعَمْ**). قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللهِ! آللهُ أَمَرَكَ أَنْ تَأْخُذَ هذِهِ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَائِنَا فَتَقْسِمَهَا عَلَى فُقَرَائِنَا؟ فَقَالَ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم: (**اللَّهُمَّ نَعَمْ**). فَقَالَ الرَّجُلُ: آمَنْتُ بِمَا جِئْتَ بِهِ، وَأَنَا رَسُولُ مَنْ وَرَائِي مِنْ قَوْمِي، وَأَنَا ضِمَامُ بْنُ ثَعْلَبَةَ، أَخُو بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ. [خ٦٣]

**(خ) لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە، وتی: كاتێك ئێمە لە مزگەوت لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین، پیاوێك بە سواری حوشرێك هاتە ژوورەوە، لە مزگەوت یخیدا[(١)] پاشان بەستییەوە، پاشان پێی وتن: كامتان محەمەدن؟ پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوانیان شانیدادابوو، وتمان: ئەو پیاوە سپیكارەی شانیداداوە[(٢)]، پیاوەكە بە پێغەمبەری وت: كوڕی عەبدولموتەلیبی؟ پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (قد أجبتُك- وەڵامدایتەوە)، پیاوەكە بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: من پرسیارت لێ دەكەم و بابەتەكەت لەسەر توند دەكەمەوە، بۆیە لە نەفسی خۆتدا شتێك بەرانبەرم هەڵمەگرە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هەرچی دەزانی پرسیار بكە)، پیاوەكە وتی: داوات لێ دەكەم[(٣)] بە پەروەردگاری خۆت و پەروەردگاری ئەوانەی پێش تۆ، ئایا خودا تۆی**

---

(١) لە مزگەوت یخیدا: واتە لە حەوشەی مزگەوتەكە یان تەنیشت مزگەوتەكە حوشترەكەی هێنا بە چۆكدا و پاڵكەوت، بۆئەوەی لەسەری دابەزێت-و.

(٢) واتە: وتمان ئەوە محەمەدە-و.

(٣) داوات لێدەكەم: واتە: پرسیارت لێ دەكەم-و.

ڕەوانە کردووە بۆ هەموو خەڵکی؟ پێغەمبەر فەرمووی: **(أللهم نعم–بەڵێ سوێند بە خودا)**، پیاوەکە وتی: سوێندت دەدەم بە خودا، ئایا خودا فەرمانی پێکردووی لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژ ئەنجام بدەین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(أللهم نعم–بەڵێ سوێند بە خودا)**، پیاوەکە وتی: سوێندت دەدەم بە خودا، ئایا خودا فەرمانی پێکردووی لە ساڵێکدا ئەم مانگە[1] بەڕۆژوو بین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(أللهم نعم–بەڵێ سوێند بە خودا)**، پیاوەکە وتی: سوێندت دەدەم بە خودا، ئایا خودا فەرمانی پێکردووی ئەم صەدەقە لە دەوڵەمەندانمان وەربگری و بەسەر هەژاراندا دابەشی بکەی؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(أللهم نعم–بەڵێ سوێند بە خودا)**، پیاوەکە وتی: ئیمانم هێنا بەوەی هێناوتە، من نێراوی هۆزەکەمم لە دوای منەوەن، من "ضِمام بن ثعلبة"م، لە بەنی سەعدی کوڕی بیکر.

## ٩- دەروازەی: ئەوەی کەراهەتی هەیە[2] لە پرسیاری زۆر

**٣١٦**– (ق) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّ أَعْظَمَ المسْلِمِينَ جُرْماً، مَنْ سَأَلَ عَنْ شَيْءٍ لَمْ يُحَرَّمْ، فَحُرِّمَ مِنْ أَجْلِ مَسْأَلَتِهِ). [خ٧٢٨٩/ م٢٣٥٨]

(ق) لە لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(مەزنترین تاوان تاوانی موسڵمانێکە پرسیاری بابەتێکی کردووە حەرام نەبووە لەبەر پرسیارەکەی ئەو حەرامکراوە)**.

**٣١٧**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (دَعُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، إِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ سُؤَالُهُمْ واخْتِلاَفُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا نَهَيْتُكُم عَنْ شَيْءٍ فَاجْتَنِبُوهُ، وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ). [خ٧٢٨٨/ م١٣٣٧ و١٣٣٧م]

---

[1] بە دەربڕینەکەدا وا دەردەکەوێ ئەو کاتە مانگی ڕەمەزن بووە، چونکە پیاوەکە دەڵێت: (ئەم مانگە)–و.

[2] واتە: ناپەسەندە–و.

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(لێمگەڕێن لەسەر ئەوەی ئێوەم وازلێهێناوە[1]، پرسیاریان و ناکۆکییان لەسەر پێغەمبەرانیان ئەوانەی پێش ئێوەیان تیابرد).**

- ولفظ مسلم: (**بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ**).

**گوزارشتەکەی موسلیم: (بە زۆری پرسیارکردنیان).**

- وزاد مسلم في أَوله: خَطَبَنَا رسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**أَيُّهَا النَّاسُ، قَدْ فَرَضَ اللهُ عَلَيْكُمُ الحَجَّ فَحُجُّوا**) فَقَالَ رَجُلٌ: أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَسَكَتَ، حَتَّى قَالَهَا ثَلاَثاً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَوْ قُلْتُ: نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ**)، ثُمَّ قال: (**ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ...**).

**موسلیم ئەمەشی لە سەرەتاوە زیاد کردووە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاری بۆ داین و فەرمووی: (خەڵکینە خودا حەجی لەسەر ئێوە فەرز کردووە بۆیە حەج بکەن)، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئایا هەموو ساڵێك؟ پێغەمبەر بێدەنگ بوو، تا پیاوەکە سێ جار پرسیارەکەی کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر بموتبا بەڵێ، واجب دەبوو، و نەتاندەتوانی[2])، پاشان فەرمووی: (کە ئێوەم وازلێهێناوە ئێوەش لە من بگەڕێن).**

**٣١٨-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ أَشْيَاءَ كَرِهَهَا، فَلَمَّا أُكْثِرَ عَلَيْهِ غَضِبَ، ثُمَّ قَالَ لِلنَّاسِ: (**سَلُونِي عَمَّا شِئْتُمْ**) ؟ قَالَ رَجُلٌ: مَنْ أَبِي؟ قَالَ: (**أَبُوكَ حُذَافَةُ**). فَقَامَ آخَرُ فَقَالَ: مَنْ أَبِي يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ: (**أَبُوكَ سَالِمٌ مَوْلَى شَيْبَةَ**). فَلَمَّا رَأَى عُمَرُ مَا فِي وَجْهِهِ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نَتُوبُ إِلَى اللهِ عزّ وجل. [خ٩٢/ م٢٣٦٠]

---

[1] واتە: پرسیار مەکەن و وردی مەکەنەوە و لە خۆتانی قورس مەکەن و ناکۆکی و جیاوازی لەسەر فەرموودەی خودا و پێغەمبەر دروست مەکەن–و.

[2] واتە: لە توانای ئێوە بەدەربوو هەموو ساڵێك بتوانن حەج بکەن–و.

(ق) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: پرسیاری شتانێك لە پێغەمبەر(ﷺ) کرا لای ناپەسەند بوون، کاتێك پرسیارەکان لەسەری زۆرکران تووڕە بوو، پاشان بە خەڵکی فەرموو: **(چی دەخوازن بپرسن)**، پیاوێك وتی: باوکی من کێیە؟ فەرمووی: **(باوکی تۆ حوزافەیە)**، پیاوێکی تر هەستا وتی: باوکی من کێیە، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: **(باوکی تۆ سالمە مەولای شەیبە)**، کاتێك عومەر لە روخساریدا[1] شتێکی بینی[2]، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە تەوبە دەکەین و دەگەڕێینەوە بۆ لای خودا(عز وجل).

**٣١٩**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ وَاخْتِلاَفِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، لاَ تَسْأَلُونِي عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ أَخْبَرْتُكُمْ بِهِ)**، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ حُذَافَةَ: مَنْ أَبِي يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: **(أَبُوكَ حُذَافَةُ بْنُ قَيْسٍ)**، فَرَجَعَ إِلَى أُمِّهِ فَقَالَتْ: وَيْحَكَ! مَا حَمَلَكَ عَلَى الَّذِي صَنَعْتَ، فَقَدْ كُنَّا أَهْلَ جَاهِلِيَّةٍ، وَأَهْلَ أَعْمَالٍ قَبِيحَةٍ؟ فَقَالَ لَهَا: إِنْ كُنْتُ لَأُحِبُّ أَنْ أَعْلَمَ مَنْ أَبِي مَنْ كَانَ مِنَ النَّاسِ.		[حم١٠٥٣١]

* صحيح، وإسناده حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بە زۆری پرسیار و جیاوازییان لەسەر پێغەمبەرانیان ئەوانەی پێش ئێوە تیاچوون، پرسیاری هەر شتێکم لێ بکەن هەواڵتان پێ دەدەم)**، عەبدوڵای کوڕی حوزافە وتی: باوکی من کێیە، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: **(باوکی تۆ حوزافەی کوڕی قەیسە)**، گەڕایەوە بۆ لای دایکی، دایکی پێی وت: هاوار بە حاڵت، چی پاڵینای بۆ ئەوەی ئەنجامت دا، ئێمە ئەهلی نەفامی و ئەهلی کاری ناشیرین بووین؟ عەبدوڵا وتی: پێمخۆش بوو بزانم باوکم لەناو خەڵکی کێیە.

---

[1] واتە: لە روخساری پێغەمبەری خودادا–و.

[2] واتە: شتێك لە تووڕەیی و بێزاری بینی–و.

## ١٠- دەروازەی: میانەگیری[1] لە ئامۆژگاری

**٣٢٠-** (ق) عَنْ أَبِي وائِلٍ قالَ: كَانَ عبْدُ اللهِ بْنُ مسعودٍ يُذَكِّرُ النَّاسَ فِي كُلِّ خَمِيسٍ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمنِ، لَوَدِدْتُ أَنَّكَ ذَكَّرْتَنَا كُلَّ يَوْمٍ، قَالَ: أَمَا إِنَّهُ يَمْنَعُنِي مِنْ ذَلِكَ أَنِّي أَكْرَهُ أَنْ أُمِلَّكُمْ، وَإِنِّي أَتَخَوَّلُكُمْ بِالمَوْعِظَةِ، كَمَا كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَتَخَوَّلُنَا بِهَا، مَخَافَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا. [خ٧٠ (٦٨)/ م٢٨٢١]

**(ق) لە ئەبی وائلەوە، وتی: هەموو پێنج شەممەیەك عەبدوڵای كوڕی مەسعوود باسی بۆ خەڵكی دەكرد، پیاوێك پێی وت: ئەی باوكی عبدالرحمن، ئاوات دەخوازم هەموو رۆژێك باست بۆ ئێمە بكردبایە، وتی: ئەوەی رێگریم لێ دەكات لەو كارە ئەوەیە لام ناپەسەندە تووشی وەڕسی و شەكەتیتان بكەم، من ناوە بە ناوە[2] ئامۆژگاریتان دەكەم وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) ناوە بە ناوە ئامۆژگاری ئێمەی دەكرد، لە ترسی وەڕسی و شەكەتی لەسەرمان.**

**٣٢١-** (خ) عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: حَدِّثِ النَّاسَ كُلَّ جُمُعَةٍ مَرَّةً، فَإِنْ أَبَيْتَ فَمَرَّتَيْنِ، فَإِنْ أَكْثَرْتَ فَثَلاَثَ مِرَارٍ، وَلاَ تُمِلَّ النَّاسَ هذَا القُرْآنَ، وَلاَ أُلفِيَنَّكَ تَأْتِي القَوْمَ وَهُمْ فِي حَدِيثٍ مِنْ حَدِيثِهِمْ، فَتَقُصُّ عَلَيْهِمْ، فَتَقْطَعُ عَلَيْهِمْ حَدِيثَهُمْ فَتُمِلُّهُمْ، وَلكِنْ أَنْصِتْ، فَإِذَا أَمَرُوكَ فَحَدِّثْهُمْ وَهُمْ يَشْتَهُونَهُ، فَانْظُرِ السَّجْعَ مِنَ الدُّعَاءِ فَاجْتَنِبْهُ، فَإِنِّي عَهِدْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَصْحَابَهُ لاَ يَفْعَلُونَ إِلاَّ ذلِكَ. يَعْنِي: لاَ يَفْعَلُونَ إِلاَّ ذلِكَ الاِجْتِنَابَ. [خ٦٣٣٧]

**(خ) لە عیكریمەوە، لە ئیبن عەباسەوە، وتی: هەموو هەفتەیەك یەكجار قسە بۆ خەڵك بكە، گەر نە، دوو جار، گەر زۆرت كرد سێ جار، خەڵكی لەم قورئانە تووشی وەڕسی مەكە، ئولفەتت پێوە ناگرن، دێی بۆ لای دەستەیەك ئەوان لە قسەی خۆیاندان و تۆش باسێكیان بۆ دەگێڕییەوە و قسەكەیان پێ دەبڕی، ئەوكات تووشی**

---

[1] میانەگیری: واتە: كورتی و پوختی-و.

[2] كەم كەم و هەفتەیە جارێك-و.

وەرسییان دەکەی، بەڵام بێدەنگ بە، گەر فەرمانیان پێ کردی قسەیان بۆ بکە و ئەوان حەزی لێ دەکەن، لە سەجعی[1] دوعا کردن وردببەرەوە و لێی دووربکەوە[2]، چونکە لە پێغەمبەری خودا و هاوەڵانیم دەبینی تەنها ئەوەیان ئەنجام دەدا، واتە: تەنها ئەو دوورکەوتنەوەیان لە سەجع ئەنجام دەدا.

## ١١- دەروازەی: چۆنێتی بانگەواز بۆ لای خودا (سبحانه وتعالى)

**٣٢٢-** (ق) عَن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، حِينَ بَعَثَهُ إِلَى اليَمَنِ: **(إِنَّكَ سَتأْتِي قَوْماً أَهْلَ كِتَابٍ، فَإِذَا جِئْتَهُمْ فَادْعُهُمْ إِلَى: أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذلِكَ فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومِ، فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللهِ حِجَابٌ)**. [خ١٤٩٦ (١٣٩٥)/ م١٩]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێک مەعازی کوڕی جەبەلی بۆ یەمەن رەوانە کرد پێی فەرموو: **(تۆ دەچی بۆ لای کۆمەڵێك ئەهلی کیتابن، گەر چووی بۆ لایان بانگیان بکە بۆ: شایەتیدان لەسەر ئەوەی خودا تاك و تەنهایە و محەمەد پێغەمبەری خودایە، گەر بەوە گوێڕایەڵییان لێکردی هەواڵیان پێ بدە خودا لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر ئەوان فەرز کردووە، گەر ئەوان بەوە گوێڕایەڵییان لێ کردی هەواڵیان پێ بدە خودا صەدەقەی لەسەر ئەوان فەرزکردووە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێت و بۆ هەژارەکانیان دەگێڕرێتەوە،**

---

[1] سەجع (السجع): یەکێکە لە هونەرەکانی بەدیعی گوزارەیی کە زمانی عەرەبی پێ جیادەبێتەوە، سەجع هاوشێوەبوونی بڕگەکانی قسەکردنە لەسەر هەمان باس بە نزیکی، بەو مانایەی رستەکان لە ژمارەی وشەکاندا یەکسان بن و کۆتاییەکان لە ئاوازدا هاوشێوە بن-و.

[2] گەر کەسەکە لە دوعادا سەرقاڵی هۆنینەوەی سەجع بێت خشوعی دوعا لەدەست دەدات، بۆیە پێی دەڵێت لە دوعادا لە سەجع خۆت بەدووربگرە-و.

**گەر ئەوان بەوە گوێڕایەڵیان لێکردی ئاگادارت دەکەمەوە خۆت بەدووربگرە لە ماڵ و سامانی بەنرخیان[1]، لە دوعای کەسی ستەملێکراو خۆت بپارێزە، چونکە لە نێوان دوعاکە و خودا پەردە بوونی نییە).**

**٣٢٣-** عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَنَحْنُ فِتْيَانٌ حَزَاوِرَةٌ، فَتَعَلَّمْنَا الْإِيمَانَ قَبْلَ أَنْ نَتَعَلَّمَ القُرْآنَ، ثُمَّ تَعَلَّمْنَا القُرْآنَ فَازْدَدْنَا بِهِ إِيمَاناً. [جه٦١]

* صحيح.

**لە جوندوبی کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، ئێمە کۆمەڵێك گەنجی پێگەیشتوو بووین(بەهێز و دامەزراو بووین)، ئیمان فێربووین بەر لەوەی قورئان فێربین، پاشان قورئان فێربووین و بەهۆیەوە ئیمانمان پێ زیاد کرد.**

## ١٢- دەروازەی: فێرکردنی ئافرەتان

**٣٢٤-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! ذَهَبَ الرِّجَالُ بِحَدِيثِكَ، فَاجْعَلْ لَنَا مِنْ نَفْسِكَ يَوْماً نَأْتِيكَ فِيهِ، تُعَلِّمُنَا مِمَّا عَلَّمَكَ اللهُ، فَقَالَ: (اجْتَمِعْنَ فِي يَوْمِ كَذَا وَكَذَا، فِي مَكَانِ كَذَا وَكَذَا)، فَاجْتَمَعْنَ، فَأَتَاهُنَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَعَلَّمَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَهُ اللهُ، ثُمَّ قَالَ: **(مَا مِنْكُنَّ امْرَأَةٌ تُقَدِّمُ بَيْنَ يَدَيْهَا مِنْ وَلَدِهَا ثَلَاثَةً؛ إِلاَّ كَانَ لَهَا حِجَاباً مِنَ النَّارِ)**، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ: يَا رَسُولَ اللهِ! اثْنَيْنِ؟ قَالَ: فَأَعَادَتْهَا مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: **(وَاثْنَيْنِ وَاثْنَيْنِ وَاثْنَيْنِ)**. [خ٧٣١٠ (١٠١)/ م٢٦٣٣]

**(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، پیاوان بە فەرموودەی تۆ تایبەت بوون، رۆژێکمان بۆ دابنێ تیایدا بێینە خزمەتت و ئەوەی خودا فێری کردووی فێرمان بکەی، پێغەمبەر فەرمووی: (لە رۆژی ئەوە و ئەوە و لە جێگە(شوێن)ی ئەوێ و ئەوێ کۆببنەوە)،**

[1] ئەو حوشتر و مەڕ و ماڵاتانەی شیریان زۆر و موو و خوری و کوڵکیان فرە و قەڵە و قەشەنگ و جوانن-و.

ئەوانیش کۆبوونەوە و پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ لایان و ئەوەی خودا فێری ئەوی کرد بوو ئەوانی پێ فێر کرد، پاشان فەرمووی: **(هەریەك لە ئێوە سێ منداڵی پێش خۆی خستبێت لە ئاگر دەبێتە پەردە بۆی)**، یەکێك لە ئافرەتەکان وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر دوو منداڵ بێت؟ دوو جار قسەکەی دووبارە کردەوە، پاشان پێغەمبەر فەرمووی: **(دووش[1]، دووش، دووش)**.

## ١٣- دەروازەی: گرتنەوەی زانست

**٣٢٥-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْن عَمْرِو بْنِ العَاصِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(إِنَّ اللهَ لاَ يَقْبِضُ العِلْمَ انْتِزَاعاً يَنْتَزِعُهُ مِنَ العِبَادِ، وَلكِنْ يَقْبِضُ العِلْمَ بِقَبْضِ العُلَمَاءِ، حَتَّى إِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِماً، اتَّخَذَ النَّاسُ رُؤُوساً جُهَّالاً، فَسُئِلُوا، فَأَفْتَوا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا)**.

[خ١٠٠/ م٢٦٧٣]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(خودا زانست ناگرێتەوە لە بەندەکان بە داڕنین دایبڕنێت، بەڵکو زانست بە گرتنەوەی زانایان[2] دەگرێتەوە، تا زانایەك نامێنێت، خەڵکی کۆمەڵێك سەرکردەی نەزان بۆ خۆیان دادەنێن، پرسیاریان لێ دەکرێت ئەوانیش بەبێ زانست فتوا دەدەن، خۆیان گومڕا دەبن و ئەوانیش گومڕا دەکەن)**.

**٣٢٦-** عَنْ زِيَادِ بْنِ لَبِيدٍ قَالَ: ذَكَرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم شَيْئاً فَقَالَ: **(ذَاكَ عِنْدَ أَوَانِ ذَهَابِ العِلْمِ)**، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! وَكَيْفَ يَذْهَبُ العِلْمُ وَنَحْنُ نَقْرَأُ القُرْآنَ، وَنُقْرِئُهُ أَبْنَاءَنَا، وَيُقْرِئُهُ أَبْنَاؤُنَا أَبْنَاءَهُمْ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ؟ قَالَ: **(ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ زِيَادُ! إِنْ كُنْتُ لأَرَاكَ مِنْ أَفْقَهِ رَجُلٍ بِالمَدِينَةِ، أَوَلَيْسَ هَذِهِ اليَهُودُ وَالنَّصَارَى يَقْرَؤُونَ التَّوْرَاةَ وَالإِنْجِيلَ لاَ يَعْمَلُونَ بِشَيْءٍ مِمَّا فِيهِمَا؟)**.

[جه٤٠٤٨]

* صحيح.

---

[1] واتە: دوو منداڵیش-و.

[2] گرتنەوەی زانایان: واتە مراندنیان-و.

لە زیادی كوڕی لەبیدەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) باسی شتێكی كرد و فەرمووی: **(ئەوە لە كاتی ڕۆیشتنی زانستدایە[1])**، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن زانست دەڕوات لە كاتێكدا ئێمە قورئان دەخوێنین و بە منداڵەكانمان دەیخوێنین، و منداڵەكانمان بە منداڵەكانی خۆیان دەخوێنن تا ڕۆژی قیامەت؟! فەرمووی: **(دایكت تۆی لەبارچوویا، زیاد، من تۆم بە فەقیهترین پیاوی مەدینە دەزانی، بۆ مەگەر ئەمە یەهوود و نەصارا نین تەورات و ئینجیل دەخوێنن و بە شتێك لەوەی تێیدایە كار ناكەن؟)**.

**٣٢٧**– عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ اليَمَانِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يَدْرُسُ الْإِسْلاَمُ كَمَا يَدْرُسُ وَشْيُ الثَّوْبِ، حَتَّى لاَ يُدْرَى مَا صِيَامٌ وَلاَ صَلاَةٌ وَلاَ نُسُكٌ وَلاَ صَدَقَةٌ! وَلَيُسْرَى عَلَى كِتَابِ اللهِ عزّ وجل فِي لَيْلَةٍ، فَلاَ يَبْقَى فِي الْأَرْضِ مِنْهُ آيَةٌ، وَتَبْقَى طَوَائِفُ مِنَ النَّاسِ: الشَّيْخُ الكَبِيرُ وَالعَجُوزُ يَقُولُونَ: أَدْرَكْنَا آبَاءَنَا عَلَى هَذِهِ الكَلِمَةِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، فَنَحْنُ نَقُولُهَا).

فَقَالَ لَهُ صِلَةُ: مَا تُغْنِي عَنْهُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَهُمْ لاَ يَدْرُونَ مَا صَلاَةٌ وَلاَ صِيَامٌ وَلاَ نُسُكٌ وَلاَ صَدَقَةٌ؟

فَأَعْرَضَ عَنْهُ حُذَيْفَةُ، ثُمَّ رَدَّهَا عَلَيْهِ ثَلاَثاً كُلَّ ذَلِكَ يُعْرِضُ عَنْهُ حُذَيْفَةُ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْهِ فِي الثَّالِثَةِ، فَقَالَ: يَا صِلَةُ، تُنْجِيهِمْ مِنَ النَّارِ، ثَلاَثاً. [جه٤٠٤٩]

* صحيح.

لە حوزەیفەی كوڕی یەمانەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئیسلام دەڕزێت[2] وەك چۆن نەقشی پۆشاك دەڕزێت، تا نازانرێت ڕۆژوو چییە و نوێژ چییە و نوسك[3] چییە و صەدەقە چییە، شەوێك دێت بەسەر كتێبەكەی خودادا(عز وجل) لە زەوی ئایەتێك لە قورئان نامێنێت، چەند دەستەیەك لە خەڵك دەمێننەوە، پیرە پیاو**

[1] ڕۆیشتنی زانست: نەمان و مردنی زانست و كەمبایەخ بوونی–و.

[2] دەڕزێت: دەپوێت و كاڵدەبێتەوە و كەمبایەخ دەبێت–و.

[3] نوسك: لێرەدا "نوسك" مانای ڕێ و ڕەسمی حەجكردنی هەیە، چونكە باسی ڕۆژوو و نوێژ و صەدەقە كراوە و تەنها باسی حەج ماوە–و.

و پیرەژن دەڵێن: ئێمە لەسەر ئەم وشەیە "لا إلـه إلا الله" بە باب و باپیرانمان گەیشتین، بۆیە ئێمەش دەیڵێینەوە).

"صـلة" بە حوزەیفەی وت: "لا إلـه إلا الله" چ سوودێك بەوان دەگەیەنێت، لە کاتێکدا ئەوان نازانن نوێژ چییە و ڕۆژوو چییە و نوسك چییە و صەدەقە چییە؟

حوزەیفە پشتی تێکرد، پاشان سێ جار پرسیارەکەی بەسەردا دووبارە کردەوە، هەر جارە و حوزەیفە پشتی تێدەکرد، لە سێیەمیاندا ڕووی لێکرد و وتی: ئەی "صلة"، لە ئاگر ڕزگاریان دەکات، سێ جار ئەمەی وت..

## ١٤- دەروازەی: بیستنی منداڵ و فێرکردنی

**٣٢٨-** (ق) عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ قَالَ: عَقَلْتُ مِنَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مَجَّةً مَجَّهَا فِي وَجْهِي . وَأَنَا ابْنُ خَمسِ سِنِينَ . مِنْ دَلْوٍ. [خ٧٧/ م٣٣م/ مساجد ٢٦٥]

(ق) لە مەحموودی کوڕی ڕەبیعەوە، وتی: لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەوەم لەبیرە لە دۆڵچەیەك[1] ئاوی دەمی خۆی پرژاند لە ڕوخسارم، من منداڵێکی پێنج ساڵان بووم.

## ١٥- دەروازەی: ئال و بەیت بە زانستێك تایبەت نەکراون

**٣٢٩-** (ق) عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: مَا عِنْدَنَا كِتَابٌ نَقْرَؤُهُ؛ إِلاَّ كِتَابُ اللهِ غَيْرَ هذِهِ الصَّحِيفَةِ، قَالَ: فَأَخْرَجَهَا، فَإِذَا فِيهَا أَشْيَاءُ مِنَ الجِرَاحَاتِ وَأَسْنَانِ الإِبِلِ، قَالَ: وَفِيهَا: (**المَدِينَةُ حَرَمٌ مَا بَيْنَ عَيْرٍ إِلَى ثَوْرٍ، فَمَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثاً، أَوْ آوَى مُحْدِثاً، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ. وَمَنْ وَالَى قَوْماً بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ.** وَذِمَّةُ المُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ، يَسْعى بِهَا

[1] دۆڵچە: دەفرێکی دارینە یان لە هەر مادەیەکی تر، بە پەتێکدا شۆڕ دەکرێتەوە بۆ ناو بیر و ئاوی پێ هەڵدەگوزرێت-و.

أَدْنَاهُمْ، فَمَنْ أَخْفَرَ مُسْلِماً فعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ). [خ٦٧٥٥ (١١١)/ م١٣٧٠]

(ق) لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: نوسراوێکمان نییە بیخوێنینەوە جگە لە کتێبەکەی خودا و ئەم لاپەڕەیە، وتی: لاپەڕەکەی دەرهێنا کۆمەڵێك شتی تێدا بوو دەربارەی بریندارکارییەکان(الجراحات) و ددانی حوشتر(أسنان الإبل)[١]، وتی: ئەمەشی تێدا بوو: **(مەدینە حەرەمە لە نێوان "عیر"ەوە بۆ "ثور"، هەر کەس "حَدَث[٢]"ێکی تێدا بەرپا بکات، یان دالّدەی "مُحْدِث[٣]"ێك بدات نەفرەتی خودا و فریشتە و هەموو خەڵکی لەسەر بێت، لە رۆژی قیامەت "صرف و عدل[٤]"ی لێ قبووڵ ناکرێت، هەر کەس وەلا بە کۆمەڵێك بدات بەبێ مۆڵەتی مەوالی خۆی نەفرەتی خوا و فریشتە و هەموو خەڵکی لەسەر بێت، لە رۆژی قیامەت"صرف و عدل"ی لێ قبووڵ ناکرێت، زیمەی موسڵمانان یەکە[٥]، نزمترینیان دەگرێتەوە[٦]، هەر کەس غەدر لە موسڵمانێك بکات نەفرەتی خودا و فریشتە و هەموو خەڵکی لەسەر بێت، لە رۆژی قیامەت "صرف و عدل"ی لێ قبووڵ ناکرێت).**

- وفي رواية للبخاري: عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيٍّ ﷺ: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ مِنَ الوَحْيِ إِلاَّ مَا فِي كِتَابِ اللهِ؟ قَالَ: وَالَّذِي فَلَقَ الحَبَّةَ وَبَرَأَ النَّسَمَةَ، مَا أَعْلَمُهُ إِلاَّ فَهْماً يُعْطِيهِ

---

[١] ئەو ماڵ و سامانەی لە خوێنی شکاندنی ددانی حوشتر دەدرێت.

[٢] "الحدث": بریتییە لە بیدعە و فیتنە و ئاشووب–و.

[٣] "المحدِث": بریتییە لە بیدعەچی و فیتنەباز و ئاشووبگێڕ–و.

[٤] "صرف و عدل" وتراوە "صرف" بریتییە لە تەوبە و "عدل" بریتییە لە فیدیە، وتراویشە "صرف" بریتییە لە نافیلە و "عدل" بریتییە لە فەرز، پوختەی ماناکەیان بریتییە لە بێبەشبوونی کەسەکە لە خێر–و.

[٥] دالّدەدان و پەنادان و ئاسایش پێدانی موسڵمانێك بۆ کەسێك دالّدەدان و پەنادان و ئاسایش پێدانی هەموو موسڵمانانە–و.

[٦] واتە: پەنادان و دالّدەدانەکە تەنها بۆ خەڵکی بە دەسەڵات و دەوڵەمەند و ناودار نییە، بەڵکو هەموو موسڵمانێك بەهێز بێت یان بێهێز دەگرێتەوە–و.

اللهُ رَجُلاً فِي القُرْآنِ، وَمَا فِي هذِهِ الصَّحِيفَةِ، قُلْتُ: وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ؟ قَالَ: العَقْلُ، وَفَكَاكُ الأَسِيرِ، وأَنْ لاَ يُقْتَلَ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ. [خ٣٠٤٧]

**لە ریوایەتێکی بوخاریدا: لە ئەبی جوحەیفەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: وتم: بە عەلی(خوا لێی رازی بێت): ئایا شتێکتان لە وەحی لە لایە جگە لە کتێبەکەی خودا؟ وتی: سوێند بەو کەسەی "فلق الحبة وبرأ النسمة"[1] شتی وا نازانم، جگە لە تێگەیشتنێك خودا لە قورئان بە پیاوێکی ببەخشێت، لەگەڵ ئەوەی لەم لاپەڕەدایە، وتم: چی لەو لاپەڕەدایە؟ وتی: دییە[2] و رزگار کردنی دیل، و موسڵمان بە بێباوەڕ ناکوژرێتەوە.**

**٣٣٠-** (م) عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: سئِلَ عَلِيٌّ: أَخَصَّكُمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِشَيْءٍ؟ فَقَالَ: مَا خَصَّنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِشَيْءٍ لَمْ يَعُمَّ بِهِ النَّاسَ كَافَةً؛ إِلاَّ مَا كَانَ فِي قِرَابِ سَيْفِي هَذَا، قَالَ: فَأَخْرَجَ صَحِيفَةً مَكْتُوبٌ فِيهَا: (**لَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ، وَلَعَنَ اللهُ مَنْ سَرَقَ مَنَارَ الأَرْضِ، وَلَعَنَ اللهُ مَنْ لَعَنَ وَالِدَهُ، وَلَعَنَ اللهُ مَنْ آوَى مُحْدِثاً**). [م١٩٧٨]

**(م) لە ئەبی توفەیلەوە، وتی: پرسیار لە عەلی کرا: ئایا پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێوەی بە شتێك تایبەت کردووە؟ وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێمەی بە شتێك تایبەت نەکردووە هەموو خەڵکی پێ نەگرتبێتەوە، جگە لەوەی لە کیفی ئەم شمشێرەمدایە، وتی: لاپەڕەیەکی دەرهێنا تیایدا نووسرا بوو: (نەفرەتی خودا لەو کەسەی بۆ جگە لە خودا سەردەبڕێت، نەفرەتی خودا لەو کەسەی نیشانەکانی زەوی دەدزێت[3]، نەفرەتی خودا لەو کەسەی نەفرەت لە باوکی خۆی دەکات، نەفرەتی خودا لەو کەسەی دالّدەی "مُحْدِث[4]"ێك دەدات).**

---

[1] "فلق الحبة وبرأ النسمة": واتە تۆو شەق پێ دەبات و گیان دەکات بە بەردا و بەدیدەهێنێت-و.

[2] دییە: خوێندان لە بری کوشتن-و.

[3] واتە: سنوورە سروشتییەکانی زەوی دەشێوێنێت، لە گۆڕینی ئاراستەی ئاو و تێکدانی چیا و گرد و دارستان، هتد..بە مەرجێ ببێتە زیان بۆ خەڵکانی تر-و.

[4] "محدث": بیدعەچی و ئاشووبگێڕ و فیتنەباز-و.

**٣٣١**– عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيٍّ: أَخْبِرْنَا عَنْ مَسِيرِكَ هَذَا، أَعَهْدٌ عَهِدَهُ إِلَيْكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، أَمْ رَأْيٌ رَأَيْتَهُ؟ فَقَالَ: مَا عَهِدَ إِلَيَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِشَيْءٍ، وَلَكِنَّهُ رَأْيٌ رَأَيْتُهُ. [د٤٦٦٦]

* صحيح الإسناد.

**لە قەیسی کوڕی عوبادەوە، وتی: بە "عەلی"م وت: هەواڵمان پێ بدە لەم ڕێگەی گرتووتەبەر[1]، ئایا عەهدێکە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی کردووی، یان را و بۆچوونێکە پێت باش بووە؟[2] وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هیچ عەهدێکی رادەست نەکردووەم، بەڵکو را و بۆچوونێکە پێمباش بووە.**

## ١٦- دەروازەی: ناپەسەندی پرسیار لە ئەهلی کیتاب

**٣٣٢**– (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ أَهْلُ الكِتَابِ يَقْرَؤُونَ التَّوْرَاةَ بِالعِبْرَانِيَّةِ، وَيُفَسِّرُونَهَا بِالعَرَبِيَّةِ لأَهْلِ الإِسْلامِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تُصَدِّقُوا أَهْلَ الكِتَابِ وَلاَ تُكَذِّبُوهُمْ**، وَقُولُوا: ﴿**ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا**﴾الآيَةَ [البقرة:١٣٦]). [خ٤٤٨٥]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: ئەهلی کیتاب تەوراتیان بە عیبرانی دەخوێندەوە و بە عەرەبی بۆ ئەهلی ئیسلام تەفسیریان دەکرد، پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەهلی کیتاب بە راست مەزانن و بەدرۆشیان مەزانن، بڵێن: ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا﴾ [البقرة:١٣٦]).**

**٣٣٣**– (خ) عَن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَيْفَ تَسْأَلُونَ أَهْلَ الكِتَابِ عَنْ شَيْءٍ وَكِتَابُكُمُ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَحْدَثُ، تَقْرَؤُونَهُ مَحْضاً لَمْ يُشَبْ، وَقَدْ حَدَّثَكُمْ أَنَّ أَهْلَ الكِتَابِ بَدَّلُوا كِتَابَ اللهِ وَغَيَّرُوهُ، وَكَتَبُوا بِأَيْدِيهِمُ الكِتَابَ، وَقَالُوا: هُوَ مِنْ عِنْدِ

---

[1] واتە: ڕۆیشتنت بۆ جەنگان دژ بەوانەی سەرپێچی لە تۆ دەکەن–و.

[2] واتە: ئایا ئەمە فەرمانی پێغەمبەرە یان ئیجتیهادی خۆتە؟–و.

اللهِ لِيَشْتَرُوا بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً؟ أَلاَ يَنْهَاكُمْ مَا جَاءَكُمْ مِنَ العِلْمِ عَنْ مَسْأَلَتِهِمْ؟ لاَ وَاللهِ، مَا رَأَيْنَا مِنْهُمْ رَجُلاً يَسأَلُكُمْ عَنِ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَيْكُمْ. [خ٧٣٦٣ (٢٦٨٥)]

**(خ) له ئیبن عەباسەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: چۆن پرسیار دەکەن لە ئەهلی کیتاب دەربارەی شتێك لە کاتێکدا کتێبەکەتان کە دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێترە[1]، بە پاڵفتەیی و بێ تێکەڵبوون بە شتێکی تر دەیخوێننەوە، کتێبەکەتان باسی ئەوەی بۆ کردن ئەهلی کیتاب کتێبی خوایان ئاڵوگۆڕ کرد و گۆڕانیان بەسەردا هێنا و بە دەستی خۆیان کتێبیان نووسی و وتیان: ئەوە لە لای خوداوەیە، بۆئەوەی نرخێکی کەمی پێ بەدەست بهێنن؟! ئایا ئەوەی بۆ ئێوە هاتووە لە زانست نەهێتان لێ ناکات لە پرسیار لێکردنیان؟ نە، سوێند بە خودا، پیاوێك لەوانمان نەبینی دەربارەی ئەوەی بۆ سەر ئێوە دابەزیوە پرسیارتان لێ بکات.**

**٣٣٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: كَانَ نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُحَدِّثُنَا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ حَتَّى يُصْبِحَ، مَا يَقُومُ إِلاَّ إِلَى عُظْمِ صَلاَةٍ. [د٣٦٦٣]

* صحيح الإسناد.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) تا بەیانی لێ دەبوویەوە باسی بەنی ئیسرائیلی بۆ دەکردین، تەنها بۆ مەزنی نوێژ هەڵدەستا.**

**٣٣٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عن النبي صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(حَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ، حَدِّثُوا عَنِّي وَلاَ تَكْذِبُوا).** [حم١١٥٣٦]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (دەربارەی بەنی ئیسرائیل قسە بکەن، حەرەجی تێدا نییە، لە منەوە بگێڕنەوە[2] و درۆ مەکەن).**

---

(1) واتە: تازەترە و لەدوای تەورات و ئینجیل دابەزیوە، بۆیە زاڵە بەسەر کتێبەکانی پێش خۆیدا و دەستوەردان و لادانی تێنەکەوتووە —و.

(2) بگێڕنەوە: واتە باس بکەن —و.

## ١٧- دەروازەی: بە شتێك قسە لەگەڵ خەڵك دەكرێت بگاتە ژیری و ژنەوتنیان

**٣٣٦-** (خ) عَنْ علي ﷺ قَالَ: حَدِّثُوا النَّاسَ بِمَا يَعْرِفُونَ، أَتُحِبُّونَ أَنْ يُكَذَّبَ اللهُ وَرَسُولُهُ. [خ١٢٧]

**(خ) لە عەلییەوە(خ)، وتی: قسە بۆ خەڵكی بكەن بەوەی دەیزانن(دەیناسن و پێی ئاشنان)، پێتان خۆشە خودا و پێغەمبەرەكەی بە درۆ بزانرێت.**

**٣٣٧-** (م) عن عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: مَا أَنْتَ بِمُحَدِّثٍ قَوْماً حَدِيثاً لاَ تَبْلُغُهُ عُقُولُهُمْ؛ إِلاَّ كَانَ لِبَعْضِهِمْ فِتْنَةً. [مقدمة مسلم]

**(م) لە عەبدوڵای كوڕی مەسعوودەوە، وتی: تۆ گەر قسە لەگەڵ دەستەیەك بكەی و نەگاتە ژیری و ژنەوتنیان بۆ هەندێكیان دەبێتە فیتنە.**

**٣٣٨-** (م) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ نُنَزِّلَ النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ، مَعَ مَا نَطَقَ بِهِ القُرْآنُ مِنْ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ [يوسف:٧٦]. [مقدمة مسلم]

**(م) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێكردین خەڵكی لە مەنزیلەتی خۆیان دابنێین، لەگەڵ ئەوەی قورئان دەریبڕیوە لە فەرموودەی خودا(تعالى): ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ [يوسف:٧٦].**

## ١٨- دەروازەی: گەشت بۆ داوای زانست[1]

**٣٣٩-** (م) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الوَلِيدِ بْنِ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: خَرَجْتُ أَنَا وَأَبِي نَطْلُبُ العِلْمَ فِي هَذَا الحَيِّ مِنَ الأَنْصَارِ، قَبْلَ أَنْ يَهْلِكُوا، فَكَانَ أَوَّلُ مَنْ لَقِينَا أَبَا اليَسَرِ، صَاحِبَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. وَمَعَهُ غُلاَمٌ لَهُ، مَعَهُ ضِمَامَةٌ مِنْ صُحُفٍ،... وذكر الحديث. [م٣٠٠٦]

---

[1] داوای زانست: واتە بەدەستهێنان و فێربوونی زانست–و.

(م) لە عوبادەی كوڕی وەلیدی كوڕی عوبادەی كوڕی صامتەوە، وتی: من و باوكم چوینە دەرەوە هەوڵی زانستمانمان دەدا لەم گەڕەكەی ئەنصار بەرلەوەی تیابچن[1]، یەكەمین كەسێك پێی گەیشتین ئەبا یەسەر[2] بوو، هاوەڵی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، غوڵامێكی خۆی لەگەڵ بوو، گورزەیەك لاپەڕەی پێبوو،....فەرموودەكەی باس كرد.

**٣٤٠-** (م) عن عَبْدِ اللهِ بْنِ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: لاَ يُسْتَطَاعُ العِلْمُ بِرَاحَةِ الجِسْمِ. [م٦١٢/١٧٥]

(م) لە عەبدوڵای كوڕی یەحیای كوڕی ئەبی كەسیرەوە، وتی: گوێم لە باوكم بوو دەیوت: بە ئاسوودەیی و پشووی جەستە زانست فەراهەم نابێت.

**٣٤١-** عَنْ كَثِيرِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِساً مَعَ أَبِي الدَّرْدَاءِ فِي مَسْجِدِ دِمَشْقَ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا أَبَا الدَّرْدَاءِ! إِنِّي جِئْتُكَ مِنْ مَدِينَةِ الرَّسُولِ صلّى الله عليه وسلّم لِحَدِيثٍ بَلَغَنِي أَنَّكَ تُحَدِّثُهُ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، مَا جِئْتُ لِحَاجَةٍ.

قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَنْ سَلَكَ طَرِيقاً يَطْلُبُ فِيهِ عِلْماً سَلَكَ اللهُ بِهِ طَرِيقاً مِنْ طُرُقِ الجَنَّةِ، وَإِنَّ المَلاَئِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا رِضاً لِطَالِبِ العِلْمِ، وَإِنَّ العَالِمَ لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ، وَالحِيتَانُ فِي جَوْفِ المَاءِ، وَإِنَّ فَضْلَ العَالِمِ عَلَى العَابِدِ كَفَضْلِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ عَلَى سَائِرِ الكَوَاكِبِ، وَإِنَّ العُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ، وَإِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَاراً وَلاَ دِرْهَماً، وَرَّثُوا العِلْمَ، فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ**). [د٣٦٤١/ ت٢٦٨٢/ جه٢٢٣/ مي٣٥٤]

* صحيح.

لە كەسیری كوڕی قەیسەوە، وتی: لەگەڵ ئەبی دەردا لە مزگەوتی دیمەشق دانیشتبووم، پیاوێك هات بۆ لای و وتی: ئەی ئەبا دەردا، من بۆ فەرموودەیەك لە مەدینەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووم بۆ لای تۆ، پێمگەیشتووە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەیگێڕیتەوە، بۆ پێویستییەكی تر نەهاتووم.

---

(١) واتە: بەرلەوەی یارانی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئەنصار بمرن و دنیا بەجێبهێڵن-و.

(٢) "أبو اليَسَر" ناوی كەعبی كوڕی عەمر بوو، لە بیستەكانی تەمەنی عەقەبە و بەدری بینیوە، دوایین كەسە لە بەدرییەكان مردبێت، ساڵی پەنجا و پێنجی كۆچی لە مەدینە مردووە.

وتی: من گوێم لێبوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: **(هەر كەس ڕێگەیەك بگرێتەبەر داوای زانستی تێدا بكات خودا ڕێگەیەك لە ڕێگەكانی بەهەشت بە ئەو دەگرێتەبەر، فریشتە باڵیان دادەخەن وەك ڕازیبوون لە داواكەری زانست، ئەوانەی لە ئاسمانەكانن و ئەوانەی لە زەویدان و حوتەكان لە ناو ئاودا داوای لێخۆشبوون بۆ زانا دەكەن، فەزڵی زانا لەسەر عابید وەك فەزڵی مانگ وایە لە شەوی چواردەدا بەسەر هەموو هەسارەكاندا، زانایان واریسانی پێغەمبەرانن، پێغەمبەران دینار و درهەمیان بە میرات بەجێنەهێڵاوە، زانستیان بە میرات بەجێهێڵاوە، هەر كەس وەریبگرێت بەشێكی گەورە و بەرینی وەرگرتووە).**

**٣٤٢**– عَنْ أَبِي العَالِيَةِ قَالَ: إن كُنَّا نَسْمَعُ الرِّوَايَةَ بِالبَصْرَةِ عَنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمْ نَرْضَ حَتَّى رَكِبْنَا إِلَى المدِينَةِ، فَسَمِعْنَاهَا مِنْ أَفْوَاهِهِمْ. [مي٥٨٣]

* إسناده صحيح.

**لە ئەبی عالیەوە، وتی: لە بەصرە ڕیوایەتمان بە دەم هاوەڵانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەبیست، ڕازی نەدەبووین تا سواردەبووین بۆ مەدینە و لە دەمی خۆیانمان دەمانبیست.**

**٣٤٣**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ: أَنَّ رَجُلاً مَنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم رَحَلَ إِلَى فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ، وَهُوَ بِمِصْرَ، فَقَدِمَ عَلَيْهِ وَهُوَ يَمُدُّ لِنَاقَةٍ لَهُ، فَقَالَ: مَرْحَباً، قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ آتِكَ زَائِراً، وَلَكِنْ سَمِعْتُ أَنَا وَأَنْتَ حَدِيثاً مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، رَجَوْتُ أَنْ يَكُونَ عِنْدَكَ مِنْهُ عِلْمٌ، قَالَ: مَا هُوَ؟ قَالَ: كَذَا وَكَذَا.. [مي٥٩٠]

* إسناده صحيح.

**لە عەبدوڵای كوڕی بورەیدەوە: پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) سەفەری كرد بۆ لای "فضالة بن عبید" كاتێك ئەو لە مصر بوو، گەیشتە لای و بینی خەریكی حوشترەكەیەتی، وتی: مەرحەبا، وتی: من بەسەردان نەهاتووم بۆ لات، بەڵام من و تۆ فەرموودەیەكمان لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بیست، ڕجام وابوو لێیەوە زانستێكت هەبێت، وتی: ئەو فەرموودە كامەیە؟ وتی: ئەوە و ئەوە.**

٣٤٤- عَنِ الحَارِثِ بْنِ مُعَاوِيَةَ الكِنْدِيِّ: أَنَّهُ رَكِبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ يَسْأَلُهُ عَنْ ثَلاَثِ خِلاَلٍ، قَالَ: فَقَدِمَ المدِينَةَ فَسَأَلَهُ عُمَرُ ﷺ: مَا أَقْدَمَكَ؟ قَالَ: لِأَسْأَلَكَ عَنْ ثَلاَثِ خِلاَلٍ، قَالَ: وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: رُبَّمَا كُنْتُ أَنَا وَالمرْأَةُ فِي بِنَاءٍ ضَيِّقٍ فَتَحْضُرُ الصَّلاَةُ فَإِنْ صَلَّيْتُ أَنَا وَهِيَ كَانَتْ بِحِذَائِي، وَإِنْ صَلَّتْ خَلْفِي خَرَجَتْ مِنَ البِنَاءِ، فَقَالَ عُمَرُ: تَسْتُرُ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بِثَوْبٍ، ثُمَّ تُصَلِّي بِحِذَائِكَ إِنْ شِئْتَ. وَعَنِ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ العَصْرِ؟ فَقَالَ: نَهَانِي عَنْهُمَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. قَالَ: وَعَنِ القَصَصِ، فَإِنَّهُمْ أَرَادُونِي عَلَى القَصَصِ؟ فَقَالَ: مَا شِئْتَ، كَأَنَّهُ كَرِهَ أَنْ يَمْنَعَهُ، قَالَ: إِنَّمَا أَرَدْتُ أَنْ أَنْتَهِيَ إِلَى قَوْلِكَ، قَالَ: أَخْشَى عَلَيْكَ أَنْ تَقُصَّ فَتَرْتَفِعَ عَلَيْهِمْ فِي نَفْسِكَ، ثُمَّ تَقُصَّ فَتَرْتَفِعَ حَتَّى يُخَيَّلَ إِلَيْكَ أَنَّكَ فَوْقَهُمْ بِمَنْزِلَةِ الثُّرَيَّا، فَيَضَعَكَ اللهُ تَحْتَ أَقْدَامِهِمْ يَوْمَ القِيَامَةِ بِقَدْرِ ذَلِكَ. [حم١١١]

* إسناده حسن.

لە حاریسی کوڕی موعاوییەی کیندییەوە: سواربوو[(١)] بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی ڕازی بێت)، ئەو دەیویست لە سێ سیفەت پرسیاری لێ بکات، وتی: گەیشتە مەدینە، عومەر(خوا لێی ڕازی بێت) پرسیاری لێکرد: چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟ وتی: بۆ ئەوەی دەربارەی سێ سیفەت پرسیارت لێ بکەم، وتی: ئەو سیانە کامانەن؟ وتی: لەوانەیە من و ژنەکەم لە بینایەکی بەرتەسکدا بین، نوێژ دێتە بەرەوە، گەر من نوێژ دەکەم ئەو لە تەنیشتمەوەیە، گەر لە دواوەم نوێژ بکات لە بیناکە دەچێتە دەرەوە، عومەر وتی: نێوانی خۆت و ئەو بە پۆشاکێك دابڕە پاشان بە تەنیشتەوە نوێژەکەی بکات گەر بتەوێ، هەروەها دەربارەی دوو ڕکات نوێژی دوای عەصر؟ عومەر وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی لێکردم لە ئەنجامدانیان، وتی: دەربارەی چیرۆك، ئەوان داوا لە من دەکەن چیرۆکیان بۆ باس بکەم[(٢)]؟ عومەر وتی: گەر بتەوێت[(٣)]، وەك ئەوەی لای ناپەسەند بێت ڕێگری لێ بکات، وتی: من ویستم

---

(١) واتە: سواری وڵاخ بوو و ڕێگەی سەفەری گرتەبەر-و.

(٢) واتە: ئەوان دەیانەوێ من قسەیان بۆ بکەم و چیرۆك و بەسەرهاتی پێشینینیان بۆ بگێڕمەوە-و.

(٣) واتە: گەر بتەوێت دەتوانی باسیان بۆ بکەی و چیرۆکیان بۆ بگێڕییەوە-و.

بگەمە قسەی تۆ[1]، عومەر وتی: ئەوەی لە تۆ لێی دەترسم ئەوەیە چیرۆك بگێڕییەوە و لە نەفسی خۆتدا بالآتر لەوان خۆت تەماشا بکەی، پاشان چیرۆك بگێڕیتەوە و خۆت بالآتر بکەی تا وا خەیاڵ بکەی لە شوێنی حەوتەوانان لەسەرو ئەوانەوەی، ئەو کات خودا لە رۆژی قیامەت بە بڕی ئەوە تۆ بخاتە ژێر پێیان.

## ١٩- دەروازەی: فێرکردن بە کاری بینراو و بە پێوانەکاری

[انظر: في تعليم كيفية الوضوء: ٩.

وفي تعليم كيفية الغسل: ١٩١٧.

وفي بيان أوقات الصلاة: ١٠٣٣.

وفي بيان كيفية الصلاة: ١١٨٩، ١١٩١.

وفي بيان الحج: ١٩٠٢.

وانظر في القياس: ١٧٦، ١٨٣٨، ١٨٢٩، ٢٠٢٢، ٢٥١٨].

## ٢٠- دەروازەی: وتنی "نازانم" لە زانستەوەیە

**٣٤٥**- عَن ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: إِنَّ الَّذِي يُفْتِي النَّاسَ فِي كُلِّ مَا يُسْتَفْتَى لَمَجْنُونٌ. [مي١٧٦]

* إسناده صحيح.

**لە ئیبن مەسعوودەوە، وتی: ئەو کەسەی لە تەواوی ئەوانەی پرسیاری لێ دەکرێت فتوا بۆ خەڵکی دەدات کەسێکی شێتە.**

**٣٤٦**- عَن ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَهُ عَنْ مَسْأَلَةٍ، فَقَالَ: لاَ عِلْمَ لِي بِهَا، فَلَمَّا أَدْبَرَ الرَّجُلُ، قَالَ ابْنُ عُمَرَ: نِعْمَ مَا قَالَ ابْنُ عُمَرَ، سُئِلَ عَمَّا لاَ يَعْلَمُ فَقَالَ: لاَ عِلْمَ لِي بِهِ. يعني: نفسه. [مي١٨٤، ١٨٦]

* إسناده حسن.

---

[1] واتە: ویستم مۆڵەتی تۆ وەربگرم و رای تۆ بزانم-و.

لە ئیبن عومەرەوە: پیاوێك پرسیاری بابەتێكی لێكرد، وتی: زانستم نییە پێی، كاتێك پیاوەكە پشتی هەڵكرد، ئیبن عومەر وتی: باشترین شتێك ئیبن عومەر وتبێتی، پرسیاری لێكرا دەربارەی شتێك نەیزانی وتی: زانستم پێی نییە، مەبەستی خۆی بوو.

**٣٤٧**- عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: لاَ أَدْرِي نِصْفُ العِلْمِ. [مي١٨٥]

* إسناده صحيح.

**لە شەعبییەوە، وتی: نازانم، نیوەی زانستە.**

**٣٤٨**- عَنِ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: مَا أُبَالِي سُئِلْتُ عَمَّا أَعْلَمُ أَوْ مَا لاَ أَعْلَمُ، لِأَنِّي إِذَا سُئِلْتُ عَمَّا أَعْلَمُ قُلْتُ: مَا أَعْلَمُ، وَإِذَا سُئِلْتُ عَمَّا لاَ أَعْلَمُ، قُلْتُ: لاَ أَعْلَمُ. [مي١٨٨]

* إسناده صحيح.

**لە ئیبن سیرینەوە، وتی: باكێكم نییە پرسیارم لە شتێك لێبكرێت، بیزانم یان نەیزانم، چونكە گەر پرسیارم لێكرا لە شتێك نەمزانی بێت دەڵێم: نازانم، گەر پرسیارم لێكرا لە شتێك نەیزانم دەڵێم: نایزانم.**

## ٢١- دەروازەی: جێگیركار(الْمُثْبِّت) پێش نەرێكار(النّافي) دەخرێت

**٣٤٩**- (خ) قَالَ الحُمَيْدِيُّ: هَذَا كَمَا أَخْبَرَ بِلاَلٌ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى فِي الكَعْبَةِ. وَقَالَ الفَضْلُ: لَمْ يُصَلِّ، فَأَخَذَ النَّاسُ بِشَهَادَةِ بِلاَلٍ. [خ. الشهادات، باب ٤]

**(خ) حومەیدی دەڵێت: ئەمە وەك ئەوەی بیلال هەواڵیدا پێغەمبەر(ﷺ) لەناو كەعبە نوێژی كرد، فەزڵ وتی: نوێژی نەكرد، خەڵكی شایەتییەكەی بیلالیان وەرگرت.**

## ٢٢- دەروازەی: هەوڵ و داوای زانست بۆ شتێكی تر جگە لە خودا

**٣٥٠**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ تَعَلَّمَ عِلْماً مِمَّا يُبْتَغَى بِهِ وَجْهُ اللهِ عزّ وجل، لاَ يَتَعَلَّمُهُ إِلاَّ لِيُصِيبَ بِهِ عَرَضاً مِنَ الدُّنْيَا، لَمْ يَجِدْ عَرْفَ الجَنَّةِ يَوْمَ القِيَامَةِ).**
يَعْنِي: رِيحَهَا. [د٣٦٦٤/ جه٢٥٢]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس زانستێك فێر ببێت لەو زانستانەی رووی خودایان(عزوجل) پێ بەمەبەست دەگیرێت، ئەو تەنها بۆ بەدەستهێنانی شتێك لە دنیا فێری ببێت، لە رۆژی قیامەت (عَرْفَ)ی بەهەشت نابینێتەوە)**، "عرف الجنة" واتە "ريحها–بۆنی بەهەشت".

**٣٥١**– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تَعَلَّمُوا العِلْمَ لِتُبَاهُوا بِهِ العُلَمَاءَ، وَلاَ لِتُمَارُوا بِهِ السُّفَهَاءَ، وَلاَ تَخَيَّرُوا بِهِ المَجَالِسَ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ، فَالنَّارُ النَّارُ)**. [جه٢٥٤]

* صحيح.

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(فێری زانست مەبن بۆئەوەی پێیەوە خۆتان بەسەر زانایاندا رابدەن[1]، هەروەها بۆ ئەوە نەبێت موجادەلەی گەمژەکانی پێ بکەن، بۆ ئەوەش نەبێت بەهۆیەوە سەری مەجلیسی پێ بگرنە دەست، هەر کەس ئەوە بکات ئاگر، ئاگر)**.

**٣٥٢**– عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَخْوَفُ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ جِدَالُ المُنَافِقِ عَلِيمِ اللِّسَانِ)**. [حب ٨٠]

* إسناده على شرط البخاري.

لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوەی زۆر لەسەر ئێوە لێی دەترسم موجادەلەی کەسێکی دووڕووی زمانزانە)**.

**٣٥٣**– عن كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(مَنْ طَلَبَ العِلْمَ لِيُجَارِيَ بِهِ العُلَمَاءَ، أَوْ لِيُمَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ، أَوْ يَصْرِفَ بِهِ وُجُوهَ النَّاسِ إِلَيْهِ، أَدْخَلَهُ اللهُ النَّارَ)**. [ت٢٦٥٤]

* حسن.

لە کەعبی کوڕی مالیکەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس هەوڵی زانست بدات بۆئەوەی شانشانێن لەگەڵ زانایان بکات یان بۆ**

---

[1] واتە: خۆتان هەڵبکێشن–و.

**ئەوەی موجادەلەی گەمژەکانی پێ بکات یان بەهۆیەوە رووی خەڵکی لە خۆی بکات، خودا دەیخاتە ناو ئاگرەوە).**

## ٢٣- دەروازەی: فێرکردن بە نموونەهێنانەوە

**٣٥٤-** عَن الحَارِثِ الْأَشْعَرِيّ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ اللهَ أَمَرَ يَحْيَى بْنَ زَكَرِيَّا بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ أَنْ يَعْمَلَ بِهَا، وَيَأْمُرَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَعْمَلُوا بِهَا، وَإِنَّهُ كَادَ أَنْ يُبْطِئَ بِهَا.**

**فَقَالَ عِيسَى: إِنَّ اللهَ أَمَرَكَ بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ لِتَعْمَلَ بِهَا، وَتَأْمُرَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَعْمَلُوا بِهَا، فَإِمَّا أَنْ تَأْمُرَهُمْ، وَإِمَّا أَنْ آمُرَهُمْ؟**

**فَقَالَ يَحْيَى: أَخْشَى إِنْ سَبَقْتَنِي بِهَا أَنْ يُخْسَفَ بِي أَوْ أُعَذَّبَ، فَجَمَعَ النَّاسَ فِي بَيْتِ المَقْدِسِ، فَامْتَلأَ المَسْجِدُ وَقَعَدُوا عَلَى الشُّرَفِ، فَقَالَ: إِنَّ اللهَ أَمَرَنِي بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ أَنْ أَعْمَلَ بِهِنَّ، وَآمُرَكُمْ أَنْ تَعْمَلُوا بِهِنَّ:**

**أَوَّلُهُنَّ: أَنْ تَعْبُدُوا اللهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً، وَإِنَّ مَثَلَ مَنْ أَشْرَكَ بِاللهِ كَمَثَلِ رَجُلٍ اشْتَرَى عَبْداً مِنْ خَالِصِ مَالِهِ بِذَهَبٍ أَوْ وَرِقٍ، فَقَالَ: هَذِهِ دَارِي، وَهَذَا عَمَلِي، فَاعْمَلْ وَأَدِّ إِلَيَّ، فَكَانَ يَعْمَلُ وَيُؤَدِّي إِلَى غَيْرِ سَيِّدِهِ، فَأَيُّكُمْ يَرْضَى أَنْ يَكُونَ عَبْدُهُ كَذَلِكَ؟**

**وَإِنَّ اللهَ أَمَرَكُمْ بِالصَّلاَةِ، فَإِذَا صَلَّيْتُمْ فَلاَ تَلْتَفِتُوا، فَإِنَّ اللهَ يَنْصِبُ وَجْهَهُ لِوَجْهِ عَبْدِهِ فِي صَلاَتِهِ، مَا لَمْ يَلْتَفِتْ.**

**وَآمُرُكُمْ بِالصِّيَامِ، فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ، كَمَثَلِ رَجُلٍ فِي عِصَابَةٍ مَعَهُ صُرَّةٌ فِيهَا مِسْكٌ، فَكُلُّهُمْ يَعْجَبُ أَوْ يُعْجِبُهُ رِيحُهَا، وَإِنَّ رِيحَ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ المِسْكِ.**

**وَآمُرُكُمْ بِالصَّدَقَةِ، فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ، كَمَثَلِ رَجُلٍ أَسَرَهُ العَدُوُّ، فَأَوْثَقُوا يَدَهُ إِلَى عُنُقِهِ، وَقَدَّمُوهُ لِيَضْرِبُوا عُنُقَهُ، فَقَالَ: أَنَا أَفْدِيهِ مِنْكُمْ بِالقَلِيلِ وَالكَثِيرِ، فَفَدَى نَفْسَهُ مِنْهُمْ.**

**وَآمُرُكُمْ أَنْ تَذْكُرُوا اللهَ، فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ، كَمَثَلِ رَجُلٍ خَرَجَ العَدُوُّ فِي أَثَرِهِ سِرَاعاً، حَتَّى إِذَا أَتَى عَلَى حِصْنٍ حَصِينٍ، فَأَحْرَزَ نَفْسَهُ مِنْهُمْ، كَذَلِكَ العَبْدُ، لاَ يُحْرِزُ نَفْسَهُ مِنَ الشَّيْطَانِ إِلاَّ بِذِكْرِ اللهِ).**

قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(وَأَنَا آمُرُكُمْ بِخَمْسٍ، اللهُ أَمَرَنِي بِهِنَّ: السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ، وَالجِهَادُ، وَالهِجْرَةُ، وَالجَمَاعَةُ، فَإِنَّهُ مَنْ فَارَقَ الجَمَاعَةَ قِيدَ شِبْرٍ؛ فَقَدْ خَلَعَ رِبْقَةَ الْإِسْلاَمِ مِنْ عُنُقِهِ، إِلاَّ أَنْ يَرْجِعَ، وَمَنْ ادَّعَى دَعْوَى الجَاهِلِيَّةِ فَإِنَّهُ مِنْ جُثَا جَهَنَّمَ).** فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ!

وَإِنْ صَلَّى وَصَامَ؟ قَالَ: (وَإِنْ صَلَّى وَصَامَ، فَادْعُوا بِدَعْوَى اللهِ الَّذِي سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ الْمُؤْمِنِينَ، عِبَادَ اللهِ). [ت٢٨٦٣، ٢٨٦٤]

* صحيح.

لە حاریسی ئەشعەرییەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(خودا بە پێنج وتە فەرمانی بە یەحیای کوڕی زەکەریا کرد، کاریان پێ بکات و فەرمان بە بەنی ئیسرائیل بکات کاریان پێ بکەن، خەریك بوو لە گەیاندنیان خاوی بنوێنێت.**

**عیسا پێی فەرموو: خودا فەرمانی پێ کردوویت بە پێنج وتە بۆئەوەی کاریان پێ بکەی و فەرمان بە بەنی ئیسرائیل بکەی کاریان پێ بکەن، جا یان برۆ فەرمانیان پێ بکە یان من فەرمانیان پێ دەکەم.**

**یەحیا وتی: دەترسم گەر تۆ بەو کارە لە من پێشبکەوی خودا بمبات بە ناخی زەویدا یان سزابدرێم، بۆیە خەڵکی لە بەیتولمەقدەس کۆکردەوە، مزگەوتەکە پڕ بوو و لەسەر بەرزاییەکان دادەنیشتن، فەرمووی: خودا فەرمانی پێ کردووم بە پێنج وتە، کاریان پێ بکەم و فەرمان بە ئێوە بکەم کاریان پێ بکەن:**

**یەکەمیان: خودا بپەرستن و شتێك نەکەن بە هاوەڵی خودا، نموونەی ئەو کەسەی هاوەڵ بۆ خودا دادەنێت وەك پیاوێك وایە لە ماڵ و سامانی پاڵفتەی خۆی بە زێڕ یان بە زیو بەندەیەك دەکڕێت، پێی دەڵێت: ئەمە ماڵەکەمە و ئەمەش کارەکەمە، کار بکە و بۆم بهێنەوە، بەندەکە کاری دەکرد و دەیبرد بۆ کەسێکی تر جیا لە سەردارەکەی خۆی، کێ لە ئێوە رازییە بەندەکەی بەو جۆرە بێت؟**

**خودا فەرمانی پێ کردوون بە نوێژ، گەر نوێژتان کرد ئاوڕمەدەنەوە، لە نوێژەکەدا خودا رووی خۆی بەرانبەر رووی بەندەکەی دادەنێت گەر ئاوڕنەداتەوە.**

**هەروەها فەرمانتان پێ دەکەم بە رۆژوو، نموونەی ئەوە وەك پیاوێك وایە لەناو کۆمەڵێك کە کیسەیەکی پێیە میسکی تێدایە، هەموویان سەریسامن، یان بۆنەکەی سەرسامی کردوون، بۆنی رۆژووگر[1] لای خودا لە بۆنی میسك خۆشترە.**

---

[1] واتە: بۆنی دەمی رۆژگر-و.

**هەروەها فەرمانتان پێ دەکەم بە صەدەقە، نموونەی ئەوە وەك پیاوێك وایە دوژمنەکەی بە دیل و یەخسیری کردووە، دەستیان بە گەردنییەوە بەستووە، پێشیان خستووە بۆئەوەی لە گەردنی بدەن، ئەویش دەڵێت: من بە کەم و زۆر فیدیەی خۆم دەدەم، بۆیە فیدیەی نەفسی خۆیدا بەوان.**

**هەروەها فەرمانتان پێ دەکەم یادی خودا بکەن، نموونەی ئەوە: وەك پیاوێك وایە دوژمن بە خێرایی بەدوایەوەن، تا گەیشتە قەڵایەکی تۆکمە[1] خۆی لەوان پاراست[2]، هەر بەو جۆرە بەندە تەنها بە یادی خودا خۆی لە شەیتان دەپارێزێت).**

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(منیش فەرمانتان پێ دەکەم بە پێنج شت، خودا فەرمانی پێکردووم: بیستن و گوێڕایەڵی، و جیهاد، وکۆچ، وکۆمەڵ، هەرکەس بە ئەندازەی بستێك لە کۆمەڵ داببڕێت پەتی ئیسلامی لە گەردن داکەندووە، مەگەر بگەڕێتەوە، هەر کەس بانگەشەی بانگێکی نەفامی بکات ئەو لەو کەسانەیە لە دۆزەخدا بە چۆکدا هاتوون)**، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، گەر نوێژ بکات و ڕۆژووش بگرێت؟ فەرمووی: **(گەر نوێژ بکات و ڕۆژووش بگرێت، بە بانگی خودا بانگ بکەن کە ناوی لێناون موسڵمانی باوەڕدار، بەندەکانی خودا).**

**٣٥٥-** عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ الْأَنْصَارِيِّ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً صِرَاطاً مُسْتَقِيماً، وَعَلَى جَنْبَتَيِ الصِّرَاطِ سُورَانِ فِيهِمَا أَبْوَابٌ مُفَتَّحَةٌ، وَعَلَى الْأَبْوَابِ سُتُورٌ مُرْخَاةٌ، وَعَلَى بَابِ الصِّرَاطِ دَاعٍ يَقُولُ: أَيُّهَا النَّاسُ ادْخُلُوا الصِّرَاطَ جَمِيعاً وَلاَ تَتَعَوَّجُوا، وَدَاعٍ يَدْعُو مِنْ فَوْقِ الصِّرَاطِ، فَإِذَا أَرَادَ يَفْتَحُ شَيْئاً مِنْ تِلْكَ الْأَبْوَابِ قَالَ: وَيْحَكَ لاَ تَفْتَحْهُ، فَإِنَّكَ إِنْ تَفْتَحْهُ تَلِجْهُ. وَالصِّرَاطُ: الْإِسْلاَمُ، وَالسُّورَانِ: حُدُودُ اللهِ تَعَالَى، وَالْأَبْوَابُ الْمُفَتَّحَةُ: مَحَارِمُ اللهِ تَعَالَى، وَذَلِكَ الدَّاعِي عَلَى رَأْسِ الصِّرَاطِ: كِتَابُ اللهِ عزّ وجل، وَالدَّاعِي فَوْقَ الصِّرَاطِ: وَاعِظُ اللهِ فِي قَلْبِ كُلِّ مُسْلِمٍ). واللفظ لأحمد. [ت٢٨٥٩، حم١٧٦٣٤]

* حديث صحيح، وإسناده حسن.

---

[1] تۆکمە: قایم و دامەزراو-و.

[2] واتە: چووە ناو قەڵاکە و لەدەستی ئەوان ڕزگاری بوو-و.

لە نەواسی کوڕی سەمعانی ئەنصارییەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(خودا نموونەیەك دەهێنێتەوە ڕێگەیەکی ڕاست و ڕێك، لە دوو لای ڕێگەکەوە دوو دیوار هەن تیایاندا دەرگای کراوە هەن، لەسەر دەرگاکان پەردەی دادراوە هەن، لەسەر دەرگای ڕێگەکە بانگکەرێك هەیە دەڵێت: خەڵکینە، هەمووتان بچنە سەر ڕێگەکە و لار و لوێر مەبن، بانگکەرێکیش لەسەرو ڕێگەکەوە بانگ دەکات، گەر بیەوێت شتێك لەو دەرگانە بکاتەوە دەڵێت: هاوار بە حاڵت مەیکەرەوە، چونکە گەر بیکەیەوە دەچییە ناویەوە، ڕێگە ڕاستەکە ئیسلامە، دوو دیوارەکە سنوورەکانی خودان(سبحانە وتعالی)، دەرگا کراوەکان حەرامەکانی خودان(سبحانە وتعالی)، ئەو بانگکەرە لەسەر سەری ڕێگەکە[1] کتێبەکەی خودایە(عز وجل)، بانگکەرەکەی سەرو ڕێگەکە بریتییە لە ئامۆژگاریکەری خودا لە دڵی هەموو موسڵمانێکدا).**

## ٢٤- دەروازەی: چیرۆك

**٣٥٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ يَقُصُّ عَلَى النَّاسِ؛ إِلاَّ أَمِيرٌ، أَوْ مَأْمُورٌ، أَوْ مُرَاءٍ). [جه٣٧٥٣/ مي٢٨٢١]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(تەنها ئەمیر یان فەرمانپێکراو و یان ریاکار چیرۆك بەسەر خەڵکیدا دەگێڕێتەوە).**

**٣٥٧-** عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (لاَ يَقُصُّ؛ إِلاَّ أَمِيرٌ أَوْ مَأْمُورٌ، أَوْ مُخْتَالٌ). [د٣٦٦٥]

* حسن صحيح.

لە عەوفی کوڕی مالیکەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(تەنها ئەمیر، یان فەرمانپێکراو، یان خۆنوێن(خۆدەرخەر) چیرۆك دەگێڕێتەوە).**

---

[1] واتە: بانگکەرەکەی یەکەم لە سەرەتای ڕێگەکەوە-و.

## ٢٥- دەروازەی: حیکمەت ونبووی باوەڕداره

**٣٥٨-** عن أبي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيِّ قَالَ: لَيْسَ هَدِيَّةٌ أَفْضَلَ مِنْ كَلِمَةِ حِكْمَةٍ تُهْدِيهَا لِأَخِيكَ. [مي٣٦٢]

* إسناده صحيح.

**له عبدالرحمانی حوبولییەوه، وتی: هیچ هەدیەیەك لـه وتەیەکی حیکمەت باشتر نییه پێشکەشی براکەتی بکەی.**

**٣٥٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(الكلِمةُ الحِكمةُ ضالَّةُ المؤمِنِ، فحيثُ وجدَها فَهوَ أحقُّ بِها)**[1]. [ت٢٦٨٧/ جه٤١٦٩]

* ضعيف جداً.

**له ئەبی هورەیرەوه، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (وتەی حیکمەت ونبووی باوەڕداره، له هەر شوێنێك بینییەوه ئەو پێی لەپێشتره[2]).**

## ٢٦- دەروازەی: مەجلیسی زانست

**٣٦٠-** عَن ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ، يَتَذَاكَرُونَ كِتَابَ اللهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ؛ إِلاَّ أَظَلَّتْهُمُ الملاَئِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا، حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقاً يَبْتَغِي بِهِ العِلْمَ، سَهَّلَ اللهُ طَرِيقَهُ مِنَ الجَنَّةِ، وَمَنْ أَبْطَأَ بِهِ عَمَلُهُ، لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ. [مي٣٦٨]

* إسناده صحيح.

[وانظر: ٢٩٧، ٣٣٣٤].

**لە ئیبن عەباسەوه، وتی: هەرکات دەستەیەك لە ماڵێك لە ماڵەکانی خودا کۆدەبنەوه، کتێبەکەی خودا دەخوێننەوه و لەبەری دەکەن و لە نێوان خۆیان**

---

[1] **ئەم فەرموودەم(٣٥٩) باس کرد بۆئەوەی لاوازییەکەی بزانرێت.**

[2] **لەپێشتره: واتە: شایستەترە–و.**

تاوتوێی دەکەن و تێگەیشتن لەگەڵ یەکتر ئاڵوگۆڕ دەکەن، فریشتەکان بە باڵەکانیان دایان دەپۆشن تا دەچنە ناو قسە و باسێکی ترەوە، هەر کەس ڕێگەیەك بگرێتەبەر زانستی پێ بەدەستبهێنێت، خودا ڕێگەکەی لە بەهەشتەوە بۆ ئاسان دەکات، هەر کەس کارەکەی دوای بخات ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخات.

## ٢٧- دەروازەی: بیرهێنانەوەی زانست و پرسیار دەربارەی

**٣٦١-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: تَذَاكَرُوا الحَدِيثَ، فَإِنَّ الحَدِيثَ يُهَيِّجُ الحَدِيثَ. [مي٦١٧ ـ ٦٢٠]

* إسناده صحيح.

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: فەرموودە بیربهێننەوە[١]، چونکە فەرموودە فەرموودەی تر بیردەهێنێتەوە.**

**٣٦٢-** عَنِ الْأَعْمَشِ قَالَ: كَانَ إِسْمَاعِيلُ بْنُ رَجَاءٍ يَجْمَعُ صِبْيَانَ الكُتَّابِ يُحَدِّثُهُمْ يَتَحَفَّظُ بِذَاكَ. [مي٦٢٩]

* إسناده صحيح.

**لە ئەعمەشەوە وتی: ئیسماعیلی کوڕی ڕەجا منداڵانی نووسەری کۆدەکردەوە فەرموودەی بۆ دەخوێندنەوە، بەوە فەرموودەکەی دەپاراست[٢].**

**٣٦٣-** عن مُحَمَّدِ بْنِ فُضَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ الحَارِثُ بْنُ يَزِيدَ العُكْلِيُّ، وَابْنُ شُبْرُمَةَ، وَالقَعْقَاعُ بْنُ يَزِيدَ، وَمُغِيرَةُ، إِذَا صَلَّوْا العِشَاءَ الْآخِرَةَ، جَلَسُوا فِي الفِقْهِ، فَلَمْ يُفَرِّقْ بَيْنَهُمْ إِلاَّ أَذَانُ الصُّبْحِ. [مي٦٣٥]

* إسناده صحيح.

---

(١) واتە: ماناکەی تێبگەن و شرۆڤە و ڕاڤەی بکەن-و.

(٢) واتە: فەرموودەی بەسەر منداڵاندا دەخوێندەوە بۆئەوەی لەبیری نەچێتەوە و بە بیری خۆی بهێنێتەوە و فەرموودەکە وەك خۆی بپارێزێت-و.

لە محەمـەدی کـوڕی فوزەیلـەوە، لـە باوکییـەوە، وتـی: حاریسـی کـوڕی یەزیـدی عوکلی، و ئیبن شوبرومە، و قەعقاعی کوڕی یەزید، و موغیرە، کاتێك نوێژی عیشایان دەکرد دادەنیشتن بۆ فیقه، تەنها بانگی بەیانی لەیەکتری جیادەکردنەوە.

**٣٦٤-** عن عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قال: إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ آفَةً، وَآفَةُ العِلْمِ النِّسْيَانُ. [مي٦٤٦، ٦٤٧]

* إسناده صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: بۆ هەموو شـتێك ئافـەتێك هەیـە، ئافـەتی زانست لەبیرچوونەوەیە.

**٣٦٥-** عن عَلِيٍّ قال: تَذَاكَرُوا هَذَا الحَدِيثَ وَتَزَاوَرُوا، فَإِنَّكُمْ إِنْ لَمْ تَفْعَلُوا يَدْرُسْ. [مي٦٥٠]

* إسناده صحيح.

لە عەلییەوە، وتی: ئەم فەرمووده[1] بیربهێننەوە و سەردانی یەکتر بکەن، چـونکە گەر ئێوە ئەوە نەکەن دەڕزێت.

**٣٦٦-** عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَضَعُ فِي رِجْلَيَّ الكَبْلَ، وَيُعَلِّمُنِي القُرْآنَ وَالسُّنَنَ. [مي٥٧٠]

* إسناده صحيح.

لە عیـکریمەوە، وتی: ئیبن عەباس لاقـەکانی کـۆت و پێوەنـد دەکـردم و قورئـان و سوننەتەکانی فێر دەکردم.

## ٢٨- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی شارینەوەی زانست هاتووە

**٣٦٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ فَكَتَمَهُ أَلْجَمَهُ اللهُ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ يَوْمَ القِيَامَةِ).** [د٣٦٥٨/ ت٢٦٤٩/ جه٢٦١، ٢٦٦]

* حسن صحيح.

---

[1] ئەم فەرمووده: واتە: ئەم زانستە، زانستی قورئان و فەرموودە –و.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس پرسیاری زانستێکی لێ بکرێت و بیشارێتەوە رۆژی قیامەت خودا بە لغاوێك لە ئاگر لەغاوی دەکات).**

**٣٦٨-** عن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: وَاللهِ! لَوْلاَ آيَتَانِ فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى، مَا حَدَّثْتُ عَنْهُ ـ يَعْنِي: عَن النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ شَيْئاً أَبداً، لَوْلاَ قَوْلُ اللهِ: ﴿**إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ**﴾ إِلَى آخِرِ الْآيَتَيْنِ [البقرة:١٧٤]. [جه٢٦٢]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: سوێند بە خودا، گەر دوو ئایەت لە کتێبەکەی خودادا(سبحانە وتعالی) نەبوونایە، هەرگیز هیچم لە ئەوەوە -واتە: لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)- نەدەگێڕایەوە، گەر فەرموودەی خودا(سبحانە وتعالی) ﴿**إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ**﴾ [البقرة:١٧٤]، تا کۆتایی دوو ئایەتەکە.

## ٢٩- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی موجادەلە هاتووە

**٣٦٩-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ؛ إِلاَّ أُوتُوا الجَدَلَ**)، ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿**مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ**﴾ [الزخرف:٥٨]. [ت٣٢٥٣/ جه٤٨]

* حسن.

لە ئەبی ئومامەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کۆمەڵێك گومڕا بووبن -لەدوای هیدایەتێك لەسەری بوون- جەدەلیان[1] پێدراوە)**، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ﴾ [الزخرف:٥٨].

---

[1] واتە: موجادەلە بە باتڵ و ناڕەوا و بۆ خۆ سەرخستن نەك بۆ دەرکەوتنی حەق-و.

**٣٧٠–** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(المِرَاءُ فِي القُرْآنِ كُفْرٌ)**. [د٤٦٠٣]

* حسن صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (جیدال لە قورئاندا بێباوەڕییە).**

**٣٧١–** عن عُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ قَالَ: مَنْ جَعَلَ دِينَهُ غَرَضاً لِلْخُصُومَاتِ، أَكْثَرَ التَّنَقُّلَ. [مي٣١٢]

* إسناده صحيح.

**لە عومەری كوڕی عبدالعزیزەوە، وتی: هەر كەس دینەكەی خۆی بكات بە مەرامی كێبەركێ و نەیاری، گواستنەوەی زۆر دەبێت[1].**

## ٣٠- دەروازەی: بەخشینی زانست بە ئەهلی خۆی

**٣٧٢–** عَنْ كَثِيرِ بْنِ مُرَّةَ قَالَ: لاَ تُحَدِّثِ البَاطِلَ الحُكَمَاءَ فَيَمْقُتُوكَ، وَلاَ تُحَدِّثِ الحِكْمَةَ لِلسُّفَهَاءِ فَيُكَذِّبُوكَ، وَلاَ تَمْنَعِ العِلْمَ أَهْلَهُ فَتَأْثَمَ، وَلاَ تَضَعْهُ فِي غَيْرِ أَهْلِهِ فَتُجَهَّلَ، إِنَّ عَلَيْكَ فِي عِلْمِكَ حَقّاً، كَمَا أَنَّ عَلَيْكَ فِي مَالِكَ حَقّاً. [مي٣٩٠]

* إسناده صحيح.

**لە كەسیری كوڕی مورەوە، وتی: باتڵ بۆ حەكیمان باس مەكە، چونكە رقت لێهەڵدەگرن، حیكمەتیش بۆ گەمژەكان باس مەكە بەدرۆت دەخەنەوە، زانست لە ئەهلی خۆی مەگرەوە، چونكە گوناهبار دەبیت، لای كەسانێكیش دایمەنێ ئەهلی زانست نین، چونكە پشتگوێ دەخرێت، لە زانستەكەت حەقت لەسەرە، وەك چۆن لە ماڵ و سامانەكەت حەقت لەسەرە.**

[1] گواستنەوەی زۆر دەبێت: واتە لەسەر رێگە و رەوگەیەكی دروست راناوەستێ و هەر دەمە و لەسەر بیروبۆچوونێكە–و.

## ٣١- دەروازەی: یەکسانی کردن لە زانستدا

**٣٧٣-** عَن ابْنِ مَيْسَرَةَ قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحداً مِنَ النَّاسِ، الشَّرِيفُ وَالوَضِيعُ عِنْدَهُ سَوَاءٌ، غَيْرَ طَاوُسٍ، وَهُوَ يَحْلِفُ عَلَيْهِ. [مي٤١٧]

* إسناده صحيح.

**لە ئیبن مەیسەرەوە، وتی: هیچ کەسم نەدیوە کەسی بالآدەست و کەسی نـزم لای یەکسان بێت جگە لە تاووس، ئەو لەسەری دامەزراو بوو).**

**٣٧٤-** عَن الزُّهْرِيِّ قَالَ: كُنَّا نَكْرَهُ كِتَابَةَ العِلْمِ، حَتَّى أَكْرَهَنَا عَلَيْهِ السُّلْطَانُ، فَكَرِهْنَا أَنْ نَمْنَعَهُ أَحداً. [مي٤١٨]

* إسناده صحيح.

**لە زوهرییەوە، وتی: نووسینی زانستمان لا ناپەسەند بوو، تـا دەسـەلآتدار ئێمـەی لەسەری ناچارکرد، بۆیە لامان ناپەسەند بوو لە نووسینی[١] رێگری لە کەسێك بکەین.**

**٣٧٥-** عن ابْنِ عَوْنٍ قَالَ: كَلَّمُوا مُحَمَّداً ـ ابن سيرين ـ فِي رَجُلٍ ـ يَعْنِي: يُحَدِّثُهُ ـ فَقَالَ: لَوْ كَانَ رَجُلاً مِنَ الزِّنْجِ لَكَانَ عِنْدِي وَعَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ فِي هَذَا سَوَاءٌ. [مي٤١٩]

* إسناده صحيح.

**لـە ئـیبن عەونـەوە، وتـی: دەربـارەی پیاوێـك کـە ئـیبن سـیرین فـەرموودەی لـێ وەردەگرت قسەیان لەگەڵ کرد، وتی: گەر پیاوێکیش بێـت لـە زنـج لەمـەدا[٢] لەگـەڵ عەبدوڵای کوڕی محەمەد لای من یەکسانە[٣].**

---

[١] لە نووسینی: واتە لە نووسینی زانست-و.

[٢] لەمەدا: واتە: لەم زانستەدا-و.

[٣] واتە: لە وەرگرتنی زانست تەماشای رەچەڵەك و پلە و پایەی دنیایی ناکرێت، بەڵکو تەماشای زانست و تەقوا دەکرێت-و.

## ٣٢- دەروازەی: جیاوازی فەقیهان

**٣٧٦-** عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: قلت لِعُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ: لَوْ جَمَعْتَ النَّاسَ عَلَى شَيْءٍ؟ فَقَالَ: مَا يَسُرُّنِي أَنَّهُمْ لَمْ يَخْتَلِفُوا، قَالَ: ثُمَّ كَتَبَ إِلَى الْآفَاقِ . أو: إِلَى الْأَمْصَارِ . لِيَقْضِ كُلُّ قَوْمٍ بِمَا اجْتَمَعَ عَلَيْهِ فُقَهَاؤُهُمْ. [مي٦٥٢]

* إسناده صحيح.

**لە حومەیدەوە، وتی: بە عومەری کوڕی عبدالعزیزم وت: گەر خەڵکی لەسەر شتێك کۆبکەیەوە؟ وتی: دڵخۆشم ناکات ئەوان جیاوازییان نەبێت، وتی: پاشان بۆ هەموو ئاسۆکانی-یان بۆ هەموو وڵاتانی- نووسی: با هەر کۆمەڵێك بەوە قەزاوەت بکەن فەقیهەکانیان لەسەری کۆك و هاودەنگن.**

**٣٧٧-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: كَانَ سَلاَّمٌ يَذْكُرُ عَنْ أَيُّوبَ . السَّخْتِيَانِيِّ . قَالَ: إِذَا أَرَدْتَ أَنْ تَعْرِفَ خَطَأَ مُعَلِّمِكَ فَجَالِسْ غَيْرَهُ. [مي٦٦٧]

* إسناده صحيح.

**لە سەعیدی کوڕی عامرەوە، وتی: "سَلاّم" بیری ئەیوبی سەختیانی دەهێنایەوە و دەیوت: گەر دەتەوێ هەڵەی مامۆستاکەت بزانی لای کەسانی تر دابنیشە.**

## ٣٣- دەروازەی: ئەو کەسەی را و پێوانە(الرأي والقياس)ی لا ناپەسەندە

**٣٧٨-** عَن أَبِي بَكْرٍ الْهُذَلِيُّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: شَهِدْتُ شُرَيْحًا وَجَاءَهُ رَجُلٌ مِنْ مُرَادٍ، فَقَالَ: يَا أَبَا أُمَيَّةَ، مَا دِيَةُ الْأَصَابِعِ؟ قَالَ: عَشْرٌ عَشْرٌ. قَالَ: يَا سُبْحَانَ اللهِ! أَسَوَاءٌ هَاتَانِ؟ جَمَعَ بَيْنَ الْخِنْصِرِ وَالْإِبْهَامِ. فَقَالَ شُرَيْحٌ: يَا سُبْحَانَ اللهِ! أَسَوَاءٌ أُذُنُكَ وَيَدُكَ؟ فَإِنَّ الْأُذُنَ يُوَارِيهَا الشَّعْرُ وَالْكُمَّةُ وَالْعِمَامَةُ، فِيهَا نِصْفُ الدِّيَةِ، وَفِي الْيَدِ نِصْفُ الدِّيَةِ. وَيْحَكَ: إِنَّ السُّنَّةَ سَبَقَتْ قِيَاسَكُمْ، فَاتَّبِعْ وَلَا تَبْتَدِعْ، فَإِنَّكَ لَنْ تَضِلَّ مَا أَخَذْتَ بِالْأَثَرِ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ الْهُذَلِيُّ: فَقَالَ لِي الشَّعْبِيُّ: يَا هُذَلِيُّ، لَوْ أَنَّ أَحْنَفَكُمْ قُتِلَ وَهَذَا الصَّبِيُّ فِي مَهْدِهِ، أَكَانَ دِيَتُهُمَا سَوَاءً؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَيْنَ الْقِيَاسُ! [مي٢٠٤]

* إسناده ضعيف.

لە ئەبی بەکری هوزەلییەوە، لە شەعبییەوە، وتی: لای شورەیح ئامادە بووم، پیاوێ لە موراد هات بۆ لای و وتی: ئەی باوکی ئومەییە، خوێن(دیة)ی پەنجەکان چییە؟ وتی: هەر دەیان بە دەیە، پیاوەکە وتی: یا سبحان الله، ئایا ئەم دوانە یەکسانن؟ پەنجەی بچووك و پەنجە گەورەی لەیەکدا، شورەیح وتی: یا سبحان الله، ئایا گوێ و دەستت یەکسانن؟ گوێ قژ و مێزەر و عەمامە دایدەپۆشێ، نیوەی خوێنی تێدایە و لە دەستیشدا نیوەی خوێن، هاوار بە حاڵت، سوننەت پێش پێوانەی ئێوە کەوتووە، شوێنبکەوە و بیدعە ئەنجام مەدە، چونکە تا دەست بە ئەسەرەوە بگریت گومڕا نابیت.

ئەبوبەکری هوزەلی وتی: شەعبی پێی وتم: ئەی هوزەلی، گەر ئەحنەفەکەی ئێوە[1] و ئەم منداڵە لە لانکەدا بکوژرابان، ئایا دییەی هەردووکیان یەکسان دەبوو؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئەدی پێوانە(قیاس) لە کوێیە؟!.

**٣٧٩–** عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: وَاللهِ لَئِنْ أَخَذْتُمْ بِالمَقَايِيسِ، لَتُحَرِّمُنَّ الحَلاَلَ، وَلَتُحِلُّنَّ الحَرَامَ.

لە شەعبییەوە، وتی: سوێند بە خودا گەر بە پێوانە کار بکەن حەڵاڵ حەرام دەکەن و حەرام حەڵاڵ دەکەن.

- وعنه أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَا أَبْغَضَ إِلَيَّ أَرَأَيْتَ أَرَأَيْتَ! يَسْأَلُ الرَّجُلُ صَاحِبَهُ فَيَقُولُ: أَرَأَيْتَ، وَكَانَ لاَ يُقَايِسُ.

هەر لە ئەوەوە دەیوت: چەند رقمە لە "أرأيتَ، أرأيتَ–ئایا پێتوایە؟"، پیاوێ لە هاوەڵەکەی دەپرسێ و دەڵێت: ئایا پێتوایە؟ ئەو[2] پێوانەی نەدەکرد.

- وعنـه: لَوْ أَنَّ هَـؤُلاَءِ كَانُوا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم لَنَزَلَتْ عَامَّةُ القُرْآنِ: يَسْأَلُونَكَ، يَسْأَلُونَكَ. [مي١٩٨، ١٩٩، ٢٠١]

* أسانيدها صحيحة.

هەر لە ئەوەوە: گەر ئەوانە لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) بوونایە، هەموو قورئان بە "يسألونك، يسألونك" دادەبەزی.

[1] واتە: ئەحنەفی کوڕی قەیس.

[2] ئەو: واتە شەعبی کاری بە پێوانە(قیاس) نەدەکرد–و.

**٣٨٠-** وعنه قَالَ: مَا حَدَّثُوكَ هَؤُلاَءِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَخُذْ بِهِ، وَمَا قَالُوهُ بِرَأْيِهِمْ فَألقِهِ فِي الحُشِّ. [مي٢٠٦]

* إسناده صحيح.

**هەر لە ئەوەوە، وتی: گەر ئەوانە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) باسیان بۆ کردی وەریبگرە، ئەوەی بە رای خۆیان وتیان هەڵیبدە ناو گژوگیا(الحُش)[1].**

## ٣٤- دەروازەی: دوورکەوتنەوە لە ئارەزووگەری[2]

**٣٨١-** عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ قَالَ: قَالَ إِبْلِيسُ لِأَوْلِيَائِهِ: مِنْ أَيِّ شَيْءٍ تَأْتُونَ بَنِي آدَمَ؟ فَقَالُوا: مِنْ كُلِّ شَيْءٍ، قَالَ: فَهَلْ تَأْتُونَهُمْ مِنْ قِبَلِ الاِسْتِغْفَارِ؟ فقَالُوا: هَيْهَاتَ، ذَاكَ شَيْءٌ قُرِنَ بِالتَّوْحِيدِ، قَالَ: لَأَبُثَّنَّ فِيهِمْ شَيْئاً لاَ يَسْتَغْفِرُونَ اللهَ مِنْهُ، قَالَ: فَبَثَّ فِيهِمُ الْأَهْوَاءَ. [مي٣١٦]

* إسناده صحيح.

**لە لە ئەوزاعییەوە، وتی: ئیبلیس بە دۆستەکانی خۆی وت: لە چ رێگەیەکەوە دێن بۆ ئادەمیزاد؟ وتیان: لە هەموو رێگەیەکەوە، وتی: ئایا لە رێگەی "إستغفار"ەوە بۆیان دێن؟ وتیان: ئەوە دوورە، چونکە ئەوە شتێکە هاوملکراوە بە یەکتاپەرستی، وتی: شتێکیان بە ناودا بڵاوە پێ دەکەم داوای لێخۆشبوون نەکەن لە خودا لێی، وتی: ئارەزووگەری بە ناویاندا بڵاوە پێ کرد.**

**٣٨٢-** عَنْ زِيَادِ بْنِ حُدَيْرٍ قَالَ: قَالَ لِي عُمَرُ: هَلْ تَعْرِفُ مَا يَهْدِمُ الْإِسْلاَمَ؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ، قَالَ: يَهْدِمُهُ زَلَّةُ العَالِمِ، وَجِدَالُ الْمُنَافِقِ بِالكِتَابِ، وَحُكْمُ الْأَئِمَّةِ المضِلِّينَ. [مي٢٢٠]

* إسناده صحيح.

---

[1] "الحش": لە قاموسی "المعاني الجامع"دا دەڵێت: بریتییە لە "البستان أو النخل المجتمع- بێستان یان باخە دارخورما"، ئێمە لە زمانی کوردیدا دەڵێین: هەڵیبدە ناو گژوگیا-و.

[2] مەبەست بە ئارەزووگەری یان ئارەزووبازی(الأهواء) کە کۆی وشەی (هوی)یە، لە روانگەی ئەهلی فەرموودەوە ئەوانەی بە بیر و بۆچوون و پێوانە کار دەکەن شوێنی ئارەزوو کەوتوون و کارەکەیان ئارەزووگەرییە-و.

لە زیادی کوڕی حودەیرەوە، وتی: عومەر پێی وتم: ئایا ئەوەی ئیسلام دەڕمێنێت دەزانی؟ وتی: وتم: نەخێر، وتی: هەڵخلیسکانی زانا، و جیدالی کەسی دووڕوو بە قورئان، و فەرمانڕەوایی ئیمامانی گومڕاکەر.

**٣٨٣–** عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ قَالَ: لاَ تُجَالِسُوا أَهْلَ الْأَهْوَاءِ وَلاَ تُجَادِلُوهُمْ، فَإِنِّي لاَ آمَنُ أَنْ يَغْمِسُوكُمْ فِي ضَلاَلَتِهِمْ، أَوْ يَلْبِسُوا عَلَيْكُمْ مَا كُنْتُمْ تَعْرِفُونَ. [مي٤٠٥]

* إسناده صحيح.

لە ئەبی قیلابەوە، وتی: لەگەڵ ئەهلی ئارەزووگەری دامەنیشن و موجادەلەیان لەگەڵ مەکەن، چونکە من دڵنیا نیم ئێوە هەڵنەژەنن لە گومڕایی خۆیان، یان ئەوەی دەتانزانی لێتان تێکەڵ بکەن[1].

**٣٨٤–** عَنْ أَسْمَاءَ بْنِ عُبَيْدٍ قَالَ: دَخَلَ رَجُلاَنِ مِنْ أَصْحَابِ الْأَهْوَاءِ عَلَى ابْنِ سِيرِينَ، فَقَالاَ: يَا أَبَا بَكْرٍ، نُحَدِّثُكَ بِحَدِيثٍ؟ قَالَ: لاَ، قَالاَ: فَنَقْرَأُ عَلَيْكَ آيَةً مِنْ كِتَابِ اللهِ؟ قَالَ: لاَ، لَتَقُومَانِ عَنِّي، أَوْ لَأَقُومَنَّ، قَالَ: فَخَرَجَا.

فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: يَا أَبَا بَكْرٍ، وَمَا كَانَ عَلَيْكَ أَنْ يَقْرَأَا عَلَيْكَ آيَةً مِنْ كِتَابِ اللهِ تعالى؟ قَالَ: إِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْرَأَا عَلَيَّ آيَةً، فَيُحَرِّفَانِهَا، فَيَقِرُّ ذَلِكَ فِي قَلْبِي. [مي٤١١]

* إسناده صحيح.

لە ئەسمای کوڕی عوبەیدەوە، وتی: دوو پیاو لە هاوەڵانی ئارەزووگەری چوونە ژوورەوە بۆ لای ئیبن سیرین و وتیان: ئەی ئەبا بەکر، فەرموودەیەکت بۆ باس دەکەین؟ وتی: نەخێر، وتیان: ئایەتێك لە کتێبەکەی خودا(سبحانه وتعالى) بەسەر تۆدا دەخوێنینەوە؟ وتی: نەخێر، هەستن لە لام بڕۆن، یان من بۆ خۆم هەڵدەستم، وتی: هەستان و ڕۆیشتن.

---

[1] لێتان تێکەڵ بکەن: واتە لێتان بشێوێنن–و.

یەکێك لە خەڵکەکە وتی: ئەی ئەبا بەکر: چی لەسەر تۆ هەبوو گەر ئایەتێکیان لە کتێبەکەی خودا بەسەر تۆدا بخوێندبایەتەوە؟ وتی: من ترسام لەوەی ئایەتێك بەسەرمدا بخوێننەوە و تەحریفی بکەن[1] و ئەوە لە دڵمدا جێگیر ببێت.

**٣٨٥-** عَن الحَسَنِ البَصْرِيِّ وَابْنِ سِيرِينَ، أَنَّهُمَا قَالاَ: لاَ تُجَالِسُوا أَصْحَابَ الْأَهْوَاءِ، وَلاَ تُجَادِلُوهُمْ، وَلاَ تَسْمَعُوا مِنْهُمْ. [مي٤١٥]

* إسناده صحيح.

**لە حەسەنی بەصری و ئیبن سیرینەوە، هەردووکیان وتویانە: لەگەڵ هاوەڵانی ئارەزووگەری دامەنیشن و هیچیان لێ مەبیستن.**

## ٣٥- دەروازەی: ڕێزنان لە زانست و شاندانە ژێر نارەحەتی و شەکەتی لەپێناوی

**٣٨٦-** عَن ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: وُجِدَ أَكْثَرُ حَدِيثِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عِنْدَ هَذَا الحَيِّ مِنَ الْأَنْصَارِ، وَاللهِ إِنْ كُنْتُ لَآتِي الرَّجُلَ مِنْهُمْ فَيُقَالُ: هُوَ نَائِمٌ، فَلَوْ شِئْتُ أَنْ يُوقَظَ لِي، فَأَدَعُهُ حَتَّى يَخْرُجَ، لِأَسْتَطِيبَ بِذَلِكَ حَدِيثَهُ. [مي٥٨٦]

* إسناده حسن.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: زۆربەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لای ئەو گەڕەکەی ئەنصار بینرانەوە، سوێند بە خودا من دەهاتم بۆ لای پیاوێك لەوان دەوترا: ئەو خەوتووە، گەر بمویستبایە بۆیان بەخەبەر دەهێنام، لێی دەگەڕام تا دەهاتە دەرەوە، بۆئەوەی بەوە خۆشی[2] لە فەرموودەکەی وەربگرم.**

---

[1] تەحریفی بکەن: واتە ماناکەی تەحریف بکەن-و.

[2] خۆشی: تام و چێژ-و.

**٣٨٧–** عَن الزُّهْرِيِّ قَالَ: كُنْتُ آتِي بَابَ عُرْوَةَ، فَأَجْلِسُ بِالبَابِ، وَلَوْ شِئْتُ أَنْ أَدْخُلَ لَدَخَلْتُ، وَلَكِنْ إِجْلاَلاً لَهُ. [مي٥٨٨]

* إسناده صحيح.

**له زوهرییەوە، وتی: دەهاتم بۆ دەرگای عوروە، لە دەرگاكە دادەنیشتم، گەر بمویستبایە بچمە ژوورەوە دەچوومە ژوورەوە، بەڵام وەك شكۆمەند كردن بۆ ئەو[1].**

**٣٨٨–** عَن ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قُلْتُ لِرَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ: يَا فُلاَنُ، هَلُمَّ فَلْنَسْأَلْ أَصْحَابَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَإِنَّهُمْ اليَوْمَ كَثِيرٌ، فَقَالَ: وَا عَجَباً لَكَ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، أَتَرَى النَّاسَ يَحْتَاجُونَ إِلَيْكَ، وَفِي النَّاسِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مَنْ تَرَى؟... الحديث وفيه: فَبَقِيَ الرَّجُلُ حتَّى رآني وقدِ اجْتَمَعَ الناسُ عَلَيَّ، فقالَ: كان هذا الفتى أعقلَ منّي. [مي٥٨٩]

* إسناده صحيح.

**له ئیبن عەباسەوە وتی: كاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەفاتی كرد، بە پیاوێكی ئەنصارم وت: ئەی فلان، با بڕۆین پرسیار لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بكەین، چونكە ئەمڕۆ ئەوان زۆرن، وتی: سەرسوڕمان لە تۆ، ئەی ئیبن عەباس، تۆ پێتوایە خەڵكی ئاتاج بن بۆ لای تۆ، لە كاتێكدا لە ناو خەڵكی ئەم هاوەڵانەی پێغەمبەر(ﷺ) دەبینی[2]؟...فەرموودەكە[3]. هەروەها تیایدا هاتووە: پیاوەكە مایەوە تا منی بینی خەڵكی لەسەرم كۆبوونەوە[4]، وتی: ئەم گەنجە لە من ئاقڵتر بوو.**

---

[1] واتە: وەك شكۆمەند كردنی ئەو و زانستەكەی چاوەڕوانی دەبووم.

[2] واتە: ئایا پێتوایە بە بوونی ئەم هاوەڵانەی پێغەمبەر خەڵك ئاتاج دەبن بە گەنجێكی وەك تۆ؟–و.

[3] واتە: خەڵكی پێویستییان بە زانستی تۆیەكی گەنج نابێت لە كاتێكدا ئەم هەموو هاوەڵە مەزنەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ناو خەڵكیدا هەن–و.

[4] خەڵكی لەسەرم كۆبوونەوە: واتە خەڵكی دەورەیاندام بۆ ئەوەی زانستم لێ وەربگرن–و.

## ٣٦- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی سیفەتی زانایان هاتووە

**٣٨٩-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: لاَ تَكُونُ عَالِماً حَتَّى تَكُونَ مُتَعَلِّماً، وَلاَ تَكُونُ بِالعِلْمِ عَالِماً حَتَّى تَكُونَ بِهِ عَامِلاً، وَكَفَى بِكَ إِثْماً أَنْ لاَ تَزَالَ مُخَاصِماً، وَكَفَى بِكَ إِثْماً أَنْ لاَ تَزَالَ مُمَارِياً، وَكَفَى بِكَ كَاذِباً أَنْ لاَ تَزَالَ مُحَدِّثاً فِي غَيْرِ ذَاتِ اللهِ. [مي٣٠١]

* إسناده حسن.

**لە ئەبی دەرداوە وتی: نابیت بە زانا تا فێرخواز نەبیت، زانا نابیت بە زانستەکە تا کار بە زانستەکە دەکەی، بەسە گوناه و خراپە بۆ تۆ بەردەوام نەیار بیت[1]، بەسە گوناه و خراپە بۆ تۆ بەردەوام موجادەلەکار بیت، بەسە بە درۆزن دەربچی گەر بەردەوام قسە بکەی، بەڵام بۆ زاتی خودا نەبێت.**

**٣٩٠-** عَنْ عِمْرَانَ المِنْقَرِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ يَوْماً فِي شَيْءٍ قَالَهُ: يَا أَبَا سَعِيدٍ لَيْسَ هَكَذَا يَقُولُ الفُقَهَاءُ، فَقَالَ: وَيْحَكَ! وَرَأَيْتَ أَنْتَ فَقِيهاً قَطُّ؟ إِنَّمَا الفَقِيهُ: الزَّاهِدُ فِي الدُّنْيَا، الرَّاغِبُ فِي الْآخِرَةِ، البَصِيرُ بِأَمْرِ دِينِهِ، المُدَاوِمُ عَلَى عِبَادَةِ رَبِّهِ. [مي٣٠٢]

* إسناده صحيح.

**لە عیمرانی مینقەرییەوە، وتی: رۆژێك دەربارەی شتێك کە حەسەن وتبووی پێم وت: ئەی باوکی سەعید، فەقیهان بەم جۆرە نالێن، وتی: هاوار بە حاڵت، ئایا تۆ هەرگیز فەقیهێکت بینیوە؟ فەقیه ئەو کەسەیە: لە دنیا زاهیدە، و حەزی بۆ دواڕۆژە، و بە کاروباری ئایینەکەی بەرچاو ڕۆشنە، و لەسەر عیبادەتی پەروەردگاری بەردەوامە.**

**٣٩١-** عَنْ كَعْبِ الأَحْبَارِ قَالَ: إِنِّي لَأَجِدُ نَعْتَ قَوْمٍ يَتَعَلَّمُونَ لِغَيْرِ العَمَلِ، وَيَتَفَقَّهُونَ لِغَيْرِ العِبَادَةِ، وَيَطْلُبُونَ الدُّنْيَا بِعَمَلِ الْآخِرَةِ، وَيَلْبَسُونَ جُلُودَ الضَّأْنِ، وَقُلُوبُهُمْ أَمَرُّ مِنَ الصَّبْرِ، فَبِي يَغْتَرُّونَ، أَوْ إِيَّايَ يُخَادِعُونَ، فَحَلَفْتُ بِي لَأُتِيحَنَّ لَهُمْ فِتْنَةً تَتْرُكُ الحَلِيمَ فِيهَا حَيْرَانَ. [مي٣٠٧]

* إسناده صحيح.

---

[1] بەردەوام نەیار بیت: واتە ململانێکار و دوژمنکار بیت بەرانبەر بە خەڵك-و.

لە کەعبی ئەحبارەوە، وتی: من سیفەتی دەستەیەك دەبینم[1]: بۆ کار فێری زانست نابن، و بۆ عیبادەت فێری فیقه نابن، و بە کاری دوارۆژ داوای دنیا دەکەن، و پێستی مەڕ لەبەر دەکەن و دڵیان لە رووەکی "الصَّبْر" تاڵترە، بە من فریو دەخۆن، یان بە من فێڵیان لێ دەکرێت، سوێندم بە خۆم خواردووە فیتنەیەکیان بۆ بەرپا دەکەم تیایدا کەسی حەلیم بە سەرگەردانی بەجێدەهێڵرێت.

٣٩٢– عَن الشَّعْبِيّ قَالَ: إِنَّمَا كَانَ يَطْلُبُ هَذَا العِلْمَ مَنِ اجْتَمَعَتْ فِيهِ خَصْلَتَانِ: العَقْلُ وَالنُّسُكُ، فَإِنْ كَانَ نَاسِكاً وَلَمْ يَكُنْ عَاقِلاً قَالَ: هَذَا أَمْرٌ لاَ يَنَالُهُ إِلاَّ العُقَلاَءُ، فَلَمْ يَطْلُبْهُ، وَإِنْ كَانَ عَاقِلاً وَلَمْ يَكُنْ نَاسِكاً قَالَ: هَذَا أَمْرٌ لاَ يَنَالُهُ إِلاَّ النُّسَّاكُ، فَلَمْ يَطْلُبْهُ.

قَالَ: وَلَقَدْ رَهِبْتُ أَنْ يَكُونَ يَطْلُبُهُ اليَوْمَ مَنْ لَيْسَتْ فِيهِ وَاحِدَةٌ مِنْهُمَا: لاَ عَقْلٌ وَلاَ نُسُكٌ. [مي٣٨٣]

* إسناده صحيح.

لە شەعبییەوە، وتی: هەر کەس دوو خەسڵەتی تێدا کۆبووبێتەوە هەوڵی ئەم زانستە[2] دەدات: ئەقڵ و نوسك[3]، گەر ناسیك بێت و ئاقڵ نەبێت دەڵێت: ئەمە کاروبارێکە تەنها ئاقڵان بەدەستی دەهێنن، بۆیە هەوڵی بۆ نادات، گەر ئاقڵ بێت و ناسیك نەبێت دەڵێت: ئەمە کاروبارێکە تەنها ناسیکان بەدەستی دەهێنن، بۆیە هەوڵی بۆ نادات.

وتی: من دەترسم لە ئەمڕۆدا کەسانێك هەوڵی بۆ بدەن یەکێك لەو دوانەیان تێدا نەبێت، نە ئەقڵ و نە نوسك.

٣٩٣– وعَنه قَالَ: وَدِدْتُ أَنِّي نَجَوْتُ مِنْ عِلْمي كَفَافاً، لاَ لِي، وَلاَ عَلَيَّ. [مي٥٤٨]

* إسناده صحيح.

هەر لە شەعبییەوە، وتی: ئاوات دەخوازم سەر بە سەر[4] لە زانستەکەم رزگارم ببێت، نە بۆ من بێ و نە لەسەرم بێت.

---

[1] واتە من لە تەوراتدا سیفەتی کۆمەڵێك دەبینم کە ئەمانەن–و.

[2] واتە: زانستی قورئان و فەرموودە–و.

[3] نوسك(النسك): واتە عیبادەت، ناسیك(الناسك) واتە عابید، کەسی یەکلابووەوە بۆ عیبادەت و زانست–و.

[4] واتە: نە چاکەم بۆ بنوسرێ و نە خراپە، یان چاکە و خراپەم تیایدا یەکسان بن–و.

**٣٩٤-** عَنِ الحَسَنِ قَالَ: أَدْرَكْتُ النَّاسَ، وَالنَّاسِكُ إِذَا نَسَكَ لَمْ يُعْرَفْ مِنْ قِبَلِ مَنْطِقِهِ، وَلَكِنْ يُعْرَفُ مِنْ قِبَلِ عَمَلِهِ، فَذَلِكَ العِلْمُ النَّافِعُ. [مي٥٥٨]

* إسناده صحيح.

**لە حەسەنەوە، وتی: بە خەڵکانێك گەیشتم، کەسی ناسیك[1] کاتێك نوسکی دەکرد لە قسەکانییەوە نەدەناسرا، بەڵکو لە کارەکانییەوە دەناسرا، ئەوەش بریتییە لە زانستی بەسوود.**

## ٣٧- دەروازەی: کارکردن بە زانست و نییەتی باش تیایدا

**٣٩٥-** عَنْ مَالِكِ بْنِ مِغْوَلٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِلشَّعْبِيِّ: أَفْتِنِي أَيُّهَا العَالِمُ، فَقَالَ: العَالِمُ مَنْ يَخَافُ اللَّهَ. [مي٢٦٤]

* إسناده صحيح.

**لە مالیکی کوڕی میغوەلەوە، وتی: پیاوێك بە شەعبی وت: ئەی زانا، فتوام بۆ بدە، شەعبی وتی: زانا ئەو کەسەیە لە خودا دەترسێت.**

**٣٩٦-** عَنِ الحَسَنِ قَالَ: العِلْمُ عِلْمَانِ: فَعِلْمٌ فِي القَلْبِ فَذَلِكَ العِلْمُ النَّافِعُ، وَعِلْمٌ عَلَى اللِّسَانِ، فَذَلِكَ حُجَّةُ اللهِ عَلَى ابْنِ آدَمَ. [مي٣٧٦]

* إسناده صحيح.

**لە حەسەنەوە، وتی: زانست دوو زانستە: زانستێك لە دڵدا ئەوە زانستی بەسوودە، زانستێکیش لە زماندا ئەوە بەڵگەی خودایە[2] لەسەر ئادەمیزاد.**

---

[1] ناسیك: واتە عابید، کەسێك خۆی بۆ عیبادەت و زانست یەکلاکردبێتەوە، نوسك: واتە عیبادەت-و.

[2] بەڵگەی خودا(حجة الله): واتە لە ڕۆژی قیامەت دەبێتە بەڵگە لەسەر زاناکە گەر کاری پێ نەکردبێت-و.

▪ وعنه، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم... مِثْلَ ذَلِكَ. [مي٣٧٧]

**هەر لە حەسەنەوە: لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)...نموونەی ئەو فەرموودە.**

* مرسل صحيح.

**٣٩٧**– عَنْ حَبِيبِ بْنِ عُبَيْدٍ قَالَ: كَانَ يُقَالُ: تَعَلَّمُوا العِلْمَ وَانْتَفِعُوا بِهِ، وَلاَ تَعَلَّمُوهُ لِتَتَجَمَّلُوا بِهِ، فَإِنَّهُ يُوشِكُ، إِنْ طَالَ بِكُمْ عُمُرٌ، أَنْ يَتَجَمَّلَ ذُو العِلْمِ بِعِلْمِهِ كَمَا يَتَجَمَّلُ ذُو البِزَّةِ بِبِزَّتِهِ. [مي٣٨١]

* إسناده صحيح.

**لە حەبیبی کوڕی عوبەیدەوە، وتی: کاتی خۆی دەوترا: زانست فێرببن و سوودی لێ ببینن، فێری مەبن بۆئەوەی خۆتانی پێ جوان بکەن، چونکە گەر تەمەنتان درێژ بێت دەبینن کەسی خاوەن زانست بە زانستەکە خۆی جوان دەکات، وەك چۆن خاوەن پۆشاك بە پۆشاکەکە خۆی جوان دەکات.**

**٣٩٨**– عَنْ هِشَامٍ، عَنِ الحَسَنِ البَصْرِيِّ قَالَ: إِنْ كَانَ الرَّجُلُ لَيُصِيبُ البَابَ مِنَ العِلْمِ، فَيَعْمَلُ بِهِ فَيَكُونُ خَيْراً لَهُ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، لَوْ كَانَتْ لَهُ فَجَعَلَهَا فِي الْآخِرَةِ.

قَالَ: قَالَ الحَسَنُ: كَانَ الرَّجُلُ إِذَا طَلَبَ العِلْمَ، لَمْ يَلْبَثْ أَنْ يُرَى ذَلِكَ فِي بَصَرِهِ وَتَخَشُّعِهِ وَلِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَصِلَتِهِ وَزُهْدِهِ.

قَالَ: وقَالَ مُحَمَّدٌ –ابْنُ سِيرِينَ–: انْظُرُوا عَمَّنْ تَأْخُذُونَ هَذَا الحَدِيثَ، فَإِنَّمَا هُوَ دِينُكُمْ. [مي٣٩٨]

* إسناده صحيح.

**لە هیشامەوە، لە حەسەنی بەصرییەوە، وتی: گەر پیاو دەروازەیە لە زانست بەدەستبهێنێ و کاری پێ بکات باشترە بۆ ئەو لە دنیا و ئەوەی لە دنیادایە، گەر بۆ ئەو بێت دەیکاتە دواڕۆژ[1].**

---

[1] **واتە: گەر زانستەکە بۆ ئەو بێت و لەسەر ئەو نەبێت کاری دواڕۆژی پێ دەکات، نەك بۆ دنیا بەکاریبهێنێت–و.**

وتی: حەسەن وتی: کاتی خۆی گەر پیاو داوای زانستی بکردبایە زۆری پێنەدەچوو لە بینین و خوشوع و زمان و دەست و سیلەی رەحم و زوهدیدا دەبینرا[1].

وتی: محەمەد–ئیبن سیرین– وتی: وردبینەوە و بزانن فەرموودە لە کێ وەردەگرن، چونکە بریتییە لە دینی ئێوە[2].

٣٩٩– عَنْ أَبِي مُسْلِمٍ الخَوْلاَنِيِّ قَالَ: العُلَمَاءُ ثَلاَثَةٌ: فَرَجُلٌ عَاشَ فِي عِلْمِهِ وَعَاشَ مَعَهُ النَّاسُ فِيهِ، وَرَجُلٌ عَاشَ فِي عِلْمِهِ وَلَمْ يَعِشْ مَعَهُ فِيهِ أَحَدٌ، وَرَجُلٌ عَاشَ النَّاسُ فِي عِلْمِهِ وَكَانَ وَبَالاً عَلَيْهِ. [مي٣٧٣]

* إسناده صحيح.

لە ئەبی موسلمی خەولانییەوە، وتی: زانایان سیانن: پیاوێك لەناو زانستەکەیدا ژیاوە و خەڵکی لەگەڵ ئەو لەناویدا ژیاون، پیاوێك لەناو زانستەکەیدا ژیاوە و هیچ کەس لەگەڵی تیایدا نەژیاوە، پیاوێکیش خەڵکی لە زانستەکەیدا ژیاوە و لەسەر ئەو وەبالە[3].

## ٣٨– دەروازەی: فەزڵی زانست بەسەر عیبادەتدا

٤٠٠– عَنْ أَبِي أُمَامَةَ البَاهِلِيِّ قَالَ: ذُكِرَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلاَنِ: أَحَدُهُمَا عَابِدٌ، وَالْآخَرُ عَالِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**فَضْلُ العَالِمِ عَلَى العَابِدِ، كَفَضْلِي عَلَى أَدْنَاكُمْ**). ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ اللهَ وَمَلاَئِكَتَهُ وَأَهْلَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرَضِينَ، حَتَّى النَّمْلَةَ فِي جُحْرِهَا، وَحَتَّى الحُوتَ، لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِ النَّاسِ الخَيْرَ**). [ت٢٦٨٥/ مي٢٩٧]

* صحيح.

---

[1] واتە: زانستەکە لەسەر ئەو رەنگی دەدایەوە، چونکە زانستی بۆ کار وەرگرتبوو، نەك بۆ موجادەلە و خۆ جوانکردن–و.

[2] واتە: فەرموودە بریتییە لە دینی ئێوە، بۆیە دەبێ بزانن دینەکەتان لە کێ وەردەگرن، گەر کەسەکە ئەهلی زانست و تەقوا و وەرع نەبوو نابێت دینی لێ وەربگیرێت، مەگەر زەروورەت داوای ئەو کارە بکات–و.

[3] وەبال: کۆڵی قورس و بەڵا و نەگبەتی–و.

لە ئەبی ئومامەی باهیلییەوە، وتی: دوو پیاو بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسکران، یەکێکیان عابید و ئەویتریان زانا[1]، پێغەبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(فەزڵی زانا لەسەر عابید وەك فەزڵی مـن وایـە لەسـەر خوارترینتـان)**، پاشـان پێغەمبەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا و فریشتەکانی و ئەهلی ئاسمانەکان و زەوییەکان-تەنانەت مێرووڵە لە کونەکەیدا و تەنانەت حوت- صەڵەوات دەدەن لەسەر فێرکاری[2] خەڵکی بە خێر)**.

٤٠١- عَنْ وَهْبِ بْنِ مُنَبِّهٍ قَالَ: مَجْلِسٌ يُتَنَازَعُ فِيهِ العِلْمُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ قَدْرِهِ صَلاَةً، لَعَلَّ أَحَدَهُمْ يَسْمَعُ الكَلِمَةَ فَيَنْتَفِعُ بِهَا سَنَةً، أَوْ مَا بَقِيَ مِنْ عُمُرِهِ. [مي٣٣٤]

* إسناده صحيح.

لە وەهبی کوڕی مونەبیهەوە، وتی: مەجلیسێك زانستی تێدا تاوتوێ بکرێت لام باشترە لە بڕی ئەو کاتە لە نوێژ[3]، لەوانەیە یەکێکیان وتەیەك ببیستێ و ساڵێك سوودی لێ ببینێت، یان ئەو بڕەی ماوە لە تەمەنی[4].

## ٣٩- دەروازەی: وەسێت بە قوتابی زانست

٤٠٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(سَيَأْتِيكُمْ أَقْوَامٌ يَطْلُبُونَ العِلْمَ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمْ فَقُولُوا لَهُمْ: مَرْحَباً مَرْحَباً بِوَصِيَّةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَاقْنُوهُمْ)**.

قال الحَكَم: اقْنُوهُم: عَلِّمُوهُمْ. [جه٢٤٧]

* حسن.

---

[1] عابیدەکە بەشێك لە زانستی لایە، بەڵام ئەوەندە عیبادەتی پێ بکات، زاناکەش خاوەن عیبادەتە، لەگەڵ ئەوەش بە زانستە زۆرەکەی سوود بە خەڵکی دەگەیەنێت، و دین بۆ خەڵکی ڕۆشن دەکاتەوە-و.

[2] فێرکار: واتە مامۆستا(معلِّم)-و.

[3] واتە: بڕی ئەو کاتە لە نوێژی سوننەت، نەك نوێژی فەرز-و.

[4] واتە: یان ئەو بڕەی ماوە لە تەمەنی سوودی لێ ببینێت-و.

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(خەڵکانێك دێن بۆ لاتان داوای زانست دەکەن، کاتێ ئەوانتان بینی پێیان بڵێن: مەرحەبا، مەرحەبا، بە وەسێتەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، "واقنوهم–فێریان بکەن"[1])**.

حەکەم دەڵێت: "اقنوهم" واتە "علموهم–فێریان بکەن".

## ٤٠- دەروازەی: خۆپارێزی لە فتوا و ترس لە فتوادان

٤٠٣– عن أبي هُرَيْرَةَ قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ أُفْتِيَ بِغَيْرِ عِلْمٍ كَانَ إِثْمُهُ عَلَى مَنْ أَفْتَاهُ). [د٣٦٥٧/ جه٥٣/ مي١٥٩]

* حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بەبێ زانست فتوای بۆ بدرێت گوناهەکەی لەسەر ئەو کەسەیە فتوای بۆ داوە)**.

٤٠٤– عَن ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَنْ أَفْتَى بِفُتْيَا يُعَمَّى عَنهَا فَإِثْمُهَا عَلَيْهِ. [مي١٦٢]

* إسناده صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە وتی: هەر کەس بە فتوایەك فتوای دا لێیەوە وێڵبوون سەرهەڵبدات[2] گوناهەکەی لەسەر ئەوە.

٤٠٥– عَنْ أَبِي سُهَيْلٍ نافِعِ بْنِ مَالِكٍ الأَصْبَحِيِّ قَالَ: كَانَ عَلَى امْرَأَتِي اعْتِكَافُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ فِي المسْجِدِ الحَرَامِ، فَسَأَلْتُ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ العَزِيزِ، وَعِنْدَهُ ابْنُ شِهَابٍ، قَالَ: قُلْتُ: عَلَيْهَا صِيَامٌ؟ قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: لاَ يَكُونُ اعْتِكَافٌ إلاَّ بِصِيَامٍ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ: عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَعَنْ أَبِي بَكْرٍ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَعَنْ عُمَرَ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَعَنْ عُثْمَانَ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ عُمَرُ: مَا أَرَى عَلَيْهَا صِيَاماً.

---

[1] واتە: ئەو وەسێتەی پێغەمبەری خودا کە فەرمووی: رێزیان لێ بگرن و فێریان بکەن–و.

[2] وێڵبوون: واتە: حەقی تێدا نەناسرێت.

فَخَرَجْتُ فَوَجَدْتُ طَاوُساً وَعَطَاءَ بْنَ أَبِي رَبَاحٍ، فَسَأَلْتُهُمَا، فَقَالَ طَاوُسٌ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ لاَ يَرَى عَلَيْهَا صِيَاماً إِلاَّ أَنْ تَجْعَلَهُ عَلَى نَفْسِهَا. قَالَ: وَقَالَ عَطَاءٌ: ذَلِكَ رَأْيِي. [مي١٦٤]

* إسناده صحيح.

لە ئەبی سوهەیل نافیعی کوڕی مالیکی ئەصبەحییەوە، وتی: لەسەر ژنەکەم ئیعتیکافی سێ ڕۆژ هەبوو لە مەسجیدولحەرام، پرسیارم لە عومەری کوڕی عبدالعزیز کرد، ئیبن شیهابی لە لا بوو، وتی: وتم: ئایا ڕۆژووی لەسەرە؟ ئیبن شیهاب وتی: ئیعتیکاف تەنها بە ڕۆژووەوەیە، عومەری کوڕی عبدالعزیز بە ئیبن شیهابی وت: لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)[1]؟ وتی: نەخێر، وتی: لە ئەبوبەکرەوە؟ وتی: نەخێر، وتی: لە عومەرەوە؟ وتی: نەخێر، وتی: لە عوسمانەوە؟ وتی: نەخێر، عومەر وتی: پێموانییە ڕۆژووی لەسەر بێت.

چوومە دەرەوە و تاووس و عەتای کوڕی ڕەباحم بینی، پرسیارم لە هەردووکیان کرد، تاووس وتی: ئیبن عەباس ڕۆژووی لەسەر نابینێت مەگەر خۆی لەسەر خۆی دانابێت، وتی: عەتا وتی: ئەوە بۆچوونی منیشە.

٤٠٦- عَنْ مَيْمُونٍ أَبِي حَمْزَةَ قَالَ: قَالَ لِي إِبْرَاهِيمُ ـ النَّخَعِيُّ ـ: يَا أَبَا حَمْزَةَ، وَاللهِ لَقَدْ تَكَلَّمْتُ، وَلَوْ وَجَدْتُ بُدّاً مَا تَكَلَّمْتُ، وَإِنَّ زَمَاناً أَكُونُ فِيهِ فَقِيهَ أَهْلِ الكُوفَةِ زَمَانُ سُوءٍ. [مي٢٠٢]

لە مەیموونەوە ئەبی حەمزە، وتی: ئیبراهیم -نەخەعی- پێی وتم: ئەی ئەبا حەمزە، سوێند بە خودا کەوتمە قسە، گەر ڕێگەچارەیەکم هەبوایە قسەم نەدەکرد، ئەم ڕۆژگارەی تیایدا من دەبم بە فەقیهی ئەهلی کووفە ڕۆژگارێکی خراپە.

٤٠٧- عَنْ عُمَرَ بْنِ إِسْحَاقَ قَالَ: لَمَنْ أَدْرَكْتُ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَكْثَرُ مِمَّنْ سَبَقَنِي مِنْهُمْ، فَمَا رَأَيْتُ قَوْماً أَيْسَرَ سِيرَةً، وَلاَ أَقَلَّ تَشْدِيداً مِنْهُمْ. [مي١٢٨]

* إسناده جيد.

---

[1] واتە: ئەم قسەت کە دەڵێی: "ئیعتیکاف تەنها بە ڕۆژووەوەیە" لە فەرموودەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەرتگرتووە و دەیڵێی؟-و.

لە عومەری کوڕی ئیسحاقەوە، وتی: ئەوانەی من پێیان گەیشتم لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) زۆرتر بوون لەوانەی خەڵکانی تر پێیان گەیشتن، کۆمەڵێکم نەبینیوە سیرەتیان ئاسانتر لەوان و توندکردنەوەیان کەمتر لەوان بێت[1].

٤٠٨- عن جَعْفَرِ بْنِ إِيَاسٍ قَالَ: قُلْتُ لِسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ: مَا لَكَ لاَ تَقُولُ فِي الطَّلاَقِ شَيْئاً؟ قَالَ: مَا مِنْهُ شَيْءٌ إِلاَّ قَدْ سَأَلْتُ عَنْهُ، وَلَكِنِّي أَكْرَهُ أَنْ أُحِلَّ حَرَاماً، أَوْ أُحَرِّمَ حَلاَلاً. [مي١٣٦]

* إسناده صحيح.

لە جەعفەری کوڕی ئیاسەوە، وتی: وتم بە سەعیدی کوڕی جوبەیر: بۆ دەبینم دەربارەی تەڵاق هیچ ناڵێی؟ وتی: هیچ شتێك لە تەڵاق نییە پرسیارم بۆ نەکردبێت، بەڵام لام ناپەسەندە حەرام حەڵاڵ بکەم و حەڵاڵ حەرام بکەم.

٤٠٩- عن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: لَقَدْ أَدْرَكْتُ فِي هَذَا المسْجِدِ عِشْرِينَ وَمِائَةً مِنَ الْأَنْصَارِ، وَمَا مِنْهُمْ مِنْ أَحَدٍ يُحَدِّثُ بِحَدِيثٍ إِلاَّ وَدَّ أَنَّ أَخَاهُ كَفَاهُ الحَدِيثَ، وَلاَ يُسْأَلُ عَنْ فُتْيَا إِلاَّ وَدَّ أَنَّ أَخَاهُ كَفَاهُ الفُتْيَا. [مي١٣٧]

* إسناده صحيح.

لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبی یەعلاوە، وتی: لەم مزگەوتەدا بە سەد و بیست کەس لە ئەنصار گەیشتم، هەریەك لەوانە فەرموودەیەکی فەرموو بێت ئاواتی خواستووە براکەی وتنی ئەو فەرموودەی لە کۆڵ بکردبایەتەوە، پرسیاری فتوایەکی لێبکرابا ئاواتی دەخواست براکەی فتواکەی لە کۆڵ بکردبایەتەوە.

٤١٠- عَنِ ابْنِ المُنْكَدِرِ قَالَ: إِنَّ العَالِمَ يَدْخُلُ فِيمَا بَيْنَ اللهِ وَبَيْنَ عِبَادِهِ، فَلْيَطْلُبْ لِنَفْسِهِ المخْرَجَ. [مي١٣٩]

* إسناده صحيح.

---

[1] واتە: خەڵکانێکی میانەڕەو و ئاسانگیربوون و دووربوون لە زیادەڕەوی و توندکردنەوە لە دیندا -و.

لە ئیبن مونکەدیرەوە، وتی: زانا دەکەوێتە نێوان خودا و بەندەکانی[1] با دەروو و دەرچەیەك بۆ خۆی بهێڵێتەوە.

٤١١- عن الصَّلْتِ بْنِ رَاشِدٍ قَالَ: سَأَلْتُ طَاوُساً عَنْ مَسْأَلَةٍ، فَقَالَ لِي: كَانَ هَذَا؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ آللهِ؟ قُلْتُ: آللهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ أَصْحَابَنَا أَخْبَرُونَا عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ أَنَّهُ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ! لاَ تَعْجَلُوا بِالبَلاَءِ قَبْلَ نُزُولِهِ، فَيُذْهَبُ بِكُمْ هُنَا وَهُنَا، فَإِنَّكُمْ إِنْ لَمْ تَعْجَلُوا بِالبَلاَءِ، قَبْلَ نُزُولِهِ، لَمْ يَنْفَكَّ المسْلِمُونَ أَنْ يَكُونَ فِيهِمْ مَنْ إِذَا سُئِلَ سَدَّدَ، وَإِذَا قَالَ: وُفِّقَ. [مي١٥٥]

* إسناده صحيح.

لە صەلتی کوڕی ڕاشیدەوە، وتی: پرسیارم کرد لە تاووس دەربارەی بابەتێك، پێی وتم: ئەمە بوو؟ وتم: بەڵێ، وتی: سوێند بە خودا؟ وتم: سوێند بە خودا، پاشان وتی: هاوەڵانمان هەواڵیان پێداوین لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە وتویەتی: ئەی خەڵکینە، پەلە مەکەن بە بەڵا بەر لە دابەزینی، چونکە بۆ ئێرە و ئەوێ دەبرێن، گەر ئێوە پەلەتان نەکرد بە بەڵا بەر لە دابەزینی ئەوا موسڵمانان دانابڕێن لەوەی کەسێکیان تێدا بێت گەر پرسیاری لێکرا بیپێکێت[2] و گەر قسەی کرد موەفەق بکرێت[3].

٤١٢- عَنْ أَبِي نَضْرَةَ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ أَبُو سَلَمَةَ البَصْرَةَ، أَتَيْتُهُ أَنَا وَالحَسَنُ، فَقَالَ لِلْحَسَنِ: أَنْتَ الحَسَنُ، مَا كَانَ أَحَدٌ بِالبَصْرَةِ أَحَبَّ إِلَيَّ لِقَاءً مِنْكَ، وَذَلِكَ أَنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ تُفْتِي بِرَأْيِكَ. فَلاَ تُفْتِ بِرَأْيِكَ، إِلاَّ أَنْ تَكُونَ سُنَّةٌ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، أَوْ كِتَابٌ مُنْزَلٌ. [مي١٦٥]

* إسناده صحيح.

لە "أبي نضرة"ەوە، وتی: کاتێك ئەبو سەلەمە هات بۆ بەصرە، من و حەسەن هاتین بۆ لای، بە حەسەنی وت: تۆ حەسەنی؟ هیچ کەس لە بەصرە بەقەدەر تۆ

---

[1] واتە: ئەو لە جێگەی خودا و پێغەمبەر باسی دینیان بۆ دەکات، بۆیە دەبێت باس و فتواکەی قسەی خودا و پێغەمبەر بێت-و.

[2] واتە: ڕاست و دروست وەڵام بداتەوە-و.

[3] واتە: خودا کۆمەکی بکات و لە زانست و حیکمەتەوە قسە بکات، نەك لە نەزانی و ئارەزووەوە-و.

بینینیم پێخۆش نەبوو، ئەوەش چونکە پێمگەیشتووە تۆ بە بۆچوونی خۆت فتوا دەدەی، بە بۆچوونی خۆت فتوا مەدە مەگەر سوننەتێك لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، یان کیتابێکی دابەزێنراو.

## ٤١- دەروازەی: مەزنڕاگرتنی زانست و پارێزگاری لێکردنی

**٤١٣**- عَنِ الحَسَنِ: أَنَّهُ دَخَلَ السُّوقَ فَسَاوَمَ رَجُلاً بِثَوْبٍ فَقَالَ: هُوَ لَكَ بِكَذَا وَكَذَا، وَاللهِ لَوْ كَانَ غَيْرَكَ مَا أَعْطَيْتُهُ، فَقَالَ: فَعَلْتُمُوهَا! فَمَا رُئِيَ بَعْدَهَا مُشْتَرِياً مِنَ السُّوقِ، وَلاَ بَائِعاً، حَتَّى لَحِقَ بِاللهِ. [مي٥٩٢]

* إسناده صحيح.

**لە حەسەنەوە، ڕۆیشتە بازاڕ لەگەڵ پیاوێك مامەڵەی پۆشاکێکی کرد، ئەویش وتی: ئەوە بۆ تۆ بەوەندە و بەوەندەیە، سوێند بە خودا گەر کەسێکی تر بوایە جگە لە تۆ پێمنەدەدا، حەسەن وتی: ئەنجامتان دا[1]، لەدوای ئەوە لە بازاڕ وەك کڕیار و فرۆشیار نەبینرا تا بە خزمەتی خودا گەیشت.**

**٤١٤**- عَنْ عُبَيْدِ بْنِ الحَسَنِ قَالَ: قَسَمَ مُصْعَبُ بْنُ الزُّبَيْرِ مَالاً فِي قُرَّاءِ أَهْلِ الكُوفَةِ، حِينَ دَخَلَ شَهْرُ رَمَضَانَ، فَبَعَثَ إِلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَعْقِلٍ بِأَلفَيْ دِرْهَمٍ، فَقَالَ لَهُ: اسْتَعِنْ بِهَا فِي شَهْرِكَ هَذَا. فَرَدَّهَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَعْقِلٍ وَقَالَ: لَمْ نَقْرَإِ القُرْآنَ لِهَذَا. [مي٥٩٤]

* إسناده صحيح.

**لە عوبەیدی کوڕی حەسەنەوە، وتی: موصعەبی کوڕی زوبەیر کاتێ ڕەمەزان هاتە بەرەوە ماڵ و سامانێکی بەسەر خوێنەرانی قورئانی ئەهلی کوفەدا دابەش کرد، دوو هەزار درهەمی بۆ عبدالرحمانی کوڕی مەعقیل ڕەوانە کرد و پێی وت: لەم مانگەدا کۆمەکییەکی لێ وەربگرە، عبدالرحمانی کوڕی مەعقیل گێڕایەوە و وتی: بۆ ئەمە قورئانمان نەخوێندووە.**

---

[1] واتە: ئەوەی وتت ئەنجامت دا لە خاترگرتنی من و دابەزاندنی نرخەکەی بۆ من-و.

**٤١٥-** عن عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ قَالَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ: مَنْ أَرْبَابُ العِلْمِ؟ قَالَ: الَّذِينَ يَعْمَلُونَ بِمَا يَعْلَمُونَ، قَالَ: فَمَا يَنْفِي العِلْمَ مِنْ صُدُورِ الرِّجَالِ؟ قَالَ: الطَّمَعُ. [مي٥٩٥]

* إسناده صحيح.

**له له عوبەیدوڵای کوڕی عومەرەوە: عومەری کوڕی خەتاب بە عەبدوڵای کوڕی سەلامی وت: ئەربابی زانست کێن؟ وتی: ئەوانەی کار دەکەن بەوەی دەیزانن، وتی: چ شتێك زانست لە سینەی پیاوان نەرێ دەکات[1]؟ وتی: چاوتێبڕین[2] (الطمع).**

**٤١٦-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: تَعَلَّمُوا العِلْمَ، فَإِذَا عَلِمْتُمُوهُ فَاكْظِمُوا عَلَيْهِ، وَلاَ تَشُوبُوهُ بِضَحِكٍ وَلاَ بِلَعِبٍ فَتَمُجَّهُ القُلُوبُ. [مي٦٠٢]

* إسناده صحيح.

**له عەلییەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: فێری زانست ببن، گەر فێریبوون تیایدا ڕۆبچن و لێی پڕببن و پێکەنین و گاڵتە و گەپی تێکەڵ مەکەن، چونکە دڵ تفی دەکاتەوە[3].**

## ٤٢- دەروازەی: ناپەسەندە بۆ زانا پیاوان لەدوایەوە بڕۆن

**٤١٧-** عَنْ سُلَيْمِ بْنِ حَنْظَلَةَ قَالَ: أَتَيْنَا أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ لِنَتَحَدَّثَ إِلَيْهِ، فَلَمَّا قَامَ قُمْنَا وَنَحْنُ نَمْشِي خَلْفَهُ، فَرَهِقَنَا عُمَرُ، فَتَبِعَهُ فَضَرَبَهُ عُمَرُ بِالدِّرَّةِ، قَالَ: فَاتَّقَاهُ بِذِرَاعَيْهِ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ! مَا نَصْنَعُ؟ قَالَ: أَوَ مَا تَرَى فِتْنَةً لِلْمَتْبُوعِ مَذَلَّةً لِلتَّابِعِ. [مي٥٤٠]

* إسناده جيد.

**له سولەیمی کوڕی حەنزەلەوە، وتی: هاتین بۆ لای ئوبەی کوڕی کەعب بۆئەوەی قسەی لەگەڵ بکەین، کاتێك هەستا ئێمەش هەستاین بۆئەوەی لەدوای ئەوەوە بڕۆین،**

---

[1] نەرێ دەکات: واتە دەسڕێتەوە-و.

[2] چاوتێبڕین(الطمع): واتە لە زانستەکەدا چاوبڕێتە دنیا و لە ئەهلی دنیا-بۆ دنیا- نزیك ببێتەوە-و.

[3] تفی دەکاتەوە: واتە زانستەکە ناگاتە دڵ-و.

عومەرمان پێگەیشت، شوێنی کەعب کەوت بە عەساکەی لێیدا، وتی: ئەویش بە دوو دەستی خۆی لە عەساکە دەپاراست، و دەیوت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، چی دەکەین[1]؟ وتی: بۆچی نابینی فیتنەیە بۆ شوێنخراو(المتبوع) و زەلیلییە بۆ شوێنکەوتوو(التابع)[2].

**٤١٨**– عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: كَانُوا يَكْرَهُونَ أَنْ تُوطَأَ أَعْقَابُهُمْ. [مي ٥٤١]

* إسناده صحيح.

**لە ئیبراهیمەوە، وتی: ئەوان لایان ناپەسەند بوو لەدوایانەوە هەنگاوهەڵبگیرێت.**

**٤١٩**– عن سُفْيَانَ، عَنْ أُمَيٍّ قَالَ: مَشَوْا خَلْفَ عَلِيٍّ، فَقَالَ: عَنِّي خَفْقَ نِعَالِكُمْ، فَإِنَّهَا مُفْسِدَةٌ لِقُلُوبِ نَوْكَى الرِّجَالِ. [مي ٥٥١]

**لە سوفیانەوە، لە ئومەییەوە، وتی: لەدوای عەلییەوە ڕۆیشتن، وتی: تەپەی نەعلەکانی پێتان لە کۆڵم بکەنەوە، چونکە ئەوە تێکدەری دڵان و گەمژەیی پیاوانە[3].**

## ٤٣- دەروازەی: وەرگرتنی کرێ لەسەر فێرکردنی قورئان

**٤٢٠**– عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: عَلَّمْتُ نَاساً مِنْ أَهْلِ الصُّفَّةِ الكِتَابَ وَالقُرْآنَ، فَأَهْدَى إِلَيَّ رَجُلٌ مِنْهُمْ قَوْساً، فَقُلْتُ: لَيْسَتْ بِمَالٍ، وَأَرْمِي عَنْهَا فِي سَبِيلِ اللهِ عزّ وجل، لَآتِيَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَلَأَسْأَلَنَّهُ، فَأَتَيْتُهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، رَجُلٌ أَهْدَى إِلَيَّ قَوْساً مِمَّنْ كُنْتُ أُعَلِّمُهُ الكِتَابَ وَالقُرْآنَ، وَلَيْسَتْ بِمَالٍ، وَأَرْمِي عَنْهَا فِي سَبِيلِ اللهِ؟ قَالَ: **(إِنْ كُنْتَ تُحِبُّ أَنْ تُطَوَّقَ طَوْقاً مِنْ نَارٍ فَاقْبَلْهَا)**. [د٣٤١٦، ٣٤١٧/ جه٢١٥٧]

* صحيح.

---

[1] چی دەکەین: واتە چ خراپە و هەڵەیەك ئەنجام دەدەین تا تۆ لێمان بدەی؟–و.

[2] واتە: گەر خەڵك لەدواوەی کەسێك بڕۆن دەبێتە فتوا بۆ هەردوو لایان–و.

[3] "تێکدەری دڵان" بۆ ئەو کەسانەی خەڵك شوێنیان دەکەون، "گەمژەیی پیاوان" بۆ ئەو خەڵکەی شوێنی کەسێك دەکەون–و.

لە عوبادەی کوڕی صامتەوە، وتی: خەڵکانێکم لە ئەهلی "صفة" فێری نووسین و قورئان کرد، پیاوێك لەوان کەوانێکی هەدیە کردم، وتم کەوانەکە ماڵ و سامان نییە و لە ڕێگەی خودا(عز وجل) تیری پێ دەتەقێنم، دەچم بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و پرسیاری لێ دەکەم، هاتم بۆ لای و وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، پیاوێك لەوانەی نووسین و قورئانم فێر دەکرد ئەم کەوانەی هەدیە کردووم و ماڵ و سامان نییە و لە ڕێگەی خودا تیری پێ دەتەقێنم؟ فەرمووی: **(گەر دەتەوێ ملوانکەیەکی ئاگر بکرێتە ملت قبووڵی بکە)**.

**٤٢١**– عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: عَلَّمْتُ رَجُلاً الْقُرْآنَ، فَأَهْدَى إِلَيَّ قَوْساً، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**إِنْ أَخَذْتَهَا أَخَذْتَ قَوْساً مِنْ نَارٍ**) فَرَدَدْتُهَا. [جه٢١٥٨]

* صحيح.

لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە، وتی: قورئانم فێری پیاوێك کرد، ئەویش کەوانێکی هەدیە کردم، ئەوەم بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) باس کرد، فەرمووی: **(گەر وەرتبگرتبا کەوانێك لە ئاگرت وەردەگرت)**، بۆیە منیش گێڕامەوە.

## ٤٤- دەروازەی: فێرکردنی منداڵ

**٤٢٢**– عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ: أَنَّهُ كَانَ يَجْمَعُ بَنِيهِ فَيَقُولُ: يَا بَنِيَّ، تَعَلَّمُوا، فَإِنْ تَكُونُوا صِغَارَ قَوْمٍ، فَعَسَى أَنْ تَكُونُوا كِبَارَ آخَرِينَ، وَمَا أَقْبَحَ عَلَى شَيْخٍ يُسْأَلُ لَيْسَ عِنْدَهُ عِلْمٌ. [مي٥٧١]

[انظر: **٨٥، ٣٢٨**].

لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە: منداڵەکانی کۆدەکردەوە و دەیوت: ڕۆڵەکانم، فێربن، گەر بچووکی کۆمەڵێك بن، بەڵکو ببنە گەورەی کۆمەڵێکی تر، چەند ناشیرینە پیرێك پرسیاری لێ بکرێت و زانستی لا نەبێت.

## بەشی یەکەم

# کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز

### ١- دەروازەی: دابەزینی وەحی و ماوەکەی

**٤٢٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**ما مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إِلاَّ أُعْطِيَ ما مِثْلُه آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وإِنَّما كانَ الَّذِي أُوتِيتُهُ وَحْياً أَوْحاهُ اللهُ إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). [خ٤٩٨١/ م١٥٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**هەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران شتێکی پێدراوە مرۆڤ لەسەری ئیمان بهێنێت، ئەوەی بە من دراوە وەحی بوو و خودا وەحی بۆ کردم، بۆیە رجام وایە لە رۆژی قیامەت لە هەموویان زیاتر شوێنکەوتەم هەبێت**[1]).

**٤٢٤-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ: أَنَّ اللهَ تَعَالَى تَابَعَ عَلَى رَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم الْوَحْيَ قَبْلَ وَفَاتِهِ، حَتَّى تَوَفَّاهُ أَكْثَرَ ما كانَ الْوَحْيُ، ثُمَّ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَعْدُ. [خ٤٩٨٢/ م٣٠١٦]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت): خودا(سبحانه وتعالى) بۆ سەر پێغەمبەرەکەی(ﷺ)-بەر لە مردنی- بەدوای یەکدا وەحی دادەبەزاند، تا تەواوی کرد، زۆرترین وەحی لەو ماوەدا دابەزی، دواتر پێغەمبەری خودا(ﷺ) کۆچی دوایی کرد.

---

[1] واتە: هەر پێغەمبەرێك خودا موعجیزەیەکی پێداوە، موعجیزەی پێغەمبەری ئێمە بریتییە لە قورئان، قورئانیش بە درێژایی رۆژگار دەمێنێتەوە و موعجیزەکەی باقییە، بۆیە رجاوایە شوێنکەوتەی پێغەمبەری ئیسلام لە شوێنکەوتەی پێغەمبەرانی تر زۆرتر بن-و.

**٤٢٥-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَكَثَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِمَكَّةَ ثَلاَثَ عَشْرَةَ، وَتُوُفِّيَ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. [خ٣٩٠٣، (٣٨٥١)/ م٢٣٥١]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سیازدە ساڵ لە مەككە مایەوە، و لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا كۆچی دوایی كرد.**

- وفي رواية لمسلم: أَقَامَ بمكةَ ثَلاثَ عَشْرةَ سَنَةً يُوحى إِلَيْهِ، وبالمدينَةِ عَشْراً.

**لە ریوایەتێكی موسلیمدا: لە مەككە سیازدە ساڵ مایەوە وەحی بۆ دەهات و لە مەدینەش دە ساڵ.**

**٤٢٦-** (خ) عَنْ عائِشَةَ وَابْنِ عَبَّاسٍ ﭫ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم لَبِثَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ، يُنْزَلُ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ، وَبِالمدِينَةِ عَشْراً. [خ٤٤٦٤، ٤٤٦٥ (٣٨٥١)]

**(خ) لە عائیشە و ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) لە مەككە دە ساڵ مایەوە، قورئانی بۆ سەر دادەبەزی، لە مەدینەش دە ساڵ.**

**٤٢٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما في قَوْلِهِ تَعَالى: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ١﴾[القدر: ١]. قَالَ: أُنْزِلَ القُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً فِي لَيْلَةِ القَدْرِ إِلى السَّمَاءِ الدُّنْيَا وَكَانَ بِمَوْقِعِ النُّجومِ، وَكَانَ اللهُ يُنَزِّلُهُ عَلَى رَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم بَعْضَهُ فِي أَثَرِ بَعْضٍ قَالَ: وَقَالوا: ﴿لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا٣٢﴾[الفرقان:٣٢]. [ك٢٨٧٨]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە ئیبن عەباسەوە(خوا لێی رازی بێت) دەربارەی ئایەتی: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ١﴾ [القدر: ١]، قورئان بەیەكجار لە شەوی قەدردا دابەزی بۆ ئاسمانی دنیا، لە شوێنی بەش بەش كردن بوو، خودا(سبحانه وتعالى) هەندێكی بەدوای هەندێكیدا بۆ سەر پێغەمبەرەكەی دادەبزاند، وتی: وتیان: ﴿لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا٣٢﴾[الفرقان:٣٢].**

## ٢- دەروازەی: لە نێوان دوو بەرگ(ما بين دفتين)

**٤٢٨-** (خ) عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَشَدَّادُ بْنُ مَعْقِلٍ عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، فَقَالَ لَهُ شَدَّادُ بْنُ مَعْقِلٍ: أَتَرَكَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ شَيْءٍ؟ قَالَ: ما تَرَكَ إِلاَّ ما بَيْنَ الدَّفَّتَيْنِ.

قَالَ: وَدَخَلْنَا عَلَى مُحَمَّدِ ابْنِ الحَنَفِيَّةِ، فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: ما تَرَكَ إِلاَّ ما بَيْنَ الدَّفَّتَيْنِ. [خ٥٠١٩]

**(خ) لە عبدالعزیزی کوڕی روفەیعەوە، وتی: من و شەددادی کوڕی مەعقیل رۆیشتین بۆ لای ئیبن عەباس(خوا لێی رازی بێت) شەددادی کوڕی مەعقیل پێی وت: ئایا پێغەمبەر(ﷺ) شتێکی وازلێهێناوە[1]؟ وتی: هیچ شتێکی وازلێنەهێناوە و هەمووی لە نێوان ئەو دوو بەرگەدایە[2].**

**وتی: هەروەها رۆیشتین بۆ لای محەمەدی کوڕی حەنەفییە و پرسیارمان لێکرد، وتی: هیچ شتێکی وازلێنەهێناوە و هەمووی لە نێوان ئەو دوو بەرگەدایە.**

## ٣- دەروازەی: یەکەمینێك لە قورئان دابەزی و دواهەمینێك دابەزی

**٤٢٩-** (ق) عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: آخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ كامِلَةً بَرَاءَةٌ، وَآخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ خاتِمَةُ سُورَةِ النِّسَاءِ: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ﴾ [النساء:١٧٦]. [خ٤٣٦٤/ م١٦١٨]

**(ق) لە بەرائەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: دوایین سورەتێك بە کاملی دابەزی بێت سورەتی (براءة) بوو، دوایین سورەتێکیش دابەزی بێت کۆتایی سورەتی (النساء) بوو[3]:** ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ﴾ [النساء:١٧٦].

---

[1] واتە: ئایا پێغەمبەر شتێك لە قورئانی خوێنراوەی وازلێهێناوە و ئێستا لەناو قورئاندا نەبێت؟.

[2] (ما بين الدفتين) جووتی (دفة)یە، کە بریتییە لە بەرگ، مەبەستەکە: هیچی بەجێنەهێڵاوە بەجێنەهێڵاوە جگە لەوەی لەو مەصحەفەدایە، واتە: شتێك لە قورئانی خوێنراوی وازلێنەهێناوە و لەناو ئەو مەصحەفەی هەیە دایناوە.

[3] واتە: سورەتی (البراءة) دوایین سورەتێکە بە یەکجار دابەزی بێت، سورەتی (النساء)یش دوایین سورەتێکە ئایەتەکانی بە ئایەتی: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ﴾ تەواوکراوە-و.

■ وفِي رواية لهما: آخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ﴾.          [خ٤٦٥٤]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیاندا: دوایین ئایەتێك دابزی: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ﴾.**

**٤٣٠**– (م) عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ قَالَ: قَالَ لِيَ ابْنُ عَبَّاسٍ: تَعْلَمُ آخِرَ سُورَةٍ نَزَلَتْ مِنَ الْقُرْآنِ، نَزَلَتْ جَمِيعاً؟ قُلْتُ: نَعَمْ ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ①﴾ [النصر: ١] قَالَ: صَدَقْتَ.          [م٣٠٢٤]

**(م) لە عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی عوتبەرەوە، وتی: ئیبن عەباس پێی وتم: دەزانین کامە دوایین سورەت بوو لە قورئان دابەزی، بەیەکجار دابەزی؟ وتم: بەڵێ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ①﴾ [النصر: ١]، وتی: راست دەکەی.**

**٤٣١**– عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: هَلْ تَقْرَأُ سُورَةَ الْمَائِدَةِ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَتْ: فَإِنَّهَا آخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ، فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهَا مِنْ حَلاَلٍ؛ فَاسْتَحِلُّوهُ، وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهَا مِنْ حَرَامٍ؛ فَحَرِّمُوهُ. وَسَأَلْتُهَا عَنْ خُلُقِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: الْقُرْآنُ.
[حم٢٥٥٤٧]

* إسناده صحيح، رجاله رجال الصحيح.

**لە جوبەیری کوڕی نوفەیرەوە، وتی: رۆیشتم بۆ لای عائیشە، وتی: ئایا سورەتی (المائدة) دەخوێنییەوە؟ وتی: وتم: بەڵێ، عائیشە وتی: ئەوە دوایین سورەتێکە دابەزی بێت، ئەوەی لە حەڵاڵ لەو سورەتەدا دەیبیننەوە بە حەڵاڵی بزانن، ئەوەی لە حەرام تیایدا دەبیننەوە بە حەرامی بزانن، پرسیاری رەوشتی پێغەمبەری خودام(ﷺ) لێکرد، وتی: قورئان بوو.**

**٤٣٢**– عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: إِنَّ أَوَّلَ مَا نَزَلَ مِنَ الْقُرْآنِ ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ①﴾ [العلق: ١].          [هق٩/٦]

**لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: یەکەمین ئایەتێك لە قورئان دابەزی﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ①﴾ [العلق: ١].**

**٤٣٣-** عَنْ أَبِي رَجَاء العُطَارِدِيِّ، عَنْ أَبِي مُوسى الأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: تَعَلَّمْنَا القُرْآنَ فِي المسْجِدِ . يعني: مَسْجَدَ البَصْرَةِ . وكنا نَجْلِسُ حِلَقاً حِلَقاً، وَكَأَنَّمَا أَنْظُرُ إِلَيْه بَيْنَ ثَوْبَيْنِ أَبْيَضَيْنِ، وَعَنْهُ أَخَذْتُ هذهِ السُّورَةَ: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ①﴾ [العلق: ١] قَالَ: وَكَانَتْ أَوَّلَ سُورَةٍ أُنْزِلَتْ عَلَى مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم. [ك٢٨٧٢]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە ئەبی ڕەجای عوتاریدییەوە، لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لە مزگەوت–واتە مزگەوتی بەصرە– فێری قورئان بووین، ئەڵقە ئەڵقە دادەنیشتین، وەك ئەوەی تەماشای بکەم لە نێوان دوو پۆشاکی سپی، لەوەوە ئەم سورەتەم وەرگرت: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ①﴾ [العلق: ١]، ئەوەش یەکەمین سورەت بوو بۆ سەر محەمەد(ﷺ) دابەزی.**

**٤٣٤-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ رضي الله عنه قَالَ: آخِرُ مَا نَزَلَ مِنَ القُرْآنِ: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ⑫⑧﴾ [التوبة: ١٢٨]. [ك٣٢٩٦]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: دوایین ئایەتێك لە قورئان دابەزی: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ⑫⑧﴾ [التوبة: ١٢٨].**

## ٤- دەروازەی: کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز

**٤٣٥-** (خ) عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ مَقْتَلَ أَهْلِ الْيَمامَةِ وَعِنْدَهُ عُمَرُ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ عُمَرَ أَتَانِي فَقَالَ: إِنَّ الْقَتْلَ قَدِ اسْتَحَرَّ يَوْمَ الْيَمَامَةِ بِقُرَّاءِ الْقُرْآنِ، وَإِنِّي أَخْشى أَنْ يَسْتَحِرَّ الْقَتْلُ بِقُرَّاءِ الْقُرْآنِ فِي المَوَاطِنِ كُلِّهَا، فَيَذْهَبَ قُرْآنٌ كَثِيرٌ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَأْمُرَ بِجَمْعِ الْقُرْآنِ، قُلْتُ: كَيْفَ أَفْعَلُ شَيْئاً لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَقَالَ عُمَرُ: هُوَ وَاللهِ

خَيْرٌ، فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَاجِعُنِي فِي ذلِكَ حَتَّى شَرَحَ اللهُ صَدْرِي لِلَّذِي شَرَحَ لَهُ صَدْرَ عُمَرَ، وَرَأَيْتُ فِي ذلِكَ الَّذِي رَأَى عُمَرُ.

قال زَيْدٌ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَإِنَّكَ رَجُلٌ شَابٌّ عَاقِلٌ لاَ نَتَّهِمُكَ، قَدْ كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَتَتَبَّعِ الْقُرْآنَ، فَاجْمَعْهُ.

قَالَ زَيْدٌ: فَوَاللهِ! لَوْ كَلَّفَنِي نَقْلَ جَبَلٍ مِنَ الْجِبَالِ مَا كَانَ بِأَثْقَلَ عَلَيَّ مِمَّا كَلَّفَنِي مِنْ جَمْعِ الْقُرْآنِ. قُلْتُ: كَيْفَ تَفْعَلاَنِ شَيْئاً لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَ أَبُو بكْرٍ: هُوَ وَاللهِ خَيْرٌ، فَلَمْ يَزَلْ يَحُثُّ مُرَاجَعَتِي حَتَّى شَرَحَ اللهُ صَدْرِي لِلَّذِي شَرَحَ اللهُ لَهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، وَرَأَيْتُ فِي ذلِكَ الَّذِي رَأَيَا.

فَتَتَبَّعْتُ الْقُرْآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ الْعُسُبِ وَالرِّقَاعِ وَاللِّخَافِ وَصُدُورِ الرِّجَالِ، فَوَجَدْتُ آخِرَ سُورَةِ التَّوْبَةِ: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾ [التوبة:١٢٨] إِلَى آخِرِهَا مَعَ خُزَيْمَةَ . أَوْ أَبِي خُزَيْمَةَ . فَأَلْحَقْتُهَا فِي سُورَتِهَا، فَكَانَتِ الصُّحُفُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ حَيَاتَهُ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللهُ عزّ وجل، ثُمَّ عِنْدَ عُمَرَ حَيَاتَهُ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللهُ، ثُمَّ عِنْدَ حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ. [خ٧١٩١، (٢٨٠٧)]

**(خ) لە زەیدی کوڕی سابیتەوە، وتی: لە کوشتنی ئەهلی یەمامەوە ئەبوبەکر ناردی لەدووم و عومەری لەلا بوو، ئەبوبەکر وتی: عومەر هاتووە بۆ لام و دەڵێ: ڕۆژی یەمامە زۆرێك لە خوێنەرانی قورئانی کوشتووە، من دەترسم جەنگەکان کوشتنی هەموو خوێنەرانی لێوە پەیدا ببێت، بۆیە زۆرێك لە قورئان بزر ببێت، من پێمباشە فەرمان بکەی بە کۆکردنەوەی قورئان، وتم: چۆن من کارێك دەکەم پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەیکردووە؟! عومەر وتی: سوێند بە خودا، ئەو کارە خێرە، بەردەوام عومەر داوای ئەو کارەی لێ دەکردم تا خودا سینەی واڵا کردم بۆ ئەو کارەی سینەی عومەری بۆ واڵا بووبوو، و ئەوەی عومەر پێی باش بوو منیش پێم باش بوو.**

**زەید وتی: ئەبوبەکر وتی: تۆ پیاوێکی گەنجی ژیری و تۆمەتبارت ناکەین[1]، پێشتر وەحیت بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەنووسییەوە، بەدواداچوون بکە بۆ قورئان و کۆی بکەرەوە.**

---

[1] واتە: دینت سەلامەتە و هیچ گومان و تانە و تۆمەتێك لەسەر زانست و تەقوای تۆ بوونی نییە-و.

زەید دەڵێ: سوێند بە خودا، گەر داوای لێم بکردبا چیایەك لە چیاکان بگوێزمەوە لەسەرم قورستر نەبوو لەوەی داوام لێکرا لە کۆکردنەوەی قورئان، وتم: چۆن ئێوە کارێك ئەنجام دەدەن پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەنجامی نەداوە؟! ئەبوبەکر وتی: سوێند بە خودا، ئەو کارە خێرە، بەردەوام هانی دەدام بۆی تا خودا سینەی واڵا کردم بۆ ئەو کارەی سینەی ئەبو بەکر و عومەری بۆ واڵا کرد بوو، ئەوەی ئەوان پێیان باش بوو پێم باش بوو.

بەدواداچوونم کرد بۆ قورئان و لە پەلکی دارخورما و پێست و خەزەف[1] و پیاوان کۆم دەکردەوە، دواییی سورەتی تەوبەم﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾ [التوبة:١٢٨]، تا کۆتایی سورەتەکە لای خوزەیمە–یان ئەبی خوزەیمە– بینییەوە و لە سورەتەکەی خۆیدا دامنا، لاپەڕەکان لە ژیانی ئەبی بەکردا لە لای بوو تا خودا مراندی، پاشان لای حەفصەی کچی عومەر بوو.

- وفي رواية: قَالَ: نَسَخْتُ الصُّحُفَ فِي المَصَاحِفِ، فَفَقَدْتُ آيَةً مِنْ سُورَةِ الأَحْزَابِ، كُنْتُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقْرَأُ بِهَا، فَلَمْ أَجِدْهَا إِلاَّ مَعَ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيِّ، الَّذِي جَعَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم شَهَادَتَهُ شَهَادَةَ رَجُلَيْنِ، وَهُوَ قَوْلُهُ: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ﴾ [الأحزاب:٢٣]. [خ٢٨٠٧]

لە ریوایەتێکدا: وتی: لاپەڕەکانم لە کۆمەڵێك موصحەفدا لەبەرگرتەوە، بەدوای ئایەتێکدا دەگەڕام لە سورەتی (الأحزاب) کاتی خۆی گوێم لێ بوو پێغەمبەری خودا دەیخوێندەوە، تەنها لای خوزەیمەی کوڕی سابیتی ئەنصاری بینیمەوە، ئەو پیاوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) شایەتییەکەی بە دوو شایەت دانابوو، ئەوەش ئایەتی: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ﴾ [الأحزاب:٢٣].

---

[1] خەزەف: بەردێکی سپی نەرمە–و.

## ٥- دەروازەی: لەبەرگرتنەوەی قورئان لە سەردەمی عوسمان

**٤٣٦**– (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ: أَنَّ حُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمانِ قَدِمَ عَلَى عُثْمانَ، وَكانَ يُغَازِي أَهْلَ الشَّامِ فِي فَتْحِ إِرْمِينِيَةَ وَأَذْرَبِيجَانَ مَعَ أَهْلِ الْعِرَاقِ، فَأَفْزَعَ حُذَيْفَةَ اخْتِلاَفُهُمْ فِي الْقِرَاءَةِ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ لِعُثْمانَ: يَا أَمِيرَ المؤْمِنِينَ! أَدْرِكْ هذِهِ الأُمَّةَ قَبْلَ أَنْ يَخْتَلِفُوا فِي الْكِتَابِ اخْتِلاَفَ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى. فَأَرْسَلَ عُثْمَانُ إِلَى حَفْصَةَ: أَنْ أَرْسِلِي إِلَيْنَا بِالصُّحُفِ نَنْسَخُهَا فِي المصَاحِفِ، ثُمَّ نَرُدُّهَا إِلَيْكِ، فَأَرْسَلَتْ بِهَا حَفْصَةُ إِلَى عُثْمانَ، فَأَمَرَ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، وعَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَسَعِيدَ بْنَ الْعاصِ، وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، فَنَسَخُوهَا فِي المصَاحِفِ، وقَالَ عُثْمانُ لِلرَّهْطِ الْقُرَشِيِّينَ الثَّلاَثَةِ: إِذَا اخْتَلَفْتُمْ أَنْتُمْ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فِي شَيْءٍ مِنَ الْقُرْآنِ فاكْتُبُوهُ بِلِسَانِ قُرَيْشٍ، فإِنَّمَا نَزَلَ بِلِسَانِهِمْ، فَفَعَلُوا، حَتَّى إِذَا نَسَخُوا الصُّحُفَ فِي المصَاحِفِ، رَدَّ عُثْمانُ الصُّحُفَ إِلَى حَفْصَةَ، وَأَرْسَلَ إِلَى كُلِّ أُفُقٍ بِمُصْحَفٍ مِمَّا نَسَخُوا، وَأَمَرَ بِمَا سِوَاهُ مِنَ الْقُرْآنِ فِي كُلِّ صَحِيفَةٍ، أَوْ مُصْحَفٍ أَنْ يُحْرَقَ. [خ٤٩٨٧، (٣٥٠٦)]

**(خ) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: حوزەیفەی کوڕی یەمان هاتەوە بۆ لای عوسمان، ئەو لەگەڵ ئەهلی عێراق غەزای ئەهلی شامی دەکرد لە فەتحی ئیرمینییە و ئازربیجان، جیاوازییان لە خوێندنەوەدا حوزەیفەی ترساند، بۆیە حوزەیفە بە عوسمانی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، فریای ئەم ئومەتە بکەوە بەرلەوەی لە قورئاندا وەك جیاوازی یەهوود و نەصارا ناکۆکییان بۆ دروست ببێت، عوسمان ناردی بۆ لای حەفصە: ئەو لاپەڕانەمان بۆ بنێرە لە چەند مەصحەفێکدا لەبەریان دەگرینەوە، پاشان بۆت دەگێڕینەوە، حەفصە لاپەڕەکانی نارد بۆ عوسمان، فەرمانی کرد بە زەیدی کوڕی سابیت و عەبدوڵای کوڕی زوبەیر و سەعیدی کوڕی عاص و عبدالرحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشام لە چەند مەصحەفێکدا لەبەریان گرتەوە، عوسمان بە سێ کەسە قورەیشییەکەی وت: گەر ئێوە و زەیدی کوڕی**

سابیت جیاوازیتان لە شتێك لە قورئاندا بۆ دروست بوو بە زمانی[1] قورەیش بینووسن، چونکە بە زمانی ئەوان دابەزیوە[2]، ئەوانیش بەو جۆرەیان کرد، تا هەموو لاپەڕەکانیان لە چەند موصحەفێکدا لەبەرگرتەوە عوسمان لاپەڕەکانی گێڕایەوە بۆ حەفصە، و بۆ هەر ناسۆیەك[3] موصحەفێك لەوانەی گیرابوونەوە رەوانە کرد، فەرمانی کرد هەرچی نووسراوی ترە لە قورئان لە هەر لاپەڕەیەکدا، یان لە هەر موصحەفێکدا بسووتێنرێ.

**٤٣٧**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لاَ يَعْرِفُ فَصْلَ السُّورِ حَتَّى تَنَزَّلَ عَلَيْهِ ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾. [د٧٨٨]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ناوبڕی سورەتەکانی نەدەزانی تا ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بۆ سەر دابەزی .

## ٦- دەروازەی: دابەزینی قورئان بە حەوت پیت[4]

**٤٣٨**- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (أَقْرَأَنِي جِبْرِيلُ عَلَى حَرْفٍ، فَرَاجَعْتُهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَسْتَزِيدُهُ وَيَزِيدُنِي، حَتَّى انْتَهى إِلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ). [خ٤٩٩١ (٣٢١٩)/ م٨١٩]

---

(١) واتە: بە شێوەزار(لهجة)ی قورەیش-و.

(٢) چونکە پێغەمبەر لە قورەیش بوو و قورئان بەسەر ئەواندا و بۆ ئەوان دادەبەزی-و.

(٣) واتە: بۆ هەر لا و ئاراستەیەك-و.

(٤) واتە: حەوت شێوەزار-و.

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(جیبریل لەسەر یەك شێوەزار پێیخوێندمەوە، گەڕامەوە بۆ لای[1]، بەردەوام داوای زیادکردنم لێ دەکرد و بۆی زیاد دەکردم، تا گەیشتە حەوت شێوەزار)[2].**

- زاد مسلم: قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: بَلَغَنِي أَنَّ تِلْكَ السَّبْعَةَ الأَحْرُفَ، إِنَّمَا هِيَ فِي الْأَمْرِ الَّذِي يَكُونُ وَاحِداً، لاَ يَخْتَلِفُ فِي حَلاَلٍ وَلاَ حَرَامٍ.

**موسلیم ئەمەی زیاد کردووە: ئیبن شیهاب دەڵێت: پێمگەیشتووە ئەو حەوت پیتە لەو کاروبارانەدایە کە یەکن، لە حەڵاڵ و حەرام جیاوازی نییە.**

**٤٣٩-** (ق) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ يَقْرَأُ سُورَةَ الفُرْقَانِ عَلَى غَيْرِ ما أَقْرَؤُهَا، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَقْرَأَنِيهَا، وَكِدْتُ أَنْ أَعْجَلَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَمْهَلْتُهُ حَتَّى انْصَرَفَ، ثُمَّ لَبَّبْتُهُ بِرِدَائِهِ، فَجِئْتُ بِهِ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقُلْتُ: إِنِّي سَمِعْتُ هَذَا يَقْرَأُ عَلَى غَيْرِ ما أَقْرَأْتَنِيهَا، فَقَالَ لِي: (أَرْسِلْهُ). ثمَّ قَالَ لَهُ: (اقْرَأْ)، فَقَرَأَ، قَالَ: **(هَكَذَا أُنْزِلَتْ).** ثُمَّ قَالَ لِي: (اقْرَأْ)، فَقَرَأْتُ، فَقَالَ: **(هكَذَا أُنْزِلَتْ، إِنَّ الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَاقْرَؤُوا مِنْهُ ما تَيَسَّرَ).** [خ٢٤١٩/ م٨١٨]

**(ق) لە عومەری کوڕی خەتابەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: گوێم لە هیشامی کوڕی حەکەمی کوڕی حیزام بوو سورەتی (الفرقان)ی بە جۆرێك دەخوێند جیاواز لەوەی من، پێغەمبەری خودا ئەو سورەتەی پێ خوێندبووم، خەریکبوو پەلەی لێ بکەم، پاشان لێیگەڕام تا رۆیشت، دواتر ئێخەی کراسەکەیم گرت و هێنام بۆ لای**

---

[1] واتە: راوێژم لەگەڵ کرد و قسەم دەربارەی کرد-و.

[2] قازی ئەبوبەکری باقلانی دەڵێت: سەحیح ئەوەیە ئەم حەوت شێوەزارە دەرکەوتووە و بە بەربڵاوی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووە و ئیمامەکان تۆماریان کردووە و عوسمان و کۆمەڵێك لە هاوەڵان لە موصحەفدا جێگیریان کردووە و هەواڵی دروستییان داوە، ئەوەی متەواتیر نەبێت لەو شێوەزارە خوێندنەوانە لادراون، ئەم شێوەزارانە جارێك ماناکانیان جیاوازە و جارێك وشەکانیان، بەڵام بەیەکتردا ناکێشن و دژیەك و نەرێکاری یەکتر نین.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتم: من گوێم لێبوو ئەمە بە جۆرێك دەیخوێند جیاواز لەوەی تۆ بە منت خوێند، پێی فەرمووم: (بەریدە[1])، پاشان پێی فەرموو: (بخوێنە)، ئەویش خوێندی، پێغەمبەر فەرمووی: (بەم جۆرە دابەزیوە)، پاشان بە منی فەرموو: (بخوێنە). منیش خوێندم، فەرمووی: (بەم جۆرە دابەزیوە، **قورئان لەسەر حەوت پیت دابەزیوە، چۆنتان بۆ ئاسان بوو لێی بخوێننەوە)**.

٤٤٠- (م) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: كُنْتُ فِي الْمَسْجِدِ، فَدَخَلَ رَجُلٌ يُصَلِّي، فَقَرَأَ قِرَاءَةً أَنْكَرْتُهَا عَلَيْهِ، ثُمَّ دَخَلَ آخَرُ، فَقَرَأَ قِرَاءَةً سِوَى قِرَاءَةِ صَاحِبِهِ، فَلَمَّا قَضَيْنَا الصَّلاَةَ، دَخَلْنَا جَمِيعاً عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقُلْتُ: إِنَّ هَذَا قَرَأَ قِرَاءَةً أَنْكَرْتُهَا عَلَيْهِ، وَدَخَلَ آخَرُ فَقَرَأَ سِوَى قِرَاءَةِ صَاحِبِهِ! فَأَمَرَهُمَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَرَأَا، فَحَسَّنَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم شَأْنَهُمَا، فَسُقِطَ فِي نَفْسِي مِنَ التَّكْذِيبِ وَلاَ إِذْ كُنْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ ! فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَا قَدْ غَشِيَنِي، ضَرَبَ فِي صَدْرِي، فَفِضْتُ عَرَقاً، وَكَأَنَّمَا أَنْظُرُ إِلَى اللهِ عزّ وجل فَرَقاً، فَقَالَ لِي: (**يَا أُبَيُّ، أُرْسِلَ إِلَيَّ: أَنِ اقْرَإِ الْقُرْآنَ عَلَى حَرْفٍ، فَرَدَدْتُ إِلَيْهِ: أَنْ هَوِّنْ عَلَى أُمَّتِي. فَرَدَّ إِلَيَّ الثَّانِيَةَ: اقْرَأْهُ عَلَى حَرْفَيْنِ، فَرَدَدْتُ إِلَيْهِ: أَنْ هَوِّنْ عَلَى أُمَّتِي. فَرَدَّ إِلَيَّ الثَّالِثَةَ: اقْرَأْهُ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَلَكَ بِكُلِّ رَدَّةٍ رَدَدْتُكَهَا مَسْأَلَةٌ تَسْأَلُنِيهَا، فَقُلْتُ: اللهُمَّ اغْفِرْ لأُمَّتِي، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأُمَّتِي، وَأَخَّرْتُ الثَّالِثَةَ لِيَوْمٍ يَرْغَبُ إِلَيَّ الْخَلْقُ كُلُّهُمْ، حَتَّى إِبْرَاهِيمُ صلّى الله عليه وسلّم**). [م٨٢٠]

(م) لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە، وتی: لە مزگەوت بووم، پیاوێك هاتە ژوورەوە و نوێژی کرد، بە خوێندنەوەیەك قورئانی خوێند لام ناپەسەند بوو، یەکێکی تر هاتە ژوورەوە بە خوێندنەوەیەکی جیاواز لە خوێندنەوەی ئەو پیاوە خوێندی، کاتێك نوێژەکەمان ئەنجامدا، هەموومان ڕۆیشتین بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێم وت: ئەمە بە خوێندنەوەیەك خوێندی لام ناپەسەند بوو، یەکێکی تر هات و بە خوێندنەوەیەکی جیاواز لە خوێندنەوەی هاوڕێکەی خوێندی! پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێ کردن و هەردووکیان خوێندیان، پێغەمبەر(ﷺ) خوێندنەوەکەیانی لا

[1] واتە: دەست لە ئێخەی بەردە–و.

باش بوو، شتێك لە بەدرۆزانین کەوتە ناو دەروونمەوە کە لە سەردەمی نەفامی منمدا بەو جۆرە بوونی نەبووە[1]، کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی بینی داگیری کردبووم کێشای بە سینەمدا، ئارەقەم لێ دەچۆڕا، وەك ئەوەی بە ئاشکرا تەماشای خودا(عز وجل) بکەم، پێی فەرمووم: **(ئەی ئوبەی، بۆم رەوانەکرا قورئان لەسەر پیتێك[2] بخوێنمەوە، گەڕامەوە بۆ لای: لەسەر ئومەتەکەم ئاسانکاری بکە، بۆ جاری دووەم وەڵامم درایەوە: لەسەر دوو پیت بیخوێنە، گەڕامەوە بۆ لای: لەسەر ئومەتەکەم ئاسانکاری بکە، بۆ جاری سێیەم وەڵامیدامەوە: لەسەر حەوت پیت بیخوێنە، بۆ هەر جارێك وەڵامی تۆم داوەتەوە داوایەك هەیە هەیە تۆ داوای بکەی، منیش وتم: خودایە، لە ئومەتەکەم خۆشببە، خودایە لە ئومەتەکەم خۆشببە، سێیەمیانم هەڵگرتووە بۆ رۆژێك هەموو خەڵکی -تەنانەت ئیبراهیمیش(علیه السلام)- رووم لێ دەکەن).**

**٤٤١**- وعَنْه قَالَ: لَقِيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم جِبْرِيلَ فَقَالَ: **(يَا جِبْرِيلُ، إِنِّي بُعِثْتُ إِلَى أُمَّةٍ أُمِّيِّينَ: مِنْهُمْ الْعَجُوزُ، وَالشَّيْخُ الْكَبِيرُ، وَالْغُلاَمُ، وَالْجَارِيَةُ، وَالرَّجُلُ الَّذِي لَمْ يَقْرَأْ كِتَاباً قَطُّ. قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّ الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ).** [ت٢٩٤٤]

* حسن صحيح.

هەر لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە جیبریل(علیه السلام) گەیشت و فەرمووی: **(ئەی جیبریل، من رەوانە کراوم بۆ ئوممەتی ئومییەکان: هەیانە بەتەمەنن، هەیانە پیری ئەفتادەن، هەیانە منداڵن، هەیانە جاریەن، هەشیانە پیاون و هەرگیز کتێبێکیان نەخوێندووەتەوە، جیبریل فەرمووی: ئەی محەمەد، قورئان لەسەر حەوت پیت دابەزیوە).**

---

[1] واتە: شەیتان وەسوەسەی بەدرۆزانینی پێغەمبەرایەتی هەڵدایە دەروونمەوە توندتر و خراپتر لەوەی سەردەمی نەفامی لەسەری بووم.

[2] پیتێك: واتە شێوەزارێك-و.

**٤٤٢**- عن أبي جُهَيْمِ بْنِ الحَارِثِ: أَنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَلَفَا فِي آيَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ، فَقَالَ هَذَا: تَلَقَّيْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَقَالَ الْآخَرُ: تَلَقَّيْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَسَأَلاَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**الْقُرْآنُ يُقْرَأُ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَلاَ تُمَارُوا فِي الْقُرْآنِ، فَإِنَّ مِرَاءً فِي الْقُرْآنِ كُفْرٌ**). [حم١٧٥٤٢]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**له جوهەیمی کوڕی حاریسەوە: دوو پیاو دەربارەی ئایەتێك له قورئان جیاوازییان بۆ دروست بوو، ئەمەیان وتی: له پێغەمبەری خودام(ﷺ) وەرگرتووە، ئەویتریان وتی: منیش له پێغەمبەری خودام(ﷺ) وەرگرتووە، بۆیە هەردووکیان پرسیاریان له پێغەمبەر(ﷺ) کرد، فەرمووی: (قورئان لەسەر حەوت پیت دەخوێنرێت، له قورئاندا موجادەله مەکەن، چونکە موجادەله له قورئاندا بێباوەڕییە).**

**٤٤٣**- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: قَرَأْتُ آيَةً وَقَرَأَ ابْنُ مَسْعُودٍ خِلاَفَهَا، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقُلْتُ: أَلَمْ تُقْرِئْنِي آيَةَ كَذَا وَكَذَا؟ قَالَ: (بَلَى)، فَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: أَلَمْ تُقْرِئْنِيهَا كَذَا وَكَذَا؟ فَقَالَ: (**بَلَى، كِلاَكُمَا مُحْسِنٌ مُجْمِلٌ**) قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ، فَضَرَبَ صَدْرِي، فَقَالَ: (**يَا أُبَيُّ بْنَ كَعْبٍ! إِنِّي أُقْرِئْتُ الْقُرْآنَ فَقِيلَ لِي: عَلَى حَرْفٍ أَوْ عَلَى حَرْفَيْنِ؟ قَالَ: فَقَالَ الْمَلَكُ الَّذِي مَعِي: عَلَى حَرْفَيْنِ، فَقُلْتُ: عَلَى حَرْفَيْنِ، فَقَالَ: عَلَى حَرْفَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةٍ؟ فَقَالَ الْمَلَكُ الَّذِي مَعِي: عَلَى ثَلاَثَةٍ، فَقُلْتُ: عَلَى ثَلاَثَةٍ، حَتَّى بَلَغَ سَبْعَةَ أَحْرُفٍ، لَيْسَ مِنْهَا إِلاَّ شَافٍ كَافٍ، إِنْ قُلْتَ: غَفُوراً رَحِيماً، أَوْ قُلْتَ: سَمِيعاً عَلِيماً، أَوْ عَلِيماً سَمِيعاً، فَاللهُ كَذَلِكَ، مَا لَمْ تَخْتِمْ آيَةَ عَذَابٍ بِرَحْمَةٍ، أَوْ آيَةَ رَحْمَةٍ بِعَذَابٍ**). [حم٢١١٤٩، ٢١١٥٣]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**له ئوبەی کوڕی کەعبەوە، وتی: من ئایەتێکم خوێندەوە و ئیبن مەسعوود بە جۆرێکی تر خوێندییەوە، هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتم: ئایا ئایەتی ئەوە و ئەوەت**

پیێ نەخوێندم؟ فەرمووی: (با، هەردووکتان "مُحْسِن ومُجْمِل"ن[١])، وتی: پێم وت[٢]، کێشای بە سینەمدا، و فەرمووی: **(ئەی ئوبەی کوڕی کەعب، من قورئانم پێخوێنرا و پێم وترا: لەسەر پیتێك یان لەسەر دوو پیت[٣]؟ فەرمووی: ئەو فریشتەی لەگەڵم بوو وتی: لەسەر دوو پیت، بۆیە وتم: لەسەر دوو پیت، فەرمووی: لەسەر دوو پیت یان سێ پیت؟ ئەو فریشتەی لەگەڵم بوو وتی: لەسەر سێ پیت، بۆیە وتم: لەسەر سێ پیت، تا گەیشتە حەوت پیت، تەنها شیفادەر و بەشکەر(شاف کاف) لەو پیتانەدایە[٤]، گەر بڵێی: "غفورا رحیما"، من دەڵێم: "سمیعا علیما" یان "علیما سمیعا"، خودا بەو جۆرەیە، گەر ئایەتێکی سزا بە رەحمەت کۆتا پێ نەهێنی، یان ئایەتێکی رەحمەت بە سزا کۆتا پێ نەهێنی[٥])**.

٤٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (أُنْزِلَ القُرْآنُ عَلى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، والمِرَاءُ فِي القُـرْآنِ كُفْرٌ - ثلاثـاً - مَـا عَـرَفْتُـمْ مِنْـهُ فَـاعْمَلُـوا بِهِ، وَمَا جَهِلْتُمْ مِنْهُ فَـرُدُّوهُ إِلى عَالِمِهِ).        [حب ٧٤]

* إسناده صحيح على شرطهما.

لە ئەبی هورەیرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(قورئان لەسەر حەوت پیت دابەزیوە، موجادەلە لە قورئاندا بێباوەڕییە-سێ جار- ئەوەی لێی دەزانن کاری پێ بکەن، ئەوەش لێی نازانن بیگێڕنەوە بۆ لای ئەو کەسەی دەیزانێت)**.

---

[١] "محسن و مجمل" واتە: چاك و جوان دەخوێنن-و.

[٢] واتە: بە پێغەمبەری خودام وت: ئایا دەبێت بەو جۆرە بێت-و.

[٣] واتە: لەسەر یەك شێوەزار پێت بخوێنم یان لەسەر دوو شێوەزار-و.

[٤] واتە: جیاوازی ئەو شێوەزارانە دەبێتە هۆی شیفای دەرد و نەخۆشییەکان و بەسن بۆ چارەسەری کێشە و گرفتەکان، گەر بە شێوەزارێك چارەسەری دەردێك یان گرفتێك نەکرێت بە شێوەزارەکەی تر چارەسەر دەکرێت-و.

[٥] واتە: لە کۆتایی ئایەتێکدا خودا بفەرموێ: (وهو شدید المِحال)، خوێنەرەکە بیکات بە (وهو أرحم الراحمین)، یان بە پێچەوانەوە-و.

## ٧- دەروازەی: بەدوای یەکتردا هاتنی سورەتەکان

**٤٤٥-** (خ) عَنْ يُوسُفَ بْنِ مَاهَكٍ قَالَ: إِنِّي عِنْدَ عَائِشَةَ أُمِّ المؤْمِنِينَ ﵂، إِذْ جاءَهَا عِرَاقِيٌّ فَقَالَ: أَيُّ الْكَفَنِ خَيْرٌ؟ قَالَتْ: وَيْحَكَ! وَما يَضُرُّكَ؟ قَالَ: يَا أُمَّ المؤْمِنِينَ! أَرِينِي مُصْحَفَكِ، قَالَتْ: لِمَ؟ قَالَ: لَعَلِّي أُوَلِّفُ الْقُرْآنَ عَلَيْهِ، فَإِنَّهُ يُقْرَأُ غَيْرَ مُؤَلَّفٍ. قالَتْ: وَما يَضُرُّكَ أَيَّهُ قَرَأْتَ قَبْلُ؟ إِنَّمَا نَزَلَ أَوَّلَ ما نَزَلَ مِنْهُ سُورَةٌ مِنَ المفَصَّلِ، فِيهَا ذِكْرُ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، حَتَّى إِذَا ثَابَ النَّاسُ إِلَى الإِسْلاَمِ نَزَلَ الحَلاَلُ وَالحَرَامُ، وَلَوْ نَزَلَ أَوَّلَ شَيْءٍ: لاَ تَشْرَبُوا الخَمْرَ، لَقَالُوا: لاَ نَدَعُ الخَمْرَ أَبَداً، وَلَوْ نَزَلَ: لاَ تَزْنُوا، لَقَالُوا: لاَ نَدَعُ الزِّنَى أَبَداً، لَقَدْ نَزَلَ بِمَكَّةَ عَلَى مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم وَإِنِي لَجَارِيَةٌ أَلْعَبُ: ﴿بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ﴾ [القمر: ٤٦]، وَما نَزَلَتْ سُورَةُ الْبَقَرَةِ وَالنِّسَاءِ؛ إِلاَّ وَأَنَا عِنْدَهُ، قَالَ: فَأَخْرَجَتْ لَهُ المصْحَفَ، فَأَمْلَتْ عَلَيْهِ آيَ السُّوَرِ. [خ٤٩٩٣ (٤٨٧٦)]

(خ) لە یوسفی کوڕی ماهەکەوە، وتی: من لای دایکی باوەڕداران عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت) بووم، عێراقییەك هات بۆ لای، و وتی: چ کفنێك باش و چاکە؟ وتی: هاوار بە حاڵت، بۆ چ زیانێکت پێ دەگەیەنێت[1]؟ وتی: دایکی باوەڕداران، موصحەفەکەی خۆتم پێ نیشان بدە، وتی: بۆچی؟ وتی: بەڵکو قورئانی لەسەر دابنێم[2]، وتی: بۆچی ئەوەی پێشتر خوێندووتە چ زیانێکت پێ دەگەیەنێت؟ ئەوەی یەکەمجار لە قورئان دابەزی سورەتێك لە موفەصەل بوو تیایدا باسی بەهەشت و ئاگر کرابوو، تا خەڵکی گەڕانەوە بۆ ئیسلام حەڵاڵ و حەرام دابەزی، گەر یەکەمین شتێك دابەزی "عارەق مەخۆنەوە" بوایە دەیانوت: هەرگیز وازناهێنین لە عارەق، گەر یەکەمجار "زینا مەکەن" دابەزیبا دەیانوت: هەرگیز وازناهێنین لە زینا، من لە مەککە جاریەیە بووم یاریم دەکرد ئەم ئایەتە بۆ سەر محەمەد دابەزی: ﴿بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ﴾ [القمر: ٤٦]، سورەتی (البقرة والنساء) کاتێك دابەزین من لە لای پێغەمبەر بووم، وتی: موصحەفەکەی بۆ دەرهێنا، ئایەتەکانی سورەتەکانی بەسەردا خوێندەوە[3].

---

[1] واتە: هەر کفنێك بێت چ زیانێك بە تۆ دەگەیەنێت—و.

[2] واتە: بۆئەوەی نوسخەیەکی لەبەر بنووسمەوە—و.

[3] واتە: عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت) سورەت سورەت ئایەتەکانی دەخوێندەوە و ئەویش دەینوسییەوە—و.

## ٨- دەروازەی: خوێنەران لە هاوەڵان

**٤٤٦**- (ق) عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: ذُكِرَ عَبْدُ اللهِ عَنْدَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو فَقَالَ: ذَاكَ رَجُلٌ لاَ أَزَالُ أُحِبُّهُ، بَعْدَ ما سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**اسْتَقْرِئُوا الْقُرْآنَ مِنْ أَرْبَعَةٍ: مِنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ**. فَبَدَأَ بِهِ. **وَسَالِمٍ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ**). قَالَ: لاَ أَدْرِي بَدَأَ بِأُبَيِّ أَوْ بِمُعاذٍ. [خ٣٧٥٨/ م٢٤٦٤]

**(ق) لە مەسرووقەوە وتی: لای عەبدوڵای کوڕی عـەمر باسـی عەبـدوڵا کـرا، وتـی: ئەوە پیاوێکە بەردەوام خۆشم دەوێـت، دوای ئـەوەی بیسـتم پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) دەیفـەرموو: (داوای خوێندنی قورئان لە چـوار کـەس بکـەن: لـە عەبـدوڵای کـوڕی مەسعوود-بەو دەستی پێکرد- و سالم مەولای ئەبی حوزەیفە و ئوبەی کوڕی کەعب، و مەعازی کوڕی جەبەل)، وتی: نازانم ئوبەی یان مەعازی پێشخست.**

**٤٤٧**- (ق) عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ: جَمَعَ الْقُرْآنَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَرْبَعَةٌ، كُلُّهُمْ مِنَ الأَنْصَارِ: أُبَيٌّ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وأَبُو زَيْدٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ.
قُلْتُ لأَنَسٍ: مَن أَبُو زَيْدٍ؟ قَالَ: أَحَدُ عُمُومَتِي. [خ٣٨١٠/ م٢٤٦٥]

**(ق) لە قەتادەوە، لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت): لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) چوار کەس قورئانیان کۆکردبووەوە، هەموویان لە ئەنصار بوون: ئوبـەی، و مـەعازی کوڕی جەبەل، و ئەبو زەید، و زەیدی کوڕی سابیت.**

**وتم بە ئەنەس: ئەبو زەید کێیە؟ وتی: یەکێك لە مامەکانم.**

- وفي رواية للبخاري: قَالَ: ماتَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَلَمْ يَجْمَعِ الْقُرْآنَ غَيْرُ أَرْبَعَةٍ: أَبُو الدَّرْدَاءِ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَأَبُو زَيْدٍ. قَالَ: وَنَحْنُ وَرِثْنَاهُ. [خ٥٠٠٤]

**لە ریوایەتێکی بوخاریدا: وتی: پێغەمبـەر(ﷺ) مـرد و تـەنها چـوار کـەس قورئـانی کۆکردبووەوە: ئەبو دەردا، و مەعازی کوڕی جەبەل، و زەیدی کوڕی سـابیت، و ئـەبو زەید. وتی: ئێمەش بە میراتمان گرت.**

**٤٤٨-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لأُبَيٍّ: (**إِنَّ اللهَ أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ**: ﴿**لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ**﴾[البينة: ١])، قَالَ: وَسَمَّانِي؟ قَالَ: (**نَعَمْ**)، فَبَكَى. [خ٣٨٠٩/ م٧٩٩]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) بە ئوبەی فەرموو: (خودا فەرمانی پێکردم ﴿لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ﴾ [البينة: ١] بەسەر تۆدا بخوێنم)، ئوبەی وتی: خودا ناوی منی هێنا؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ)، ئوبەی گریا.**

## ٩- دەروازەی: دوایین بەسەردا خوێندنەوە

**٤٤٩-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كانَ يَعْرِضُ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم الْقُرْآنَ كُلَّ عامٍ مَرَّةً، فَعَرَضَ عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ فِي الْعَامِ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ، وَكَانَ يَعْتَكِفُ كُلَّ عامٍ عَشْراً، فَاعْتَكَفَ عِشْرِينَ فِي الْعَامِ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ. [خ٤٩٩٨ (٢٠٤٤)]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە وتی: هەموو ساڵێك جارێك قورئانی بەسەر پێغەمبەردا دەخوێندەوە[1]، لەو ساڵەی تیایدا گیانی سپارد دوو جار بەسەریدا خوێندەوە، هەموو ساڵێك دە ڕۆژ ئیعتیکافی دەکرد، لەو ساڵەی گیانی سپارد بیست ڕۆژ ئیعتیکافی کرد.**

**٤٥٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَيُّ الْقِرَاءَتَيْنِ كَانَتْ أَخِيراً، قِرَاءَةُ عَبْدِ اللهِ أَوْ قِرَاءَةُ زَيْدٍ؟ قَالَ: قُلْنَا: قِرَاءَةُ زَيْدٍ، قَالَ: لاَ، إِلاَّ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَعْرِضُ الْقُرْآنَ عَلَى جِبْرَائِيلَ كُلَّ عَامٍ مَرَّةً، فَلَمَّا كَانَ فِي الْعَامِ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ عَرَضَهُ عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ، وَكَانَتْ آخِرَ الْقِرَاءَةِ قِرَاءَةُ عَبْدِ اللهِ. [حم٢٤٩٤]

* صحيح.

---

[1] بکەرەکە لادراوە کە بریتییە لە (جیبریل) وەك لە ڕیوایەتەکانی تردا هاتووە-د.

لـە ئـیبن عەباسـەوە، وتـی: کـام لـە دوو خوێندنەوەکـە دوایـین خوێندنـەوە بـوو؟ خوێندنەوەی عەبدوڵا[1] یان خوێندنەوەی زەیـد؟ وتـی: وتمـان: خوێندنـەوەی زەیـد، وتـی: نـەخێر، پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) هـەموو سـاڵێ جارێـك قورئـانی بـۆ جیبریـل دەخوێنـدەوە، کاتێـك گەیشـتە ئـەو سـاڵەی تیایـدا گیـانی سـپارد دوو جـار بـۆی خوێندەوە، دوایین خوێندنەوە خوێندنەوەی عەبدوڵا بوو.

٤٥١- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ قَالَ: عُرِضَ القرآنُ عَلى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَرَضَاتٍ فَيَقُولُونَ: إنَّ قِراءَتنا هذهِ هِي العَرْضَةُ الأَخِيرةُ. [ك٢٩٠٤]

* قال الذهبي: صحيح.

لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: چەندین جار قورئان بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) خوێندراوەتـەوە، بۆیـە دەڵـێن: ئـەم خوێندنـەوەی ئێمـە دوایین خوێندنەوەیە.

٤٥٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ جِبْرِيلُ يَعْرِضُ القُرْآنَ عَلى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم كُلَّ عَامٍ مَرَّةً فِي رَمَضَانَ، فَلَمَّا كَانَ العَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيْهِ عَرَضَهُ مَرَّتَيْنِ. [مخ٢٥٩٣/٧]

* إسناده حسن.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: جیبریل هەموو سـاڵێك یـەك جـار لـە رەمەزانـدا قورئانی بەسەر پێغەمبەردا دەخوێندەوە، کاتێك گەیشـتە ئـەو سـاڵەی تیایـدا گیـانی سپارد دوو جار بەسەریدا خوێندەوە.

## ١٠- دەروازەی: روودانی نەسخ لە قورئاندا

٤٥٣- (خ) عَنْ عُمَرَ ﷺ قَال: أَقْرَؤُنَا أُبَيٌّ، وَأَقْضَانَا عَلِيٌّ، وَإِنَّا لَنَدَعُ مِنْ قَوْلِ أُبَيٍّ، وَذَاكَ أَنَّ أُبَيّاً يَقُولُ: لاَ أَدَعُ شَيْئاً سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَقَدْ قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا﴾ [البقرة:١٠٦]. [خ٤٤٨١]

---

[1] مەبەست عەبدوڵای کوڕی مەسعوودە، وەك لە ریوایەتەکانی تردا هاتووە-و.

(خ) لە عومەرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: قورئانخوێنترینی ئێمە ئوبەیە، قازیترینی ئێمە عەلییە، ئێمە لە قسەکەی ئوبەی وازدەهێنین، ئەوەش چونکە ئوبەی دەیوت: شتێك لە پێغەمبەری خودام بیستبێت دەستی لێ هەڵناگرم، خودا(سبحانە وتعالی) دەفەرموێت: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا﴾ [البقرة:١٠٦].

**٤٥٤**– (ع) عَن زِرٍّ قَالَ: قال لي أُبَيُّ بنُ كَعبٍ: كأيِّنْ تَقرأُ سُورةَ الأحزابِ؟ أو كأيِّنْ تَعُدُّها؟ قال: قُلْتُ له: ثلاثًا وسَبعينَ آيةً، فقال: قَطُّ؟ لقد رَأيْتُها، وإنَّها لَتُعادِلُ سورةَ البَقَرةِ، ولقد قَرَأْنا فيها: **(الشَّيخُ والشَّيخةُ إذا زَنَيا فارْجُموهُما البتَّةَ نَكالًا منَ اللهِ واللهُ عزيزٌ حكيمٌ)**.
[حم٢١٢٠٧، ٢١٢٠٦]

* إسناده ضعيف.

(ع) لە زیرەوە، وتی: ئوبەی کوڕی کەعب پێی وتم: سورەتی ئەحزاب زۆربیەکەی چەند دەخوێنی؟ یان زۆربیەکەی چەند دەژمێری؟ وتی: پێم وت: حەفتا و سێ ئایەت، ئوبەی وتی: هەرگیز، من بینیم هاوتای سورەتی "البقرة" بوو، لە سورەتی "الأحزاب"دا ئەممان خوێندەوە: **(الشیخ والشیخة إذا زنیا فارجموهما البتة نكالا من الله والله علیم حكیم)**.

## ١١- دەروازەی: مەکی و مەدەنی

**٤٥٥**– عَنْ عَبْدِ اللهِ ـ ابنِ مَسْعُودٍ ـ ﷺ قَالَ: مَا كَانَ ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ أُنْزِلَ بِالمدِيْنَةِ، وَمَا كَانَ ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ فَبِمَكَّةَ. [ك٤٢٩٥]

لە عەبدوڵاوە –ئیبن مەسعوود–(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ئەوەی ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ وە لە مەدینە دابەزیوە، ئەوەی ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ە لە مەککە دابەزیوە.

- وفي رواية قال: قَرَأْنَا المفَصَّلَ حِيْناً وَحِجَجاً بِمَكَّةَ لَيْسَ فِيها ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾. [ك٤٢٩٦]

* قال الذهبي: على شرطهما. وسكت عن الأولى.

لە ریوایەتێکدا وتی: ماوەیەك و بۆ چەندین ساڵ "المفصل"مان لە مەککە دەخوێند ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ی تێدا نەبوو.

## بەشی دووەم

# فەزڵی قورئان و فەزڵی خوێندنەوەی قورئان

## ١- دەروازەی: فەزڵی خوێندنەوەی قورئان

**٤٥٦-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الأُتْرُجَّةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ، وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ. وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ التَّمْرَةِ، لاَ رِيحَ لَهَا، وَطَعْمُهَا حُلْوٌ. وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ، وَطَعْمُهَا مُرٌّ. وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ، لَيْسَ لَهَا رِيحٌ، وَطَعْمُهَا مُرٌّ)**. [خ٥٤٢٧ (٥٠٢٠)/ م٧٩٧]

(ق) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(نموونەی ئەو باوەڕدارەی قورئان دەخوێنێت وەك شەمامە وایە، بۆنی خۆشە و تامی خۆشە، نموونەی ئەو باوەڕدارەی قورئان ناخوێنێت وەك خورما وایە، بۆنی نییە و تامی شیرینە، نموونەی کەسی دووڕوو کە قورئان دەخوێنێت وەك ڕێحانە وایە، بۆنی خۆشە و تامی تاڵە، نموونەی کەسی دووڕووش کە قورئان ناخوێنێك وەك گوژاڵك وایە بۆنی نییە و تامی تاڵە)**.

**٤٥٧-** (ق) عَنْ عبد الله بن عمر رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٍ آتَاهُ اللهُ الْقُرْآنَ، فَهُوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ. وَرَجُلٍ آتَاهُ اللهُ مالاً، فَهُوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ)**. [خ٧٥٢٩ (٥٠٢٥)/ م٨١٥]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(حەسادەت تەنها لە دوو شتدایە: پیاوێك خودا قورئانی پێداوە ساتێك لە شەو و ساتێك لە ڕۆژ دەیخوێنێتەوە، پیاوێکیش خودا ماڵ و سامانی پێداوە، ساتێك لە شەو و ساتێك لە ڕۆژ خەرجی دەکات[1])**.

---

[1] واتە: لە ڕێگەی خودادا لێی دەبەخشێت-و.

**٤٥٨**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ أَنْ يَجِدَ فِيهِ ثَلاَثَ خَلِفَاتٍ عِظَامٍ سِمَانٍ**)؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: (**فَثَلاثُ آيَاتٍ يَقْرَأُ بِهِنَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلاَثِ خَلِفَاتٍ عَظَامٍ سِمَانٍ**). [م٨٠٢]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئایا یەکێك لە ئێوە پێیخۆشە کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ لای خانەوادەکەی سێ حوشتری ئاوسی گەورەی قەڵەوی هەبێت؟**)، وتمان: بەڵێ، فەرمووی: (**یەکێك لە ئێوە سێ ئایەت لە نوێژەکەی بیخوێنێتەوە باشترە بۆ ئەو لە سێ حوشتری ئاوسی گەورەی قەڵەو**).

**٤٥٩**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ: اقْرَأْ وَارْتَقِ، وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا، فَإِنَّ مَنْزِلَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَا**). [د١٤٦٤/ ت٢٩١٤]

* حسن صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**بە هاوەڵی قورئان دەوترێت: بخوێنە و بەرزبەرەوە، بە تەرتیل بخوێنە وەك چۆن لە دنیا دەتخوێند، چونکە مەنزڵی تۆ لای دوایین ئایەتێکە دەیخوێنی**).

**٤٦٠**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ قَرَأَ حَرْفاً مِنْ كِتَابِ اللهِ، فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لاَ أَقُولُ الم حَرْفٌ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ، وَلاَمٌ حَرْفٌ، وَمِيمٌ حَرْفٌ**). [ت٢٩١٠]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەرکەس پیتێك لە کتێبەکەی خودا بخوێنێت بەوە چاکەیەکی بۆ هەیە، چاکەش بە دە بەرانبەرە، ناڵێم "الم" پیتێکە، بەڵکو ئەلیف پیتێکە و لام پیتێکە و میم پیتێکە**).

**٤٦١**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ للهِ أَهْلِينَ مِنَ النَّاسِ**) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، مَنْ هُمْ؟ قَالَ: (**هُمْ أَهْلُ الْقُرْآنِ، أَهْلُ اللهِ وَخَاصَّتُهُ**). [جه٢١٥/ مي٣٣٦٩]

* صحيح.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە خەڵکی بۆ خودا خانەوادە هەیە)، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوانە کێن؟ فەرمووی: (ئەوانە ئەهلی قورئانن، ئەهلی خودا و تایبەتانی ئەون).**

**٤٦٢**- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: اقْرَؤوا الْقُرْآنَ، وَلاَ يَغُرَّنَّكُمْ هَذِهِ الْمَصَاحِفُ الْمُعَلَّقَةُ، فَإِنَّ اللهَ لَنْ يُعَذِّبَ قَلْباً وَعَى الْقُرْآنَ. [مي٣٣٦٢، ٣٣٦٣]

* إسناده صحيح.

**لە ئەبی ئومامەوە، وتی: قورئان بخوێنن، ئـەم موصـحەفە هەڵواسـراوانە فریوتـان نەدەن، چونکە خودا سزای دڵێك نادات قورئان حاڵی بووبێت.**

**٤٦٣**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَا يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ إِذَا رَجَعَ مِنْ سُوقِهِ، أَوْ مِنْ حَاجَتِهِ، فَاتَّكَأَ عَلَى فِرَاشِهِ، أَنْ يَقْرَأَ ثَلاَثَ آيَاتٍ مِنَ الْقُرْآنِ. [مي٣٣٧٩]

* إسناده صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: چی ڕێگری دەکات لە یەکێك لە ئێوە گەر لە بازاڕەکـەی یان لە پێویستییەکەی گەڕایـەوە، لەسـەر جێگەکـەی پـاڵ بداتـەوە و سـێ ئایـەت لـە قورئان بخوێنێت.**

## ٢- دەروازەی: فەزڵی گرنگیدان بە قورئان تا لەبیرنەچێتەوە

**٤٦٤**- (ق) عَنْ عـائِشَةَ، عَـنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّـم قَـالَ: (**مَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَهُـوَ حـافِظٌ لَهُ، مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَمَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ، وَهُوَ يَتَعَاهَدُهُ، وَهُوَ عَلَيْهِ شَدِيدٌ، فَلَهُ أَجْرَانِ**). [خ٤٩٣٧/ م٧٩٨]

(ق) لە عائیشەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(نموونەی ئەو كەسەی قورئان دەخوێنێت و لەبەری دەكات و لەبیری ناچێتەوە لەگەڵ "السفرة الكرام البررة-پێغەمبەران(یان فریشتەكان)"دایە، نموونەی ئەو كەسەش قورئان دەخوێنێ و گرنگی پێدەدات تاكو لەبیری نەچێتەوە و ئەو كارەش لەسەری گرانە، دوو پاداشتی بۆ هەیە).**

**٤٦٥-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمر رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ صَاحِبِ الإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ، إِنْ عاهَدَ عَلَيْهَا أَمْسَكَهَا، وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ). [خ٥٠٣١/ م٧٨٩]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(نموونەی هاوەڵی قورئان وەك نموونەی خاوەن حوشترێكی بەستراوە وایە، گەر گرنگی پێ بدات و ئاگای لێی بێت دەیگرێت، گەر بەرەڵای بكات دەڕوات).**

**٤٦٦-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (بِئْسَ ما لأَحَدِهِمْ أَنْ يَقُولَ: نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ، بَلْ نُسِّيَ، وَاسْتَذْكِرُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ أَشَدُّ تَفَصِّياً مِنْ صُدُورِ الرِّجالِ مِنَ النَّعَمِ). [خ٥٠٣٢/ م٧٩٠]

(ق) لە عەبدوڵای كوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(خراپترین كاری یەكێك لە ئێوە ئەوەیە بڵێ: ئایەتی ئەوە و ئەوەم لەبیركرد، بەڵكو لەبیریبرایەوە، هەوڵی بیرهێنانەوەی قورئان بدەن، چونكە لە سینەی پیاواندا لە حوشتر زۆرتر و زیاتر تووشی هەڵهاتن[1] دێت).**

**٤٦٧-** عن السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ: أَنَّ شُرَيْحاً الْحَضْرَمِيَّ ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ يَتَوَسَّدُ الْقُرْآنَ). [ن١٧٨٢]

* صحيح الإسناد.

---

[1] واتە: ڕۆیشتن و لەبیرچوونەوە-و.

لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە: ناوی شوریحی حەزرەمی لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) برا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەو لەسەر قورئان سەرنانێتەوە[1])**.

## ٣- دەروازەی: باشترینی ئێوە ئەو کەسەیە قورئان فێردەبێت و خەڵکیش فێری قورئان دەکات

**٤٦٨-** (خ) عَنْ عُثْمَانَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ**). [خ٥٠٢٧]

(خ) لە عوسمانەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(باشترینی ئێوە ئەو کەسەیە قورئان فێربووە و خەڵکیش فێری قورئان دەکات)**.

**٤٦٩-** (خ) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: جَمَعْتُ الْمُحْكَمَ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقُلْتُ لَهُ: وَمَا الْمُحْكَمُ؟ قَالَ: المُفَصَّلُ. [خ٥٠٣٦ (٥٠٣٥)]

(خ) لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) "المحكم"م کۆکردەوە، پێم وت: "المحكم" چییە؟ وتی: "المفصل"[2].

---

[1] لەسەر ئەم فەرموودەیە وتراوە: قسەکە مەدح و زەم هەڵدەگرێت، مەدح: ماناکەی شەو ناخەوێ و قورئان دەخوێنێت، زەم: ماناکەی شەو لەسەر قورئان ناخەوێت، بەڵام لە ئەخلاقی پێغەمبەر(ﷺ) دوورە زەمی هاوەڵێکی خۆی بکات و ئەو ئامادە نەبێت، بۆیە تەنها مەدح هەڵدەگرێت-و.

[2] لە سورەتی (الحجرات)ەوە بۆ کۆتایی قورئانی پیرۆز.

## ٤- دەروازەی: درێژکـردنـەوە(الـمد) و ئاوازپێدان(الترجيع) بە خوێندنەوەی قورئان

**٤٧٠-** (ق) عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُغَفَّلِ المزَنِيِّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ الْفَتْحِ عَلَى نَاقَةٍ لَهُ، يَقْرَأُ سُورَةَ الْفَتْحِ ـ أَوْ مِنْ سُورَةِ الْفَتْحِ ـ قَالَ: فَرَجَّعَ فِيهَا.

قَالَ: ثُمَّ قَرَأَ مُعَاوِيَةُ يَحْكِي قِرَاءَةَ ابْنِ مُغَفَّلٍ، وقَالَ: لَوْلاَ أَنْ يَجْتَمِعَ النَّاسُ عَلَيْكُمْ لَرَجَّعْتُ كَمَا رَجَّعَ ابْنُ مُغَفَّلٍ، يَحْكِي النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم.

فَقُلْتُ لِمُعَاوِيَةَ: كَيْفَ كانَ تَرْجِيعُهُ؟ قَالَ: آ آ آ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. [خ٧٥٤٠ (٤٢٨١)/ م٧٩٤]

**(ق) لە شوعبەوە، لە موعاویەی کوڕی قورەوە، لە عەبدوڵای کوڕی موغەفەلی موزەنییەوە، وتی: ڕۆژی فەتح پێغەمبەری خودام(ﷺ) لەسەر حوشترێکی خۆی بینی، سورەتی "الفتح"ی دەخوێند-یان لە سورەتی "الفتح"ی دەخوێند- وتی: بە گەرووی ئاوازی پێ دەدا.**

**وتی: پاشان موعاویە خوێندنەوەکەی ئیبن موغەفەلی وتەوە، هەروەها وتی: گەر خەڵکی لەسەرتان کۆنەبوونایەتەوە چۆن ئیبن موغەفەل ئاوازی پێ دەدا و ئەوەی پێغەمبەری(ﷺ) وتەوە، منیش بەو جۆرە بۆ ئێوە ئاوازم پێ دەدا.**

**وتم بە موعاویە: ئاوازپێدانەکەی چۆن بوو؟ وتی: (آ آ آ) سێ جار.**

- وفي رواية للبخاري: وَهُوَ يَقْرَأُ سُورَةَ الْفَتْحِ ـ أَوْ مِنْ سُورَةِ الْفَتْحِ ـ قِرَاءَةً لَيِّنَةً، يَقْرَأُ وَهُوَ يُرَجِّعُ. [خ٥٠٤٧]

**لە ڕیوایەتێکی بوخاریدا: ئەو سورەتی "الفتح"ی دەخوێند-یان لە سورەتی "الفتح"ی دەخوێند- بە خوێندنەوەیەکی نەرم، دەیخوێند و ئەو ئاوازی پێ دەدا.**

**٤٧١-** (خ) عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سُئِلَ أَنَسٌ: كَيْفَ كانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَقَالَ: كانَتْ مَدّاً، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ①﴾، يَمُدُّ بِبِسْمِ اللهِ، وَيَمُدُّ بِالرَّحْمنِ، وَيَمُدُّ بِالرَّحِيمِ. [خ٥٠٤٦ (٥٠٤٥)]

(خ) لە قەتادەوە، وتی: پرسیار لە ئەنەس کرا: خوێندنەوەی پێغەمبەر(ﷺ) چۆن بوو؟ وتی: درێژکردنەوە بوو، پاشان ئەنەس ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ①﴾ی خوێندەوە، "بسم الله"ی درێژ دەکردەوە، و "الرحمن"ی درێژ دەکردەوە، و "الرحيم"ی درێژ دەکردەوە.

## ٥- دەروازەی: تەرتیلی قورئان و دوورکەوتنەوە لە پەلەپەل و خوێندن بە خێرایی

**٤٧٢**- (ق) عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ مَسْعُودٍ فَقَالَ: قَرَأْتُ المفَصَّلَ اللَّيْلَةَ فِي رَكْعَةٍ، فَقَالَ: هَذًّا كَهَذِّ الشِّعْرِ؟! لَقَدْ عَرَفْتُ النَّظَائِرَ الَّتِي كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَقْرِنُ بَيْنَهُنَّ، فَذَكَرَ عِشْرِينَ سُورَةً مِنَ المفَصَّلِ، سُورَتَيْنِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ.          [خ٧٧٥/ م٨٢٢]

(ق) لە ئەبی وائیلەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای ئیبن مەسعوود وتی: ئەم شەو "المفصل"م لە یەك ركات نوێژدا خوێند، وتی: پەلە و خێرا وەك پەلە كردن و خێرایی خوێندنی هۆنراوە؟! سورەتە هاوشێوەكانم زانی كە پێغەمبەر(ﷺ) هاوملی و هاوتایی دەخستە نێوانیانەوە، بیست سورەتی لە "المفصل"[1] باس كرد، دوو سورەت لە هەر ركاتێكدا.

**٤٧٣**- عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم. قَالَ أَبُو عَامِرٍ: قَالَ نَافِعٌ: أُرَاهَا حَفْصَةَ. أَنَّهَا سُئِلَتْ عَنْ قِرَاءَةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَتْ: إِنَّكُمْ لاَ تَسْتَطِيعُونَهَا، قَالَ: فَقِيلَ لَهَا: أَخْبِرِينَا بِهَا، قَالَ: فَقَرَأَتْ قِرَاءَةً تَرَسَّلَتْ فِيهَا. قَالَ أَبُو عَامِرٍ: قَالَ نَافِعٌ: فَحَكَى لَنَا ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ- ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ②﴾، ثُمَّ قَطَّعَ ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ③﴾، ثُمَّ قَطَّعَ ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ④﴾.          [حم٢٦٤٧٠]

* رجاله ثقات رجال الشيخين.

---

[1] لە سورەتی (الحجرات)ەوە بۆ كۆتایی قورئانی پیرۆز.

لە ئیبن ئەبی مولەیکەوە، لە یەکێك لە هاوسەرەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ)-ئەبو عامیر وتی: نافیع وتی: پێموایە حەفصەیە- پرسیاری لێکرا دەربارەی خوێندنی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، وتی: ئێوە ناتوانن وەك خوێندنەوەی ئەو ئەنجام بدەن، وتی: پێی وترا: دەربارەی خوێندنەوەی ئەو هەواڵمان پێ بدە، وتی: خوێندنەوەیەکی خوێندن هێواشی(خاوی) تێدا بەکارهێنا- ئەبو عامیر وتی: نافیع وتی: ئیبن و ئەبی مولەیکە ئەو خوێندنەوەی بۆ وتین- ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ۝﴾، پاشان بڕی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ۝﴾، پاشان بڕی ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ۝﴾ [الفاتحة]، پاشان بڕی.

## ٦- دەروازەی: جوانکردن و خۆشکردنی دەنگ بە خوێندنەوە

**٤٧٤-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (ما أَذِنَ اللهُ لِشَيْءٍ ما أَذِنَ لِنَبِيٍّ حَسَنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ يَجْهَرُ بِهِ). [خ٧٥٤٤ (٥٠٢٣)/ م٧٩٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بووە دەیفەرموو: **(خودا گوێی بۆ شتێك نەگرتووە وەك گوێگرتنی بۆ پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش بە قورئان[1]، دەنگی پێ بەرزدەکاتەوە).**

- وفي رواية لهما: (مَا أَذِنَ اللهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ). [خ٧٤٨٢]

لە ریوایەتێکی هەردووکیاندا: **(خودا گوێی بۆ شتێك نەگرتووە وەك گوێگرتنی بۆ پێغەمبەرێك دەنگی خۆش بە قورئان دەدات).**

- وفي رواية للبخاري قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ). [خ٧٥٢٧]

لە ریوایەتێکی بوخاریدا: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەو کەسەی ئاوازی خۆش بە قورئان نادات لە ئێمە نییە).**

---

[1] قورئان: یان خوێندنەوە، قورئان بەو مانایەی لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ﴾[القيامة: ١٧]، کە مانای "خوێندنەوە"ی هەیە-و.

**٤٧٥**– (ق) عَنْ أَبِي مُوسى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ لَهُ: (**يَا أَبَا مُوسى! لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْماراً مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ** ).          [خ٥٠٤٨/ م٧٩٣]

(ق) لە ئەبی موساوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، پێی فەرموو: **(ئەی ئەبا موسا، میزمارێك لە میزمارەکانی ئالی داود بە تۆ دراوە[1])**.

- وزاد عند مسلم في أوله: (لَوْ رَأَيْتَنِي وَأَنَا أَسْتَمِعُ لِقِرَاءَتِكَ الْبَارِحَةَ).

لای موسلیم لە سەرەتاکەیەوە ئەمە زیاد کراوە: **(گەر منت ببینیبا دوێنێ چۆن گوێم لە خوێندنەوەکەت گرتبوو!)**.

**٤٧٦**– عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ**).          [د١٤٦٨/ ن١٠١٥/ جه١٣٤٢/ مي٣٥٤٣]

* صحيح.

لە بەرای کوڕی عازیبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بە دەنگی خۆشتان قورئان جوان بکەن)**.

**٤٧٧**– عَنْ عَائِشَةَ . زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم . قَالَتْ: أَبْطَأْتُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَيْلَةً بَعْدَ الْعِشَاءِ، ثُمَّ جِئْتُ، فَقَالَ: (**أَيْنَ كُنْتِ**) ؟ قُلْتُ: كُنْتُ أَسْتَمِعُ قِرَاءَةَ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِكَ، لَمْ أَسْمَعْ مِثْلَ قِرَاءَتِهِ وَصَوْتِهِ مِنْ أَحَدٍ. قَالَتْ: فَقَامَ وَقُمْتُ مَعَهُ حَتَّى اسْتَمَعَ لَهُ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ: (**هَذَا سَالِمٌ، مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي أُمَّتِي مِثْلَ هَذَا**).          [جه ١٣٣٨]

* صحيح.

---

[1] دەنگی خۆش و شیرینی ئاوازی شوبهاندووە بە میزمار(ئامێرێکی مۆسیقییە)، داود ئەو پێغەمبەرە بوو لە دەنگی خۆشی خوێندنەوەدا لە لوتکەدا بوو، نەوەویش دەڵێت: لێرەدا مەبەست بە "میزمار" دەنگی خۆشە، ئەسڵی وشەی "الزمر" بریتییە لە گۆرانی–د.

لە عائیشەوە –هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)– وتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) شەوێك دوای عیشا دواكەوتم[1]، پاشان هاتمەوە، فەرمووی: **(لە كوێ بوویت)**، وتم: گوێم لە خوێندنەوەی یەكێك لە هاوەڵانت گرتبوو، نموونەی ئەو خوێندنەوە و دەنگەم لە كەس نەبیستووە، وتی: پێغەمبەر هەستا و منیش لەگەڵی هەستام تا گوێی بۆ گرت، پاشان لای بە لامدا كردەوە و فەرمووی: **(ئەمە سالمە، مەولای ئەبی حوزەیفە، حەمد بۆ ئەو خودایەی لە ئومەتەكەم نموونەی وەك ئەمەی داناوە)**.

**٤٧٨**– عَنْ مُحَمَّدٍ . ابن سيرين . قَالَ: كَانُوا يَرَوْنَ هَذِهِ الْأَلْحَانَ فِي الْقُرْآنِ مُحْدَثَةً. [مي٣٥٤٦]

* إسناده جيد.

لە محەمەدەوە –ئیبن سیرین– وتی: ئەوان ئەم ئاوازانەیان لە قورئان بە داهێنراو[2] دەزانی.

**٤٧٩**– عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ أَبا مُوسَى رضي الله عنه كَانَ يَقْرَأُ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَمَشَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَسْمَعُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ قِيْلَ لَهُ، قَالَ: لَوْ عَلِمْتُ لَحَبَّرْتُ لَكَ تَحْبِيراً، وَلَشَوَّقْتُ لَكَ تَشْوِيقاً. [مخ٥/١٦٥٠]

* إسناده صحيح.

لە ئەنەسەوە: شەوێك ئەبو موسا قورئانی دەخوێند، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشت بۆ گوێ لێگرتنی، كاتێك ڕۆژی لێبوویەوە پێیوترا، ئەبو موسا وتی: گەر بمزانیبایە بە خۆشترین دەنگ دەمڕازاندەوە و بە جوانترین شێوە تامەزرۆم دەكردی.

**٤٨٠**- عَنْ أَنسِ بْنِ مَالكٍ، عَنْ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ حِلْيَةً، وَحِلْيَةُ الْقُرْآنِ الصَّوْتُ الحَسَنُ). [مخ٧/٢٤٩٦]

* إسناده حسن.

---

[1] لە مەدینە شەوان ئافرەتان بۆ پێویستی خۆیان دەچوونە دەرەوە، دیارە خاتوو عائیشە هەندێ دواكەوتووە –و.

[2] مەبەست بیدعەیە.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(بۆ هەموو شت خشڵ[1] هەیە، خشڵی قورئان دەنگی خۆشە).**

**٤٨١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: أَيُّ النَّاسِ أَحْسَنُ قِرَاءَةً؟ قَالَ: (الَّذِي إِذَا سَمِعْتَهُ يَقْرَأُ رَأَيْتَ أَنَّهُ يَخْشَى اللهَ عزّ وجل). [مخ١١/٢٢٣]

* رجاله ثقات

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا: چ جۆرێك لە خەڵك خوێندنەوەی قورئانیان باشترینە؟ فەرمووی: **(ئەو کەسەی گەر گوێت لێگرت دەیخوێند ببینی ئەو لە خودا(عز وجل) دەترسێت).**

## ٧- دەروازەی: (هەتا دڵتان لەسەری تەبایە قورئان بخوێنن)

**٤٨٢-** (ق) عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (اقْرَؤوا الْقُرْآنَ ما ائْتَلَفَتْ قُلُوبُكُمْ، فَإِذَا اخْتَلَفْتُمْ فَقُومُوا عَنْهُ ). [خ٥٠٦٠/ م٢٦٦٧]

(ق) لە جوندوبی کوڕی عەبدوڵاوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەتا دڵتان لەسەری تەبایە قورئان بخوێنن، گەر جیاوازی کەوتە نێوانتانەوە لەسەری هەستن[2]).**

**٤٨٣-** (خ) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً قَرَأَ آيَةً، وَسَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقْرَأُ خِلاَفَهَا، فَجِئْتُ بِهِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَأَخْبَرْتُهُ، فَعَرَفْتُ فِي وَجْهِهِ الْكَرَاهِيَةَ، وقَالَ: (كِلاَكُمَا مُحْسِنٌ، وَلاَ تَخْتَلِفُوا، فَإِنَّ مَنْ كانَ قَبْلَكُمُ اخْتَلَفُوا؛ فَهَلَكُوا). [خ٣٤٧٦ (٢٤١٠)]

---

[1] خشڵ: بریتییە لەو شتانەی مرۆڤ خۆی پێ دەڕازێنێتەوە لە زێڕ و زیو و لە شتانی تری دەدا بۆ جوان کردن و ڕازاندنەوە-و.

[2] بۆ ئەوەی جیاوازی سەرنەکێشێت بۆ شەڕ لە نێوانتان.

(خ) لە ئیبن مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: گوێم لە پیاوێك بوو ئایەتێکی خوێند، گوێم لە پێغەمبەر بوو پێچەوانەی ئەوە دەیخوێند، پیاوەکەم هێنا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵم پێدا، لە روخساری پێغەمبەردا پێناخۆشیم هەست پێکرد، و فەرمووی: **(هەردووکتان کار چاکن، ناکۆك مەبن، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە ناکۆك بوون، بۆیە تیاچوون).**

## ٨- دەروازەی: گریان لە خوێندنی قورئاندا

**٤٨٤-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُود قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(اقْرَأْ عَلَيَّ)**، قَالَ: قُلْتُ: أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قَالَ: **(إِنِّي أَشْتَهِي أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي)**، قَالَ: فَقَرَأْتُ النِّسَاءَ حَتَّى إِذَا بَلَغْتُ: **﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا﴾** [النساء: ٤١]، قَالَ لِي: **(كُفَّ، أَوْ أَمْسِكْ)**، فَرَأَيْتُ عَيْنَيْهِ تَذْرِفَانِ. [خ٥٠٥٥ (٤٥٨٢)/ م٨٠٠]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بەسەرمدا بخوێنە)**، وتی: وتم: قورئان بەسەر تۆدا بخوێنم و بۆ سەر تۆ دابەزێنراوە؟! فەرمووی: **(من حەزدەکەم لە غەیری خۆمەوە ببیستم)**، وتی "النساء"م خوێند تا گەیشتمە: **﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا﴾** [النساء: ٤١]، پێی فەرمووم: **(بەسە، یان بوەستە)**، بینیم دوو چاوی فرمێسك دەڕێژن.

## ٩- دەروازەی: چەند قورئان بخوێنرێت؟

**٤٨٥-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(اقْرَإِ الْقُرْآنَ فِي شَهْرٍ)**، قُلْتُ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، حَتَّى قَالَ: **(فَاقْرَأْهُ فِي سَبْعٍ، وَلاَ تَزِدْ عَلَى ذلِكَ)**. [خ٥٠٥٤ (١١٣١)/ م١١٥٩/١٨٤]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە مانگێکدا قورئان بخوێنە**[1]**)**، وتم: من هێزی زۆرترم هەیە، تا فەرمووی: **(کەوابوو لە حەوت ڕۆژدا بیخوێنە، و لەسەر ئەوە زیادی مەکە)**.

- وفي روايةٍ لهما قَالَ: (وَلاَ تَزِدْ عَلَى ذَلِكَ، فَإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَلِزَوْرِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَلِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقّاً). [خ١٩٧٥]

لە ریوایەتێکی هەردووکیاندا: فەرمووی: **(لەسەر ئەوە زیادی مەکە، هاوسەرەکەت مافی لەسەرتە، سەردانکەرانت مافیان لەسەرتە، و جەستەت مافی لەسەرتە)**.

**٤٨٦**– (م) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ، أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ، فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الظُّهْرِ، كُتِبَ لَهُ كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ). [م٧٤٧]

(م) لە عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە خوێندنی حیزبەکەی، یان لە خوێندنی شتێك لە حیزبەکەی، خەوی لێکەوت و لە نێوان نوێژی بەیانی و نوێژی نیوەڕۆدا خوێندی بۆی دەنوسرێت وەك ئەوەی لە شەودا خوێندبێتی**[2]**)**.

## ١٠- دەروازەی: کەمترینێك کە لە قورئان دەخوێنرێت

[انظر: **٥٢٦**][3].

---

[1] واتە لە مانگێکدا خەتمێکی قورئان بکە–و.

[2] زانایان بۆ قەزا کردنەوەی ئەوراد و شەونوێژ و خوێندنی قورئان ئاماژە بەم ئایەتە دەکەن: ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا﴾[الفرقان: ٦٢].

[3] کەمترین خوێندنەوە لە شەوێکدا دوو ئایەتە، لە درێژیدا وەك ئایەتەکانی سورەتی (البقرة) وابن وەك لە فەرموودەی (٥٢٦)دا هاتووە–و.

## ١١- دەروازەی: خودا بەم کتێبە خەڵکانێك بەرزدەکاتەوە

**٤٨٧-** (م) عَنْ عَامِرِ بْنِ وَاثِلَةَ: أَنَّ نَافِعَ بْنَ عَبْدِ الحَارِثِ لَقِيَ عُمَرَ بِعُسْفَانَ، وَكَانَ عُمَرُ يَسْتَعْمِلُهُ عَلَى مَكَّةَ، فَقَالَ: مَنِ اسْتَعْمَلْتَ عَلَى أَهْلِ الْوَادِي؟ فَقَالَ: ابْنَ أَبْزَى، قَالَ: وَمَنِ ابْنُ أَبْزَى؟ قَالَ: مَوْلًى مِنْ مَوَالِينَا، قَالَ: فَاسْتَخْلَفْتَ عَلَيْهِمْ مَوْلًى؟ قَالَ: إِنَّهُ قَارِئٌ لِكِتَابِ اللهِ عزّ وجل، وَإِنَّهُ عَالِمٌ بِالْفَرَائِضِ. قَالَ عُمَرُ: أَمَا إِنَّ نَبِيَّكُمْ صلّى الله عليه وسلّم قَدْ قَالَ: (**إِنَّ اللهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَاماً وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ**). [م٨١٧]

**(م) لە عامیری کوڕی وائیلەوە، نافیعی کوڕی عەبدولحاریس لە عوسفان بە عومەر گەیشت، عومەر لەسەر مەککە دایمەزراندبوو، عومەر وتی: کێت لەسەر ئەهلی وادی بەکارهێناوە؟ وتی: ئیبن ئەبزا، وتی: ئیبن ئەبزا کێیە؟ وتی: مەولایەکە لە مەولاکانمان، عومەر وتی: مەولات لەسەر ئەوان کردووە بە جێنشین؟ وتی: ئەو خوێنەری کتێبەکەی خودایە(عز وجل) و زانایە بە فەرزەکان، عومەر وتی: پێغەمبەرەکەتان فەرموویەتی: (خودا بەم کتێبە خەڵکانێك بەرزدەکاتەوە و خەڵکانێك دادەبەزێنێت).**

## ١٢- دەروازەی: سەفەر ناکرێت بە قورئان بۆ زەوی دوژمن

**٤٨٨-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ العَدُوِّ. [خ٢٩٩٠/ م١٨٦٩]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد سەفەر بە قورئان بکرێت بۆ زەوی دوژمن.**

- وفي رواية لمسلم: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تُسَافِرُوا بِالْقُرْآنِ، فَإِنِّي لاَ آمَنُ أَنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ**).

**لە ریوایەتێکی موسلیمدا: وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (سەفەر بە قورئان مەکەن، چونکە من دڵنیام نیم لەوەی دوژمن دەستی پێ نەگەیەنن)[(١)].**

## ١٣- دەروازەی: فەزڵی قورئان

**٤٨٩-** عَنِ الْحَارِثِ الأَعْوَرِ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ أُمَّتَكَ سَتُفْتَتَنُ مِنْ بَعْدِكَ؟ قَالَ: فَسَأَلَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَوْ سُئِلَ: مَا الْمَخْرَجُ مِنْهَا؟ قَالَ: (الْكِتَابُ الْعَزِيزُ، الَّذِي ﴿لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾[فصلت: ٤٢]، مَنِ ابْتَغَى الْهُدَى فِي غَيْرِهِ أَضَلَّهُ اللهُ، وَمَنْ وَلِيَ هَذَا الأَمْرَ مِنْ جَبَّارٍ فَحَكَمَ بِغَيْرِهِ قَصَمَهُ اللهُ، هُوَ الذِّكْرُ الْحَكِيمُ، وَالنُّورُ الْمُبِينُ، وَالصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ، فِيهِ خَبَرُ مَنْ قَبْلَكُمْ، وَنَبَأُ مَا بَعْدَكُمْ، وَحُكْمُ مَا بَيْنَكُمْ، وَهُوَ الْفَصْلُ لَيْسَ بِالْهَزْلِ، وَهُوَ الَّذِي سَمِعَتْهُ الْجِنُّ فَلَمْ تَتَنَاهَ أَنْ قَالُوا: ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ۝ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ﴾ [الجن: ١- ٢]، وَلاَ يَخْلَقُ عَنْ كَثْرَةِ الرَّدِّ، وَلاَ تَنْقَضِي عِبَرُهُ، وَلاَ تَفْنَى عَجَائِبُهُ).

ثُمَّ قَالَ عَلِيٌّ لِلْحَارِثِ: خُذْهَا إِلَيْكَ يَا أَعْوَرُ.          [مي٣٣٧٥]

* إسناده حسن.

**لە حاریسی کوڕی ئەعوەرەوە، لە عەلییەوە، وتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئایا لەدوای تۆ ئومەتەکەت تووشی فیتنە دەبن؟ وتی: پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) یان پرسیاری لێکرا: رێگە چارە چییە بۆ ئەو فیتنەیە؟ فەرمووی: (کتێبی عەزیز کە: ﴿لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾[فصلت: ٤٢]، هەر کەس لە غەیری قورئان هیدایەت داوا بکات**

---

(١) زانایان دەڵێن نەهییەکە بۆ ئەوەیە نەبادا دوژمنان رێز و حورمەتی قورئان رانەگرن، دەشڵێن: نەهییەکە تایبەت بووە بە هاوەڵان چونکە قورئان لە سینەی هەموویان کۆکراوەتەوە، نەبادا ئەو هاوەڵە بڕوات بۆ زەوی دوژمن و تیابچێت و بەشێك لە قورئان بزر ببێت، ئەم بۆچوونەیان دوورە، چونکە خودا بەڵێنی پارێزگاری قورئانی داوە-و.

**خودا گومڕای دەکات، هەر کەس ئەم ئەمرە لە ملهوڕێکەوە بگرێتە دەست و بە غەیری قورئان حوکم بکات خودا پشتی دەشکێنێت، قورئان زیکری حەکیمە، و روناکی رۆشنکەرەوەیە، و شا رێگەی راست و دروستە، سەربوردەی ئەوانەی پێش ئێوەی تێدایە، و هەواڵی دوای ئێوەی تێدایە، هەروەها حوکمی نێوانتانی تێدایە، قورئان جیاکەرەوەیە و گاڵتە و یاری نییە، قورئان ئەوەیە هەرکە جنۆکە بیستی وتیان: ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ۝ يَهْدِيٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ﴾ [الجن: ١ - ٢]، لە زۆری دووبارەکردنەوە ناڕزێت، پەند و ئامۆژگاری تەواو نابێت، و سەرسوڕهێنەکانی کۆتاییان پێ نایەت).**

**پاشان عەلی بە حاریسی وت: بیگرە بۆ خۆت، ئەی ئەعوەر.**

**٤٩٠**- عَنْ كَعْبِ الأَحْبَارِ قَالَ: عَلَيْكُمْ بِالْقُرْآنِ، فَإِنَّهُ فَهْمُ الْعَقْلِ، وَنُورُ الْحِكْمَةِ، وَيَنَابِيعُ الْعِلْمِ، وَأَحْدَثُ الْكُتُبِ بِالرَّحْمَنِ عَهْداً. وَقَالَ: فِي التَّوْرَاةِ: يَا مُحَمَّدُ، إِنِّي مُنَزِّلٌ عَلَيْكَ تَوْرَاةً حَدِيثَةً، تَفْتَحُ فِيهَا أَعْيُناً عُمْياً، وَآذَاناً صُمّاً، وَقُلُوباً غُلْفاً. [مي ٣٣٧٠]

* إسناده حسن.

**لە کەعبی ئەحبارەوە، وتی: دەست بە قورئانەوە بگرن، چونکە قورئان تێگەیشتنی ئەقڵ و نوری حیکمەت، و کانیاوی زانستە، نوێترین کتێبێکە لە خودای رەحمانەوە، هەروەها وتی: لە تەوراتدا[1]: ئەی محەمەد، من تەوراتێکی نوێ بەسەر تۆدا دادەبەزێنم، چاوی کوێر، و گوێی کەڕ، و دڵی داخراوی پێ دەکەیەوە.**

**٤٩١**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ مسعودٍ قَالَ: إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ مَأْدُبَةُ اللهِ، فَخُذُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، فَإِنِّي لاَ أَعْلَمُ شَيْئاً أَصْفَرَ مِنْ خَيْرٍ مِنْ بَيْتٍ لَيْسَ فِيهِ مِنْ كِتَابِ اللهِ شَيْءٌ. وَإِنَّ الْقَلْبَ الَّذِي لَيْسَ فِيهِ مِنْ كِتَابِ اللهِ شَيْءٌ خَرِبٌ، كَخَرَابِ الْبَيْتِ الَّذِي لاَ سَاكِنَ لَهُ. [مي ٣٣٥٠]

* رجاله ثقات.

---

[1] **واتە: لە تەوراتدا نوسراوە—و.**

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: ئەم قورئانە سفرەی خودایە، چەند دەتوانن لێی وەربگرن، من شتێك نابینم لە خێر خاڵی بێت وەك ماڵێك شتێك لە کتێبەکەی خودای تێدا نەبێت، ئەو دڵەی شتێك لە کتێبەکەی خودای تێدا نەبێت دڵێکی وێرانەیە، وەك وێرانەی ئەو ماڵەی نیشتەجێبووی تێدا نەماوە.

**٤٩٢**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ قَرَأَ القُرْآنَ فَقَدِ اسْتَدْرَجَ النُّبوَّةَ بَيْنَ جَنْبَيْهِ، غَيْرَ أَنَّهُ لا يُوحى إِلَيْهِ، لا يَنْبَغِي لِصَاحِبِ القُرْآنِ أَنْ يَجِدَ مَعْ مَنْ وَجَدَ، وَلا يَجْهَلَ مَعْ مَنْ جَهِلَ، وَفِي جَوْفِهِ كَلامُ اللهِ تَعَالى). [ك٢٠٢٨]

* قال الذهبي: صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس قورئان بخوێنێت پێغەمبەرایەتی لە نێوان دوو لایدا[1] هەڵگرتووە، تەنها ئەوەندەیە وەحی بۆ ناکرێت، نابێت هاوەڵی قورئان لەگەڵ ئەو کەسەی تووڕەیی و کینەی هەیە تووڕەیی و کینەی هەبێت، نابێت لەگەڵ ئەو کەسەی نەزانی و نەفامی ئەنجام دەدات نەفامی و نەزانی ئەنجام بدات، لە کاتێکدا ئەو لە ناوەوەیدا کەلامی خودا(سبحانه وتعالى) هەیە).**

## ١٤- دەروازەی: قورئان کەلامی خودایە

**٤٩٣**- عَنْ عَمْرِو بنِ دِيْنَارٍ قَالَ،: أَدْرَكْتُ النَّاسَ مُنْذُ سَبْعِينَ سَنَةً يَقُولُونَ: اللهُ الخَالِقُ وَمَا سِواهُ مَخْلُوقٌ، وَالقُرْآنُ كَلاَمُ اللهِ عزّ وجل. [هق١٠/٤٣]

لە عەمری کوڕی دینارەوە، وتی: بە خەڵکانێك گەیشتم ماوەی حەفتا ساڵ دەڵێن: خودا دروستکەرە و جگە لە خودا دروستکراوە و قورئان کەلامی خودایە(عز وجل).

---

[1] واتە: لە سینەیدا-و.

**٤٩٤**– عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**فَضْلُ كَلَامِ اللهِ عَلَى كَلَامِ خَلْقِهِ، كَفَضْلِ اللهِ عَلَى خَلْقِهِ**). [مي ٣٤٠٠]

* مرسل، إسناده حسن.

**لە شەهری کوڕی حەوشەبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (فەزڵی کەلامی خودا لەسەر کەلامی دروستکراوان وەك فەزڵی خودایە لەسەر دروستکراوانی).**

## ١٥- دەروازەی: فەزڵی گوێگرتن لە قورئان

**٤٩٥**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَنِ استمَعَ إلى آيةٍ من كتابِ اللهِ، كانتْ له نُورًا. [مي ٣٤١٠]

* إسناده ضعيف.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: هەر کەس گوێی گرتبێت بۆ ئایەتێك لە کتێبەکەی خودا بۆ ئەو بووە بە نوور.**

**٤٩٦**– عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ قَالَ: إِنَّ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ لَهُ أَجْرٌ، وَإِنَّ الَّذِي يَسْتَمِعُ لَهُ أَجْرَانِ. [مي٣٤٠٩]

[وانظر: **٤٧٥ ـ ٤٧٩، ٤٨٤**].

**لە خالیدی کوڕی مەعدانەوە، وتی: ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێت پاداشتێکی بۆ هەیە، ئەو کەسەی گوێی بۆ دەگرێت دوو پاداشتی بۆ هەیە.**

## ١٦- دەروازەی: بڕی بەرزکردنەوەی دەنگ بە خوێندنەوە

**٤٩٧**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ عَلَى قَدْرِ مَا يَسْمَعُهُ مَنْ فِي الْحُجْرَةِ، وَهُوَ فِي الْبَيْتِ. [د١٣٢٧]

* حسن صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: بڕی خوێندنەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەندە بوو کەسێك لە ژوورەکەدا بیبیستێت، و ئەو لە ماڵەکەدا بێت.**

**٤٩٨**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بِاللَّيْلِ، يَرْفَعُ طَوْراً، وَيَخْفِضُ طَوْراً. [د١٣٢٨]

* حسن.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: لە شەودا خوێندنەوەی پێغەمبەر(ﷺ) قۆناغێك[1] دەنگی بەرز دەکردەوە و قۆناغێك دەنگی نزم دەکردەوە.**

**٤٩٩**– عَنْ أَبِي قَتَادَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم خَرَجَ لَيْلَةً، فَإِذَا هُوَ بِأَبِي بَكْرٍ ﷺ يُصَلِّي، يَخْفِضُ مِنْ صَوْتِهِ، قَالَ: وَمَرَّ بِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ وَهُوَ يُصَلِّي رَافِعاً صَوْتَهُ. قَالَ: فَلَمَّا اجْتَمَعَا عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، قَالَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: **(يَا أَبَا بَكْرٍ! مَرَرْتُ بِكَ وَأَنْتَ تُصَلِّي تَخْفِضُ صَوْتَكَ)**، قَالَ: قَدْ أَسْمَعْتُ مَنْ نَاجَيْتُ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: وَقَالَ لِعُمَرَ: **(مَرَرْتُ بِكَ وَأَنْتَ تُصَلِّي رَافِعاً صَوْتَكَ)**، قَالَ: فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أُوقِظُ الْوَسْنَانَ، وَأَطْرُدُ الشَّيْطَانَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(يَا أَبَا بَكْرٍ! ارْفَعْ مِنْ صَوْتِكَ شَيْئاً)**، وَقَالَ لِعُمَرَ: **(اخْفِضْ مِنْ صَوْتِكَ شَيْئاً)**. [د١٣٢٩/ ت٤٤٧]

* صحيح.

**لە ئەبی قەتادەوە: شەوێك پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە، بینی ئەبوبەکر(خوا لێی ڕازی بێت) نوێژ دەکات و دەنگی نزم دەکاتەوە، بە پاڵ عومەری کوڕی خەتابدا گوزەری کرد ئەو نوێژی دەکرد و دەنگی بەرز دەکردەوە، وتی: کاتێك لای پێغەمبەر(ﷺ) هەردووکیان کۆبوونەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی ئەبا بەکر بە پاڵ تۆدا گوزەرم کرد تۆ نوێژت دەکرد و دەنگی خۆت نزم دەکردەوە)، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، بەو کەسەم بیستووە موناجاتم دەکرد، وتی: بە عومەریشی**

---

[1] **واتە: ماوەیەك دەنگی بەرز دەکردەوە و ماوەیەك دەنگی نزم دەکردەوە–و.**

فەرموو: **(بە پاڵ تۆدا گوزەرم کرد تۆش نوێژت دەکرد و دەنگی خۆت بەرز دەکردەوە)**، وتی: عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، خەواڵووەکان بەئاگا دەهێنم، و شەیتان دەردەکەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی ئەبابەکر هەندێ دەنگت بەرزبکەرەوە)**، بە عومەری فەرموو: **(هەندێ لە دەنگت دابەزێنە)**.

٥٠٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: اعْتَكَفَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي الْمَسْجِدِ، فَسَمِعَهُمْ يَجْهَرُونَ بِالْقِرَاءَةِ، فَكَشَفَ السِّتْرَ، وَقَالَ: **(أَلاَ إِنَّ كُلَّكُمْ مُنَاجٍ رَبَّهُ، فَلاَ يُؤْذِيَنَّ بَعْضُكُمْ بَعْضاً، وَلاَ يَرْفَعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الْقِرَاءَةِ)**، أَوْ قَالَ: **(فِي الصَّلاَةِ)**. [د١٣٣٢]

* صحيح.

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مزگەوت ئیعتیکافی کرد، گوێی لێبوو بە خوێندنەوەی قورئان دەنگ هەڵدەبڕن، پەردەکەی لادا، و فەرمووی: **(دەزانن هەمووتان موناجات لەگەڵ پەروەردگار دەکەن، هەندێکتان ئازاری هەندێکتان مەدەن، لە خوێندنەوەدا هەندێکتان بەسەر هەندێکی ترتان دەنگ هەڵمەبڕن)**، یان فەرمووی: **(لە نوێژدا)**.

٥٠١- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(الْجَاهِرُ بِالْقُرْآنِ كَالْجَاهِرِ بِالصَّدَقَةِ، وَالْمُسِرُّ بِالْقُرْآنِ كَالْمُسِرِّ بِالصَّدَقَةِ)**. [د١٣٣٣/ ت٢٩١٩/ ن١٦٦٢]

* صحيح.

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەو کەسەی خوێندنەوەی قورئان دەردەخات وەك ئەو کەسە وایە صەدەقە دەردەخات[1]، ئەو کەسەش خوێندنەوەی قورئان دەشارێتەوە وەك ئەو کەسە وایە صەدەقە دەشارێتەوە)**.

---

[1] واتە: وەك ئەو کەسە وایە خێر و صەدەقە دەردەخات بۆ ئەوەی خەڵکی لە خێردا چاوی لێ بکەن، نەك مەبەستی ریاکاری بێت لە دەرخستنەکەیدا.

## ١٧- دەروازەی: "تحزیب-بەش بەش کردن"ی قورئان

**٥٠٢-** عَنِ ابْنِ الْهَادِ قَالَ: سَأَلَنِي نَافِعُ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، فَقَالَ لِي: فِي كَمْ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ فَقُلْتُ: مَا أُحَزِّبُهُ، فَقَالَ لِي نَافِعٌ: لاَ تَقُلْ مَا أُحَزِّبُهُ، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**قَرَأْتُ جُزْءاً مِنَ الْقُرْآنِ**). قَالَ: حَسِبْتُ أَنَّهُ ذَكَرَهُ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ. [د١٣٩٢]

* صحيح.

**لە ئیبنولهادەوە، وتی: نافیعی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیم پرسیاری لێکردم و پێی وتم: چەند قورئان دەخوێنی؟ وتم: "ما أُحَزِّبُه-ئەوەی بەش بەشی دەکەم"، نافیع پێی وتم: مەڵێ: "ما أحزبه"، چونکە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (جوزئێك لە قورئانم خوێند). وتی: پێموابوو ئەوەی لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە باس کرد.**

**٥٠٣-** عَنْ أَنَسٍ قَالَ: وَجد رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّم ذاتَ ليلةٍ شيئًا، فلما أصبح قيل: يا رسولَ اللهِ، إنَّ أثرَ الوجَعِ عليك لَبَيِّنٌ، قال: (**أمَا إنِّي على ما تَرَوْنَ -بحَمْدِ اللهِ- قد قرأتُ البارحةَ السَّبْعَ الطِّوالَ**). [مه١١٣٦/ حب٣١٩]

* إسناده ضعيف (ناصر).

**لە ئەنەسەوە وتی: شەوێك پێغەمبەری خودا هەستی بە ئازارێك کرد، کاتێك ڕۆژی لێبوویەوە وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، ئازار لە روخسارت دیارە، فەرمووی: (من بەو جۆرەم کە دەیبینن، -بە حەمدی خودا- دوێنێ حەوت سوورەتە درێژەکەم خوێند[1]).**

## ١٨- دەروازەی: کەسێك شتێك لە قورئان لەبیربکات

**٥٠٤-** عَنْ أَنَسِ بنِ مالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**عُرِضَتْ عَلَيَّ أجورُ أمتي، حتى الْقَذاةُ يُخرجُها الرَّجُلُ مِنَ المَسجدِ، وعُرِضَ عَلَيَّ ذُنُوبُ أُمَّتي، فَلَمْ أَرَ ذَنبًا أعظَمَ مِنْ سُورةٍ مِنَ القرآنِ، أوْ آيةٍ أُوتِيَهَا رَجُلٌ ثُمَّ نسيَها**). [د٤٦١/ ت٢٩١٦]

* ضعيف.

---

[1] واتە: لەگەڵ ئەو ئازارەش حەوت سورەتە درێژەکەی خوێندووە-و.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(پاداشتی ئومەتەکەم بۆ خرایەڕوو، تەنانەت ئەو هەڵدراوانەی پیاو لە مزگەوت دەیباتە دەرەوە[1]، گوناهی ئومەتەکەم بۆ خرایە روو گوناهێکم نەبینی گەورەتر لە: سورەتێك یان ئایەتێکی قورئان بە پیاوێك بدرێت[2] و پاشان لەبیری بچێتەوە).**

## ١٩- دەروازەی: خەڵکانێك پەلە دەکەن لە پاداشتی قورئان

**٥٠٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَنَحْنُ نَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَفِينَا الْأَعْرَابِيُّ وَالْأَعْجَمِيُّ، فَقَالَ: **(اقْرَؤُوا فَكُلٌّ حَسَنٌ، وَسَيَجِيءُ أَقْوَامٌ يُقِيمُونَهُ كَمَا يُقَامُ الْقِدْحُ، يَتَعَجَّلُونَهُ، وَلاَ يَتَأَجَّلُونَهُ).** [د٨٣٠]

* صحيح.

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ لامان و ئێمە قورئانمان دەخوێند، لەناوماندا ئەعرابییەك و ئەعجەمییەك هەبوو، فەرمووی: **(بخوێنن هەموو باشن، لە داهاتوودا خەڵکانێك دێن راستی دەکەنەوە وەك چۆن تیر[3] راست دەکرێتەوە[4]، پەلە لە پاداشتەکەی دەکەن، و دوای ناخەن[5]).**

**٥٠٦-** عن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شِبْلٍ قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(اقْرَؤُوا الْقُرْآنَ، وَلاَ تَغْلُوا فِيهِ، وَلاَ تَجْفُوا عَنْهُ، وَلاَ تَأْكُلُوا بِهِ، وَلاَ تَسْتَكْثِرُوا بِهِ).** [حم١٥٥٢٩]

* حديث صحيح.

---

[1] مەبەست بە "هەڵدراو": چڵم و بەڵغەم و تفە، ئەو کەسەی لە مزگەوت فڕێی نادات و دەیباتە دەرەوەی مزگەوت پاداشتی بۆ دەنوسرێت-و.

[2] واتە لەبەری دەکات-و.

[3] هەلووك: پارچە دارێکە بە درێژی قولانجێك-و.

[4] واتە بە جوانی و بە دروستی دەیخوێنن-و.

[5] واتە: خوێندنەوەکەیان بۆ دنیا بەکاردەهێنن و دوای ناخەن بۆ دوارۆژ-و.

لــە عبــدالرحمانی کــوڕی شــیبلەوە، وتــی: گــوێم لــە پێغەمبــەری خــودا(ﷺ) بــوو دەیفەرموو: **(قورئان بخوێنن و زیادەڕەوی تێدا مەکەن، جەفاتان بۆ دروست نەبێت لێی، بە قورئانەوە مەخۆن، و بە قورئانەوە هەوڵی زۆرخوازی مەدەن).**

## ٢٠- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی فەزڵی خوێندنەوەی چەند ئایەتێك هاتووە

٥٠٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: مَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ عَشْرَ آيَاتٍ كُتِبَ مِنَ الذَّاكِرِينَ، وَمَنْ قَرَأَ بِمِائَةِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ، وَمَنْ قَرَأَ بِخَمْسِ مِائَةِ آيَةٍ إِلَى الْأَلْفِ أَصْبَحَ وَلَهُ قِنْطَارٌ مِنَ الْأَجْرِ، قِيلَ: وَمَا الْقِنْطَارُ؟ قَالَ: مِلْءُ مَسْكِ الثَّوْرِ ذَهَباً. [مي٣٥٠١]

* إسناده صحيح.

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: هەر کەس لە شەوێکدا دە ئایەت بخوێنێت لە یادکەران دەنووسرێت، هەر کەس سەد ئایەت بخوێنێت لە "القانتین" دەنوسرێت، هەر کەس پێنج سەد ئایەت تا هەزار ئایەت بخوێنێت "القنطار"ێك لە پاداشتی بۆ هەیە، وترا: "القنطار" چییە؟ وتی: پڕ بە پێستی گایەك زێڕ.**

٥٠٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: مَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ بِخَمْسِينَ آيَةً، لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ. [مي٣٤٨٩]

* إسناده صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: هەر کەس شەوێك پەنجا ئایەت بخوێنێت لە بێئاگایان نانوسرێت.**

٥٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ حَافَظَ عَلى هَؤلَاءِ الصَلَواتِ المكتوباتِ لم يُكْتَبْ مِن الغافلينَ، ومَنْ قرأَ في ليلةٍ مائةَ آيةٍ لم يُكتب مِن الغافلين -أو كُتِبَ من القانتين-).** [مه١١٤٢/١]

* إسناده صحيح على شرطهما (ناصر).

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس بەردەوام بێت لەسەر نوێژە فەرزەکان لە بێئاگایان نانوسرێت، هەر کەس لە شەوێکدا سەد ئایەت بخوێنێت لە بێئاگایان نانوسرێت–یان لە "القانتین" دەنوسرێت–).**

**٥١٠**– عن أبي هريرة ﷺ قال: قَالَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَن قَرأَ عَشْرَ آياتٍ في ليلةٍ لَمْ يُكتبْ من الغافِلِينَ). [ك٢٠٤١]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس لە شەوێکدا دە ئایەت بخوێنێت لە بێئاگایان نانوسرێت).**

## ٢١- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی خەتمی قورئان هاتووە

**٥١١**– عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ قَالَ: إِنَّمَا دَعَوْنَاكَ أَنَّا أَرَدْنَا أَنْ نَخْتِمَ الْقُرْآنَ، وَإِنَّهُ بَلَغَنَا: أَنَّ الدُّعَاءَ يُسْتَجَابُ عِنْدَ خَتْمِ الْقُرْآنِ، قَالَ: فَدَعَوْا بِدَعَوَاتٍ. [مي٣٥٢٥]

* إسناده صحيح.

**لە حەکەمەوە، لە موجاهیدەوە، وتی: ناردی بەدوامدا و وتی: بۆیە من بانگمان کردی ئێمە دەمانەوێ خەتمی قورئان بکەین[1]، پێمانگەیشتووە لە خەتمی قورئاندا دوعا گیرایە، وتی: کۆمەڵێك دوعای کرد.**

**٥١٢**– عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ قَالَ: إِذَا قَرَأَ الرَّجُلُ الْقُرْآنَ نَهَاراً صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ قَرَأَهُ لَيْلاً صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى يُصْبِحَ.

**لە ئیبراهیمی نوخەعەییەوە، وتی: گەر پیاوێ بە ڕۆژدا قورئانی خوێند فریشتە صەڵەواتی لەسەر دەدەن تا ئێوارەی بەسەردا دێت، گەر شەو خوێندی فریشتە صەڵەواتی لەسەر دەدەن تا ڕۆژی لێ دەبێتەوە.**

---

[1] واتە: دوعای خەتمی قورئان بخوێنین–و.

▪ وفي رواية: قَالَ سُلَيْمَانُ الأَعْمَشُ: فَرَأَيْتُ أَصْحَابَنَا يُعْجِبُهُمْ أَنْ يَخْتِمُوهُ أَوَّلَ النَّهَارِ، وَأَوَّلَ اللَّيْلِ. [مي ٣٥٢٠، ٣٥٢١]

* إسناده صحيح.

**لە ریوایەتێکدا: سولەیمانی ئەعمەش وتی: هاوەڵانی خۆمانم بینی کۆبوونەوەیان لە سەرەتای رۆژ و سەرەتای شەو پێ باش بوو.**

## ٢٢- دەروازەی: تەنها کەسی پاك دەست لە قورئان دەدات

**٥١٣-** عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ بِكِتَابٍ فِيهِ الْفَرَائِضُ وَالسُّنَنُ وَالدِّيَاتُ، وَبَعَثَ بِهِ مَعَ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ وَفِيهِ قَالَ: (**وَلاَ يَمَسُّ الْقُرْآنَ إِلاَّ طَاهِرٌ**). [ط٤٦٨][هق١/٣٠٩]

**لە ئەبی بەکری کوڕی محەمەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمەوە، لە باوکییەوە، لە باپیرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نووسراوێکی بۆ ئەهلی یەمەن نووسی تیایدا فەرزەکان و سوننەتەکان و "الديات"[1]ی تێدا بوو، بە عەمری کوڕی حەزمدا رەوانەی کرد، فەرموودەکەی باس کرد و تیایدا هاتبوو، فەرمووی: (تەنها کەسی پاك دەست لە قورئان دەدات).**

**٥١٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ يَمَسُّ الْقُرْآنَ إِلاَّ طَاهِرٌ**). [هق١/٨٨]

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (تەنها کەسی پاك دەست لە قورئان دەدات).**

**٥١٥-** عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أُمْسِكُ الْمصْحَفَ عَلَى سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ فَاحْتَكَكْتُ، فَقَالَ سَعْدٌ: لَعَلَّكَ مَسَسْتَ ذَكَرَكَ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: قُمْ فَتَوَضَّأْ، فَقُمْتُ فَتَوَضَّأْتُ ثُمَّ رَجَعْتُ. [هق١/٨٨]

---

[1] واتە: خوێندان بە ماڵ و سامان-و.

لە موصعەبی کوڕی سەعدەوە، وتی: لەسەر سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص موصحەفەکەم گرتبوو، خۆم خوراند، سەعد وتی: لەوانەیە دەستت بەر زەکەرت کەوتبێت؟ وتم: بەڵێ، وتی: هەستە و دەستنوێژ بگرەوە، هەستام و دەستنوێژم گرتەوە و پاشان گەڕامەوە.

**٥١٦**– عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم لَمَّا بَعَثَهُ وَالِياً إِلَى اليَمَنِ قَالَ: **(لاَ تَمَسَّ القُرْآنَ إِلاَّ وَأَنْتَ طَاهِرٌ)**. [ك٦٠٥١]

* قال الذهبي: صحيح.

لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە: کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەك والی رەوانەی یەمەنی کرد، فەرمووی: **(بە پاکی نەبێت دەست نەدەی لە قورئان)**.

## ٢٣- دەروازەی: خوێندنەوە بەبێ دەستنوێژ

**٥١٧**– عَنْ أَبِي الْغَرِيفِ قَالَ: أُتِيَ عَلِيٌّ ﷺ بِوَضُوءٍ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ ثَلاَثاً، وَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثاً، وَغَسَلَ يَدَيْهِ وَذِرَاعَيْهِ ثَلاَثاً ثَلاَثاً، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تَوَضَّأَ، ثُمَّ قَرَأَ شَيْئاً مِنَ الْقُرْآنِ ثُمَّ قَالَ: **(هَذَا لِمَنْ لَيْسَ بِجُنُبٍ، فَأَمَّا الْجُنُبُ فَلاَ وَلاَ آيَةَ)**. [حم٨٧٢]

* إسناده حسن.

لە ئەبی غەریفەوە، وتی: بۆ دەستنوێژ ئاو بۆ عەلی هێنرا، سێ جار ئاوی رادا لە دەم و لە لووتی، سێ جار روخساری خۆی شۆری، دوو دەست و دوو باڵی سێ جار سێ جار شۆری، پاشان مەسحی سەری خۆی کرد، پاشان دوو پێی خۆی شۆری، پاشان وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی بەم جۆرە دەستنوێژی گرت، پاشان شتێك لە قورئانی خوێند، پاشان پێغەمبەر فەرمووی: **(ئەمە بۆ کەسێکە لەشگران نەبێت، بەڵام کەسی لەشگران نە دەستنوێژ و نە ئایەت[1])**.

---

[1] واتە: نە دەستنوێژ دەگرێت و نە ئایەت دەخوێنێت تا خۆی دەشۆرێ و لەشگرانییەکەی دەردەکات–و.

**٥١٨-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: كُنَّا مَعَ سَلْمَانَ فَخَرَجَ فَقَضَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ جَاءَ فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الله، لَوْ تَوَضَّأْتَ لَعَلَّنَا أَنْ نَسْأَلَكَ عَنْ آيَاتٍ، قَالَ: إِنِّي لَسْتُ أَمَسُّهُ، إِنَّمَا ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ﴾ [الواقعة:٧٩]، فَقَرَأَ عَلَيْنَا مَا شِئْنَا. [ك٣٧٨٢/ هق١/٨٨]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە عبدالرحمانی كوڕی یەزیدەوە، وتی: لەگەڵ سەلمان بووین، ڕۆیشت و قەزای حاجەتی كرد، پاشان هات و وتم: ئەی باوكی عەبدوڵا، گەر دەستنوێژ بگریت، بەڵكو پرسیاری چەند ئایەتێكت لێ بكەین، وتی: من دەستی لێ نادەم، ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ﴾ [الواقعة:٧٩]، تەنها پاكان دەستی لێ دەدەن، چەندمان ویست بەسەر ئێمەدا خوێندییەوە.**

**٥١٩-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ كَانَ فِي قَوْمٍ وَهُمْ يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ، فَذَهَبَ لِحَاجَتِهِ، ثُمَّ رَجَعَ وَهُوَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ! أَتَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَلَسْتَ عَلَى وُضُوءٍ؟ فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: مَنْ أَفْتَاكَ بِهَذَا، أَمُسَيْلِمَةُ؟ [ط ٤٦٩]

* رجاله ثقات، وابن سيرين لم يسمع من عمر.

**لە محەمەدی كوڕی سیرینەوە: عومەری كوڕی خەتاب لەناو دەستەیەك بوو قورئانیان دەخوێند، ڕۆیشتن بۆ قەزای حاجەت، پاشان گەڕایەوە و ئەو قورئانی خوێند، پیاوێك پێی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئایا قورئان دەخوێنی و دەستنوێژت نییە؟ عومەر پێی وت: كێ بەمە فتوای بۆ دای، موسەیلەمە؟.**

## ٢٤- دەروازەی: فێربوونی قورئان و كار پێ كردنی

**٥٢٠-** عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: حَدَّثَنَا مَنْ كَانَ يُقْرِئُنَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّهُمْ كَانُوا يَقْتَرِئُونَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَشْرَ آيَاتٍ، فَلاَ يَأْخُذُونَ فِي الْعَشْرِ الْأُخْرَى حَتَّى يَعْلَمُوا مَا فِي هَذِهِ مِنَ الْعِلْمِ وَالْعَمَلِ، قَالُوا: فَعَلِمْنَا الْعِلْمَ وَالْعَمَلَ. [حم٢٣٤٨٢]

* إسناده حسن.

**لە عەتای کوڕی ئەبی عبدالرحمانەوە، وتی: ئەوانەی قورئانیان پێ دەخوێندین لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆیان باس کردین، ئەوان دە ئایەتیان لە پێغەمبەری خوداوە بەسەردا دەخوێنرایەوە، دە ئایەتی تریان وەرنەدەگرت تا کاریان دەکرد بەوەی لەم دە ئایەتەدایە لە زانست و کار، وتیان: بەم جۆرە زانست و کار فێربووین.**

**٥٢١-** عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ - ابنِ مَسْعُودٍ - قَالَ: كُنَّا إِذَا تَعَلَّمْنَا مِنَ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم عَشْرَ آيَاتٍ مِنَ الْقُرْآنِ، لَمْ نَتَعَلَّمْ مِنَ الْعَشْرِ التي نَزَلَتْ بَعْدَهَا حَتَّى نَعْلَمَ مَا فِيهِ، قِيلَ لِشَرِيكٍ: مِنَ الْعَمَلِ؟ قَالَ: نَعَمْ.
[ك٢٠٤٧/هق٣/١١٩]

* قال الذهبي: صحيح.

**لە شەریکەوە، لە عەتای کوڕی سائیبەوە، لە ئەبی عبدالرحمانەوە لە عەبدوڵاوە- ئیبن مەسعوود- وتی: ئێمە گەر دە ئایەت لە قورئان لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فێربوبینایە، لەو دە ئایەتەی تر بەدوایدا دادەبەزی فێرنەدەبووین تا ئەوەی تیایاندایە[1] فێردەبووین، وترا: بە شەریك: لە کار[2]؟ وتی: بەڵێ.**

**٥٢٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: لَقَدْ عِشْنَا بُرْهَةً مِنْ دَهْرِنَا وَأَحَدُنَا يُؤْتَى الإِيمَانَ قَبلَ الْقُرْآنِ، وَتَنْزِلُ السُّورَةُ عَلَى مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم، فَيَتَعَلَّمُ حَلاَلَهَا وَحَرَامَهَا، وَآمِرَهَا، وَزَاجِرَهَا، وَمَا يَنْبَغِي أَنْ يَقِفَ عَنْدَهُ مِنْهَا، كَمَا تَعَلَّمُونَ أَنْتُمُ الْيَوْمَ الْقُرْآنَ، ثُمَّ لَقَدْ رَأَيْتُ الْيَوْمَ رِجَالاً يُؤْتَى أَحَدُهُمُ الْقُرْآنَ قَبْلَ الإِيمَانِ، فَيَقْرَأُ مَا بَيْنَ فَاتِحَتِهِ إِلَى خَاتِمَتِهِ، مَا يَدْرِي مَا آمِرُهُ وَلاَ زَاجِرُهُ، وَلاَ مَا يَنْبَغِي أَنْ يَقِفَ عِنْدَهُ مِنْهُ، فَيَنْثُرُهُ نَثْرَ الدَّقَلِ. [ك١٠١/هق٣/١٢٠]

* قال الذهبي: على شرطهما.

---

[1] **واتە: تا ئەوەی لە دە ئایەتەکەی یەکەمدایە فێر دەبووین-و.**

[2] **لە کار: واتە پرسییان تا ئەوەی لە کار لە ناو ئەو ئایەتانەدایە فێردەبوون؟ ئەویش وتی: بەڵێ-و.**

لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە، وتی: ماوەیەك لە رۆژگار ژیاین، یەكێك لە ئێمە بەر لە قورئان ئیمانی پێ دەدرا، سورەتێك بۆ سەر محەمەد(ﷺ) دادەبەزی حەڵاڵ و حەرام و فەرمانكەر و دەمكوتكەر و ئەوەی پێویستە لەپای بوەستێت فێر دەبوو، وەك چۆن ئەمڕۆ ئێوە قورئان فێر دەبن، پاشان لە ئەمڕۆدا پیاوانێك دەبینم یەكێك لەوان بەر لە ئیمان قورئانی پێ دەدرێت، لە فاتیحەی قورئانەوە تا كۆتایی قورئان دەخوێنێت نازانێت فەرمان و دەمكوتكەرەكان و ئەوەی پێویستە لەپای بوەستێت كامانەن، هەڵیدەدات و بڵاوەی پێ دەكات وەك هەڵدان و بڵاوە پێ كردنی خورمای قەڵب.

## ٢٥- دەروازەی: كردنی "الله أكبر" لە كۆتایی سورەتە كورتەكاندا

**٥٢٣**- عَنْ عِكْرِمَةَ بْنِ سُلَيْمَانَ قَالَ: قَرَأْتُ عَلى إِسْمَاعِيلَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ قِسْطَنْطِينَ، فَلَمَّا بَلَغْتُ ﴿وَٱلضُّحَىٰ ۝١﴾ قَالَ لِي: كَبِّرْ عِنْدَ خَاتِمَةِ كُلِّ سُورَةٍ حَتَّى تَخْتِمْ، وَأَخْبَرَهُ عَبْدُ اللهِ بْنِ كَثِيرٍ: أَنَّهُ قَرَأَ عَلى مُجَاهِدٍ فَأَمَرَهُ بِذلِكَ، وَأَخْبَرَهُ مُجَاهِدٌ: أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ أَمَرَهُ بذلِكَ، وَأَخْبَرَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَنَّ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ أَمَرَهُ بِذلِكَ، وَأَخْبَرَهُ أُبَيُّ بْنِ كَعْبٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَمَرَهُ بِذلِكَ. [ك٥٣٢٥]
* قال الذهبي: فيه البزي، قد تُكُلِّمَ فيه.

لە عیكریمەی كوڕی سولەیمانەوە، وتی: بەسەر ئیسماعیلی كوڕی عەبدوڵای كوڕی قیستەنتیندا قورئانم خوێندەوە كاتێك گەیشتمە ﴿وَٱلضُّحَىٰ ۝١﴾، پێی وتم: لە كۆتایی هەر سورەتێكدا "الله أكبر" بكە تا خەتمی دەكەی، عەبدوڵای كوڕی كوسەیر هەواڵی پێدابوو: ئەو بەسەر موجاهیدا قورئانی خوێند بوو و بەو كارە فەرمانی پێ كرد بوو، موجاهید هەواڵی پێدا بوو: ئیبن عەباس فەرمانی بەوە پێكردووە، ئیبن عەباس هەواڵی پێداوە: ئوبەی كوڕی كەعب بەوە فەرمانی پێكردووە، ئوبەی كوڕی كەعب هەواڵی پێداوە: پێغەمبەر(ﷺ) بەوە فەرمانی پێكردووە.

# بەشی سێیەم

## فەزڵی هەندێ سورەت و ئایەت

### ١- دەروازەی: فەزڵی سورەتی "الفاتحة"

**٥٢٤-** (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بَيْنَمَا جِبْرِيلُ قَاعِدٌ عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم سَمِعَ نَقِيضاً مِنْ فَوْقِهِ، فَرَفَعَ رأْسَهُ، فَقَالَ: هَذَا بَابٌ مِنَ السَّمَاءِ فُتِحَ الْيَوْمَ، لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إِلاَّ الْيَوْمَ، فَنَزَلَ مِنْهُ مَلَكٌ، فَقَالَ: هَذَا مَلَكٌ نَزَلَ إِلَى الأَرْضِ، لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إِلاَّ الْيَوْمَ، فَسَلَّمَ وقَالَ: أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا، لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ: فَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَخَوَاتِيمِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ لَنْ تَقْرَأَ بِحَرْفٍ مِنْهُمَا إِلاَّ أُعْطِيتَهُ. [م٨٠٦]

**(م) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: لە کاتێکدا جیبریل لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوو دەنگێك(نقیض)ی[1] لەسەرەوە بیست، بۆیە سەری بەرز کردەوە، فەرمووی: ئەوە دەرگایەکی ئاسمانە ئەمڕۆ کرایەوە، جگە لە ئەمڕۆ هەرگیز نەکراوەتەوە، فریشتەیەکی لێ دابەزی، بۆیە فەرمووی: ئەوە فریشتەیەکە دابەزیوە بۆ زەوی، جگە لە ئەمڕۆ هەرگیز دانەبەزیوە، سەلامی کرد و وتی: مژدەت لێ بێت بە دوو نوور کە بە تۆ دراون، بە هیچ پێغەمبەرێکی پێش تۆ نەدراون: "فاتحة الكتاب" و کۆتایی سورەتی "البقرة"، هەر پیتێکی ئەو دوانە بخوێنی پێتدەدرێت[2].**

**٥٢٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَرَجَ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(يَا أُبَيُّ)** ! وَهُوَ يُصَلِّي، فَالْتَفَتَ أُبَيٌّ وَلَمْ يُجِبْهُ، وَصَلَّى أُبَيٌّ فَخَفَّفَ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ، مَا مَنَعَكَ يَا أُبَيُّ أَنْ تُجِيبَنِي إِذْ دَعَوْتُكَ)**؟

---

[1] **"نقيض": دەنگێك وەك دەنگی کردنەوەی دەرگا، واتە وەك جیڕەی دەرگا-د.**

[2] **واتە: بە هەر پیتێك پاداشتێکی بۆ هەیە-و.**

فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي كُنْتُ فِي الصَّلاَةِ، قَالَ: (أَفَلَمْ تَجِدْ فِيمَا أَوْحَى اللهُ إِلَيَّ أَنِ ﴿ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ [الأنفال:٢٤])، قَالَ: بَلَى، وَلاَ أَعُودُ إِنْ شَاءَ اللهُ، قَالَ: (أَتُحِبُّ أَنْ أُعَلِّمَكَ سُورَةً لَمْ يَنْزِلْ فِي التَّوْرَاةِ وَلاَ فِي الْإِنْجِيلِ، وَلاَ فِي الزَّبُورِ، وَلاَ فِي الْفُرْقَانِ مِثْلُهَا) ؟ قَالَ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (كَيْفَ تَقْرَأُ فِي الصَّلاَةِ) ؟ قَالَ: فَقَرَأَ أُمَّ الْقُرْآنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! مَا أُنْزِلَتْ فِي التَّوْرَاةِ، وَلاَ فِي الْإِنْجِيلِ، وَلاَ فِي الزَّبُورِ، وَلاَ فِي الْفُرْقَانِ مِثْلُهَا، وَإِنَّهَا سَبْعٌ مِنَ الْمَثَانِي، وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُعْطِيتُهُ).          [ت٢٨٧٥/ مي٣٤١٦]

* صحيح.

له ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشت بۆ لای ئوبەی کوڕی کەعب، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی ئوبەی)**، ئەو نوێژی دەکرد، ئوبەی ئاوڕێکی دایەوە و وەڵامی نەدایەوە، ئوبەی نوێژەکەی کرد و بە خێرایی تەواوی کرد و ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: السلام علیك یا رسول الله، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(وعلیك السلام، ئەی ئوبەی چی ڕێگری لێ کردی وەڵامم نەدەیەوە کاتێك من بانگم کردی؟)**، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من لە نوێژدا بووم، فەرمووی: **(بۆچی لەناو ئەوەی خودا وەحی بۆ کردووم ئەمە نابینیتەوە: ﴿ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾** [الأنفال:٢٤]، وتی: با، إنشاءالله دووبارەی ناکەمەوە، فەرمووی: **(پێتخۆشە سورەتێکت فێر بکەم لە تەورات و ئینجیل و زەبوور و فورقاندا نموونەی وەك ئەوە دانەبەزی بێت)**، وتی: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(چۆن لە نوێژدا دەخوێنی؟)**، وتی: "أم القرآن"ی خوێند، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، لە تەورات و ئینجیل و زەبوور و فورقاندا نموونەی دانەبەزیوە، ئەوە بریتییە لە "سبع من المثاني[1]" و قورئانی مەزن کە بە من دراوە)**.

---

[1] ئەو حەوت ئایەتە شکۆدارە بەردەوام لە نوێژەکاندا دووبارە دەکرێنەوە، یان دوو جار دابەزیون–و.

## ٢- دەروازەی: فەزڵی "البقرة وآل عمران وآية الكرسي"

**٥٢٦-** (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْبَدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (الآيَتَانِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ. مَنْ قَرَأَهُمَا فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ). [خ٤٠٠٨/ م٨٠٧، ٨٠٨]

(ق) لە ئەبی مەسعوودی بەدرییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی "البقرة" هەر کەس لە شەوێکدا بیانخوێنێت بەشی دەکات).**

**٥٢٧-** (م) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم (**يَا أَبَا الْمُنْذِرِ! أَتَدْرِي أَيُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ مَعَكَ أَعْظَمُ**) ؟ قَالَ: قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: (**يَا أَبَا الْمُنْذِرِ! أَتَدْرِي أَيُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ مَعَكَ أَعْظَمُ**) ؟ قَالَ: قُلْتُ: ﴿**ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ**﴾[البقرة:٢٥٥]، قَالَ: فَضَرَبَ فِي صَدْرِي وقَالَ: (**واللهِ! لِيَهْنِكَ الْعِلْمُ أَبَا الْمُنْذِرِ**). [م٨١٠]

(م) لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی باوکی مونزیر، دەزانی چ ئایەتێك لە کتێبەکەی خودا لەگەڵت مەزنە؟)**، وتی: وتم: ﴿**ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ**﴾، وتی: کێشای بە سینەمدا و فەرمووی: **(سوێند بە خودا، زانست پیرۆزبایت لێ دەکات**[1]**، ئەی ئەبا مونزیر).**

**٥٢٨-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ، إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْفِرُ مِنَ الْبَيْتِ الَّذِي تُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ**). [م٧٨٠].

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان، شەیتان لە ماڵێك هەڵدێت سورەتی "البقرة"ی تێدا بخوێنرێت).**

---

[1] واتە: زانستت لێ پیرۆز بێت-و.

**٥٢٩-** (م) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (اقْرَؤوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعاً لأَصْحَابِهِ. اقْرَؤوا الزَّهْرَاوَيْنِ: الْبَقَرَةَ وَسُورَةَ آلِ عِمْرانَ، فَإِنَّهُمَا تَأْتِيَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا غَيَايَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ، تُحَاجَّانِ عَنْ أَصْحَابِهِمَا. اقْرَؤوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ، فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ، وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ، وَلاَ تَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ). [م٨٠٤]

(م) لە ئەبی ئومامەی باهلییەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(قورئان بخوێنن، لە ڕۆژی قیامەت دێت و وەك تکاکارە بۆ هاوەڵەکانی، دوو گەشاوەکە بخوێنن: "البقرة وآل عمران" ئەو دوانە لە ڕۆژی قیامەتدا دێن و وەك ئەوەی دوو پەڵە هەور یان دوو سێبەر بن، یان وەك دوو پۆل باڵندەی ڕیزبەستووی باڵ کراوە بن، لەسەر هاوەڵەکانیان موجادەلە دەکەن، کەسانی پووچ(البطلة)[1] ناتوانن بەدەستی بهێنن).**

## ٣- دەروازەی: فەزڵی حەوت سورەتی یەکەم

**٥٣٠-** عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ أَخَذَ السَّبْعَ الأُوَلَ فَهُوَ حَبْرٌ). [حم٢٤٤٤٣]

* إسناده حسن.

لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس حەوت سوورەتی یەکەم وەربگرێت ئەو حەبرە[2]).**

---

[1] واتە: ساحیران.

[2] واتە: ئەو زانایە—و.

## ٤- دەروازەی: فەزڵی دوو سورەتی (هود و الواقعة)

**٥٣١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: يَا رَسُولَ اللهِ! قَدْ شِبْتَ، قَالَ: (**شَيَّبَتْنِي هُودٌ، وَالْوَاقِعَةُ، وَالْمُرْسَلاَتُ، وَ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ﴾، وَ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾**). [ت٣٢٩٧]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: ئەبوبەکر(خوا لێی رازی بێت) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، پیر بوویت، فەرمووی: ("هود و الواقعة و المرسلات" و ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ﴾ و ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ پیریان کردم).**

## ٥- دەروازەی: فەزڵی سورەتی (الکهف)

**٥٣٢-** (ق) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يَقْرَأُ سُورَةَ الْكَهْفِ، وَإِلَى جانِبِهِ حِصَانٌ مَرْبُوطٌ بِشَطَنَيْنِ، فَتَغَشَّتْهُ سَحَابَةٌ، فَجَعَلَتْ تَدْنُو وَتَدْنُو، وَجَعَلَ فَرَسُهُ يَنْفِرُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَذَكَرَ ذلِكَ لَهُ، فَقَالَ: (**تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ بِالقُرْآنِ**).

[خ٥٠١١ (٣٦١٤)/ م٧٩٥]

**(ق) لە بەرای کوڕی عازیبەوە، وتی: پیاوێك قورئانی دەخوێند و لە تەنیشتییەوە ئەسپێك بە دوو پەتی درێژ بەسترابوویەوە، پەڵە هەورێك دایپۆشی و نزمتر و نزمتر دەبوویەوە، ئەسپەکەی رادەپەڕی، کاتێك رۆژی لێبوویەوە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوەی بۆ باس کرد، فەرمووی: (ئەوە سەکینەیەك بووە بە قورئان دابەزیوە).**

**٥٣٣-** (م) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آياتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ، عُصِمَ مِنَ الدَّجَّالِ**). [م٨٠٩]

**(م) لە ئەبی دەرداوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس دە ئایەت لە سەرەتای سورەتی (الکهف) لەبەربکات، لە دەجال پارێزراو دەبێت).**

■ وفي رواية: قَالَ: (مِنْ آخِرِ الْكَهْفِ).

**لە ریوایەتێکدا: (لە کۆتایی سورەتی (الكهف)).**

**٥٣٤-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ فِيمَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ الْعَتِيقِ. [مي٣٤٥٠]

* موقوف إسناده صحيح.

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: هەر کەس لە شەوی جومعە سورەتی (الكهف) بخوێنێت ئەوەندە نووری بۆ هەڵدەکات نێوان خۆی و "البيت العتيق"[1] رۆشن بکاتەوە.**

## ٦- دەروازەی: فەزڵی سورەتی (السجدة)

**٥٣٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لاَ يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ بِتَنْزِيلَ السَّجْدَةِ وَبتَبَارَكَ. [ت٢٨٩٢/ مي٣٤٥٤]

* صحيح.

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نەدەخەوت تا (تنزيل السجدة و تبارك)ی دەخوێند.**

**٥٣٦-** عَنْ كَعْبِ الأَحْبَارِ قَالَ: مَنْ قَرَأَ تَنْزِيلُ السَّجْدَةَ، وَ ﴿تَبَـٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾، كُتِبَ لَهُ سَبْعُونَ حَسَنَةً، وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا سَبْعُونَ سَيِّئَةً، وَرُفِعَ لَهُ بِهَا سَبْعُونَ دَرَجَةً. [مي٣٤٥٢]

* موقوف، إسناده صحيح.

**لە کەعبی ئەحبارەوە، وتی: هەر کەس (تنزيل السجدة و ﴿تَبَـٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾ بخوێنێت، حەفتا چاکەی بۆ دەنوسرێت، و حەفتا خراپەی لێ هەڵدەوەرێت، و بەوە حەفتا پلەی بۆ بەرز دەکرێتەوە).**

---

[1] **"البيت العتيق" واتە: خانە دێرینەکە کە بریتییە لە کەعبەی موشەرەف-و.**

## ٧- دەروازەی: فەزڵی سورەتی (يس)

**٥٣٧**– عن صَفْوَانَ، حَدَّثَنِي الْمَشْيَخَةُ: أَنَّهُمْ حَضَرُوا غُضَيْفَ بْنَ الْحَارِثِ الثُّمَالِيَّ حِينَ اشْتَدَّ سَوْقُهُ، فَقَالَ: هَلْ مِنْكُمْ أَحَدٌ يَقْرَأُ ﴿يسٓ﴾؟ قَالَ: فَقَرَأَهَا صَالِحُ بْنُ شُرَيْحٍ السَّكُونِيُّ، فَلَمَّا بَلَغَ أَرْبَعِينَ مِنْهَا قُبِضَ، قَالَ: فَكَانَ الْمَشْيَخَةُ يَقُولُونَ: إِذَا قُرِئَتْ عِنْدَ الْمَيِّتِ خُفِّفَ عَنْهُ بِهَا.

[حم١٦٩٦٩]

* أثر إسناده حسن.

**لە صەفوانەوە، پیران بۆیان باس کردم: کاتێك "غضيف بن الحارث الثمالي" کەوتە سەرەمەرگ ئەوان لەسەری ئامادە بوون، وتی: ئایا کەس لە ئێوە هەیە ﴿يسٓ﴾ بخوێنێت؟ وتی: "صالح بن شريح السكوني" خوێندی، کاتێك گەیشتە ئایەتی چل گیانی سپارد، وتی: پیران دەیانوت: گەر لای مردوو بیخوێنی بەوە ئازاری لەسەر سووك دەبێت.**

## ٨- دەروازەی: فەزڵی (حم الدخان)

**٥٣٨**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عِيسَى قَالَ: أُخْبِرْتُ أَنَّهُ مَنْ قَرَأَ ﴿حمٓ﴾ الدُّخَانَ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، إِيمَاناً وَتَصْدِيقاً بِهَا أَصْبَحَ مَغْفُوراً لَهُ. [مي٣٤٦٣]

* موقوف، إسناده صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عیساوە، وتی: هەواڵم پێدراوە هەر کەس لە شەوی جومعەدا ﴿حمٓ﴾ الدُّخَانَ، بە ئیمان و بەڕاستزانینەوە بخوێنێت ڕۆژی لێدەبێتەوە و خودا لە گوناهەکانی خۆشبووە.**

## ٩- دەروازەی: فەزڵی سورەتی (الملك)

**٥٣٩**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ سُورَةً مِنَ الْقُرْآنِ ثَلاَثُونَ آيَةً شَفَعَتْ لِرَجُلٍ حَتَّى غُفِرَ لَهُ، وَهِيَ سُورَةُ ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾)**.

[د١٤٠٠/ ت٢٨٩١/ جه٣٧٨٦]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (سورەتێك لە قورئاندا سی ئایەتە شفاعەتی بۆ پیاوێك کرد تا لێخۆشبوون، ئەوەش سورەتی: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾ە).**

## ١٠- دەروازەی: فەزڵی سورەتی (الزلزلة)

**٥٤٠**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **﴿إِذَا زُلْزِلَتِ﴾ تَعْدِلُ نِصْفَ الْقُرْآنِ، و﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾ تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ، و﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ①﴾ تَعْدِلُ رُبُعَ الْقُرْآنِ)**. [ت٢٨٩٤]

* صحيح، دون فضل ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ﴾.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (﴿إِذَا زُلْزِلَتِ﴾ هاوتای نیوەی قورئانە، ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾ هاوتای سێیەکی قورئانە، ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ①﴾ هاوتای چارەکێکی قورئانە).**

## ١١- دەروازەی: فەزڵی ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾

**٥٤١**- عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَجِيءُ مَا جَاءَ بِكَ)**؟ قَالَ: جِئْتُ لِتُعَلِّمَنِي شَيْئاً أَقُولُهُ عِنْدَ مَنَامِي، فقَالَ: **(فَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ**

فَاقْرَأْ ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، ثُمَّ نَمْ عَلَى خَاتِمَتِهَا، فَإِنَّهَا بَرَاءَةٌ مِنَ الشِّرْكِ).

لفظ الدارمي. [د٥٠٥٥/ ت٣٤٠٣/ مي٣٤٧٠]

* صحيح.

لە فەروەری کوڕی نەوفلەوە، لە باوکییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هاتنی ئەوەی تۆی هێناوە؟**[1]**)**، وتی: هاتووم شتێکم فێر بکەی لە کاتی نووستنم بیخوێنم، فەرمووی: **(گەر چوویتە ناو جێی پاڵدانەوە و نووستن ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ بخوێنە، پاشان لەسەر خاتیمەکەی**[2] **بخەوە، ئەوە بەریبوونە لە هاوەڵدانان)**

## ١٢- دەروازەی: فەزڵی ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾

**٥٤٢-** (ق) عَنْ عائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم بَعَثَ رَجُلاً عَلَى سَرِيَّةٍ، وَكَانَ يَقْرَأُ لأَصْحَابِهِ فِي صَلاَتِهِ فَيَخْتِمُ بِـ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾، فَلَمَّا رَجَعُوا ذَكَرُوا ذٰلِكَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**سَلُوهُ، لأَيِّ شَيْءٍ يَصْنَعُ ذٰلِكَ**) ؟ فَسَأَلُوهُ فَقَالَ: لأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمٰنِ، وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللهَ يُحِبُّهُ**). [خ٧٣٧٥/ م٨١٣]

(ق) لە عائیشەوە: پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێکی لەسەر سریەیەك ڕەوانە کرد، ئەو لە نوێژەکەیدا بۆ هاوەڵەکانی قورئانی دەخوێند و بە ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾ کۆتایی بە خوێندنەوەکەی دەهێنا، کاتێك گەڕانەوە ئەوەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد، فەرمووی: **(پرسیاری لێ بکەن بۆ چ شتێك ئەو کارەی دەکرد؟)**، ئەوانیش پرسیاریان لێکرد، وتی: چونکە سیفەتی ڕەحمانە، من پێمخۆشە بیخوێنم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەواڵی پێ بدەن خودا ئەوی خۆشدەوێت)**.

---

[1] واتە: بۆچی هاتووی؟-و.

[2] واتە: کاتی تەواوبوونی سورەتەکە و کۆتایی سورەتەکە-و.

**٥٤٣**- (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: أَنَّ رَجُلاً سَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ: ﴿**قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ**①﴾. يُرَدِّدُهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَذَكَرَ ذلِكَ لَهُ، وَكَأَنَّ الرَّجُلَ يَتَقَالُّهَا، فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ**). [خ٥٠١٣]

(خ) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پیاوێك گوێی لە پیاوێك بوو: ﴿**قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ**①﴾ی دەخوێند و دووبارەی دەکردەوە، کاتێك ڕۆژی لێبوویەوە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوەی بۆ باس کرد، پیاوەکە ئەوەی بە کەم تەماشا دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، ئەوە هاوتای سێیەکی قورئانە)**.

**٥٤٤**- (م) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يِقْرَأَ فِي لَيْلَةٍ ثُلُثَ الْقُرْآنِ**) ؟ قَالُوا: وَكَيْفَ يَقْرَأُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ؟ قَالَ: (﴿**قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ**①﴾، **تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ**). [م٨١١]

(م) لە ئەبی دەرداوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ئایا یەکێك لە ئێوە دەستەوسانە لە یەك شەودا سێیەکی قورئان بخوێنێت؟)**، وتیان چۆن سێیەکی قورئان دەخوێنێت؟ فەرمووی: (﴿**قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ**①﴾، **هاوتای سێیەکی قورئانە)**.

**٥٤٥**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم (**احْشُدُوا، فَإِنِّي سَأَقْرَأُ عَلَيْكُمْ ثُلُثَ الْقُرْآنِ**) فَحَشَدَ مَنْ حَشَدَ، ثُمَّ خَرَجَ نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَرَأَ: ﴿**قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ**﴾، ثُمَّ دَخَلَ، فَقَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ: إِنِّي أُرَى هَذَا خَبَرٌ جَاءَهُ مِنَ السَّمَاءِ، فَذَاكَ الَّذِي أَدْخَلَهُ، ثُمَّ خَرَجَ نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**إِنِّي قُلْتُ لَكُمْ: سَأَقْرَأُ عَلَيْكُمْ ثُلُثَ الْقُرْآنِ، أَلاَ إِنَّهَا تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ**). [م٨١٢]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کۆببنەوە، چونکە من سێیەکی قورئانتان بەسەردا دەخوێنمەوە)**، ئەوەی کۆبوویەوە کۆبوویەوە،

پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە دەرەوە و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ی خوێندەوە، پاشان ڕۆیشتە ژوورەوە، یەكێكمان بە یەكێكی تری وت: من وا دەبینم ئەوە هەواڵێكە لە ئاسمانەوە بۆی هاتووە، ئەوە بوو بردییە ژوورەوە، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە دەرەوە و فەرمووی: (**من بە ئێوەم وت: سێیەكی قورئان بەسەر ئێوەدا دەخوێنم، ئاگادار بن ئەوە**[1] **هاوتای سێیەكی قورئانە**).

## ١٣- دەروازەی: فەزڵی (المعوذات)

**٥٤٦-** (خ) عَنْ عائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ، جَمَعَ كَفَّيْهِ ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا، فَقَرَأَ فِيهِمَا: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، وَ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾، و﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾، ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا ما اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ، يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رأْسِهِ وَوَجْهِهِ، وَما أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ، يَفْعَلُ ذلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ. [خ٥٠١٧]

(خ) لە عائیشەوە: پێغەمبەر(ﷺ) كە هەموو شەو دەچوو بۆ ناو جێگەكەی دوو دەستی كۆدەكردەوە و فووی پیادا دەكردن، ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ی پیادا دەخوێندن، پاشان چەند بیتوانیبا بە جەستەی خۆیدا دەهێنا، لە سەر و ڕوخسار و پێشەوەی جەستەی دەستی پێ دەكرد، ئەوەی سێ جار ئەنجام دەدا.

- زاد في رواية: قَالَتْ عَائِشَةُ: فَلَمَّا اشْتَكَى كَانَ يَأْمُرُنِي أَنْ أَفْعَلَ ذَلِكَ بِهِ. [خ٥٧٤٨]

لە ڕیوایەتێكدا ئەمەی زیاد كردووە: عائیشە وتی: كاتێك نەخۆشكەوت فەرمانی بە من دەكرد ئەوەی بۆ بكەم.

**٥٤٧-** (م) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَلَمْ تَرَ آيَاتٍ أُنْزِلَتِ اللَّيْلَةَ لَمْ يُرَ مِثْلُهُنَّ قَطُّ؟ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾، وَ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾). [م٨١٤]

---

[1] واتە: سورەتی: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ـ و.

(م) لە عوقبەی كوڕی عامرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئایا دەزانن ئەم شەو كۆمەڵێك ئایەتێك دابەزیوە نموونەیان هەرگیز دانەبەزیوە؟ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾).**

## ١٤- دەروازەی: فەزڵی هەندێ سورەت

**٥٤٨**– عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ قَالَ: تَعَلَّمُوا سَورَةَ البَقَرَةِ، وَسُورَةَ النِّسَاءِ، وَسُورَةَ المائِدَةِ، وَسُورَةِ الحَجِّ، وَسُورَةَ النُّورِ؛ فَإِنَّ فِيهِنَّ الفَرَائِضَ. [ك٣٤٩٣]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە عومەری كوڕی خەتابەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: سورەتی (البقرة) و سورەتی (النساء) و سورەتی (المائدة) و سورەتی (الحج) و سورەتی (النور) فێرببن، چونكە فەرزەكانیان تێدان.**

# بەشی چوارەم

## سوژدەی قورئان

### ١- دەروازەی: فەزڵی سوژدەی تیلاوە و حوکمەکانی

**٥٤٩-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَقْرَأُ عَلَيْنَا السُّورَةَ فِيهَا السَّجْدَةُ، فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ، حَتَّى مَا يَجِدُ أَحَدُنَا مَوْضِعَ جَبْهَتِهِ. [خ١٠٧٥/ م٥٧٥]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) سورەتێکی بەسەر ئێمەدا دەخوێندەوە سوجدەی تێدا بوو، ئەو سوژدەی دەبرد و ئێمەش سوژدەمان دەبرد، تا یەکێك لە ئێمە شوێنی ناوچاوانی نەدەبینییەوە.**

**٥٥٠-** (خ) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ: أنه قَرَأَ يَوْمَ الجُمُعَةِ عَلَى المِنْبَرِ بِسُورَةِ النَّحْلِ، حَتَّى إِذَا جاءَ السَّجْدَةَ نَزَلَ فَسَجَدَ، وَسَجَدَ النَّاسُ، حَتَّى إِذَا كانَتِ الجُمُعَةُ الْقَابِلَةُ، قَرَأَ بِهَا، حَتَّى إِذَا جَاءَ السَّجْدَةَ، قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّا نَمُرُّ بِالسُجُودِ، فَمَنْ سَجَدَ فَقَدْ أَصَابَ، وَمَنْ لَمْ يَسْجُدْ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ. وَلَمْ يَسْجُدْ عُمَرُ ﷺ.

**(خ) لە عومەری کوڕی خەتابەوە(خوا لێی رازی بێت): لە رۆژی جومعە لەسەر مینبەر سورەتی (النحل)ی خوێندەوە، تا گەیشتە سەجدە، دابەزی و سوژدەی برد و خەڵکیش سوژدەیان برد، جومعەی داهاتوو هاتە بەرەوە و سورەتەکەی خوێندەوە و تا گەیشتە سەجدە وتی: خەڵکینە، ئێمە بە سوژدەکاندا گوزەر دەکەین، هەر کەس سوژدە ببات پێکاویەتی، هەر کەس سوژدە نەبات گوناهی لەسەر نییە، عومەر(خوا لێی رازی بێت) سوژدەی نەبرد.**

- وَزَادَ نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: إِنَّ اللهَ لَمْ يَفْرِضِ السُّجُودَ؛ إِلاَّ أَنْ نَشَاءَ. [خ١٠٧٧]

نافیع، لە ئیبن عومەرەوە، ئەمەی زیاد كردووە: خودا سوژدەی فەرز نەكردووە، مەگەر خۆمان بمانەوێت.

**٥٥١**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ، اعْتَزَلَ الشَّيْطَان يَبْكِي، يَقُولُ: يَا وَيْلَهُ! . وَفِي رِوَايَةِ أَبِي كُرَيْبٍ: يَا وَيْلِي! . أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ، وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ فَلِيَ النَّارُ). [م٨١]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئادەمیزاد سوژدەی خوێندەوە**[1] **و سوژدەی برد، شەیتان كەنارگیر دەبێت و دەگری، دەڵێت: هاوار بە حاڵی**–لە ریوایەتەكەی ئەبی كورەیبدا: **هاوار بە حاڵم– ئیبن ئادەم فەرمانی پێكرا بە سوژدە و سوژدەی برد و بەهەشتی بۆ هەیە، من فەرمانم پێكرا بە سوژدە، نەمبرد، و ئاگرم بۆ هەیە).**

## ٢- دەروازەی: ئەو سورەتانەی سەژدەیان تێدایە

**٥٥٢**- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَرَأَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم النَّجْمَ بِمَكَّةَ، فَسَجَدَ فِيهَا وَسَجَدَ مَنْ مَعَهُ، غَيْرَ شَيْخٍ أَخَذَ كَفّاً مِنْ حَصى، أَوْ تُرابٍ، فَرَفَعَهُ إِلَى جَبْهَتِهِ، وَقَالَ: يَكْفِينِي هَذَا، فَرَأَيْتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ قُتِلَ كافِراً. [خ١٠٦٧/ م٥٧٦]

**(ق) لە عەبدوڵای كوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە مەككە (النجم)ی خوێندەوە، سوژدەی تیابرد و ئەوانەی لەگەڵی بوون سوژدەیان برد، جگە لە پیرێك مشتێك چەو، یان خۆڵی هەڵگرت و بەرزی كردەوە بۆ ناوچاوانی، و وتی: ئەمە بەسە بۆ من، لەدوای ئەوە بینیم بە بێباوەڕی كوژرا.**

**٥٥٣**- عَنِ الْأَعْرَجِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَرَأَ بِـ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ﴾، فَسَجَدَ فِيهَا، ثُمَّ قَامَ فَقَرَأَ بِسُورَةٍ أُخْرَى. [ط٤٨١]

* إسناده منقطع.

---

[1] واتە: ئایەتێكی خوێندەوە سوژدەی تێدا بوو.

**لە ئەعرەجەوە: عومەری کوڕی خەتاب (﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ﴾ [النجم: ١])ی خوێندەوە، سوژدەی تێدا برد، پاشان هەستا و سورەتێکی تری خوێند.**

**٥٥٤**- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ﴿صٓ﴾ لَيْسَ مِنْ عَزَائِمِ السُّجُودِ، وَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَسْجُدُ فِيهَا. [خ١٠٦٩]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) وتی: سوژدەی ﴿صٓ﴾، لە سوژدەی پێ لەسەرداگیراو نییە، پێغەمبەرم(ﷺ) بینی تیایدا سوژدەی دەبرد.**

**٥٥٥**- (ق) عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ الْعَتَمَةَ، فَقَرأَ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١﴾ [الانشقاق: ١]، فَسَجَدَ، فَقُلْتُ لَهُ، قَالَ: سَجَدْتُ خَلْفَ أَبِي الْقَاسِمِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلاَ أَزَالُ أَسْجُدُ بِهَا حَتَّى أَلْقَاهُ. [خ٧٦٦/ م٥٧٨]

**(ق) لە ئەبی رافیعەوە وتی: نوێژی عیشام لەگەڵ ئەبی هورەیرە ئەنجامدا، (﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١﴾ [الانشقاق: ١])ی خوێندەوە و سوژدەی برد، لەو بارەیەوە لێم پرسی، وتی: لەدوای باوکی قاسمەوە(ﷺ) سوژدەم برد[1]، بەردەوام بەوە سوژدە دەبەم تا بە خزمەتی دەگەم.**

**٥٥٦**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ يَسْجُدُ فِي سُورَةِ الْحَجِّ سَجْدَتَيْنِ. [ط ٤٨٠]

* إسناده صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی دینارەوە وتی: عەبدوڵای کوڕی عومەرم بینی لە سورەتی (الحج) دوو سوژدەی دەبرد.**

**٥٥٧**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: فِي سُورَةِ الحَجِّ سَجْدَتَانِ. [ك٣٤٧٢]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: لە سورەتی (الحج) دوو سوژدە هەیە.**

---

[1] **واتە: سوژدەی تیلاوەم برد–و.**

## ٣- دەروازەی: ئەوەی لە سوژدەی قورئاندا دەوترێت

**٥٥٨**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي رَأَيْتُنِي اللَّيْلَةَ، وَأَنَا نَائِمٌ، كَأَنِّي أُصَلِّي خَلْفَ شَجَرَةٍ، فَسَجَدْتُ، فَسَجَدَتِ الشَّجَرَةُ لِسُجُودِي، فَسَمِعْتُهَا وَهِيَ تَقُولُ: اللَّهُمَّ اكْتُبْ لِي بِهَا عِنْدَكَ أَجْراً، وَضَعْ عَنِّي بِهَا وِزْراً، وَاجْعَلْهَا لِي عِنْدَكَ ذُخْراً، وَتَقَبَّلْهَا مِنِّي، كَمَا تَقَبَّلْتَهَا مِنْ عَبْدِكَ دَاوُدَ.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَقَرَأَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم سَجْدَةً ثُمَّ سَجَدَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَسَمِعْتُهُ وَهُوَ يَقُولُ مِثْلَ مَا أَخْبَرَهُ الرَّجُلُ عَنْ قَوْلِ الشَّجَرَةِ.		[ت٥٧٩، ٣٤٢٤/ جه١٠٥٣]

* حسن.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من ئەم شەو لە خەودا بینیم وەك ئەوەی لە پشت درەختێکەوە نوێژ بکەم، سوژدەم برد و درەختەکەش بە سوژدەکەی من سوژدەی برد، گوێم لێبوو دەیوت: (أللهم اکتب لي بها عندك أجرا، وضع عني بها وزرا، واجعلها لي عندك ذخرا وتقبلها مني کما تقبلتها من عبدك داود–خودایە بەم سوژدەیە لای خۆت پاداشتم بۆ بنووسە، و بەهۆیەوە گوناهم لێ بکەرەوە، و لای خۆت بۆم بکە بە توێشوو و لێم قبووڵ بکە وەك چۆن لە بەندەکەی خۆت داود قبووڵت کرد).**

**ئیبن عەباس وتی: پێغەمبەر(ﷺ) سوژدەیەکی خوێندەوە و پاشان سوژدەی برد، ئیبن عەباس وتی: گوێم لێبوو ئەوەی دەفەرموو پیاوەکە هەواڵی پێدابوو لە قسەی درەختەکە.**

**٥٥٩**– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ فِي سُجُودِ الْقُرْآنِ بِاللَّيْلِ: (سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ). لفظ الترمذي.		[د١٤١٤/ ت٥٨٠/ ١١٢٨٠]

* صحيح.

**لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە سوژدەکانی قورئاندا بە شەو دەیفەرموو: (سجد وجهي للذي خلقه، وشق سمعه وبصره بحوله وقوته–روخسارم**

سوژدە دەبات بۆ ئەو کەسەی دروستی کردووە، و بە هەوڵ و هێزی خۆی بیستن و بینینی بۆ کردووەتەوە).

## ٤- دەروازەی: ژمارەی سوژدەکانی قورئان

**٥٦٠-** عَن عَمرِو بنِ العَاصِ: أن النبيَّ - صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّم - أَقْرَأَهُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَجدَةً فِي القُرآنِ، منها: ثَلاَثَ عشْرةَ فِي المفصَّلِ، وفِي سورةِ الحَجِّ سَجدتانِ. [د١٤٠١/ جه١٠٥٧]

* ضعيف.

**لە عەمری کوڕی عاصەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پازدە سوژدەی لە قورئان پێخوێند، لەوانە: سیانیان لە "المفصل" بوون[1]، لە سورەتی (الحج)یش دوو سوژدە.**

**٥٦١-** عَنْ عَليّ ﷺ قَالَ: عَزَائِمُ السُّجودِ فِي القُرْآنِ: ﴿الٓمٓ تَنزِيلُ﴾و ﴿حمٓ تَنزِيلٌ﴾ السجدة، و(النجم)، و﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ﴾. [ك٣٩٥٧]

* قال الذهبي: صحيح.

**لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: سوژدەی پێ لەسەر داگیراو لە قورئاندا: ﴿الٓمٓ تَنزِيلُ﴾، ﴿حمٓ تَنزِيلٌ﴾ السجدة، و(النجم)، ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ﴾.**

## ٥- دەروازەی: ئایا بۆ سوژدەی تیلاوە "الله أكبر" دەکرێت؟

**٥٦٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقْرَأُ عَلَيْنَا الْقُرْآنَ، فَإِذَا مَرَّ بِالسَّجْدَةِ كَبَّرَ، وَسَجَدَ وَسَجَدْنَا.

قَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ: وَكَانَ الثَّوْرِيُّ يُعْجِبُهُ هَذَا الْحَدِيثُ.

قَالَ أَبُو دَاوُد: يُعْجِبُهُ لِأَنَّهُ كَبَّرَ. [د١٤١٣]

* منكر بذكر التكبير، والمحفوظ دونه

[1] "المفصل" لە سورەتی (الحجرات) یان (ق)ەوە دەست پێ دەکات تا سورەتی (الناس)-و

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) قورئانی بەسەردا دەخوێندین، کاتێک بە سوژدەدا گوزەری دەکرد "الله أکبر"ی دەکرد و سوژدەی دەبرد و سوژدەمان دەبرد.

عبدالرزاق وتی: سەوری بەم فەرموودە سەرسام بوو.

ئەبو داود وتی: پێی سەرسام بوو چونکە "الله أکبر"ی کردووە.

## ٦- دەروازەی: ئایا کاتە نەهیلێکراوەکان سوژدەی تلاوەی قورئان دەبرێت؟

**٥٦٣-** عَنْ أَبِي تَمِيمَةَ الْهُجَيْمِيِّ قَالَ: لَمَّا بَعَثْنَا الرَّكْبَ . قَالَ أَبُو دَاوُد: يَعْنِي: إِلَى الْمَدِينَةِ . قَالَ: كُنْتُ أَقُصُّ بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ فَأَسْجُدُ، فَنَهَانِي ابْنُ عُمَرَ، فَلَمْ أَنْتَهِ، ثَلاَثَ مِرَاتٍ، ثُمَّ عَادَ فَقَالَ: إِنِّي صَلَّيْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ ﭫ، فَلَمْ يَسْجُدُوا حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ. [د١٤١٥]

* صحيح بمتابعاته (شعيب).

لە ئەبی تەمیمەی هوجەیمییەوە، وتی: کاتێ دەستەیەك ڕەوانە کراین-ئەبو داود دەڵێ: واتە: بۆ مەدینە- وتی: لەدوای نوێژی بەیانی قورئانم دەخوێند و سوجدەم دەبرد، ئیبن عومەر سێ جار نەهی لێکردم، بەڵام من دەستم هەڵنەگرت، پاشان چەند بارەی کردەوە و وتی: لە دوای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمانەوە(خوایان لێ ڕازی بێت) نوێژم کرد سوژدەیان نەدەبرد تا خۆر هەڵدەهات.

## ٧- دەروازەی: ئایا لەشپیس و حەیزدار سوژدە دەبات؟

**٥٦٤-** عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: إِذَا سَمِعَ الْحَائِضُ وَالْجُنُبُ «السَّجْدَةَ»، يَغْتَسِلُ الْجُنُبُ وَيَسْجُدُ، وَلاَ تَقْضِي الْحَائِضُ؛ لِأَنَّهَا لاَ تُصَلِّي. [مي١٠١٦]

* إسناده صحيح

لە ئیبراهیمەوە، وتی: گەر حەیزدار و لەشپیس گوێی لە ((سەجدە)) بوو، لەشپیس خۆی دەشۆرێ و سوژدە دەبات، حەیزدار قەزای سوژدەکە ناکاتەوە، چونکە نوێژ ناکات.

## دەروازەی: ئەو کەسەی قورئان بە بۆچوونی خۆی تەفسیر دەکات

**٥٦٥**– عن جندب بن عبد الله قال: قال رسول الله صلّى الله عليه وسلّم: **(من قال في كتاب الله عزّ وجل برأيه فأصاب، فقد أخطأ)**. [د٣٦٥٢/ ت٢٩٥٢]

* ضعيف.

**لە جوندوبی کوڕی عەبدولاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس بە بۆچوونی خۆی دەربارەی کتێبەکەی خودا وتی و پێکای[1]، ئەوە هەڵەی کردووە).**

## (١)
## سورة الفاتحة

**٥٦٦**– (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ المعَلَّى قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي فِي المسْجِدِ، فَدَعَانِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَلَمْ أُجِبْهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي كُنْتُ أُصَلِّي، فَقَالَ: **(أَلَمْ يَقُلِ اللهُ: ﴿ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾** [الأنفال:٢٤])، ثمَّ قَالَ لِي: **(لأُعَلِّمَنَّكَ سُورَةً هِيَ أَعْظَمُ السُّوَرِ فِي القُرْآنِ، قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ مِنَ المَسْجِدِ)**. ثمَّ أَخَذَ بِيَدِي، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ، قُلْتُ لَهُ: أَلَمْ تَقُلْ: **(لأُعَلِّمَنَّكَ سُورَةً هِيَ أَعْظَمُ سُورَةٍ فِي القُرْآنِ)**، قَالَ: **(﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾**[الفاتحة]: **هِيَ السَّبْعُ المثَانِي، وَالقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ)**. [خ٤٤٧٤]

**(خ) لە ئەبی سەعیدی مەعەللاوە، وتی: لە مزگەوت نوێژم دەکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بانگی کردم و وەڵامم نەدایەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا من نوێژم دەکرد، فەرمووی: (خودا نەیفەرمووە: ﴿ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ [الأنفال:٢٤] –وەڵامی خودا و پێغەمبەر بدەنەوە گەر بانگیان کردن بۆ ئەو شتەی زیندووتان دەکاتەوە؟)، پاشان پێی فەرمووم: (سورەتێکت فێر دەکەم**

---
[1] واتە: بە بۆچوونی خۆی قورئانی تەفسیر کرد و لە بۆچوونەکەیدا راستی کرد–و

**مەزنترین سورەتە لە قورئاندا)، فەرمووی: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[الفاتحة]، ئەوە "السبع المثاني"[1] و قورئانی مەزنە کە بە من دراوە).**

٥٦٧- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أُمُّ القُرْآنِ هِيَ: السَّبْعُ المَثَانِي، وَالقُرْآنُ العَظِيمُ). [خ٤٧٠٤]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: "أم القرآن-دایکی قورئان" بریتییە لە "السبع المثاني"، و "القرآن العظیم-قورئانی مەزن".

٥٦٨- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الْيَهُودُ مَغْضُوبٌ عَلَيْهِمْ، وَالنَّصَارَى ضُلاَّلٌ). [ت٢٩٥٤]

* صحيح.

لە عەدی کوڕی حاتەمەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(یەهوود خەشملێگیراوانن(المغضوب علیهم)، و نەصاراش سەرلێشێواوان(ضُلاّل)[2])**.

٥٦٩- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ: أَنَّهَا ذَكَرَتْ قِرَاءَةَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤﴾، يُقَطِّعُ قِرَاءَتَهُ آيَةً آيَةً.

لە ئوم سەلەمەوە، ئەو خوێندنەوەی پێغەمبەری خودای(ﷺ) باس کرد: (﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤﴾ پێغەمبەر ئایەت ئایەت خوێندنەوەکەی دەبڕی[3].

---

[1] ئەو حەوت ئایەتەی مەدح و سەنای خودایان پێ دەکرێت و لە نوێژەکاندا دووبارە دەکرێنەوە، یان ئەو سورەتەی دوو جار دابەزیوە-و.

[2] تەفسیری ئایەتی: ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ﴾[الفاتحة: ٧] -و

[3] واتە نێوان و وەستانی دەخستە نێوان ئایەتەکان-و.

- ولفظ الترمذي: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُقَطِّعُ قِرَاءَتَهُ يَقْرَأُ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، ثُمَّ يَقِفُ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، ثُمَّ يَقِفُ، وَكَانَ يَقْرَؤُهَا: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾. [د٤٠٠١/ ت٢٩٢٧]

* صحيح.

لەفزەكەی ترمزی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) خوێندنەوەكەی خۆی دەبڕی، ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ی دەخوێند، پاشان دەوەستا: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ پاشان دەوەستا، ئەو بە (مَلِكِ يومِ الدِّين) دەیخوێندەوە[1].

٥٧٠- عن عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ: أَنَّهُ أَخْبَرَهُ مَنْ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم. وَهُوَ بِوَادِي الْقُرَى وَهُوَ عَلَى فَرَسِهِ.، وَسَأَلَهُ رَجُلٌ مِنْ بُلْقِينَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَنْ هَؤُلاَءِ؟ قَالَ: (هَؤُلاَءِ الْمَغْضُوبُ عَلَيْهِمْ) وَأَشَارَ إِلَى الْيَهُودِ، فَقَالَ: مَنْ هَؤُلاَءِ؟ قَالَ: (هَؤُلاَءِ الضَّالُّون)؛ يَعْنِي: النَّصَارَى. قَالَ: وَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: اسْتُشْهِدَ مَوْلاَكَ. أَوْ قَالَ: غُلاَمُكَ. فُلاَنٌ، قَالَ: (بَلْ هُوَ يُجَرُّ إِلَى النَّارِ فِي عَبَاءَةٍ غَلَّهَا). [حم٢٠٧٣٦]

* إسناده صحيح.

لە عەبدوڵای كوڕی شەقیقەوە، یەكێك گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووە هەواڵی پێداوە-ئەو لە "وادي القرى" بووە و لەسەر ئەسپەكەی بووە- پیاوێك لە "بُلْقِينَ" پرسیاری لێكرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەوانە كێن؟ فەرمووی: (**هؤلاء المغضوب عليهم-ئەوانە خەشملێگیراوانن**)، ئاماژەی كرد بۆ یەهوود، وتی: ئەی ئەوانە كێن؟ فەرمووی: (**هؤلاء الضالون-ئەوانە سەرلێشێواوانن**)، واتە نەصارا، وتی: پیاوێك هات بۆ لای و وتی: مەولاكەت-یان وتی: غوڵامەكەت- شەهید بوو، فەرمووی: (**بەڵكو ئەو رادەكێشرێت بۆ ئاگر لەسەر عەبایەك لایخستبوو**[2]).

---

[1] واتە: (مالكِ يومِ الدين)ی بە (مَلِكِ يومِ الدين) دەخوێندەوە-و.

[2] واتە: عەبایەكی لە غەنیمەت بە ناڕەوا بۆ خۆی لاخستبوو-و.

٥٧١- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾. قَالَ: الجِنُّ والإِنْسُ. [ك٣٠٢١]

لە ئیبن عەباسەوە دەربارەی فەرموودەی خودا(عز وجل): ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ وتی: جنۆکە و مرۆڤ[1].

٥٧٢- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، وعَنْ أُنَاسٍ مِنْ أصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾. قَالَ: هُوَ يَوْمُ الحِسَابِ. [ك٣٠٢٢]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

لە عەبدولڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، هەروەها لە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە(ﷺ):﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾، وتی: ئەوە ڕۆژی حسابە[2].

## (٢)

## سورة البقرة

### ئایەتی: ﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ [البقرة: ٢]

٥٧٣- (خ) قَالَ مَعْمَرٌ: ﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ﴾ هَذَا الْقُرْآنُ. ﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾: بَيَانٌ وَدِلاَلَةٌ. ﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾: لاَ شَكَّ. ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ﴾؛ يَعْنِي: هَذِهِ أَعْلاَمُ الْقُرْآنِ.

[خ. التوحيد، باب ٤٦]

(خ) مەعمەر وتی: ﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ﴾ ئەم قورئانە، ﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ بەیان کردن و ڕێنموونی کردنە، ﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ شکی تێدا نییە، ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ﴾ واتە: ئەمانە بەیداخ و مەشخەڵی قورئانن.

---

[1] واتە: تەفسیری وشەی (العالمین)ی کرد بە جنۆکە و مرۆڤ-و.

[2] واتە: (یوم الدین) بریتییە لە ڕۆژی حساب-و.

### ئایەتی: ﴿وَأُتُوا۟ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ [البقرة: ٢٥]

٥٧٤- (خ) قَالَ أَبُو الْعَالِيَةِ: ﴿كُلَّمَا رُزِقُوا۟﴾: أُتُوا بِشَيْءٍ، ثُمَّ أُتُوا بِآخَرَ. ﴿قَالُوا۟ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ﴾: أُتِينَا مِنْ قَبْلُ. ﴿وَأُتُوا۟ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ يُشْبِهُ بَعْضُهُ بَعْضاً، وَيَخْتَلِفُ فِي الطُّعُومِ. [خ. بدء الخلق، باب ٨]

(خ) ئەبو عالییە دەڵێت: ﴿كُلَّمَا رُزِقُوا۟﴾ هەرکات شتێکیان بۆ دەهێنرێت، پاشان شتێکی تریان بۆ دەهێنرێت، ﴿قَالُوا۟ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ﴾: پێشتر پێمان درا و بۆمان هێنرا، ﴿وَأُتُوا۟ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ هەندێکی لە هەندێکی تر دەچێت، بەڵام لە تام و چێژدا لەیەکتر جیاوازن.

### ئایەتی: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ [البقرة: ٣٧]

٥٧٥- (خ) قَالَ أَبُو الْعَالِيَةِ: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ فَهُوَ قَوْلُهُ: ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا﴾ [الأعراف:٢٣]. [خ. الأنبياء، باب ١]

(خ) ئەبو عالییە دەڵێت: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ **بریتییە لە ئایەتی: ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا﴾.**

### ئایەتی: ﴿وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ﴾ [البقرة: ٥٨]

٥٧٦- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (قِيلَ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ: ﴿وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ﴾، فَبَدَّلُوا، فَدَخَلُوا يَزْحَفُونَ عَلَى أَسْتَاهِهِمْ، وَقالُوا: حَبَّةٌ فِي شَعْرَةٍ). [خ٣٤٠٣/ م٣٠١٥]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بە بەنی ئیسرائیل وترا: ﴿وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا وَقُولُواْ حِطَّةٞ﴾، ئەوان گۆڕییان، لەسەر پاشیان چوونە ژوورەوە و وتیان: "حبة في شعرة[1]").**

**ئایەتی: ﴿قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ﴾ [البقرة: ٦٨]**

**٥٧٧-** (خـ) قَالَ أَبُو الْعَالِيَةِ: الْعَوَانُ: النَّصَفُ بَيْنَ الْبِكْرِ وَالْهَرِمَةِ. ﴿فَاقِعٞ﴾: صَافٍ. ﴿لَّا ذَلُولٞ﴾: لَمْ يُذِلَّهَا الْعَمَلُ. ﴿تُثِيرُ ٱلۡأَرۡضَ﴾: لَيْسَتْ بِذَلُولٍ تُثِيرُ الأَرْضَ، وَلاَ تَعْمَلُ فِي الْحَرْثِ. ﴿مُسَلَّمَةٞ﴾ مِنَ الْعُيُوبِ. ﴿لَّا شِيَةَ﴾: بَيَاضٌ. ﴿صَفۡرَآءُ﴾ إِنْ شِئْتَ سَوْدَاءُ. ﴿فَٱدَّٰرَٰٔتُمۡ﴾: اخْتَلَفْتُمْ. [خ. الأنبياء، باب ٣٠]

**(خـ) ئەبو عالییە دەڵێت: (عَوَانٌ) العوان: نیوە لە نێوان بەچکە و پیری(نێون)، ﴿فَاقِعٞ﴾ پاڵفتە[2]،﴿لَّا ذَلُولٞ﴾ بۆ کار رامنەهێنراوە(ژێربار نەکراوە)، ﴿تُثِيرُ ٱلۡأَرۡضَ﴾ رامهاتوو نییە زەوی بکێڵێت و لە کشتوکاڵدا بەکاربهێنرێت، ﴿مُسَلَّمَةٞ﴾ سەلامەت لە نەنگی و ناتەواوی، ﴿لَّا شِيَةَ﴾ سپی، ﴿صَفۡرَآءُ﴾ گەر دەخوازی رەش، ﴿فَٱدَّٰرَٰٔتُمۡ﴾ ناکۆکیتان تیایدا بۆ دروست بوو.**

**ئایەتی: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ يَكۡتُبُونَ ٱلۡكِتَٰبَ بِأَيۡدِيهِمۡ﴾ [البقرة: ٧٩]**

**٥٧٨-** عَنْ ابن عباس في قوله: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ يَكۡتُبُونَ ٱلۡكِتَٰبَ بِأَيۡدِيهِمۡ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشۡتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلٗا﴾[البقرة: ٧٩]. قال: أحبار اليهود وجدوا صفة

[1] واتە: لە جێگەی ئەوەی بە سوژدەوە بچنە ژوورەوە پاشە و پاش لەسەر دوایان چوونە ژوورەوە و وشەی (حطة) کە مانای داواکردنی هەڵوەراندنی گوناهە گۆڕییان بۆ (حبة في شعرة-دەنکە جۆیەك، یان دەنکێك لە گوڵێکدا)، لە ریوایەتێکدا دەفەرموێ: وشەکەیان گۆڕی بۆ (حنطة-گەنم)-و.

[2] رەنگێکی پاڵفتە کە رەنگی تری پێ تێکەڵ نەبووبێت(فاقع لونُها)-و.

محمّد صلّى الله عليه وسلّم مكتوباً في التوراة: أكحلَ العين، ربعةً، جَعْدَ الشعرِ، حسن الوجه، فلما وجدوه في التوراة محَوْهُ حسداً وبغياً، فأتاهم نفرٌ من قريش من أهل مكة، فقالوا: تجدون في التوراة نبياً منا؟ فقالوا: نعم، نجده طويلاً أزرق سبط الشعر، فأنكرت قريش وقالوا: ليس هذا منا. [مخ١٢/١٢٣]

* إسناده صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە دەربارەی ئایەتی: ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَـٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَـٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ [البقرة: ٧٩]، وتی: ئەحباری یەهوود سیفەتی محەمەدیان(ﷺ) لە تەوراتدا بینییەوە نووسرا بوو: چاو رەش، بالا مام ناوەند، قژ لوول، روخسار جوان(شیرین)، کاتێك لە تەوراتدا بینییانەوە سڕیانەوە وەك حەسوودی و شەڕ و خراپە، چەند کەسێك لە قورەیش لە ئەهلی مەککە هاتن بۆ لایان، و وتیان: ئایا لە تەوراتدا پێغەمبەرێك لە ئێمە دەبیننەوە[1]؟ وتیان بەڵێ: دەیبینینەوە: کەسێکی بالابەرزی، چاو شینی، قژ خاو، قورەیش ئەوەیان لا نامۆبوو و وتیان: ئەوە لە ئێمە نییە.**

## ئایەتی: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ﴾ [البقرة: ١١٥]

**٥٧٩**- عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي سَفَرٍ، فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ، فَلَمْ نَدْرِ أَيْنَ الْقِبْلَةُ، فَصَلَّى كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا عَلَى حِيَالِهِ، فَلَمَّا أَصْبَحْنَا ذَكَرْنَا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَنَزَلَ: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ﴾. [ت٣٤٥/ جه١٠٢٠]

* حسن.

**لە عامیری کوڕی رەبیعەوە، وتی: لە سەفەرێك و لە شەوێکی تاریکدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، نەمانزانی قیبلە لە کوێوەیە، هەر پیاوێك لە ئێمە لەسەر**

---

[1] واتە: وەسفی پێغەمبەرێك لە ئێمە دەبیننەوە؟-و.

ئاراستەی خۆی نوێژی دەکرد، کاتێك ڕۆژمان لێبوویەوە ئـەوەمان بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ) باس کرد، ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِۚ﴾.

## ئایەتی: ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ﴾ [البقرة: ١١٦]

٥٨٠- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**قَالَ اللهُ: كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ: فَزَعَمَ أَنِّي لاَ أَقْدِرُ أَنْ أُعِيدَهُ كما كانَ، وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ: فَقَوْلُهُ: لِي وَلَدٌ، فَسُبْحَانِي أَنْ أَتَّخِذَ صَاحِبَةً أَوْ وَلَداً**). [خ٤٤٨٢]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێـت)، لـە پێغەمبـەرەوە(ﷺ) فـەرمووی: **(خودا دەفەرموێت: ئادەمیزاد من بە درۆ دەزانێت و ئەوەی بۆ نەبوو[1]، جنێـوی پێدام و ئەوەی بۆ نەبوو، بە درۆزانینی مـن: ئـەو بانگەشـەیەتی مـن نـاتوانم وەك یەکەمجاری بیگێڕمەوە[2]، جنێودانی بە من: ئەو قسەیەتی: من منداڵم هەیە، پاکێتی بۆ من لەوەی هاوسەر یان کوڕم هەبێت).**

## ئایەتی: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾ [البقرة: ١٢١]

٥٨١- (خـ) عَنْ أَبِي رَزِينٍ قَالَ: ﴿يَتۡلُونَـهُۥ حَـقَّ تِلَاوَتِـهِۦٓ﴾: يَتَّبِعُونَهُ يَعْمَلُونَ بِهِ حَقَّ عَمَلِهِ. [خ. كتاب التوحيد، باب ٤٧]

(خـ) لە ئەبی ڕەزینەوە، وتی: ﴿يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِـهِۦٓ﴾، شـوێنی دەکـەون و بـە حەق کاری پێ دەکەن.

---

[1] واتە: نەدەبوا ئەو کار و ڕەفتارەی لێبوەشێتەوە-و.

[2] واتە: زیندووی بکەمەوە-و.

**٥٨٢**- عن ابن عباس رضي الله عنهما في قول الله عزّ وجل: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾. قال: يُحِلُّونَ حلالَهُ ويُحَرِّمونَ حرامَهُ، ولا يُحَرِّفُونَهُ عن مَوَاضِعِه. [ك٣٠٥٤]

* قال الذهبي: صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) دەربارەی فەرموودەی خودا(عز وجل): : ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾، وتی: حەڵی بە حەلاڵ دادەنێن و حەرامی بە حەرام، و لە شوێن و جێگەی خۆی تەحریفی ناكەن.**

## ئایەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾ [البقرة: ١٤٣]

**٥٨٣**- (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(يُدْعى نُوحٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: هَلْ بَلَّغْتَ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيُقَالُ لأُمَّتِهِ: هَلْ بَلَّغَكُمْ؟ فَيَقُولُونَ: ما أَتَانَا مِنْ نَذِيرٍ، فَيَقُولُ: مَنْ يَشْهَدُ لَكَ؟ فَيَقُولُ: مُحَمَّدٌ وَأُمَّتُهُ، فَيَشْهَدُونَ أَنَّهُ قَدْ بَلَّغَ، ﴿وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾. فَذلِكَ قَوْلُهُ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾)**. وَالْوَسَطُ: الْعَدْلُ. [خ٤٤٨٧ (٣٣٣٩)]

(خ) **لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە رۆژی قیامەت نوح بانگ دەكرێت، دەڵێت: "لبيك وسعديك يا رب" دەفەرموێت: ئایا گەیاندت؟ دەڵێت: بەڵێ، بە ئوممەتەكەی دەوترێت: ئایا بە ئێوەی گەیاند؟ دەڵێن: هیچ ترسێنەرێكمان بۆ نەهاتووە، دەفەرموێت: كێ شایەتیت بۆ دەدات[1]؟ دەڵێت: محەمەد و ئوممەتەكەی، شایەتی دەدەن ئەو پەیامەكەی گەیاندووە[2]،﴿وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾) ئەوەش فەرموودەكەی خودایە(جل ذكره): ﴿وَكَذَٰلِكَ**

---

[1] **واتە: خودا بە نوح دەفەرموێت: كێ شایەتیت بۆ دەدات؟-و.**

[2] **واتە: محەمەد و ئوممەتەكەی شایەتی بۆ نوح دەدەن پەیامەكەی گەیاندووە-و.**

جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾

**الوسط: العدل–ڕێك و ڕاست(میانەگیر).**

## ئایەتی: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ﴾ [البقرة: ١٤٣]

**٥٨٤**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا تَوَجَّهَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى الْكَعْبَةِ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، فَكَيْفَ الَّذِينَ مَاتُوا وَهُمْ يُصَلُّونَ إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَأَنْزَلَ اللهُ تعالى: **﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ﴾** الآية. [د٤٦٨٠/ ت٢٩٦٤/ مي١٢٧١]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی لە کەعبە کرد، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، حاڵی ئەوانە چۆن بێت مردن و ئەوان ڕوویان لە بەیتولمەقدەس دەکرد، ئایەت دابەزی: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ﴾ الآية.**

## ئایەتی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ﴾ [البقرة: ١٥٩]

**٥٨٥**– عَنْ البَرَاءِ بنِ عَازِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **﴿يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ﴾**، قَالَ: (دَوَابُّ الأرضِ). [جه٤٠٢١]

* ضعف الإسناد.

**لە بەرائی کوڕی عازیبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ﴿يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ﴾ بریتین لە گیاندارانی زەوی.**

## ئایەتی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَى﴾ [البقرة: ١٧٨]

**٥٨٦**– (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ الْقِصَاصُ وَلَمْ تَكنْ فِيهِمُ الدِّيَةُ، فَقَالَ اللهُ تَعَالَى لِهذِهِ الأُمَّةِ: **﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَى ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ**

﴿وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰۚ فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ﴾، فَالْعَفْوُ أَنْ يَقْبَلَ الدِّيَةَ فِي الْعَمْدِ، ﴿فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍۗ﴾: يَتَّبِعُ بِالمَعْرُوفِ، وَيُؤَدِّي بِإِحْسَانٍ، ﴿ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌۗ﴾ مِمَّا كُتِبَ عَلَى مَنْ كانَ قَبْلَكُمْ، ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾: قَتَلَ بَعْدَ قَبُولِ الدِّيَةِ. [خ٤٤٩٨]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: لە بەنی ئیسرائیلدا تۆڵەكردنەوە هەبوو و خوێن(دية) بوونی نەبوو، خودا(سبحانه وتعالى) بەم ئومەتەی فەرمووی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَىۖ ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰۚ فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ﴾، "العفو" ئەوەیە خوێن قبووڵ بكات لە كوشتنی ئەنقەستدا، ﴿فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍۗ﴾، ئەو بە مەعرووف داوای خوێنەكە بكات و ئەویش بە ئیحسان خوێنەكە بدات، ﴿ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌۗ﴾ -ئەوە سووككردن و رەحمەتە لە پەروەردگاری ئێوەوە لەوەی لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە فەرزكرابوو، ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، واتە لەدوای قبووڵ كردنی خوێن دەستدرێژی بكات و بكوژێتەوە[1].

## ئایەتی: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ﴾ [البقرة: ١٨٤]

٥٨٧- (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قال: لما نَزَلَتْ: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾، كانَ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُفْطِرَ وَيَفْتَدِيَ، حَتَّى نَزَلَتِ الآيَةُ الَّتِي بَعْدَهَا، فَنَسَخَتْهَا. [خ٤٥٠٧/ م١١٤٥]

(ق) لە سەلەمەی كوڕی ئەكوەعەوە، وتی: كاتێك ئایەتی: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾، دابەزی، هەر كەس بیویستبا بیشكێنێت و فیدیە بدات دەیتوانی، تا ئایەتەكەی دوای ئەوە دابەزی و نەسخی كردەوە.

---

[1] واتە: گەر لەدوای وەرگرتنی خوێن بكوژێتەوە سزایەكی بە ئێشی لای خوداوە بۆ براوەتەوە -و.

- وفي رواية لمسلم: قَالَ: كُنَّا فِي رَمَضَانَ عَلَى عهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَنْ شَاءَ صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ فَافْتَدَى بِطَعَامِ مِسْكِينٍ، حَتَّى أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾[البقرة:١٨٥].

لە ریوایەتێکی موسلیمدا، وتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لە رەمەزاندا هەر کەس بیویستبا بەڕۆژوو دەبوو، هەر کەسیش بیویستبا بە پێدانی خواردنی هەژارێك ڕۆژووەکەی دەشکاند تا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾.

## ئایەتی: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ﴾ [البقرة: ١٨٧]

**٥٨٨-** (خ) عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا كَانَ الرَّجُلُ صَائِماً، فَحَضَرَ الإِفْطَارُ، فَنَامَ قَبْلَ أَنْ يُفْطِرَ، لَمْ يَأْكُلْ لَيْلَتَهُ وَلاَ يَوْمَهُ حَتَّى يُمْسِيَ. وَإِنَّ قَيْسَ بْنَ صِرْمَةَ الأَنْصَارِيَّ كَانَ صَائِماً، فَلَمَّا حَضَرَ الإِفْطَارُ، أَتَى امْرَأَتَهُ فَقَالَ لَهَا: أَعِنْدَكِ طَعَامٌ؟ قَالَتْ: لاَ، وَلكِنْ أَنْطَلِقُ فَأَطْلُبُ لَكَ، وَكَانَ يَوْمَهُ يَعْمَلُ، فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ، فَجَاءَتْهُ امْرَأَتُهُ، فَلَمَّا رَأَتْهُ قَالَتْ: خَيْبَةً لَكَ! فَلَمَّا انْتَصَفَ النَّهَارُ غُشِيَ عَلَيْهِ، فَذُكِرَ ذلِكَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ﴾، فَفَرِحُوا بِهَا فَرَحاً شَدِيداً، وَنَزَلَتْ: ﴿وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ﴾. [خ١٩١٥]

(خ) لە لە بەرائەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: هاوەڵانی محەمەد(ﷺ) گەر پیاو بەڕۆژوو بوایە و بەربانگ ئامادەبوایە، بەر لە بەربانگ دەخەوت، شەوەکەی و ڕۆژەکەی هیچی نەدەخوارد تا ئێوارەی بەسەردا دەهات، قەیسی کوڕی صیرمەی ئەنصاری بەڕۆژوو بوو کاتێك بەربانگ ئامادە بوو هات بۆ لای ژنەکەی و پێی وت: خواردنت لە لایە؟ وتی: نەخێر، بەڵام دەچم و بۆت دەهێنم، ئەو بە ڕۆژەکەیدا ئیشی دەکرد، بۆیە چاوەکانی چوونە خەو، ژنەکەی هاتەوە بۆ لای، کاتێك بینی وتی:

بێهیوایی بۆ تۆ[1]، کاتێك ڕۆژ گەیشتە نیوە بووڕایەوە[2]، ئەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسکرا، ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَائِكُمْ﴾، بە خۆشحاڵییەکی زۆرەوە پێی دڵخۆش بوون، ئەمەش دابەزی: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ﴾.

٥٨٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ [البقرة:١٨٣]، فَكَانَ النَّاسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا صَلَّوْا الْعَتَمَةَ حَرُمَ عَلَيْهِمْ الطَّعَامُ وَالشَّرَابُ وَالنِّسَاءُ وَصَامُوا إِلَى الْقَابِلَةِ، فَاخْتَانَ رَجُلٌ نَفْسَهُ، فَجَامَعَ امْرَأَتَهُ وَقَدْ صَلَّى الْعِشَاءَ وَلَمْ يُفْطِرْ، فَأَرَادَ اللهُ عزّ وجل أَنْ يَجْعَلَ ذَلِكَ يُسْراً لِمَنْ بَقِيَ وَرُخْصَةً وَمَنْفَعَةً، فَقَالَ سُبْحَانَهُ: ﴿عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ﴾ [البقرة:١٨٧]، وَكَانَ هَذَا مِمَّا نَفَعَ اللهُ بِهِ النَّاسَ، وَرَخَّصَ لَهُمْ وَيَسَّرَ.　　[د٢٣١٣]

* حسن صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ [البقرة:١٨٣]، خەڵکی لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك نوێژی عیشایان دەکرد خواردن و خواردنەوە و ئافرەتیان لەسەر حەرام بوو و تا شەوەکەی تر، پیاوێك ناپاکی لە نەفسی خۆی کرد و چووە لای ژنەکەی، ئەو نوێژی عیشای کرد بوو و ڕۆژوی نەشکاندبوو، خودا(عز وجل) ویستی ئەوە ئاسان بێت بۆ ئەو کەسەی ماوەتەوە، هەروەها روخسەت و سوود و قازانج بێت، بۆیە خودا(سبحانه وتعالى) فەرمووی: ﴿عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ﴾ [البقرة:١٨٧]، ئەمە لەوانە بوو خودا سوودی بە خەڵك پێ گەیاند، و روخسەتی پێدان و بۆی ئاسان کردن.

---

[1] واتە: تۆ خەوت لێکەوتووە و بۆت نییە تا سبەی ئێوارە هیچ بخۆی–و.

[2] واتە: بۆ ڕۆژی دووەم بەبێ بەربانگ و پارشێو بەڕۆژوو بوو، بۆیە کاتێ گەیشتە نیوەڕۆ بەرگەی نەگرت و بورایەوە–و.

## ئایەتی: ﴿وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا﴾ [البقرة: ١٨٩]

٥٩٠- (ق) عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: نَزَلَتْ هذِهِ الآيَةُ فِينَا، كانَتِ الأَنْصَارُ إِذَا حَجُّوا فَجَاؤُوا، لَمْ يَدْخُلُوا مِنْ قِبَلِ أَبْوَابِ بُيُوتِهِمْ، وَلكِنْ مِنْ ظُهُورِهَا، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَدَخَلَ مِنْ قِبَلِ بَابِهِ، فَكَأَنَّهُ عُيِّرَ بِذلِكَ، فَنَزَلَتْ: ﴿وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ﴾. [خ١٨٠٣/ م٣٠٢٦]

**(ق) له بەرائەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمە دابەزی، ئەنصار کاتێك حەجیان دەکرد و دەگەڕانەوە لە دەرگای ماڵەکانیانەوە نەدەچوونە ژوورەوە، بەڵکو لە پشتەوەی ماڵەکانیان، پیاوێك لە ئەنصار هاتەوە و لە دەرگاکەوە رۆیشتە ژوورەوە، وەك ئەوەی بەو کارە تانەی لێ درابێت، ئایەت دابەزی: ﴿وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ﴾.**

## ئایەتی: ﴿وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ [البقرة: ١٩٣]

٥٩١- (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً جاءَهُ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ! أَلاَ تَسْمَعُ ما ذَكَرَ اللهُ فِي كِتَابِهِ: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟﴾ إِلى آخِرِ الآيَةِ [الحجرات:٩]، فَمَا يَمْنَعُكَ أَنْ لاَ تُقَاتِلَ كَمَا ذَكَرَ اللهُ فِي كِتَابِهِ؟ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي! أُعَيَّرُ بِهذِهِ الآيَةِ وَلاَ أُقاتِلُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أُعَيَّرَ بِهذِهِ الآيَةِ الَّتِي يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾ إِلى آخِرِهَا [النساء:٩٣]. قَالَ: فَإِنَّ اللهَ يَقُولُ: ﴿وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾. قَالَ ابْنُ عُمَرَ: قَدْ فَعَلْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذْ كانَ الإِسْلاَمُ قَلِيلاً، فَكانَ الرَّجُلُ يُفْتَنُ فِي دِينِهِ: إِمَّا يَقْتُلُونَهُ وَإِمَّا يُوثِقُونَهُ، حَتَّى كَثُرَ الإِسْلاَمُ، فَلَمْ تَكنْ فِتْنَةٌ. فَلَمَّا رَأَى أَنَّهُ لاَ يُوَافِقُهُ فِيما يُرِيدُ قَالَ: فَمَا قَوْلُكَ فِي عَلِيٍّ وَعُثْمَانَ؟ قَالَ ابْنُ عُمَرَ: ما قَوْلِي فِي عَلِيٍّ وَعُثْمَانَ؟ أَمَّا عُثْمَانُ: فَكانَ اللهُ قَدْ عَفَا عَنهُ، فَكَرِهْتُمْ أَنْ يَعْفُوَ عَنْهُ. وَأَمَّا عَلِيٌّ: فَابْنُ عَمِّ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَخَتَنُهُ. وَأَشَارَ بِيَدِهِ. وَهذِهِ ابْنَتُهُ. أَوْ بِنْتُهُ. حَيْثُ تَرَوْنَ. [خ٤٦٥٠ (٤٥١٣)]

## ئایەتی: ﴿وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا﴾ [البقرة: ١٨٩]

٥٩٠- (ق) عَن الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: نَزَلَتْ هذِهِ الآيَةُ فِينَا، كانَتِ الأَنْصَارُ إِذَا حَجُّوا فَجَاؤُوا، لَمْ يَدْخُلُوا مِنْ قِبَلِ أَبْوَاب بُيُوتِهِمْ، وَلكِنْ مِنْ ظُهُورِهَا، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَدَخَلَ مِنْ قِبَلِ بَابِهِ، فَكَأَنَّهُ عُيِّرَ بِذلِكَ، فَنَزَلَتْ: ﴿وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ﴾. [خ١٨٠٣/ م٣٠٢٦]

**(ق) لە بەرائەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمە دابەزی، ئەنصار کاتێك حەجیان دەکرد و دەگەڕانەوە لە دەرگای ماڵەکانیانەوە نەدەچوونە ژوورەوە، بەڵکو لە پشتەوەی ماڵەکانیان، پیاوێك لە ئەنصار هاتەوە و لە دەرگاکەوە رۆیشتە ژوورەوە، وەك ئەوەی بەو کارە تانەی لیّ درابێت، ئایەت دابەزی: ﴿وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ﴾.**

## ئایەتی: ﴿وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ [البقرة: ١٩٣]

٥٩١- (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً جاءَهُ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ! أَلاَ تَسْمَعُ ما ذَكَرَ اللهُ فِي كِتَابِهِ: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟﴾ إِلى آخِرِ الآيَةِ [الحجرات:٩]، فَمَا يَمْنَعُكَ أَنْ لاَ تُقَاتِلَ كَمَا ذَكَرَ اللهُ فِي كِتَابِهِ؟ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي! أُعَيَّرُ بِهذِهِ الآيَةِ وَلاَ أُقاتِلُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أُعَيَّرَ بِهذِهِ الآيَةِ الَّتِي يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾ إِلى آخِرِهَا [النساء:٩٣]. قَالَ: فَإِنَّ اللهَ يَقُولُ: ﴿وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾. قَالَ ابْنُ عُمَرَ: قَدْ فَعَلْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذْ كانَ الإِسْلاَمُ قَلِيلاً، فَكانَ الرَّجُلُ يُفْتَنُ فِي دِينِهِ: إِمَّا يَقْتُلُونَهُ وَإِمَّا يُوثِقُونَهُ، حَتَّى كَثُرَ الإِسْلاَمُ، فَلَمْ تَكنْ فِتْنَةٌ. فَلَمَّا رَأَى أَنَّهُ لاَ يُوَافِقُهُ فِيما يُرِيدُ قَالَ: فَمَا قَوْلُكَ فِي عَلِيٍّ وَعُثْمَانَ؟ قَالَ ابْنُ عُمَرَ: ما قَوْلِي فِي عَلِيٍّ وَعُثْمَانَ؟ أَمَّا عُثْمَانُ: فَكانَ اللهُ قَدْ عَفَا عَنهُ، فَكَرِهْتُمْ أَنْ يَعْفُوَ عَنْهُ. وَأَمَّا عَلِيٌّ: فَابْنُ عَمِّ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَخَتَنُهُ. وَأَشَارَ بِيَدِهِ. وَهذِهِ ابْنَتُهُ. أَوْ بِنْتُهُ. حَيْثُ تَرَوْنَ. [خ٤٦٥٠ (٤٥١٣)]

(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت) پیاوێك هات بۆ لای و وتی: ئەی باوکی عبدالرحمن، ئایا نابیستی خودا لە کتێبەکەیدا چی باس دەکات: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟﴾ إلى آخِرِ الآيَةِ [الحجرات:٩]، چی رێگریت لێ دەکات نەجەنگی وەك خودا لە کتێبەکەیدا باسی کردووە؟ ئیبن عومەر وتی: برازای خۆم، بەم ئایەتە تانەم لێ بدرێت و نەجەنگم پێمخۆشترە لەوەی بەم ئایەتەی تر تانەم لێبدرێت، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾ إلى آخِرِهَا[النساء:٩٣]، پیاوەکە وتی: بەڵام خودا دەفەرموێت: ﴿وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾، ئیبن عومەر وتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەمان کرد، چونکە ئیسلام کەم بوو، پیاو لە دینەکەیدا تووشی فیتنە دەهات: یان دەیانکوشت یان کۆت و بەندیان دەکرد، تا ئیسلام زۆر بوو، فیتنە نەما، کاتێك بینی ئیبن عومەر تەبا نییە لەگەڵ ئەوەی ئەو دەیەوێت وتی: قسەت چییە لەسەر عەلی و عوسمان؟ ئیبن عومەر وتی: قسەم چییە لەسەر عەلی و عوسمان؟ عوسمان، خودا لێی بووراوە، ئێوە پێتان ناخۆش بوو خودا لێی بورێت، عەلیش، کوڕی مامی پێغەمبەری خودایە(ﷺ) و زاوای ئەوە، بە دەستی ئاماژەی کرد-ئەمەش(ابنته-أو بنته-کچەکەی ئەوە) وەك دەبینن[1].

## ئایەتی: ﴿وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ﴾ [البقرة: ١٩٥]

٥٩٢- (خ) عَنْ حُذَيْفَةَ: ﴿وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ﴾. قَالَ: نَزَلَتْ فِي النَّفَقَةِ. [خ٤٥١٦]

(خ) لە حوزەیفەوە: ﴿وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ﴾، وتی: دەربارەی خەرجکردن دابەزی.

---

[1] دیارە ئیبن عومەر بە دەستی ئاماژەی بۆ قەبری فاتیمە(خوا لێی رازی بێت) کردووە کە لە بەقیع نێژراوە-و.

**٥٩٣**– عَنْ أَسْلَمَ أَبِي عِمْرَانَ قَالَ: كُنَّا بِمَدِينَةِ الرُّومِ، فَأَخْرَجُوا إِلَيْنَا صَفّاً عَظِيماً مِنَ الرُّومِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ مِثْلُهُمْ أَوْ أَكْثَرُ، وَعَلَى أَهْلِ مِصْرَ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ، وَعَلَى الْجَمَاعَةِ فَضَالَةُ بْنُ عُبَيْدٍ، فَحَمَلَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى صَفِّ الرُّومِ حَتَّى دَخَلَ فِيهِمْ، فَصَاحَ النَّاسُ وَقَالُوا: سُبْحَانَ اللهِ، يُلْقِي بِيَدَيْهِ إِلَى التَّهْلُكَةِ!

فَقَامَ أَبُو أَيُّوبَ الأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّكُمْ تَتَأَوَّلُونَ هَذِهِ الآيَةَ هَذَا التَّأْوِيلَ، وَإِنَّمَا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ فِينَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ لَمَّا أَعَزَّ اللهُ الإِسْلاَمَ، وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ، فَقَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ سِرّاً دُونَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: إِنَّ أَمْوَالَنَا قَدْ ضَاعَتْ، وَإِنَّ اللهَ قَدْ أَعَزَّ الإِسْلاَمَ، وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ، فَلَوْ أَقَمْنَا فِي أَمْوَالِنَا، فَأَصْلَحْنَا مَا ضَاعَ مِنْهَا.

فَأَنْزَلَ اللهُ تَبارَكَ وتَعالَى عَلَى نَبِيِّهِ صلّى الله عليه وسلّم يَرُدُّ عَلَيْنَا مَا قُلْنَا: ﴿**وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ**﴾، فَكَانَتِ التَّهْلُكَةُ الإِقَامَةَ عَلَى الأَمْوَالِ وَإِصْلاَحِهَا، وَتَرْكَنَا الْغَزْوَ.

فَمَا زَالَ أَبُو أَيُّوبَ شَاخِصاً فِي سَبِيلِ اللهِ، حَتَّى دُفِنَ بِأَرْضِ الرُّومِ. (واللفظ للترمذي).

[د٢٥١٢/ ت ٢٩٧٢]

* صحيح.

**لە ئەسلەمەوە، ئەبی عیمران، وتی: لە شاری رۆم بووین، ریزێکی گەورەیان لە رۆم بۆ هێنایینە دەرەوە، لە موسڵمانان هاوشێوەی ئەوان یان زیاتر بۆیان چوونە دەرەوە، عوقبەی کوڕی عامیر لەسەر ئەهلی مصر بوو، لەسەر کۆمەڵەکەش فەزالەی کوڕی عوبەید بوو، پیاوێك لە موسڵمانان هێرشی برد بۆ سەر ریزی رۆمەکان تا رۆیشتە ناویانەوە، خەڵکەکە هاواریان کرد و وتیان: "سبحان الله" بە دەستی خۆی خۆی دەخاتە ناو تالووکەوە![1]**

**ئەبو ئەیوبی ئەنصاری هەستا و وتی: خەڵکینە، ئێوە ئەم تەئویلە بۆ ئەم ئایەتە دەکەن، ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمە –کۆمەڵی ئەنصار– دابەزی، کاتێك خودا ئیسلامی عەزیز کرد و سەرخەرانی زۆر بوون، هەندێکمان بە نهێنی و بەبێ باس کردن لای**

---

**[1] واتە: خۆی تیادەبات–و.**

پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە هەندێکی ترمان وت، ماڵ و سامانمان لەدەستچوو و خوداش عیززەتی بە ئیسلام داوە و سەرخەرانی زۆربوون، گەر بتوانین لەناو ماڵ و سامانمان بمێنینەوە و ئەوەی لە دەستمان چووە چاکی بکەین.

خودا(تبارك وتعالى) ئایەتی دابەزاند بۆ سەر پێغەمبەرەکەی و بەرپەرچی ئەوە دەداتەوە وتمان: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ﴾، بۆیە تالووکە مانەوە بوو لەسەر ماڵ و سامان و چاککردنی و وازهێنانمان لە غەزا.

بەردەوام ئەبو ئەیوب لە رێگەی خودا ئامادە بوو[1] تا لە زەوی رۆم ئەسپەردە کرا.(واللفظ للترمذي).

## ئایەتی: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ﴾ [البقرة: ١٩٧]

**٥٩٤**– (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْيَمَنِ يَحُجُّونَ وَلاَ يَتَزَوَّدُونَ، وَيَقُولُونَ: نَحْنُ المُتَوَكِّلُونَ، فَإِذَا قَدِمُوا مَكَّةَ سَأَلُوا النَّاسَ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ﴾. [خ١٥٢٣]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) وتی: ئەهلی یەمەن حەجیان دەکرد و توێشوویان لەگەڵ خۆیان هەڵنەدەگرت و دەیانوت: ئێمە پشتبەستوانین بە خودا(متوکلون)، کاتێك دەهاتن بۆ مەککە داوایان لە خەڵك دەکرد، بۆیە خودا(سبحانه وتعالى) ئایەتی دابەزاند: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ﴾.

## ئایەتی: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ﴾ [البقرة: ١٩٨]

**٥٩٥**– (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَتْ عُكَاظٌ وَمَجَنَّةُ وَذُو الْمَجَازِ أَسْوَاقاً فِي الجَاهِلِيَّةِ، فَلَمَّا كَانَ الإِسْلاَمُ تَأَثَّمُوا مِنَ التِّجَارَةِ فِيهَا، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ...﴾ فِي مَوَاسِمِ الحَجِّ. قَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ كَذَا. [خ٢٠٩٨، (١٧٧٠)]

---

[1] واتە: لە جیهادکردن لە رێگەی خودا–و.

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) وتی: "عكاظ و مجنة و ذو المجاز" لە سەردەمی نەفامیدا بازاڕ بوون، کاتێك ئیسلام هات بە گوناهیان زانی بازرگانییان تێدا بکەن، بۆیە خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ...﴾ -گوناهێکتان لەسەر نییە لە مەوسیمی حەجدا.. ئیبن عەباس بەم جۆرەی خوێندەوە.**

- وفي رواية لأبي داود: قَالَ ابن عَبَّاسٍ: كَانُوا لاَ يَتَّجِرُونَ بِمِنًى، فَأُمِرُوا بِالتِّجَارَةِ إِذَا أَفَاضُوا مِنْ عَرَفَاتٍ. [د١٧٣١]

**لە ریوایەتێکی ئەبی داود: ئیبن عەباس وتی: لە مینا بازرگانیان نەدەکرد، فەرمانیان پێکرا بە بازرگانی کاتێك لە عەرەفاتەوە شۆڕدەبنەوە.**

**٥٩٦-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ التَّيْمِيِّ قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً أُكْرِي فِي هَذَا الْوَجْهِ، وَكَانَ نَاسٌ يَقُولُونَ: إِنَّهُ لَيْسَ لَكَ حَجٌّ، فَلَقِيتُ ابْنَ عُمَرَ فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنِّي رَجُلٌ أُكْرِي فِي هَذَا الْوَجْهِ، وَإِنَّ نَاساً يَقُولُونَ: إِنَّهُ لَيْسَ لَكَ حَجٌّ؟

فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: أَلَيْسَ تُحْرِمُ وَتُلَبِّي، وَتَطُوفُ بِالْبَيْتِ، وَتُفِيضُ مِنْ عَرَفَاتٍ، وَتَرْمِي الْجِمَارَ؟ قَالَ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: فَإِنَّ لَكَ حَجّاً. جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَسَأَلَهُ عَنْ مِثْلِ مَا سَأَلْتَنِي عَنْهُ، فَسَكَتَ عَنْهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَلَمْ يُجِبْهُ، حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ﴾، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَقَرَأَ عَلَيْهِ هَذِهِ الْآيَةَ، وَقَالَ: (لَكَ حَجٌّ). [د١٧٣٣]

* صحيح.

**لە ئەبی ئومامەی تەیمییەوە، وتی: من پیاوێك بووم بە کرێ دەگێرام لەم ئاراستەوە[١]، خەڵکی دەیانوت: حەجت بۆ نییە، بە ئیبن عومەر گەیشتم و وتم: ئەی باوکی عبدالرحمن، من پیاوێکم لەم ئاراستەوە بە کرێ دەگێریم، خەڵکانێك دەڵێن حەجت بۆ نییە؟**

---

(١) **واتە: لە رێگەی حەج بە کرێ دەگێرام و کاتێك دەگەیشتمە مەککە حەجی خۆم دەکرد-و.**

ئیبن عومەر وتی: ئایا ئیحرام نابەستی و "لبیك" ناکەی و تەواف بەیت ناکەی و لە عەرەفات شۆڕنابییەوە و بەردەکان هەڵنادەی؟ وتی: وتم: با، وتی: تۆ حەجت بۆ هەیە، پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) نموونەی ئەم پرسیارەی تۆ لە منت کرد پرسیاری لێکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لێی بێدەنگ بوو و وەڵامی نەدایەوە، تا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ﴾، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناردی بەدوایدا و ئایەتەکەی بەسەردا خوێندەوە و فەرمووی: **(حەجت بۆ هەیە)**.

## ئایەتی: ﴿ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ﴾ [البقرة: ١٩٩]

**٥٩٧**– (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: يَطُوفُ الرَّجُلُ بِالْبَيْتِ ما كانَ حَلاَلاً حَتَّى يُهِلَّ بِالحَجِّ، فَإِذَا رَكِبَ إِلَى عَرَفَةَ فَمَنْ تَيَسَّرَ لَهُ هَدِيَّةٌ مِنَ الإِبِلِ أَو الْبَقَرِ أَوِ الْغَنَمِ، ما تَيَسَّرَ لَهُ مِنْ ذلِكَ، أَيَّ ذلِكَ شَاءَ، غَيْرَ أَنَّهُ إِنْ لَمْ يَتَيَسَّر لَهُ، فَعَلَيْهِ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ فِي الحَجّ، وَذلِكَ قَبْلَ يَوْمِ عَرَفَةَ، فَإِنْ كانَ آخِرُ يَوْمٍ مِنَ الأَيَّامِ الثَّلاَثَةِ يَوْمَ عَرَفَةَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ، ثُمَّ لِيَنْطَلِقْ حَتَّى يَقِفَ بِعَرَفاتٍ مِنْ صَلاَةِ الْعَصْرِ إِلَى أَنْ يَكُونَ الظَّلاَمُ، ثُمَّ لِيَدْفَعُوا مِنْ عَرَفاتٍ إِذَا أَفاضُوا مِنْهَا حَتَّى يَبْلُغُوا جَمْعاً الَّذِي يُتَبَرَّرُ فِيهِ، ثمَّ لِيَذْكُرُوا اللهَ كَثِيراً، أَوْ: أَكْثِرُوا التَّكْبِيرَ والتَّهْلِيلَ قَبْلَ أَنْ تُصْبِحُوا، ثُمَّ أَفِيضُوا فَإِنَّ النَّاسَ كانُوا يُفِيضُونَ، وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾. حَتَّى تَرْمُوا الجَمْرَةَ. [خ٤٥٢١]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: بێ بەستنی ئیحرام پیاو تەواف بەیت دەکات[1] تا دەست بە حەج دەکات، کاتێك سواربوو بۆ عەرەفە هەر کەس بۆی فەراهەم بوو هەدیەیەك لە حوشتر یان گا و مانگا یان مەڕ و بزن پێشکەش دەکات، هەر کام لەوانەی بۆ فەراهەم بوو و کامیان بخوازێت، بەڵام گەر بۆی فەراهەم نەبوو سێ رۆژ رۆژووی لەسەرە لە حەجدا، ئەو رۆژووە بەر لە رۆژی عەرەفەیە، گەر دوایین رۆژ لە سێ رۆژەکە رۆژی عەرەفە بوو گوناهێکی لەسەر نییە، پاشان تێتەقێنێ تا لە

[1] واتە: تا دەگەنە موزدەلیفە(فتح الباري)–و.

عەرەفات دەوەستێ لە نوێژی عەصرەوە تا تاریك دادێت، پاشان با یەکتر پاڵ بنێن(یەکتر رابدەن) گەر لە عەرەفات شۆڕبوونەوە تا دەگەنە ئەو جێگەی "البر-ضاکة"ی تێدا داوا دەکرێت[1]، پاشان با زۆر یادی خودا بکەن، یان: "الله أکبر و لا إله إلا الله" زۆر بکەن بەرلەوەی رۆژیان لێبێتەوە، پاشان با شۆڕببنەوە، چونکە خەڵکی شۆڕ دەبوونەوە[2]، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، تا بەردەکان هەڵدەدەن.

## ئایەتی: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ﴾ [البقرة: ٢٢٣]

**٥٩٨-** (ق) عَنْ جابِرٍ ﷺ قَالَ: كَانَتِ الْيهُودُ تَقُولُ: إِذَا جامَعَهَا مِنْ وَرَائِهَا؛ جاءَ الْوَلَدُ أَحْولَ، فَنَزَلَتْ: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ﴾.

[خ٤٥٢٨/ م١٤٣٥]

(ق) لە جابرەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: یەهوود دەیانوت: گەر پیاو لەدواوە چووە لای ژنەکەی منداڵەکە خێل دەردەچێت، ئایەت دابەزی: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ﴾.

## ئایەتی: ﴿وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُواْ﴾ [البقرة: ٢٢٣]

**٥٩٩-** عَنْ مَالِك، عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ الدِّيلِيِّ: أَنَّ الرَّجُلَ كَانَ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ ثُمَّ يُرَاجِعُهَا، وَلاَ حَاجَةَ لَهُ بِهَا، وَلاَ يُرِيدُ إِمْسَاكَهَا، كَيْمَا يُطَوِّلُ بِذَلِكَ عَلَيْهَا الْعِدَّةَ لِيُضَارَّهَا، فَأَنْزَلَ اللهُ

---

[1] دیارە ئیبن عومەر بە دەستی ئاماژەی بۆ قەبری فاتیمە(خوا لێی رازی بێت) کردووە کە لە بەقیع نێژراوە-و.

[2] واتە: سەردەمانی پێشوو بۆ حەج کردن خەڵکی بەو جۆرەیان دەکرد-و.

تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ﴾ يَعِظُهُمْ اللهُ بِذَلِكَ. [ط١٢٤٨]

* إسناده منقطع.

لە مالیكەوە، لە سەوری كوڕی زەیدی دیلییەوە: پیاو ژنەكەی خۆی تەڵاق دەدا و پاشان دەیگێڕایەوە، و هیچ پێویستییەكی بە ژنەكە نەبوو، و نەیدەویست دەستی پێوە بگرێت، بۆئەوەی بەو كارەی عیددەی ژنەكە درێژە بكێشێت و زیانی پێ بگەیەنێت، خودا(تبارك وتعالى) ئایەتی دابەزاند: ﴿وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ﴾، خودا بەوە ئامۆژگارییان دەكات.

## ئایەتی: ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ﴾ [البقرة: ٢٣٢]

٦٠٠- (خ) عَنِ الحَسَنِ: ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ﴾. قَالَ: حَدَّثَنِي مَعْقِلُ بْنُ يَسَارٍ: أَنَّهَا نَزَلَتْ فِيهِ، قَالَ: زَوَّجْتُ أُخْتاً لِي مِنْ رَجُلٍ فَطَلَّقَهَا، حَتَّى إِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُهَا جاءَ يَخْطُبُهَا، فَقُلْتُ لَهُ: زَوَّجْتُكَ وَفَرَشْتُكَ وَأَكْرَمْتُكَ، فَطَلَّقْتَهَا، ثُمَّ جِئْتَ تَخْطُبُهَا! لاَ وَاللهِ لاَ تَعُودُ إِلَيْكَ أَبَداً. وَكَانَ رَجُلاً لاَ بَأْسَ بِهِ، وَكانَتِ المرْأَةُ تُرِيدُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْهِ، فَأَنْزَلَ اللهُ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ﴾. فَقُلْتُ: الآنَ أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ: فَزَوَّجَهَا إِيَّاهُ. [خ٥١٣٠ (٤٥٢٩)]

(خ) لە حەسەنەوە: ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ﴾ وتی: مەعقیلی كوڕی یەسار بۆی باس كردم: دەربارەی ئەو دابەزیوە، وتی: خوشكێكم كردە هاوسەری پیاوێك، تەڵاقیدا، تا عیددەكەی تەواو بوو هات و داخوازی كردەوە، پێم وت: هاوسەرگیریم بۆ كردی و راخەر بۆ ئامادە كردی و رێزم لێگرتی، كەچی تەڵاقتدا، پاشان دێی و داخوازی دەكەیەوە، نە، سوێند بە خودا، هەرگیز نایەتەوە بۆ لات، ئەو پیاوێكی خراپ نەبوو، ئافرەتەكەش دەیویست بگەڕێتەوە بۆ لای، خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ﴾، وتم: ئێستا ئەنجامی دەدەم، ئەی پێغەمبەری خودا، وتی: هاوسەرگیری پێ كردەوە لەگەڵی.

ئایەتی: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ﴾ [البقرة: ٢٣٨]

٦٠١- (م) عَنْ أَبِي يُونُسَ . مَوْلَى عَائِشَةَ . أَنَّهُ قَالَ: أَمَرَتْنِي عَائِشَةُ أَنْ أَكْتُبَ لَهَا مُصْحَفاً، وَقَالَتْ: إِذَا بَلَغْتَ هَذِهِ الآيَةَ فَآذِنِّي: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ﴾، فَلَمَّا بَلَغْتُهَا آذَنْتُهَا، فَأَمْلَتْ عَلَيَّ: حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ، وَالصَّلاَةِ الْوُسْطَى، وَصَلاَةِ الْعَصْرِ، وَقُومُوا للهِ قَانِتِينَ. قَالَتْ عَائِشَةُ: سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [م٦٢٩]

(م) لە ئەبی یونسەوە، مەولای عائیشە، وتی: عائیشە فەرمانی پێ کردم موصحەفێکی بۆ بنووسمەوە، وتی: گەر گەیشتییە ئەم ئایەتە: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ﴾ مۆڵەتم لێ وەربگرە، کاتێك گەیشتمە ئەو ئایەتە مۆڵەتم لێ وەرگرت، بەسەرمدا خوێندییەوە: "حافظوا على الصلوات، والصلاة الوسطى، وصلاة العصر، وقوموا لله قانتين"، عائیشە وتی: لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست.

٦٠٢- (م) عَنْ شَقِيقِ بْنِ عُقْبَةَ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَصَلاَةِ الْعَصْرِ، فَقَرَأْنَاهَا مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ نَسَخَهَا اللهُ، فَنَزَلَتْ: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ﴾، فَقَالَ رَجُلٌ كَانَ جَالِساً عِنْدَ شَقِيقٍ لَهُ: هِيَ إِذَنْ صَلاَةُ الْعَصْرِ، فَقَالَ الْبَرَاءُ: قَدْ أَخْبَرْتُكَ كَيْفَ نَزَلَتْ، وَكَيْفَ نَسَخَهَا اللهُ، وَاللهُ أَعْلَمُ. [م٦٣٠]

(م) لە شەقیقی کوڕی عوقبەوە، لە بەرائی کوڕی عازیبەوە، وتی: ئەم ئایەتە "حافظوا على الصلوات وصلاة العصر" دابەزی، چەند خودا ویستی خوێندمانەوە، پاشان خودا نەسخی کردەوە و ئەمە دابەزی: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ﴾ پیاوێك کە دانیشتبوو بە شەقیقی وت: کەوابوو ئەوە[1] نوێژی عەصرە، بەرا وتی: هەواڵم پێدای چۆن دابەزی و چۆن خودا نەسخی کردەوە، خودا زاناترە.

[1] ئەوە: واتە "الصلاة الوسطى"و.

ئایەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا﴾ [البقرة: ٢٤٠]

٦٠٣- (خ) عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا﴾؛ قَالَ: كانَتْ هَذِهِ الْعِدَّةُ، تَعْتَدُّ عِنْدَ أَهْلِ زَوْجِهَا وَاجِبٌ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ﴾. قَالَ: جَعَلَ اللهُ لَهَا تَمَامَ السَّنَةِ سَبْعَةَ أَشْهُرٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً وَصِيَّةً، إِنْ شَاءَتْ سَكَنَتْ فِي وَصِيَّتِهَا، وَإِنْ شَاءَتْ خَرَجَتْ، وَهُوَ قَوْلُ اللهِ تَعَالَى: ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾. فَالعِدَّةُ كما هِيَ وَاجِبٌ عَلَيْهَا، زَعَمَ ذلِكَ عَنْ مُجَاهِدٍ.

وَقَالَ عَطَاءٌ: قالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: نَسَخَتْ هذِهِ الآيَةُ عِدَّتَهَا عِنْدَ أَهْلِهَا، فَتَعْتَدُّ حَيْثُ شَاءَتْ، وَهْوَ قَوْلُ اللهِ تَعَالَى: ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ﴾. قَالَ عَطَاءٌ: إِنْ شَاءَتِ اعْتَدَّتْ عِنْدَ أَهْلِهِ وَسَكَنَتْ فِي وَصِيَّتِهَا، وَإِنْ شَاءَتْ خَرَجَتْ، لِقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ﴾. قَالَ عَطَاءٌ: ثُمَّ جاءَ الْمِيرَاثُ فَنَسَخَ السُّكْنى، فَتَعْتَدُّ حَيْثُ شَاءَتْ وَلاَ سُكْنى لَهَا. [خ٤٥٣١]

**(خ) لە موجاهیدەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا﴾، وتی: ئەمە بریتی بوو لە عیددە، لای ئەهلی مێردەکەی بەسەری دەبرد، واجب بوو، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ﴾، وتی: خودا تەواوی ساڵەکەی بۆ کرد بە حەوت مانگ و بیست شەو وەك وەسێت پێکردنی، گەر بیەوێت لە وەسێت پێکردنەکەی نیشتەجێ دەبێت، گەر بیەوێت دەردەچێت، ئەوەش فەرموودەکەی خودایە(سبحانه وتعالى): ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾، عیددە وەك هەیە لەسەری واجبە، بانگەشەی ئەوەی کرد لە موجاهیدەوەیە.**

**عەتا دەڵێت: ئیبن عەباس دەڵێت: ئەم ئایەتە عیددەی ئافرەتەکەی لای خانەوادەکەی نەسخ کردەوە، بۆیە چۆن بخوازێت لەوێ عیددەکەی بەسەر دەبات، ئەوەش فەرموودەکەی خودایە(سبحانه وتعالى): ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ﴾، عەتا دەڵێت: گەر**

بخوازێت لای خانەوادەی مێردەکەی و لە وەسێت پێکردنەکەی عیددەکەی بەسەر دەبات، گەر بیشخوازێت دەچێتە دەرەوە، لەبەر فەرموودەکەی خودا(سبحانه وتعالى): ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ﴾، عەتا دەڵێت: پاشان میرات هات و نەسخی نیشتەجێ بوونی کردەوە، چۆن بخوازێت عیددەکەی بەسەر دەبات و نیشتەجێ بوونی بۆ نییە.

## ئایەتی: ﴿لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ﴾ [البقرة: ٢٤٠]

٦٠٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَكُونُ مِقْلاَتاً، فَتَجْعَلُ عَلَى نَفْسِهَا إِنْ عَاشَ لَهَا وَلَدٌ أَنْ تُهَوِّدَهُ، فَلَمَّا أُجْلِيَتْ بَنُو النَّضِيرِ، كَانَ فِيهِمْ مِنْ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ، فَقَالُوا: لاَ نَدَعُ أَبْنَاءَنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَيِّ﴾.

قَالَ أَبُو دَاوُد: الْمِقْلاَتُ: الَّتِي لاَ يَعِيشُ لَهَا وَلَدٌ. [د٢٦٨٢]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: دەبوو ژنێك "مقلات-منداڵی بۆ نەمێنێت" بێت، لەسەر خۆی پێویستی دەکرد گەر کوڕێکی بۆ بمێنێت بیکات بە یەهوودی، کاتێك بەنو نەزیر راگوێزران منداڵی ئەنصاریان لەناودا بوو، بۆیە وتیان: رێگە نادەین منداڵەکانمان ببەن، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَيِّ﴾.

ئەبو داود وتی: "المقلات" ئەو ژنەی منداڵی بۆ نامێنێت.

## ئایەتی: ﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ﴾ [البقرة: ٢٦٦]

٦٠٥- (خ) عَنْ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ يَوْماً لأَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: فِيمَ تَرَوْنَ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ: ﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ﴾؟ قَالُوا: اللهُ أَعْلَمُ، فَغَضِبَ عُمَرُ، فَقَالَ: قُولُوا: نَعْلَمُ أَوْ لاَ نَعْلَمُ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فِي نَفْسِي مِنْهَا شَيْءٌ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ! قَالَ عُمَرُ: يَا ابْنَ أَخِي، قُلْ وَلاَ تَحْقِرْ نَفْسَكَ، قالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ضُرِبَتْ مَثَلاً لِعَمَلٍ، قَالَ

عُمَرُ: أَيُّ عَمَلٍ؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لِعَمَلٍ، قَالَ عُمَرُ: لِرَجُلٍ غَنِيٍّ يَعْمَلُ بِطَاعَةِ اللهِ عزّ وجل، ثُمَّ بَعَثَ اللهُ لَهُ الشَّيْطَانَ، فَعَمِلَ بِالمعاصِي حَتَّى أَغْرَقَ أَعْمَالَهُ. [خ٤٥٣٨]

(خ) له عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە، وتی: ڕۆژێك عومەر(خوا لێی رازی بێت) بە هاوەڵانی پێغەمبەری وت: پێتانوایە ئەم ئایەتە دەربارەی کێ دابەزی ﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ﴾؟ وتیان: خوا زانترە، عومەر تووڕە بوو، وتی: بڵێن: دەزانین، یان نازانین، ئیبن عەباس وتی: دەربارەی شتێکم لە نەفسمدا هەیە، ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر وتی: برازای خۆم، بڵێ و خۆت بە کەم مەزانە، ئیبن عەباس وتی: نموونەیەك بۆ کار هێنراوەتەوە، عومەر وتی: چ کارێك؟ ئیبن عەباس وتی: بۆ هەر کارێك، عومەر وتی: بۆ پیاوێکی دەوڵەمەند کار بە تاعەتی خودا(عز وجل) بکات، پاشان خودا شەیتانی بۆ ڕەوانە دەکات، بە یاخیبوون کار دەکات تا هەموو کارەکانی نغرۆ دەکات.

## ئایەتی: ﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ﴾ [البقرة: ٢٦٧]

٦٠٦- عَنِ الْبَرَاءِ: ﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ﴾. قَالَ: نَزَلَتْ فِينَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، كُنَّا أَصْحَابَ نَخْلٍ، فَكَانَ الرَّجُلُ يَأْتِي مِنْ نَخْلِهِ عَلَى قَدْرِ كَثْرَتِهِ وَقِلَّتِهِ، وَكَانَ الرَّجُلُ يَأْتِي بِالْقِنْوِ وَالْقِنْوَيْنِ، فَيُعَلِّقُهُ فِي الْمَسْجِدِ، وَكَانَ أَهْلُ الصُّفَّةِ لَيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ، فَكَانَ أَحَدُهُمْ إِذَا جَاعَ أَتَى الْقِنْوَ فَضَرَبَهُ بِعَصَاهُ، فَيَسْقُطُ مِنَ الْبُسْرِ وَالتَّمْرِ فَيَأْكُلُ، وَكَانَ نَاسٌ مِمَّنْ لاَ يَرْغَبُ فِي الْخَيْرِ، يَأْتِي الرَّجُلُ بِالْقِنْوِ فِيهِ الشِّيصُ وَالْحَشَفُ، وَبِالْقِنْوِ قَدْ انْكَسَرَ، فَيُعَلِّقُهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ﴾، قَالوا: لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أُهْدِيَ إِلَيْهِ مِثْلُ مَا أَعْطَاهُ لَمْ يَأْخُذْهُ إِلاَّ عَلَى إِغْمَاضٍ أَوْ حَيَاءٍ، قَالَ: فَكُنَّا بَعْدَ ذَلِكَ يَأْتِي أَحَدُنَا بِصَالِحِ مَا عِنْدَهُ. [ت٢٩٨٧/ جه١٨٢٢]

* صحيح.

لە بەرانەوە: ﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ﴾، وتی: دەربارەی ئێمە -کۆمەڵی ئەنصار- دابەزی، ئێمە خاوەن باخی دارخورما بووین، پیاو بەپێی برِی زۆری و کەمی لە خورماکەی دەهێنا، پیاویٙ بۆڵێك یان دوو بۆڵی دەهێنا و لە مزگەوت هەڵیدەواسی، ئەهلی "الصُفّة" خواردنێکیان نەبوو، یەکێك لەوانە گەر برسیبوایە دەهات بۆ لای بۆڵە خورماکە و بە دار عەساکەی لێی دەدا، بۆیە خورمای پێنەگەیو و پێگەیو بەردەبوویەوە و دەیخوارد، کەسانێك حەزی خێریان نەبوو بۆڵێکی دەهێنا کە خورمای ناباش و وشکهەڵهاتووی تێدا بوو، یان بۆڵێکی شکاوی دەهێنا، و هەڵیدەواسی، بۆیە خودا(سبحانه وتعالى) ئایەتی دابەزاند: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ﴾، وتیان: گەر یەکێك لە ئێوە نموونەی ئەوەی دەیبەخشیٙ هەدیە بکرێت وەریناگرێت مەگەر چاوی لیٙ بنوقێنیٙ یان لە شەرمدا وەریبگرێت، وتی: لەدوای ئەوە یەکێك لە ئێمە باشترینی ئەوەی دەهێنا لە لای بوو.

## ئایەتی: ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ﴾ [البقرة: ٢٨٤]

٦٠٧- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: ﴿لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾. قَالَ: فَاشْتَدَّ ذلِكَ عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَتَوْا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، ثُمَّ بَرَكُوا عَلَى الرُّكَبِ، فَقَالُوا: أَيْ رَسُولَ اللهِ! كُلِّفْنَا مِنَ الأَعْمَالِ مَا نُطِيقُ: الصَّلاَةُ وَالصِّيَامُ وَالْجِهَادُ وَالصَّدَقَةُ، وَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيْكَ هذِهِ الآيَةُ، وَلاَ نُطِيقُهَا، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَتُرِيدُونَ أَنْ تَقُولُوا كَمَا قَالَ أَهْلُ الْكِتَابَيْنِ مِنْ قَبْلِكُمْ: سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا؟ بَلْ قُولُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ**) قَالُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ. فَلَمَّا اقْتَرَأَهَا الْقَوْمُ ذَلَّتْ بِهَا أَلْسِنَتُهُمْ، فَأَنْزَلَ اللهُ فِي إِثْرِهَا: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ

بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ﴿٢٨٥﴾﴾ [البقرة].

فَلَمَّا فَعَلُوا ذَلِكَ نَسَخَهَا اللهُ تَعَالَى، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَا﴾، قَالَ: (نَعَمْ) ﴿رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَا﴾، قَالَ: (نَعَمْ) ﴿رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ﴾ قَالَ: (نَعَمْ) ﴿...وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴿٢٨٦﴾﴾[البقرة] قَالَ: (نَعَمْ). [م١٢٥]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: کاتێك ئەم ئایەتە: ﴿لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴿٢٨٤﴾﴾، بۆ سەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) دابەزی، وتی: ئەوە لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) توند و سەخت بوو، هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و لەسەر ئەژنۆ دانیشتن و وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، داوای کۆمەڵێك کارمان لێکرا لە تواناماندا بوو: نوێژ و ڕۆژوو و جیهاد و صەدەقە، ئەم ئایەتەت بۆ سەر دابەزیوە لە تواناماندا نییە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دەتانەوێ ئەوە بڵێن ئەهلی دوو کتێبەکە بەر لە ئێوە وتیان: گوێدەگرین و یاخی دەبین؟ بەڵکو بڵێن: "سمعنا وأطعنا غفرانك ربنا وإليك المصير-گوێدەگرین و گوێڕایەڵ دەبین، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەین پەروەردگاری ئێمە، سەرئەنجام و گەڕانەوە بۆ لای تۆیە")، وتیان:** گوێدەگرین و گوێڕایەڵ دەبین، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەین پەروەردگاری ئێمە، سەرئەنجام و گەڕانەوە بۆ لای تۆیە، کاتێك خەڵکەکە خوێندیان زمانیان بە وتنی ملکەچ بوو(ڕاهات)، بۆیە خودا بەدوایدا ئایەتی دابەزاند: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ﴿٢٨٥﴾﴾، کاتێك ئەوەیان ئەنجامدا خودا(سبحانه وتعالى) نەسخی کردەوە، و ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا

ٱكۡتَسَبَتۡۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَا﴾، فەرمووی: (بەڵێ)، ﴿رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَا﴾، فەرمووی: (بەڵێ)، ﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ﴾، فەرمووی: (بەڵێ)، ﴿...وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، فەرمووی: (بەڵێ).

## (٣)

## سورة آل عمران

### ئایەتی: ﴿مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ﴾ [آل عمران: ٧]

٦٠٨- (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: تَلاَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم هَذِهِ الآيَةَ: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾. قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (فَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ما تَشَابَهَ مِنْهُ، فَأُولئِكَ الَّذِينَ سَمَّى اللهُ، فَاحْذَرُوهُمْ). [خ٤٥٤٧/ م٢٦٦٥]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئەو کەسانەت بینی شوێنی موتەشابیهی قورئان دەکەون، ئەوانە بریتین لەو کەسانەی خودا ناوی هێناون، بۆیە خۆتانیان لێ بپارێزن[1])**.

[1] مەبەست ئاگادارکردنەوە و هۆشداریدانە لە گوێگرتن لەوانەی شوێنی موتەشابیهی قورئان دەکەون.

## ئایەتی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ [آل عمران: ١١٠]

٦٠٩- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾. قَالَ: خَيْرَ النَّاسِ لِلنَّاسِ، تَأْتُونَ بِهِمْ فِي السَّلاَسِلِ فِي أَعْنَاقِهِمْ، حَتَّى يَدْخُلُوا فِي الإِسْلاَمِ. [خ٤٥٥٧ (٣٠١٠)]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾، وتی: باشترینی خەڵك بۆ خەڵکی، بە زنجیرکردنە گەردنیان دەیانهێنن تا بچنە ناو ئیسلامەوە.**

- وفي رواية قال: قال رَسُول الله صلّى الله عليه وسلّم: (عَجِبَ اللهُ مِنْ قَوْمٍ يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ فِي السَّلاسِلِ). [خ٣٠١٠]

لە ریوایەتێکدا: وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا سەرسوڕدەمێنێ لە خەڵکانێك بە کۆت و زنجیرەوە دەچنە بەهەشتەوە[1]).**

٦١٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾. قَالَ: هُمْ الَّذِينَ هَاجَرُوا مَعَ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى الْمَدِينَة. [حم٢٤٦٣]

* إسناده حسن.

**لە ئیبن عەباسەوە دەربارەی ئایەتی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾، وتی: ئەوانە بریتین لەو کەسانەی لەگەڵ محەمەد(ﷺ) کۆچیان کرد بۆ مەدینە.**

---

[1] ئیبن جەوزی دەڵێت: ماناکەی ئەوان بە دیل دەگیرێن و کۆت و بەند دەکرێن، کاتێك راستی و دروستی ئیسلامیان بۆ دەردەکەوێت بە رازیبوونەوە دێنە ناو ئیسلامەوە و دەچنە بەهەشتەوە.

## ئایەتی: ﴿لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ﴾ [آل عمران: ١٢٨]

**٦١١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ عَلَى أَحَدٍ، أَوْ يَدْعُوَ لأَحَدٍ، قَنَتَ بَعْدَ الرُّكُوعِ، فَرُبَّمَا قَالَ، إِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ: **(اللَّهُمَّ! رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ. اللَّهُمَّ! أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ، وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ. اللَّهُمَّ! اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، وَاجْعَلْهَا سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ)**، يَجْهَرُ بِذلِكَ، وَكَانَ يَقُولُ فِي بَعْضِ صَلاَتِهِ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ: **(اللَّهُمَّ! الْعَنْ فُلاَناً وَفُلاَناً)** لأَحْيَاءٍ مِنَ الْعَرَبِ، حَتَّى أَنْزَلَ اللهُ: ﴿لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ﴾ الآيَةَ. [خ٤٥٦٠ (٧٩٧)/ م٦٧٥]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) بیویستبا دوعا لە کەسێك بکات، یان دوعا بۆ کەسێك بکات، لەدوای ڕکوع قنووتی دەخوێند، کاتێك دەیفەرموو: "سمع الله لمن حمده" بۆی هەبوو بیفەرموویا: اللَّهُمَّ! رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ. اللَّهُمَّ! أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ، وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ. اللَّهُمَّ! اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، وَاجْعَلْهَا سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ-خودایە حەمد بۆ تۆیە، خودایە وەلیدی کوڕی وەلید و سەلەمەی کوڕی هیشام و عەییاشی کوڕی ڕەبیعە ڕزگار بکە، خودایە سزای خۆت لەسەر موزەر توند بکەرەوە، بیکە بە گرانی و سیاسالی بۆیان وەك گرانی و سیالییەکەی یوسف)، بەوە دەنگی بەرز دەکردەوە، هەروەها لە هەندێ نوێژیدا لە نوێژی بەیانی دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ! الْعَنْ فُلاَناً وَفُلاَناً-خودایە، نەفرەت لە فلان و فلان بکە)، نەفرەت لە زیندووان لە عەرەب، تا خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ﴾..ئایەتەکە.**

## ئایەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً﴾ [آل عمران: ١٣٥]

**٦١٢-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: إِنِي كُنْتُ رَجُلاً إِذَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَدِيثاً نَفَعَنِي اللهُ مِنْهُ بِمَا شَاءَ أَنْ يَنْفَعَنِي، وَإِذَا حَدَّثَنِي أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِهِ اسْتَحْلَفْتُهُ، فَإِذَا حَلَفَ لِي صَدَّقْتُهُ، وإِنهَ حَدَّثَنِي أَبُو بَكْرٍ - وَصَدَقَ أَبُو بَكْرٍ - قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه

وسلّم يَقُولُ: (مَا مِنْ عَبْدٍ يُذْنِبُ ذَنْباً، ثُمَّ يَقُومُ فَيتطَهَّرُ، ثُمَّ يُصَلِّي، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللهَ إلاَّ غَفَرَ اللهُ لَهُ)، ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ﴾ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ. [د١٥٢١/ ت٤٠٦/ جه١٣٩٥]

* حسن صحيح.

لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: من پیاوێك بووم گەر لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموودەیەكم ببیستبایە خودا سوودی پێ دەگەیاندم بەوەی بیەوێت سوودم پێ بگەیەنێت، گەر یەكێك لە هاوەڵانی بۆی باس بكردمام سوێندم دەدا، گەر سوێندی بۆ بخواردبام بەڕاستم دەزانی، ئەبوبەكر بۆی باس كردم–ئەبوبەكریش راست دەكات– وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر بەندەیەك گوناهێك ئەنجام بدات، پاشان هەستێت و خۆی پاك بكاتەوە و پاشان داوای لێخۆشبوون لە خودا بكات خودا لێیخۆش دەبێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ﴾، تا كۆتایی ئایەتەكە).**

## ئایەتی: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًاۢ﴾ [آل عمران: ١٦٩]

**٦١٣**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَمَّا أُصِيبَ إِخْوَانُكُمْ بِأُحُدٍ، جَعَلَ اللهُ أَرْوَاحَهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ، تَرِدُ أَنْهَارَ الْجَنَّةِ، تَأْكُلُ مِنْ ثِمَارِهَا، وَتَأْوِي إِلَى قَنَادِيلَ مِنْ ذَهَبٍ مُعَلَّقَةٍ فِي ظِلِّ الْعَرْشِ، فَلَمَّا وَجَدُوا طِيبَ مَأْكَلِهِمْ وَمَشْرَبِهِمْ وَمَقِيلِهِمْ، قَالُوا: مَنْ يُبَلِّغُ إِخْوَانَنَا عَنَّا أَنَّا أَحْيَاءٌ فِي الْجَنَّةِ نُرْزَقُ، لِئَلاَّ يَزْهَدُوا فِي الْجِهَادِ، وَلاَ يَنْكُلُوا عِنْدَ الْحَرْبِ؟ فَقَالَ اللهُ سُبْحَانَهُ: أَنَا أُبَلِّغُهُمْ عَنْكُمْ)، قَالَ: فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ. [د٢٥٢٠]

* حسن.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(كاتێك براكانتان لە ئوحد تووشبوون(شەهیدبوون) خودا رۆحەكانیانی كردە ناو هەناوی باڵندەی سەوز، دەچن بۆ سەر روبارەكانی بەهەشت و لە بەروبوومی بەهەشت دەخۆن و دەگەڕێنەوە**

بۆ هێلانەی زێڕینی هەڵواسراو لەژێر سێبەری عەرش، کاتێك خۆشی خواردن و خواردنەوە و نیشتەجێبوونیان بینی، وتیان: کێ لە ئێمەوە بە براکانمان رادەگەیەنێت کە ئێمە زیندووین و لە بەهەشت ڕۆزی دەدرێین، بۆئەوەی لە جیهاد زوهد نەکەن(کەنارگیر نەبن) و لە جەنگ پاشگەز نەبنەوە؟ خودا(سبحانه وتعالى) فەرمووی: من لە ئێوەوە بەوانی رادەگەیەنم، فەرمووی: خودا ئەمەی دابەزاند: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە).

### ئایەتی: ﴿إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ﴾ [آل عمران: ١٧٣]

٦١٤- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾. قالَهَا إِبْرَاهِيمُ عليه السلام حِينَ أُلْقِيَ فِي النَّارِ، وَقَالَهَا مُحَمَّدٌ صلّى الله عليه وسلّم حِينَ قَالوا: ﴿إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ١٧٣﴾. [خ٤٥٦٣]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە: ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾، ئیبراهیم(علیه السلام) فەرمووی کاتێك هەڵدرا بۆ ناو ئاگرەکە، هەروەها محەمەد فەرمووی: کاتێك وتیان: ﴿إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ١٧٣﴾.

### ئایەتی: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟﴾ [آل عمران: ١٨٨]

٦١٥- (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّ رِجالاً مِنَ المنَافِقِينَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، كانَ إِذَا خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى الْغَزْوِ تَخَلَّفُوا عَنْهُ، وَفَرِحُوا بِمَقْعَدِهِمْ خِلاَفَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَإِذَا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم اعْتَذَرُوا إِلَيْهِ وَحَلَفُوا، وَأَحَبُّوا أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا، فَنَزَلَتْ: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟﴾ الآية. [خ٤٥٦٧/ م٢٧٧٧]

(ق) لـە ئـەبی سـەعیدی خودرییـەوە(خوا لێـی رازی بێـت): کۆمـەڵێك پیـاو لـە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەردەچوو بۆ غەزا لێی دوادەکەوتن، بە دانیشتن و دواکەوتنیان لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆشحاڵ دەبوون، کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەگەڕایەوە عوزرخواییان بۆ دەهێنایەوە و سوێندیان دەخوارد و پێیانخۆش بوو حەمد بکرێن بە شتێك ئەنجامیان نەدابوو، بۆیە ئایەت دابەزی: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ﴾.

٦١٦– (ق) عَنْ مَرْوَانَ ـ ابنِ الحَكَمِ ـ قَالَ لِبَوَّابِهِ: اذْهَبْ يا رَافِعُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْ: لَئِنْ كانَ كُلُّ امْرِئٍ فَرِحَ بِمَا أُوتِيَ، وَأَحَبَّ أَنْ يُحْمَدَ بِمَا لَمْ يَفْعَلْ، مُعَذَّباً؛ لَنُعَذَّبَنَّ أَجْمَعُونَ! فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَما لَكُمْ وَلِهذِهِ؟ إِنَّمَا دَعا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَهُودَ فَسَأَلَهُمْ عَنْ شَيْءٍ، فَكَتَمُوهُ إِيَّاهُ، وَأَخْبَرُوهُ بِغَيْرِهِ، فَأَرَوْهُ أَنْ قَدِ اسْتَحْمَدُوا إِلَيْهِ بِمَا أَخْبَرُوهُ عَنْهُ فِيما سَأَلَهُمْ، وَفَرِحُوا بِمَا أَتَوْا مِنْ كِتْمانِهِمْ، ثُمَّ قَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَـٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ كَذَلِكَ، حَتَّى قَوْلِهِ: ﴿يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ﴾. [خ٤٥٦٨/ م٢٧٧٨]

(ق) لە مەروانەوە–ئیبن حەکەم– بە دەرگاوانەکەی خۆی وت: ئەی رافیع بچۆ بۆ لای ئیبن عەباس و بڵێ: گەر هەر مرۆڤێ دڵخۆش بێت بەوەی پێیدراوە و پێیخۆش بێت حەمد بکرێت بە شتێك ئەنجامی نەداوە سزا بدرێت، ئەوا هەموومان سزا دەدرێین، ئیبن عەباس وتی: ئێوە چیتانداوە لەمە؟ پێغەمبەر(ﷺ) یەهوودی بانگ کرد و پرسیاری شتێکی لێکردن، ئەوانیش لێیان شاردەوە و هەواڵی شتێکی تریان پێدا، ئەوان پێیانوابوو لەوەی هەواڵیان پێداوە بۆ ئەو شتەی لەوانی پرسی حەمدیان بەدەستهێناوە، دڵخۆش بوون بەوەی پێی هەستابوون لە شاردنەوەی، پاشان ئیبن عەباس ئەمەی خوێندەوە: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَـٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ﴾، تا ئایەتی ﴿يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ﴾.

ئایەتی: ﴿أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ﴾ [آل عمران: ١٩٥]

٦١٧- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! لاَ أَسْمَعُ اللهَ ذَكَرَ النِّسَاءَ فِي الْهِجْرَةِ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ﴾. [ت٣٠٢٣]

* صحيح.

لە ئوم سەلەمەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، نابیستم خودا لە کۆچدا باسی ئافرەت بکات، خودا(سبحانه وتعالى) ئایەتی دابەزاند: ﴿أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ﴾.

## (٤)

## سورة النساء

ئایەتی: ﴿وَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تُقۡسِطُواْ فِي ٱلۡيَتَٰمَىٰ﴾ [النساء: ٣]

٦١٨- (ق) عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ: أَنَّهُ سَأَلَ عائِشَةَ ﵂، عَنْ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿وَإِنۡ خِفۡتُمۡ﴾، إِلَى ﴿وَرُبَٰعَ﴾. فَقَالَتْ: يَا ابْنَ أُخْتِي! هِيَ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا، تُشَارِكُهُ فِي مالِهِ، فَيُعْجِبُهُ مالُهَا وَجَمَالُهَا، فَيُرِيدُ وَلِيُّهَا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا، بِغَيْرِ أَنْ يُقْسِطَ فِي صَدَاقِهَا، فَيُعْطِيَهَا مِثْلَ ما يُعْطِيهَا غَيْرُهُ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوهُنَّ؛ إِلاَّ أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ، وَيَبْلُغُوا بِهِنَّ أَعْلَى سُنَّتِهِنَّ مِنَ الصَّدَاقِ، وَأُمِرُوا أَنْ يَنْكِحُوا ما طَابَ لَهُمْ مِنَ النِّسَاءِ سِوَاهُنَّ.

قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عائِشَةُ: ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ اسْتَفْتَوْا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَعْدَ هذِهِ الآيَةِ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَيَسۡتَفۡتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾[النساء:١٢٧]. وَالذِي ذَكَرَ اللهُ أَنَّهُ يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ الآيَةُ الأُولى، الَّتِي قَالَ فِيهَا: ﴿وَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تُقۡسِطُواْ فِي ٱلۡيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ [النساء:٣].

قَالَتْ عائِشَةُ: وَقَوْلُ اللهِ فِي الآيَةِ الأُخْرَى: ﴿وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾ [النساء:١٢٧]؛ يَعْنِي: هِيَ رَغْبَةُ أَحَدِكُمْ عَنْ يَتِيمَتِهِ الَّتِي تَكُونُ فِي حَجْرِهِ، حِينَ تَكُونُ قَلِيلَةَ المالِ وَالجَمَالِ،

فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوا مـا رَغِبُـوا فِـي مالِهَا وَجَمَالِهَا مِـنْ يَتَامـى النِّسَـاءِ إِلاَّ بِالْقِسْـطِ، مِـنْ أَجْـلِ رَغْبَتِهِمْ عَنْهُنَّ. [خ٢٤٩٤/ م٣٠١٨]

(ق) لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە: پرسیاری لە عائیشە(خوا لێـی رازی بێـت) کـرد دەربـارەی فـەرموودەی خودا(سـبحانه وتعـالى): ﴿وَإِنْ خِفْـتُمْ﴾، إِلَى تـا ﴿وَرُبَـٰعَ﴾ عائیشـــە وتـــی: خوشـــکەزای خـــۆم، ئـــەوە کچـــێکی بێباوکـــە لـــە ژێـــر چـــاودێری سەرپەرشـــتکارەکەی، لـــە مـــاڵ و ســـامانی سەرپەرشـــتکارەکەیدا هاوبەشـــە، سەرپەرشتکارەکە ماڵ و سـامانی کچـەکە و جوانییەکـەی جێـی سـەرنجییەتی، بۆیـە سەرپەرشتیارەکە دەیەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، بەبێ ئـەوەی دادپـەروەری لـە مارەییەکەی ئەنجام بدات، وەك چۆن مارەیی بە ئافرەتانی تر دەدات بەویشی بـدات، بۆیە نەهییان لێکرا هاوسەرگیرییان لەگەڵ بکـەن، مەگـەر لەگـەڵیان دادپـەروەر بـن و ئەوانیش بگەیەنن بە زۆرترین سوننەتی مارەیی، فەرمانیان پێکرا جگە لەوان چەندیان پێخۆشە[1] لە ئافرەتانی تر مارە بکەن.

عوروە دەڵێت: عائیشە وتی: پاشان خەڵکی لەدوای ئەم ئایەتـە داوای فتوایـان لـە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد دەربارەی ئافرەتان، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَـآءِ﴾ تـا ﴿وَتَرْغَبُـونَ أَن تَنكِحُـوهُنَّ﴾[النساء:١٢٧]، ئـەوەی خـودا باسـی کردووە–لە کتێبەکەدا بەسەر ئێوەدا دەخوێنرێتەوە[2]– ئایـەتی یەکەمـە کـە تیایـدا دەفـەرموێت: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُواْ فِي ٱلْيَتَـٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَـا طَـابَ لَكُـم مِّـنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ [النساء:٣].

عائیشـــە وتـــی: فـــەرموودەی خـــودا لـــە ئایەتەکـــەی تـــردا: ﴿وَتَرْغَبُـــونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾[النساء:١٢٧]، واتە: بریتییە لە حەزی یەکێك لە ئێوە لە کچە بێباوکەکە، کە لەژێر چاودێری خۆیدایە کاتێك ماڵ و سامان جوانییەکەی کەم بێت، بۆیە نەهییان

[1] مەبەست دوو یان سێ یان چوارە–و.

[2] مەبەستی ئەم بەشەی ئایەتەکەیە: ﴿وَمَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ﴾[النساء: ١٢٧]–و.

لێکرا هاوسەرگیری لەگەڵ ئەوانە بکەن حەزیان لە ماڵ و سامان و جوانییەکانیانە لە منداڵی بێباوکی ئافرەتان مەگەر بە دادپەروەرانە، لەبەر حەز لێ نەکردنیان[1].

### ئایەتی: ﴿وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ [النساء: ٦]

**٦١٩-** (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂: ﴿وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾. قَالَتْ: أُنْزِلَتْ فِي وَالِي الْيَتِيمِ، أَنْ يُصِيبَ مِنْ مالِهِ إذَا كانَ مُحْتاجاً، بِقَدْرِ مالِهِ بِالمعْرُوفِ. [خ٢٧٦٥ (٢٢١٢)/ م٣٠١٩]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): ﴿وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾، وتی: دەربارەی سەرپەرشتیاری منداڵی بێباب دابەزی، بە چاکە دەست بۆ شتێك لە ماڵەکەی ببات گەر ئاتاج بێت، ئەوەش بە بڕی ماڵ و سامانەکەی.

- وفي رواية للبخاري: إِذَا كَانَ فَقِيراً، أَنَّهُ يَأْكُلُ مِنْهُ مَكَانَ قِيَامِهِ عَلَيْهِ بِمَعْرُوفٍ. [خ٤٥٧٥]

لە ریوایەتێکی بوخاریدا: گەر هەژار بوو[2] بە چاکە لێی دەخوات[3] لەبری سەرۆکارییەکەی.

### ئایەتی: ﴿وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ﴾ [النساء: ٨]

**٦٢٠-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: إِنَّ نَاساً يَزْعُمُونَ أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ نُسِخَتْ، وَلاَ واللهِ ما نُسِخَتْ، وَلكِنَّهَا مِمَّا تَهَاوَنَ النَّاسُ، هُما وَالِيَانِ: وَالٍ يَرِثُ وَذَاكَ الَّذِي يَرْزُقُ، وَوَالٍ لاَ يَرِثُ فَذَاكَ الَّذِي يَقُولُ بِالمعْروفِ، يَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ أَنْ أُعْطِيَكَ. [خ٢٧٥٩]

---

[1] (گەر ماڵ و سامان و جوانییان کەم بوو)) ئەم بەشە لای ئیمامی بوخاری هاتووە، گەر ئەمەی لەگەڵ نەبێت ماناکەی لەنگ و ناتەواوە-و.

[2] واتە: گەر سەرپەرشتیارەکە هەژار بوو-و.

[3] بە بڕێکی دیاریکراو لە ماڵ و سامانی منداڵە بێبابەکە دەخوات-و.

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: خەڵکانێك بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەم ئایەتە نەسخ کراوە، نەخێر، سوێند بە خودا نەسخ نەکراوە، بەڵام لەو کارانەیە خەڵکی کەمتەرخەمی تێدا دەکەن، ئەو دوانە دوو والین[1]: والییەك میرات دەگرێت[2]، ئەوە ئەو والییەیە ڕۆزی دەدات[3]، والییەکیش میرات ناگرێت[4]، ئەمەش ئەو والییەیە بە چاکە قسە دەکات، دەڵێت: شتێکم لا نییە پێتی بدەم.

- وفي رواية: هِيَ مُحْكَمَةٌ وَلَيْسَتْ بِمَنْسُوخَةٍ. [خ٤٥٧٦]

لە ریوایەتێکی بوخاریدا: ئەوە موحکەمە و نەسخ نەکراوە.

## ئایەتی: ﴿لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا﴾ [النساء: ١٩]

٦٢١- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ﴾. قَالَ: كَانُوا إِذَا مَاتَ الرَّجُلُ كَانَ أَوْلِيَاؤُهُ أَحَقَّ بِامْرَأَتِهِ، إِنْ شَاءَ بَعْضُهُمْ تَزَوَّجَهَا، وَإِنْ شَاؤُوا زَوَّجُوهَا، وَإِنْ شَاؤُوا لَمْ يُزَوِّجُوهَا، فَهُمْ أَحَقُّ بِهَا مِنَ أَهْلِهَا، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي ذَلِكَ. [خ٤٥٧٩]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ﴾، وتی: کاتێك پیاوێك دەمرد سەرپەرشتیارانی[5] لەپێشتربوون بە ژنەکەی، گەر یەکێکیان بیخواستبا هاوسەرگیری لەگەڵ دەکرد، گەر بیانویستبا بە مێردیان دەدا، گەر نەیانویستبا بە مێردیان نەدەدا، ئەوان لە خانەوادەی ئافرەتەکە لەپێشتربوون پێی، ئەم ئایەتە لەوەدا دابەزی.

---

[1] واتە: دوو جۆر میراتگرن-و.

[2] واتە: لە میراتەکە بەشی هەژاران لە خزمان و کەسوکاری لێدەدات-و.

[3] واتە: مردووەکە میراتی بەجێهێڵاوە بۆ میراتگر-و.

[4] واتە: مردووەکە هیچی بەجێنەهێڵاوە بۆ میراتگر-و.

[5] واتە: میراتگرن لە کوڕ و برا و باوك-و.

## ئایەتی: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ [النساء: ٣٢]

٦٢٢– عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: يَغْزُو الرِّجَالُ وَلاَ تَغْزُو النِّسَاءُ، وَإِنَّمَا لَنَا نِصْفُ الْمِيرَاثِ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَبارَكَ وتَعَالَى: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾. قَالَ مُجَاهِدٌ: وَأَنْزَلَ فِيهَا: ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ﴾ [الأحزاب:٣٥]. [ت٣٠٢٢]

* صحيح.

له ئوم سەلەمەوە، وتی: پیاوان غەزا دەکەن و ژنان غەزا ناکەن، ئێمە نیوەی میراتمان بۆ هەیە[1]، خودا(تبارك وتعالى) ئایەتی دابەزاند: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾، موجاهید دەڵێت: هەروەها ئەم ئایەتەش تیایدا دابەزی: ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ﴾ [الأحزاب:٣٥].

## ئایەتی: ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ﴾ [النساء: ٣٣]

٦٢٣– (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ﴾ قَالَ: وَرَثَةً. ﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ قَالَ: كانَ المهَاجِرُونَ لَمَّا قَدِمُوا المدِينَةَ، يَرِثُ المهَاجِرُ الأَنْصَارِيَّ دُونَ ذَوِي رَحِمِهِ، للأُخُوَّةِ الَّتِي آخى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بَيْنَهُمْ، فَلَمَّا نَزَلَتْ: ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ﴾ نَسَخَتْ، ثُمَّ قَالَ: ﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ إلاَّ النَّصْرَ وَالرِّفَادَةَ وَالنَّصِيحَةَ. وَقَدْ ذَهَبَ الْمِيرَاثُ. وَيُوصِي لَهُ. [خ٢٢٩٢]

(خ) له ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ﴾، وتی: "موالي" واتە: "ورثة–میراتگران"، ﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾، وتی: کۆچکەران

[1] واتە: ئوم سەلەمە ئەو پرسیارەی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد: (پیاوان غەزا دەکەن و ژنان غەزا ناکەن، ئێمە نیوەی میراتمان بۆ هەیە)، وەك لە فەرموودەی(٦١٧)دا هاتووە، خوداش ئایەتی دابەزاند و وەڵامی دایەوە–و.

کاتێك هاتن بۆ مەدینە، کۆچکەر میراتی لە ئەنصاری دەبرد نەك ئەوانەی کەسوکاری بوون، ئەوەش لەبەر ئەو برایەتییەی پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوانیان دایمەزراند، کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ﴾ میراتگری برایەتی نەسخ بوویەوە، پاشان وتی: ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾، جگە لە سەرخستن و پشتیوانی کردن و نەصیحەت میرات نەما، بەڵام وەسێتی بۆ دەکات[1].

٦٢٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾[النساء:٣٣]، كَانَ الرَّجُلُ يُحَالِفُ الرَّجُلَ لَيْسَ بَيْنَهُمَا نَسَبٌ، فَيَرِثُ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ، فَنَسَخَ ذَلِكَ الْأَنْفَالُ، فَقَالَ تَعَالَى: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ﴾[الأنفال:٧٥]. [د٢٩٢١]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ[2] أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾ [النساء:٣٣]، پیاو لەگەڵ پیاو پەیمانی دەبەست بەبێ ئەوەی رەچەڵەك لە نێوانیان بێت، یەکێکیان میراتی لەویتریان دەگرت، "الأنفال" ئەوەی نەسخ کردەوە، خودا(سبحانه وتعالى) فەرمووی: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ﴾ [الأنفال:٧٥].

## ئایەتی: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾ [النساء: ٩٣]

٦٢٥- (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: آيَةٌ اخْتَلَفَ فِيهَا أَهْلُ الْكُوفَةِ، فَرَحَلْتُ فِيهَا إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَسَأَلْتُهُ عَنْهَا، فَقَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ﴾، هِيَ آخِرُ ما نَزَلَ، ومَا نَسَخَهَا شَيْءٌ. [خ٤٥٩٠، (٣٨٥٥)/ م٣٠٢٣]

---

[1] واتە: دەتوانێ وەسێت بکات بەشێك لە ماڵ و سامانەکەی-کە بریتییە لە سێ یەك- بە کەسێك بدرێت.

[2] لە فەرموودەکەدا بە (عاقدَتْ) هاتووە و لە ئایەتەکەدا بە (عقدَتْ)-د.

(ق) لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، وتی: ئایەتێك ئەهلی کوفە تیایدا جیاوازییان هەبوو، لەپێناوی سەفەرم کرد بۆ لای ئیبن عەباس و دەربارەی پرسیارم لێکرد، وتی: ئەم ئایەتە: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ﴾، دوایین ئایەتە دابەزی، و هیچ شتێك نەسخی نەکردووە.

- وفي رواية لهما: قَالَ: أَمَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمنِ بْنُ أَبْزَى قَالَ: سَلِ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ هَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ ما أَمْرُهُمَا: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ [الأنعام:١٥١]، ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾، فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَقَالَ: لَمَّا أُنْزِلَتِ الَّتِي فِي الْفُرْقَانِ، قَالَ مُشْرِكُو أَهْلِ مَكَّةَ: فَقَدْ قَتَلْنَا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ، وَدَعَوْنَا مَعَ اللهِ إِلهاً آخَرَ، وَقَدْ أَتَيْنَا الفَوَاحِشَ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ﴾ الآيَةَ [الفرقان:٧٠]، فَهذِهِ لأُولئِكَ، وَأَمَّا التِي فِي النِّسَاءِ: الرَّجُلُ إِذَا عَرَفَ الإِسْلاَمَ وَشَرَائِعَهُ، ثُمَّ قَتَلَ فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ. [خ٣٨٥٥]

لە ریوایەتێکی هەردووکیاندا: وتی: عبدالرحمانی کوڕی ئەبزا فەرمانی پێ کردم و وتی: لە ئیبن عەباس پرسیاری ئەم دوو ئایەتە بکە و فەرمانەکانیان چییە: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ [الأنعام:١٥١]، و ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾، پرسیارم لە ئیبن عەباس کرد وتی: کاتێك ئەوەی لە "الفرقان"دا دابەزی[1]، هاوەڵدانەرانی ئەهلی مەککە وتیان: ئێمە ئەو نەفسەمان کوشتووە خودا حەرامی کردووە، لەگەڵ خودا خواوەندێکی ترمان پەرستووە، و فاحیشەمان ئەنجامداوە، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ﴾ [الفرقان:٧٠]، ئەمە بۆ ئەوانە بوو، بەڵام ئەوەی لە "النساء"دایە: پیاو کە ئیسلام و شەریعەتەکەی ناسی، پاشان کەسێکی کوشت سزاکەی دۆزەخە.

---

[1] مەبەستی ئەم ئایەتەی سوورەتی "الفرقان"ە: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ﴾[الفرقان: ٦٨] ـو.

**ئایەتی: ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا﴾ [النساء: ٩٤]**

**٦٢٦-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا﴾. قَالَ: كانَ رَجُلٌ فِي غُنَيْمَةٍ لَهُ فَلَحِقَهُ المسْلِمُونَ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَقَتَلُوهُ وَأَخَذُوا غُنَيْمَتَهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ فِي ذلِكَ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾: تِلْكَ الْغُنَيْمَةُ. قالَ: قَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ: السَّلَامَ. [خ٤٥٩١/ م٣٠٢٥]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا﴾، وتی: پیاوێك كەمێ ماڵ و سامانی خۆی پـێ بوو، موسڵمانان پێی گەیشتن، وتی: "السَّلَامُ عَلَيْكُمْ" كوشتیان و كەمە ماڵ و سامانەكەیان برد، خـودا لەوەدا ئایەتی دابەزاند تا: ﴿تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾، وتـی: ئـەوە بریتییـە لـە كەمە ماڵ و سامانەكە.**

**وتی: ئیبن عەباس: "السلم"ی بە "السلام" خوێندەوە.**

**ئایەتی: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ﴾ [النساء: ٩٥]**

**٦٢٧-** (خ) عَنْ زيدِ بنِ ثابتٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَمْلَى عَلَيْهِ: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ... وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ قَالَ: فَجَاءَهُ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهُوَ يُمِلُّهَا عَلَيَّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ لَوْ أَسْتَطِيعُ الْجِهَادَ لَجَاهَدْتُ، وَكَانَ رَجُلاً أَعْمى، فَأَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَلَى رَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم ـ وَفَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي، فَثَقُلَتْ عَلَيَّ حَتَّى خِفْتُ أَنْ تُرَضَّ فَخِذِي ـ ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ﴾. [خ٢٨٣٢]

**(خ) لە زەیدی كوڕی سابیتەوە(خوا لێی رازی بێت) پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمەی بەسەردا خوێندەوە: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ... وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، وتی: ئیبن ئوم مەكتووم هات بۆ لای كاتێك بەسەر مندا دەیخوێندەوە، وتـی:**

ئەی پێغەمبەری خودا، گەر جیهادم بتوانیبایە دەمکرد، ئەو پیاوێکی کوێر بوو، خودا(تبارك وتعالى) ئایەتی بۆ سەر پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دابەزاند-رانی لەسەر رانم بوو، ئەوەندە قورس بوو لەسەرم ترسم هەبوو بشکێت- پاشان لەسەری نەما[1]، خودا(عز وجل): ﴿غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ﴾ دابەزاند.

## ئایەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمْ﴾ [النساء: ٩٧]

٦٢٨- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ نَاساً مِنَ المسْلِمِينَ كانُوا مَعَ المشْرِكِينَ، يُكَثِّرُونَ سَوَادَ المشْرِكِينَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، يَأْتِي السَّهْمُ فَيُرْمى بِهِ، فَيُصِيبُ أَحَدَهُمْ فَيَقْتُلُهُ، أَوْ يُضْرَبُ فَيُقْتَلُ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمْ﴾ الآية. [خ٤٥٩٦]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە: لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەڵکانێك لە موسڵمانان لەگەڵ هاوەڵدانەران بوون و ژمارەی ئەوانیان زیاد دەکرد، تیر دەهات و هەڵدەدرا و یەکێکیانی دەپێکا و دەیکوشت، یان لێیدەدرا و دەکوژرا، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمْ﴾، ئایەتەکە.

## ئایەتی: ﴿أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ﴾ [النساء: ٩٧]

٦٢٩- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ﴾. قَالَ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ كانَ جَرِيحاً. [خ٤٥٩٩]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): ﴿إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ﴾، وتی: عبدالرحمانی کوڕی عەوف بریندار بوو.

---

[1] واتە: وەحییەکە تەواو بوو و لەسەر پێغەمبەر نەما.

**ئایەتی: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا﴾ [النساء: ١٢٨]**

**٦٣٠-** (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا﴾. قَالَتْ: الرَّجُلُ تكُونُ عِنْدَهُ المرْأَةُ، لَيْسَ بِمُسْتَكْثِرٍ مِنْهَا، يُرِيدُ أَن يُفَارِقَهَا، فَتَقُولُ: أَجْعَلُكَ مِنْ شَأْنِي فِي حِلٍّ، فَنَزَلَتْ هذِهِ الآيَةُ فِي ذلِكَ. [خ٢٤٥٠/ م٣٠٢١]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا﴾، وتی: پیاوێك ژنێکی لە لا بوو، لێی بێنیاز بوو و دەیویست لێی جیاببێتەوە، ژنەکە دەیوت: لە کاروباری خۆم گەردنت ئازاد دەکەم، ئەم ئایەتە لەوەدا دابەزی.**

- وفي رواية لهما قالَتْ: هُوَ الرَّجُلُ يَرَى مِنِ امْرَأَتِهِ ما لاَ يُعْجِبُهُ، كِبَراً أَوْ غَيْرَهُ، فَيُرِيدُ فِرَاقَهَا، فَتَقُولُ: أَمْسِكْنِي وَاقْسِمْ لِي ما شِئْتَ، قَالَتْ: فَلاَ بَأْسَ إِذَا تَرَاضَيَا. [خ٢٦٩٤]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان: وتی: ئەوە پیاوێکە شتێك لە ژنەکەی دەبینێت جێگەی سەرنجی نییە، لوتبەرزی یان شتێکی تر، بۆیە دەیەوێت لێی جیاببێتەوە، ژنەکە دەڵێت: لای خۆت بمهێڵەوە و چۆن دەخوازی بەو جۆرە بەشم بدە، عائیشە وتی: خراپ نییە گەر هەردووکیان رازی بن.**

**(٥)**

## سورة المائدة

**ئایەتی: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾ [المائدة: ٣]**

**٦٣١-** (ق) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْيَهُودِ قَالَ لَهُ: يَا أَمِيرَ المؤْمِنِينَ، آيَةٌ فِي كِتَابِكُمْ تَقْرَؤُونَهَا، لَوْ عَلَيْنَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ نَزَلَتْ، لاَتَّخَذْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ عِيداً، قَالَ: أَيُّ آيَةٍ؟ قَالَ: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينًا﴾. قَالَ عُمَرُ: قَدْ عَرَفْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ، وَالمكَانَ الَّذِي نَزَلَتْ فِيهِ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَهُوَ قَائِمٌ بِعَرَفَةَ يَوْمَ جُمُعَةٍ. [خ٤٥/ م٣٠١٧]

(ق) لە عومەری کوڕی خەتابەوە: پیاوێك لە یەهوود پێی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئایەتێك لە کتێبەکەتان دەیخوێننەوە، گەر بەسەر ئێمەی یەهوودا دابەزیبایە ئەو ڕۆژەمان دەکرد بە جەژن، وتی: کام ئایەت؟ وتی: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾، عومەر وتی: ئەو ڕۆژە و ئەو شوێنەش تیایدا بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) دابەزی دەزانین، ئەو[1] لە ڕۆژی جومعە لە عەرەفە بەپێوە وەستا بوو.

## ئایەتی: ﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ﴾ [المائدة: ٤٢]

**٦٣٢**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ قُرَيْظَةُ وَالنَّضِيرُ، وَكَانَ النَّضِيرُ أَشْرَفَ مِنْ قُرَيْظَةَ، فَكَانَ إِذَا قَتَلَ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْظَةَ رَجُلاً مِنَ النَّضِيرِ قُتِلَ بِهِ، وَإِذَا قَتَلَ رَجُلٌ مِنَ النَّضِيرِ رَجُلاً مِنْ قُرَيْظَةَ فُودِيَ بِمِائَةِ وَسْقٍ مِنْ تَمْرٍ. فَلَمَّا بُعِثَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم قَتَلَ رَجُلٌ مِنَ النَّضِيرِ رَجُلاً مِنْ قُرَيْظَةَ، فَقَالُوا: ادْفَعُوهُ إِلَيْنَا نَقْتُلْهُ، فَقَالُوا: بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَتَوْهُ، فَنَزَلَتْ: ﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ﴾، وَالْقِسْطُ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، ثُمَّ نَزَلَتْ: ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ [المائدة: ٥٠]. [د٤٤٩٤/ ن٤٧٤٦]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: "قریظة و النضیر" هەبوون، "النضیر" لە "قریظة" بالآتربوون، گەر پیاوێك لە "قریظة" پیاوێکی لە "النضیر" بکوشتبایە دەکوژرایەوە، گەر پیاوێك لە "النضیر" پیاوێکی لە "قریظة"ی بکوشتبا بە سەد وەسەق[2] لە خورما فیدیەیان دەدا، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ڕەوانە کرا پیاوێك لە "النضیر" پیاوێك لە "قریظة"ی کوشت، وتیان[3]: پیاوەکەمان ڕادەست بکەن دەیکوژینەوە، ئەوانیش

---

[1] واتە: پێغەمبەر(ﷺ).

[2] یەك وەسەق نزیك بە ١٣٠ کیلۆگرامە-و.

[3] واتە: بەنو قورەیزە وتیان.

وتیان: پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوان ئێمە و ئێوەدایە، هاتن بۆ لای، ئایەت دابەزی: ﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ﴾، "القسط": نەفس بە نەفس، پاشان ئەمە دابەزی: ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾.

## ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ [المائدة: ٤٤]

٦٣٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ٱلْفَٰسِقُونَ﴾: هَؤُلَاءِ الْآيَاتِ الثَّلَاثِ نَزَلَتْ فِي الْيَهُودِ خَاصَّةً، فِي قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ. [د٣٥٧٦]

* حسن صحيح الإسناد.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، تا دەگاتە: ﴿ٱلْفَٰسِقُونَ﴾، ئەو سێ ئایەتە بەتایبەت دەربارەی یەهوود دابەزیوە و لەسەر (قريظة و النضير[1]).

٦٣٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: إِنَّ اللهَ عزّ وجل أَنْزَلَ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، وَ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾، وَ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَنْزَلَهَا اللهُ فِي الطَّائِفَتَيْنِ مِنَ الْيَهُودِ، وَكَانَتْ إِحْدَاهُمَا قَدْ قَهَرَتِ الْأُخْرَى فِي الْجَاهِلِيَّةِ، حَتَّى ارْتَضَوْا أَوْ اصْطَلَحُوا عَلَى أَنَّ كُلَّ قَتِيلٍ قَتَلَهُ الْعَزِيزَةُ مِنَ الذَّلِيلَةِ فَدِيَتُهُ خَمْسُونَ وَسْقاً، وَكُلَّ قَتِيلٍ قَتَلَهُ الذَّلِيلَةُ مِنَ الْعَزِيزَةِ فَدِيَتُهُ مِائَةُ وَسْقٍ.

فَكَانُوا عَلَى ذَلِكَ حَتَّى قَدِمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم الْمَدِينَةَ، فَذَلَّتِ الطَّائِفَتَانِ كِلْتَاهُمَا لِمَقْدَمِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، ورَسول الله صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَئِذٍ لَمْ يَظْهَرْ وَلَمْ يُوطِئْهُمَا عَلَيْهِ وَهُوَ فِي الصُّلْحِ، فَقَتَلَتِ الذَّلِيلَةُ مِنَ الْعَزِيزَةِ قَتِيلاً، فَأَرْسَلَتِ الْعَزِيزَةُ إِلَى الذَّلِيلَةِ أَنِ ابْعَثُوا إِلَيْنَا بِمِائَةِ وَسْقٍ، فَقَالَتِ الذَّلِيلَةُ: وَهَلْ كَانَ هَذَا فِي حَيَّيْنِ قَطُّ دِينُهُمَا وَاحِدٌ وَنَسَبُهُمَا وَاحِدٌ وَبَلَدُهُمَا وَاحِدٌ،

[1] دوو هۆزی یەهودی دەوروبەری مەدینە بوون.

دِيَةُ بَعْضِهِمْ نِصْفُ دِيَةِ بَعْضٍ؟ إِنَّا إِنَّمَا أَعْطَيْنَاكُمْ هَذَا ضَيْماً مِنْكُمْ لَنَا وَفَرَقاً مِنْكُمْ، فَأَمَّا إِذْ قَدِمَ مُحَمَّدٌ فَلاَ نُعْطِيكُمْ ذَلِكَ، فَكَادَتِ الْحَرْبُ تَهِيجُ بَيْنَهُمَا، ثُمَّ ارْتَضَوْا عَلَى أَنْ يَجْعَلُوا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَيْنَهُمْ، ثُمَّ ذَكَرَتِ الْعَزِيزَةُ فَقَالَتْ: وَاللهِ مَا مُحَمَّدٌ بِمُعْطِيكُمْ مِنْهُمْ ضِعْفَ مَا يُعْطِيهِمْ مِنْكُمْ، وَلَقَدْ صَدَقُوا مَا أَعْطَوْنَا هَذَا إِلاَّ ضَيْماً مِنَّا وَقَهْراً لَهُمْ، فَدُسُّوا إِلَى مُحَمَّدٍ مَنْ يَخْبُرُ لَكُمْ رَأْيَهُ: إِنْ أَعْطَاكُمْ مَا تُرِيدُونَ حَكَّمْتُمُوهُ، وَإِنْ لَمْ يُعْطِكُمْ حَذِرْتُمْ فَلَمْ تُحَكِّمُوهُ.

فَدَسُّوا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَاساً مِنَ الْمُنَافِقِينَ لِيَخْبُرُوا لَهُمْ رَأْيَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمَّا جَاءَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَخْبَرَ اللهُ رَسُولَهُ بِأَمْرِهِمْ كُلِّهِ، وَمَا أَرَادُوا، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ﴾ [المائدة: ٤١ ـ ٤٧]، ثُمَّ قَالَ: فِيهِمَا وَاللهِ نَزَلَتْ، وَإِيَّاهُمَا عَنَى اللهُ عزّ وجل.　　　[حم٢٢١٢]

* إسناده حسن.

له ئیبن عەباسەوە، وتی: خودا(عز وجل) ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾، ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾، ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ﴾، وتی: ئیبن عەباس وتی: خودا دەربارەی دوو کۆمەڵ لە یەهوود دایبەزاندن، لە سەردەمی نەفامی یەکێکیان ئەویتریانی ژێردەستە کرد بوو، تا رازیبوون و رێکەوتن لەسەر ئەوەی هەر کوژراوێك کۆمەڵە زاڵەکە لە کۆمەڵە بەزیوەکە بیکوژێت فیدییەکەی پەنجا وەسەق بێت[1]، هەر کوژراوێکیش کۆمەڵە بەزیوەکە لە کۆمەڵە زاڵەکەی بیکوژێت فیدییەکەی سەد وەسەق بێت.

ئەوان لەسەر ئەوە بوون تا پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ مەدینە، هەردوو کۆمەڵەکە بۆ هاتنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ملکەچ بوون، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەو رۆژەدا بەسەریاندا سەرنەکەوتبوو و دەسەڵاتی بەسەریاندا پەیدا نەکردبوو، ئەو لە ئاشتەواییدا بوو، کۆمەڵە بەزیوەکە یەکێکیان لە کۆمەڵە زاڵەکە کوشت، کۆمەڵە زاڵەکە جوابیان نارد بۆ کۆمەڵە بەزیوەکە سەد وەسەق خورمامان بۆ رەوانە بکەن، دەستە بەزیوەکە وتیان: ئایا هەرگیز

[1] واتە: پەنجا وەسەق لە خورما، یەك وەسەق نزیك بە ١٣٠ کیلۆگرامە—و.

ئەوە بووە لە دوو گەڕەکدا خاوەن یەك دین بن و رەچەڵەکیان یەك رەچەڵەك بێت و ولاّتیان یەك ولاّت، خوێنی لایەکیان نیوەی خوێنی لاکەی تر بێت؟! ئێمە ئەوەمان وەك زۆر و ستەم و جیاکاری لە ئێوەوە بە ئێوە بەخشیوە، ئێستا محەمەد هاتووە ئەوەتان پێ نادەین، خەریك بوو لە نێوان جەنگ بەرپابێت، پاشان رازیبوون پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نێوانیان دابنێن، پاشان کۆمەڵە زاڵەکە وتیان[1]: سوێند بە خودا، محەمەد دووبەرانبەری ئەوەی ئێوە دەیدەدەن بەوان لەوان وەرناگرێت بۆ ئێوە، ئەوان راستدەکەن ئەوەیان وەك ستەم و ژێردەستەیی بە ئێمە بەخشیوە، بۆیە کەسێك رەوانە بکەن بۆ لای محەمەد بۆچوونی ئەو وەربگرێت، گەر ئەوەی ئێوە دەتانەوێ پێیدان بیکەن بە دادوەر، گەر پێینەدان خۆتان دەپارێزن و نایکەن بە دادوەر.

کەسانێك لە دووڕوانیان رەوانەی لای پێغەمبەر(ﷺ) کرد بۆئەوەی رای پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ ئەوان وەربگرێت، کاتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) خودا هەموو کارەکەی ئەوان و ئەوەی دەیانەوێت بە پێغەمبەرەکەی راگەیاندبوو، خودا(عز وجل) ئایەتی دابەزاند: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا﴾، تا ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ﴾[المائدة: ٤١ - ٤٧] ، پاشان وتی[2]: سوێند بە خودا دەربارەی ئەوان دابەزیوە و خودا(عز وجل) مەبەستی ئەوانە.

### ئایەتی: ﴿وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ [المائدة: ٦٧]

**٦٣٥**– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُحْرَسُ، حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾، فَأَخْرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَأْسَهُ مِنَ الْقُبَّةِ، فَقَالَ لَهُمْ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ انْصَرِفُوا فَقَدْ عَصَمَنِي اللهُ). [ت٣٠٤٦]

* حسن.

---

[1] واتە: کۆمەڵە زاڵەکە لە نێوان خۆیان بە یەکتریان وت–و.

[2] واتە: ئیبن عەبباس وتی–و.

لە عائیشەوە وتی: پاسەوانی پێغەمبەر(ﷺ) دەکرا، تا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ﴾، لە قوببەیەکەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەری دەرکرد و پێی فەرموون: **(خەڵکینە، ئێوە بڕۆن خودا من دەپارێزێت)**.

## ئایەتی: ﴿لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ [المائدة: ٩٢]

**٦٣٦–** عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: مَاتَ رِجَالٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَبْلَ أَنْ تُحَرَّمَ الْخَمْرُ، فَلَمَّا حُرِّمَتِ الْخَمْرُ، قَالَ رِجَالٌ: كَيْفَ بِأَصْحَابِنَا وَقَدْ مَاتُوا يَشْرَبُونَ الْخَمْرَ؟ فَنَزَلَتْ: ﴿لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾. [ت٣٠٥٠]

* صحيح.

لە بەڕائەوە، وتی: بەر لەوەی عارەق حەرام بکرێت پیاوگەلێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) مردن، کاتێك عارەق حەرام کرا، پیاوانێك وتیان: دەبێ حاڵی هاوەڵانمان چۆن بێت مردن و عارەقیان دەخواردەوە؟ ئایەت دابەزی: ﴿لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾.

## ئایەتی: ﴿لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ﴾ [المائدة: ١٠١]

**٦٣٧–** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ قَوْمٌ يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم اسْتِهْزَاءً، فَيَقُولُ الرَّجُلُ: مَنْ أَبِي؟ وَيَقُولُ الرَّجُلُ تَضِلُّ نَاقَتُهُ: أَيْنَ نَاقَتِي؟ فَأَنْزَلَ اللهُ فيهم هذِهِ الآيَةَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ﴾، حَتَّى فَرَغَ مِنَ الآيَةِ كُلِّهَا. [خ٤٦٢٢]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت) وتی: دەستەیەك بە گاڵتە پێکردنەوە پرسیاریان لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەکرد، پیاوێکیان دەیوت: باوکی من کێیە؟ پیاوێك حوشترەکەی بزر بووبوو دەیوت: حوشترەکەم لە کوێیە؟ خودا

دەربارەیان ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾، تا لە هەموو ئایەتەكە بوویەوە.

**(٦)**

## سورة الأنعام

### ئایەتی: ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم﴾ [الأنعام: ٥٢]

**٦٣٨-** عَنْ خَبَّابٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾. قَالَ: جَاءَ الْأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ التَّمِيمِيُّ وَعُيَيْنَةُ بْنُ حِصْنٍ الْفَزَارِيُّ، فَوَجَدَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَعَ صُهَيْبٍ وَبِلاَلٍ وَعَمَّارٍ وَخَبَّابٍ قَاعِداً فِي نَاسٍ مِنَ الضُّعَفَاءِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، فَلَمَّا رَأَوْهُمْ حَوْلَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم حَقَّرُوهُمْ، فَأَتَوْهُ، فَخَلَوْا بِهِ وَقَالُوا: إِنَّا نُرِيدُ أَنْ تَجْعَلَ لَنَا مِنْكَ مَجْلِساً، تَعْرِفُ لَنَا بِهِ الْعَرَبُ فَضْلَنَا، فَإِنَّ وُفُودَ الْعَرَبِ تَأْتِيكَ، فَنَسْتَحْيِي أَنْ تَرَانَا الْعَرَبُ مَعَ هَذِهِ الْأَعْبُدِ؟! فَإِذَا نَحْنُ جِئْنَاكَ؛ فَأَقِمْهُمْ عَنْكَ، فَإِذَا نَحْنُ فَرَغْنَا؛ فَاقْعُدْ مَعَهُمْ إِنْ شِئْتَ.

قَالَ: (نَعَمْ)، قَالُوا: فَاكْتُبْ لَنَا عَلَيْكَ كِتَاباً.

قَالَ: فَدَعَا بِصَحِيفَةٍ، وَدَعَا عَلِيّاً لِيَكْتُبَ، وَنَحْنُ قُعُودٌ فِي نَاحِيَةٍ، فَنَزَلَ جِبْرَائِيلُ عليه السلام فَقَالَ: ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۝٥٢﴾ ثُمَّ ذَكَرَ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ وَعُيَيْنَةَ بْنَ حِصْنٍ، فَقَالَ: ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَـٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّـٰكِرِينَ ۝٥٣﴾[الأنعام: ٥٣]، ثُمَّ قَالَ: ﴿وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِنَا فَقُلْ سَلَـٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾ [المائدة:٥٤].

قَالَ: فَدَنَوْنَا مِنْهُ حَتَّى وَضَعْنَا رُكَبَنَا عَلَى رُكْبَتِهِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَجْلِسُ مَعَنَا، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقُومَ، قَامَ وَتَرَكَنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم

بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ﴾، وَلاَ تُجَالِسِ الأَشْرَافَ ﴿تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا﴾؛ يَعْنِي: عُيَيْنَةَ وَالأَقْرَعَ ﴿وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا﴾ [الكهف:٢٨] قَالَ: هَلاَكاً، قَالَ: أَمْرُ عُيَيْنَةَ وَالأَقْرَعِ. ثُمَّ ضَرَبَ لَهُمْ مَثَلَ الرَّجُلَيْنِ وَمَثَلَ الحَيَاةِ الدُّنْيَا.

قَالَ خَبَّابٌ: فَكُنَّا نَقْعُدُ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَإِذَا بَلَغْنَا السَّاعَةَ الَّتِي يَقُومُ فِيهَا، قُمْنَا وَتَرَكْنَاهُ حَتَّى يَقُومَ. [جه٤١٢٧]

* صحيح.

لە خەبابەوە دەربارەی ئایەتی: ﴿وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ﴾، تا ئایەتی: ﴿فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، وتی: ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی و عویینەی کوڕی حیصنی فەزاری هاتن و پێغەمبەری خودایان بینی لەگەڵ صوهەیب و بیلال و عەمار و خەبابدا دانیشتبوو، لەناو کۆمەڵێك لاواز لە باوەڕداران، کاتێك بە دەوری پێغەمبەردا(ﷺ) ئەوانیان بینی بە چاوی سووك تەماشایان کردن، پێغەمبەریان تەنها کردەوە و وتیان: ئێمە دەمانەوێ دانیشتنێکمان لەگەڵ خۆت بۆ دابنێی، بەهۆیەوە عەرەب فەزڵ و پلە و پایەی ئێمە بناسێت، وەفدی عەرەب دێن بۆ لات، ئێمە شەرم دەکەین عەرەب لەگەڵ ئەو کۆیلانە ئێمە ببینێت؟! گەر ئێمە هاتین بۆ لات ئەوانە لای خۆت هەڵبستێنە، کاتێك ئێمە تەواوبووین، گەر دەتەوێ لەگەڵیان دابنیشە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (باشە)، وتیان: کەوابوو نووسراوێکمان لەسەر خۆت بۆ بنووسە.

وتی: داوای لاپەڕەیەکی کرد و عەلی بانگ کرد تا بینووسێت، ئێمەش لە سووچێکەوە دانیشتبووین، جیبریل(علیه السلام) دابەزی: و فەرمووی: ﴿وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ مَا عَلَيۡكَ مِنۡ حِسَابِهِم مِّن شَيۡءٖ وَمَا مِنۡ حِسَابِكَ عَلَيۡهِم مِّن شَيۡءٖ فَتَطۡرُدَهُمۡ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، پاشان باسی ئەقرەعی کوڕی حابیس و عویینەی کوڕی حیصنی کرد و فەرمووی: ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنۢ بَيۡنِنَآۗ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ

بِٱلشَّٰكِرِينَ﴿٥٣﴾﴾ [الأنعام: ٥٣]، پاشان فەرمووی: ﴿وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾ [المائدة:٥٤].

دەڵێ: لێی نزیکبووینەوە تا ئەژنۆمان توند کرد لە هەردوو ئەژنۆی، پێشتر پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵمان دادەنیشت، گەر بیویستبا هەڵبستێت هەڵدەستا و بەجێیدەهێڵاین، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ﴾، لەگەڵ ئەشراف دامەنیشە، ﴿تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا﴾، واتە: عویینە و ئەقرەع، ﴿وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا﴿٢٨﴾﴾ [الكهف:٢٨]، واتە: تیاچوون، وتراویشە: کاروباری عویینە و ئەقرەع، پاشان نموونەی دوو پیاوی بۆ هێنانەوە و ئەوجا نموونەی ژیانی دنیا[1].

خەباب دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دادەنیشتین کە دەگەیشتینە ئەو ساتەی پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا هەڵدەستا هەڵدەستاین و بەجێمان دەهێڵا بۆئەوەی ئەویش هەستێت.

## ئایەتی: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ﴾ [الأنعام: ٥٩]

**٦٣٩**- (خ) عَنِ ابنِ عُمر رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُول اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَفَاتِحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًاۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ﴿٣٤﴾﴾). [خ٤٦٢٧، (١٠٣٩)]

(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کلیلەکانی پەنهان(مفاتح الغيب) پێنجن:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ

[1] مەبەستی ئایەتەکانی سورەتی (الكهف)ە کە بەدوای ئایەتی(٢٨)دا دێن-و.

وَيَعْلَمُ مَا فِي ٱلْأَرْحَامِۖ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًاۖ وَمَا تَدْرِي نَفْسُۢ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ﴿٣٤﴾﴾).

### ئایەتی: ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا﴾ [الأنعام: ٦٥]

٦٤٠- (خ) عَنْ جابِرٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ﴾، قَالَ رسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَعُوذُ بِوَجْهِكَ). قَالَ: ﴿أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ﴾، قَالَ: (أَعُوذُ بِوَجْهِكَ). ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ﴾، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (هذَا أَهْوَنُ، أَوْ: هَذَا أَيْسَرُ). [خ٤٦٢٨]

(خ) لە جابرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ﴾، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(پەنا دەگرم بە رووی خۆت)**، فەرمووی: ﴿أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ﴾، فەرمووی: **(پەنا دەگرم بە رووی خۆت)**، ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ﴾، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەمە سووکترە، یان ئەمە ئاسانترە)**.

### ئایەتی: ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾ [الأنعام: ٨٢]

٦٤١- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾، شَقَّ ذلِكَ عَلَى أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَقَالُوا: أَيُّنَا لَمْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَيْسَ كَمَا تَظُنُّونَ، إِنَّمَا هُوَ كَمَا قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ: ﴿يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ [لقمان:١٣]). [خ٦٩٣٧ (٣٢)/ م١٢٤]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: کاتێك ئەم ئایەتە: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾ دابەزی، لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) گران بوو و وتیان: کێ لە ئێمە هەیە ستەمی لە خۆی نەکردبێت؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ)

فەرمووی: **(بەو جۆرە نییە ئێوە گومان دەبەن، بەڵکو بەو جۆرەیە لوقمان بە کوڕەکەی خۆی فەرموو: ﴿يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ﴾** [لقمان:١٣]**).**

[خ٣٤٢٩]

- وفي رواية للبخاري: (لَيْسَ ذَلِكَ، إِنَّمَا هُوَ الشِّرْكُ).

**لە ڕیوایەتێکی بوخاریدا: (ئەوە نییە، بەڵکو ئەوە هاوەڵدانانە).**

## ئایەتی: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا﴾ [الأنعام: ١٤٥]

**٦٤٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يَأْكُلُونَ أَشْيَاءَ، وَيَتْرُكُونَ أَشْيَاءَ تَقَذُّراً، فَبَعَثَ اللهُ تَعَالَى نَبِيَّهُ صلّى الله عليه وسلّم، وَأَنْزَلَ كِتَابَهُ، وَأَحَلَّ حَلاَلَهُ، وَحَرَّمَ حَرَامَهُ، فَمَا أَحَلَّ فَهُوَ حَلاَلٌ، وَمَا حَرَّمَ فَهُوَ حَرَامٌ، وَمَا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ عَفْوٌ. وَتَلاَ: **﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا﴾** إِلَى آخِرِ الْآيَةِ. [د٣٨٠٠]

* صحيح الإسناد.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: ئەهلی سەردەمی نەفامی کۆمەڵێك شتیان دەخوارد و کۆمەڵێك شتیان وازلێدەهێنا وەك بێزلێکردنەوە، ئەوەی خودا حەڵاڵی کردووە حەڵاڵە و ئەوەی خودا حەرامی کردووە حەرامە، ئەوەش لێی بێدەنگ بووە چاوپۆشییە، ئەمەی خوێندەوە: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا﴾، تا کۆتایی ئایەتەکە.**

## ئایەتی: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا﴾ [الأنعام: ١٤٥]

**٦٤٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَخَطَّ خَطّاً، وَخَطَّ خَطَّيْنِ عَنْ يَمِينِهِ، وَخَطَّ خَطَّيْنِ عَنْ يَسَارِهِ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ فِي الْخَطِّ الْأَوْسَطِ فَقَالَ: (هَذَا سَبِيلُ اللهِ)، ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الْآيَةَ: **﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ﴾**. [جه١١]

* صحيح.

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: لای پێغەمبەر(ﷺ) بووین، هێڵێکی کێشا، و دوو هێڵی لای راستی خەتەکەوە کێشاو و دوو هێڵی لای چەپییەوە کێشا و پاشان دەستی خستە سەر هێڵە ناوەندەکە و فەرمووی: (ئەمە ڕێگەی خودایە)، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ﴾.

## (٧)

## سورة الأعراف

### ئایەتی: ﴿خُذُوا زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ [الأعراف: ٣١]

٦٤٤– (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَهِيَ عُرْيَانَةٌ، فَتَقُولُ: مَنْ يُعِيرُنِي تِطْوَافاً؟ تَجْعَلُهُ عَلَى فَرْجِهَا، وَتَقُولُ: مَن يُعِيرُنِي تِطْوَافًا؟ تَجْعَلُهُ على فَرْجِهَا، وَتَقُولُ:

الْيَوْمَ يَبْدُو بَعْضُهُ أَوْ كُلُّهُ    فَمَا بَدَا مِنْهُ فَلاَ أُحِلُّهُ

فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿خُذُوا زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾. [م٣٠٢٨]

(م) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: ئافرەت تەوافی بەیتی دەکرد و ئەو رووت بوو، دەیوت: کێ پۆشاکی تەوافم بە خواستن پێ دەدات؟ ئەو لەسەر فەرجی دادەنا، و دەیوت:

(ئەمڕۆ هەندێکی یان هەمووی دەردەکەوێت، ئەوەی دەردەکەوێ حەڵاڵی ناکەم)

ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿خُذُوا زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾.

### ئایەتی: ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُ لِلْجَبَلِ﴾ [الأعراف: ١٤٣]

٦٤٥– عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا﴾. قَالَ حَمَّادٌ: هَكَذَا، وَأَمْسَكَ سُلَيْمَانُ بِطَرَفِ إِبْهَامِهِ عَلَى أُنْمُلَةِ إِصْبَعِهِ الْيُمْنَى، قَالَ: فَسَاخَ الْجَبَلُ، ﴿وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا﴾. [ت٣٠٧٤]

* صحيح

لە ئەنەسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا﴾، حەماد وتی: بەم جۆرە، سولەیمان لێواری پەنجەگەورەی لکاند بە پەنجەکانی راستییەوە و وتی: چیاکە رۆچوو(نوقم بوو)، ﴿وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا﴾.

## ئایەتی: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ [الأعراف: ١٧٢]

٦٤٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (أَخَذَ اللهُ الْمِيثَاقَ مِنْ ظَهْرِ آدَمَ بِنَعْمَانَ - يَعْنِي: عَرَفَةَ - فَأَخْرَجَ مِنْ صُلْبِهِ كُلَّ ذُرِّيَّةٍ ذَرَأَهَا، فَنَثَرَهُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ كَالذَّرِّ، ثُمَّ كَلَّمَهُمْ قِبَلاً، قَالَ: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدْنَآ أَن تَقُولُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ۝ أَوْ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ۝﴾). [حم٢٤٥٥]

* رجاله ثقات.

لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خودا لە نەعمان-واتە عەرەفە-پەیمانی لە پشتی ئادەم وەرگرت، هەرچی نەوە لە پشتی ئەوە و بڵاوەی پێ کردووە هێنایە دەرەوە و وەك مرواری لەبەردەمی پەرشی کرنەوە، پاشان رووبەڕوو قسەی لەگەڵ کردن و فەرمووی:** ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدْنَآ أَن تَقُولُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ۝ أَوْ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ۝﴾).

## ئایەتی: ﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ﴾ [الأعراف: ١٩٩]

٦٤٧- (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ: ﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ﴾. قَالَ: ما أَنْزَلَ اللهُ إِلاَّ فِي أَخْلاَقِ النَّاسِ. [خ٤٦٤٣]

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی زوبەیرەوە: ﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ﴾، وتی: خودا دەربارەی ئەخلاقی خەڵك دایبەزاندووە.

▪ وفي رواية معلقة: قَالَ: أَمرَ اللهُ نَبِيَّهُ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَأْخُذَ الْعَفْوَ مِنْ أَخْلاَقِ النَّاسِ. [خ٤٦٤٤]

**لە ڕیوایەتێکی موعەلەقدا: وتی: خودا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کرد عەفو وەربگرێت لە ئەخلاقی خەڵك[1].**

**(٨)**

## سورة الأنفال

## ئایەتی: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ﴾ [الأنفال: ١]

**٦٤٨**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ بَدْرٍ: (**مَنْ فَعَلَ كَذَا وَكَذَا فَلَهُ مِنَ النَّفَلِ كَذَا وَكَذَا**)، قَالَ: فَتَقَدَّمَ الْفِتْيَانُ، وَلَزِمَ الْمَشْيَخَةُ الرَّايَاتِ فَلَمْ يَبْرَحُوهَا، فَلَمَّا فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِمْ، قَالَ الْمَشْيَخَةُ: كُنَّا رِدْءاً لَكُمْ، لَوِ انْهَزَمْتُمْ لَفِئْتُمْ إِلَيْنَا، فَلاَ تَذْهَبُوا بِالْمَغْنَمِ وَنَبْقَى، فَأَبَى الْفِتْيَانُ وَقَالُوا: جَعَلَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿**يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ**﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿**كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ۝**﴾، يَقُولُ: فَكَانَ ذَلِكَ خَيْراً لَهُمْ، فَكَذَلِكَ أَيْضاً، فَأَطِيعُونِي، فَإِنِّي أَعْلَمُ بِعَاقِبَةِ هَذَا مِنْكُمْ.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: لە ڕۆژی بەدر پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس ئەوە و ئەوە بکات لە "نفل[2]" ئەوە و ئەوەی بۆ هەیە)، وتی: گەنجەکان پێشکەوتن و پیرەکان پەیوەستبوون بە بەیداخەکانەوە و لێی جیانەبوونەوە، کاتێك خودا فەتحی بە ڕوودا کردنەوە، پیرەکان وتیان: ئێمە پشتیوانی ئێوە بووین، گەر شکستان بخواردبایە ڕووتان لە ئێمە دەکرد، بۆیە غەنیمەتەکە مەبەن بۆ خۆتان و**

---

[1] واتە: لە خەڵکی ببورێت-و.

[2] ئەوەی جەنگاوەر دەیبات زیاد لە شایستەبوونی بە غەنیمەت-و.

ئێمە بمێنینەوە[1]، گەنجەکان رازی نەبوون و وتیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە ئێمەی داوە، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ﴾، تا ﴿كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ۝﴾ دەڵێت: ئەوە بۆ ئەوان خێر بوو، بۆ ئەوانیش بەهەمان شێوە، بۆیە گوێڕایەڵی من بن، چونکە من لە ئێوە زاناترم بە سەرئەنجامی ئەمە.

- وفي رواية: قَالَ: فَقَسَمَهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِالسَّوَاءِ. [د٢٧٣٧ . ٢٧٣٩]

* صحيح.

لە ریوایەتێکدا: بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە یەکسانی دابەشی کرد.

## ئایەتی: ﴿إِن تَسْتَفْتِحُواْ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ﴾ [الأنفال: ١٩]

**٦٤٩**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ ثَعْلَبَةَ بْنِ أَبِي صُعَيرٍ العُذْرِيِّ قَالَ: كَانَ المُسْتَفْتِحَ أَبو جَهْلٍ، فَإِنَّهُ قَالَ حِيْنَ التَقَى القَوْمُ: اللَّهُمَّ أَيُّنَا كَانَ أَقْطَعَ لِلرَّحِمِ، وَآتَانَا بِمَا لا نَعْرِفُ، فَأَحْنِهِ الغَدَاةَ، فَكَانَ ذَلكَ اسْتِفْتَاحَهُ فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِن تَسْتَفْتِحُواْ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ﴾ إلى قوله: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾. [ك٣٢٦٤]

* قال الذهبي: على شرطهما.

لە عەبدوڵای کوڕی سەعلەبەی کوڕی ئەبی صوعەیری عوزرییەوە، وتی: ئەوەی داوای فەتحی کرد ئەبو جەهل بوو، کاتێك بە کۆمەڵەکە گەیشت وتی: خودایە، کام لامان سیلەی رەحمی زۆرتر بڕیوە و شتێکی بۆ هێناوین پێی ئاشنا نین ئەم بەیانییە بیهێنە بە چۆکدا، ئەوە بڕیتی بوو لە داوای فەتحی ئەو، بۆیە خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿إِن تَسْتَفْتِحُواْ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ﴾ تا ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾.

---

[1] واتە: ئێمە بێبەش ببین–و.

ئایەتی: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ﴾ [الأنفال: ٢٢]

٦٥٠- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ﴾؛ قَالَ: هُمْ نَفَرٌ مِنْ بَنِي عَبْدِ الدَّارِ. [خ٤٦٤٦]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ﴾، ئەوانە چەند کەسێك بوون لە "بني عبد الدار".

ئایەتی: ﴿وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةً﴾ [الأنفال: ٢٥]

٦٥١- عَنْ مُطَرِّفٍ قَالَ: قُلْنَا لِلزُّبَيْرِ ﷺ: يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ، مَا جَاءَ بِكُمْ ضَيَّعْتُمُ الْخَلِيفَةَ حَتَّى قُتِلَ، ثُمَّ جِئْتُمْ تَطْلُبُونَ بِدَمِهِ؟! قَالَ الزُّبَيْرُ ﷺ: إِنَّا قَرَأْنَاهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ ﷺ: ﴿وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةً﴾ لَمْ نَكُنْ نَحْسَبُ أَنَّا أَهْلُهَا حَتَّى وَقَعَتْ مِنَّا حَيْثُ وَقَعَتْ!. [حم١٤١٤، ١٤٣٨]

* إسناده جيد.

لە موتەریفەوە، وتی: بە زوبەیرمان(خوا لێی رازی بێت) وت: ئەی باوکی عەبدوڵا، چی ئێوەی هێناوە، دەستان بەردا لە خەلیفە تا کوژرا، پاشان هاتوون داوای خوێنەکەی دەکەن؟! زوبەیر(خوا لێی رازی بێت) وتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خودا و ئەبی بەکر و عومەر و عوسماندا(خوایان لێ رازی بێت) ئەمەمان دەخوێندەوە: ﴿وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةً﴾، پێمان وانەبوو ئێمە ئەهلی ئەو فیتنە بین تا ئەوە روویدا لێمان کە روویدا!.

ئایەتی: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمۡ وَأَنتَ فِيهِمۡ﴾ [الأنفال: ٣٣]

٦٥٢- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قَالَ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: اللَّهُمَّ! إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ، فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ، أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ. فَنَزَلَتْ: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ

لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ۝ وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ الآيَةَ. [خ٤٦٤٨/ م٢٧٩٦]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: ئەبو جەهل وتی: خودایە، گەر ئەمە حەقە لە لای تۆوە لە ئاسمانەوە بەردەبارانمان بکە، یان سزای بە ئێشمان بۆ بهێنە، ئایەت دابەزی: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ۝ وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾.

**٦٥٣**- عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (اَنزَلَ اللهُ عَلَيَّ أَمَانَيْنِ لأُمَّتِي: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ۝ وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ۝﴾، فَإذا مَضَيتُ، تَرَكتُ فِيهِمُ الإستِغفَار إلَى يَومِ القِيَامَةِ). [ت٣٠٨٢]

* ضعيف الإسناد.

له ئەبی موساوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا دوو ئەمانی بۆ ئومەتەکەم بۆ سەر من دابەزاندووە:** ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ۝ وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ۝﴾ [الأنفال: ٣٣]، **کە ڕۆیشتم "إستغفار"م تا ڕۆژی قیامەت لەناو ئێوە بەجێهێڵاوە).**

**ئایەتی: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ﴾ [الأنفال: ٤١]**

**٦٥٤**- عَنْ عَطَاءٍ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾. قَالَ: خُمُسُ اللهِ وَخُمُسُ رَسُولِهِ وَاحِدٌ، كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَحْمِلُ مِنْهُ، وَيُعْطِي مِنْهُ وَيَضَعُهُ حَيْثُ شَاءَ، وَيَصْنَعُ بِهِ مَا شَاءَ. [ن٤١٥٣]

* مرسل صحيح الإسناد.

لە عەتاوە دەربارەی فەرموودەی خودا(عز وجل): ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾، فەرمووی: **(پێنجیەکی خودا و پێنجیەکی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) یەکێکن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لێی هەڵدەگرت و لێی دەبەخشی و چۆنی بخواستبایە وا دایدەنا و چۆنی بخواستبایە وای لێ دەکرد).**

**٦٥٥**– عَنْ قَيْسِ بْنِ مُسْلِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ الْحَسَنَ بْنَ مُحَمَّدٍ عَنْ قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ﴾. قَالَ: هَذَا مَفَاتِحُ كَلاَمِ اللهِ، الدُّنْيَا وَالْآخِرَةُ لِلَّهِ، قَالَ: اخْتَلَفُوا فِي هَذَيْنِ السَّهْمَيْنِ بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: سَهْمِ الرَّسُولِ وَسَهْمِ ذِي الْقُرْبَى؛ فَقَالَ قَائِلٌ: سَهْمُ الرَّسُولِ صلّى الله عليه وسلّم لِلْخَلِيفَةِ مِنْ بَعْدِهِ. وَقَالَ قَائِلٌ: سَهْمُ ذِي الْقُرْبَى لِقَرَابَةِ الرَّسُولِ صلّى الله عليه وسلّم. وَقَالَ قَائِلٌ: سَهْمُ ذِي الْقُرْبَى لِقَرَابَةِ الْخَلِيفَةِ، فَاجْتَمَعَ رَأْيُهُمْ عَلَى أَنْ جَعَلُوا هَذَيْنِ السَّهْمَيْنِ فِي الْخَيْلِ وَالْعُدَّةِ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَكَانَا فِي ذَلِكَ خِلاَفَةَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ. [ن٤١٥٤]

* مرسل صحيح الإسناد.

لە قەیسی کوڕی موسلیمەوە، وتی: پرسیارم لە حەسەنی کوڕی محەمەد کرد دەربارەی فەرموودەی خودا(عز وجل): ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ﴾، وتی: ئەمە کلیلی کەلامی خودایە، دنیا و دواڕۆژ بۆ خودایە، وتی: لەدوای مردنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەم دوو بەشەدا جیاوازی کەوتە نێوانیان[1]: بەشی پێغەمبەر(ﷺ) و بەشی "ذي قربى–نزیکان(کەسوکار)"، یەکێك وتی: بەشی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خەلیفەیە لەدوای ئەو، یەکێکی تر وتی: بەشی "ذي قربى" بۆ خزمانی پێغەمبەرە(ﷺ)، یەکێك وتی: بەشی "ذي قربى" بۆ خزمانی خەلیفەیە، رایان لەسەر ئەوە کۆبوویەوە ئەم دوو بەشە–لە ئەسپ و چەك و پێویستی– لە رێگەی خودا دابنێن، لە خەلافەتی ئەبی بەکر و عومەردا لەسەر ئەوە بوون.

---

[1] واتە: نێوان هاوەڵان–و.

**ئایەتی: ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ﴾ [الأنفال: ٦٥]**

**٦٥٦**- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا نَزَلَت: **﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِ﴾**، شَقَّ ذلِكَ عَلَى المسْلِمِينَ، حِينَ فُرِض عَلَيْهِمْ أَنْ لاَ يَفِرَّ وَاحِدٌ مِنْ عَشَرَةٍ، فَجَاءَ التَّخْفِيفُ، فَقَالَ: **﴿ٱلْـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِ﴾**، قَالَ: فَلَمَّا خَفَّفَ اللهُ عَنْهُمْ مِنَ الْعِدَّةِ، نَقَصَ مِنَ الصَّبْرِ بِقَدْرِ ما خُفِّفَ عَنْهُمْ.　　[خ٤٦٥٣ (٤٦٥٢)]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِ﴾، لەسەر موسڵمانان گران بوو، کاتێك لەسەریان فەرز کرا یەك کەس لە دە کەس هەڵنەیەت، بۆیە ئاسانکاری هات و فەرمووی: ﴿ٱلْـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِ﴾، وتی: کاتێك خودا لە ژمارەدا لەسەری سووك کردن بە بڕی ئەوەی لەسەریان سووك کرابوو ئارامگری کەمی کرد.**

## (٩)

## سورة التوبة (براءة)

**٦٥٧**- (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: سُورَةُ التَوْبةِ؟ قَالَ: التَّوْبَةُ هِيَ الْفَاضِحَةُ، ما زَالَتْ تَنْزِلُ: وَمِنْهُمْ وَمِنْهُمْ، حَتَّى ظَنُّوا أَنَّهَا لَنْ تُبْقِيَ أَحَداً مِنْهُمْ إِلاَّ ذُكِرَ فِيهَا. قَالَ: قُلتُ: سورَةُ الأَنْفَالِ؟ قَالَ: نَزَلَتْ فِي بَدْرٍ. قَالَ: قُلْتُ: سُورَةُ الحَشْرِ؟ قَالَ: نَزَلَتْ فِي بَنِي النَّضِيرِ.　　[خ٤٨٨٢، (٤٠٢٩)/ م٣٠٣١]

**(ق) لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، وتی: وتم بە ئیبن عەباس: سورەتی التوبة[1]؟ وتی: "التوبة" بریتییە لە رسواکەر، بەردەوام "ومنهم، ومنهم" دادەبەزی تا وا گومانیان**

---

[1] **واتە: چی دەڵێی دەربارەی سورەتی (التوبة)؟-و.**

برد هیچ کەس لەوان نامێنێ تیایدا ناوی نەبرێت[1]، وتی: وتم: سورەتی الأنفال؟ وتی: لە بەدر دابەزی، وتی: وتم: سورەتی الحشر؟ وتی: لە "بني النضير" دابەزی.

## ئایەتی: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ﴾ [التوبة: ٦]

**٦٥٨-** (خ) عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾: إِنْسَانٌ يَأْتِيهِ فَيَسْتَمِعُ مَا يَقُولُ وَمَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ، فَهُوَ آمِنٌ حَتَّى يَأْتِيَهُ فَيَسْمَعَ كَلاَمَ اللهِ، وَحَتَّى يَبْلُغَ مَأْمَنَهُ حَيْثُ جَاءَهُ. [خ. التوحيد، باب ٣٩]

(خ) لە موجاهیدەوە وتی: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾: مرۆڤێکە دێت بۆ لای[2] و ئەوەی دەیڵێت و بۆ سەری دابەزیوە دەیبیستێ، ئەو لە ئەماندایە تا دەگاتە لای و کەلامی خودا دەبیستێ، هەروەها تا دەگەڕێتەوە و شوێنی ئاسایشی خۆی کە لێوەی هاتووە.

## ئایەتی: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ﴾ [التوبة: ١٩]

**٦٥٩-** (م) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ رَجُلٌ: مَا أُبَالِي أَنْ لاَ أَعْمَلَ عَمَلاً بَعْدَ الإِسْلاَمِ؛ إِلاَّ أَن أُسْقِيَ الْحَاجَّ. وَقَالَ آخَرُ: مَا أُبَالِي أَنْ لاَ أَعْمَلَ عَمَلاً بَعْدَ الإِسْلاَمِ؛ إِلاَّ أَنْ أَعْمُرَ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ. وَقَالَ آخَرُ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ أَفْضَلُ مِمَّا قُلْتُمْ. فَزَجَرَهُمْ عُمَرُ وَقَالَ: لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. وَهُوَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، وَلَكِنْ إِذَا صَلَّيْتُ الْجُمُعَةَ دَخَلْتُ فَاسْتَفْتَيْتُهُ فِيمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ. فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ﴾ الآيَةَ إِلَى آخِرِهَا. [م١٨٧٩]

---

[1] واتە: هەموان لە خۆیان ترساون لە سورەتی (التوبة)دا شتێك دەربارەیان دابەزێت، کەسی دووڕوو ترسی دەرکەوتنی دووڕوویییەکەی بووە و کەسی باوەڕداریش لە هەستی خۆ بە کەم زانینەوە لەبەردەم خودا ترساوە نەنگی و ناتەواوییەکەی دەربکەوێت-و.

[2] واتە: دێت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)-و.

(م) لە نیعمانی کوڕی بەشیرەوە، وتی: لای مینبەرەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووم، پیاوێك وتی: باکێکم نییە لەدوای ئیسلام کارێك ئەنجام نەدەم، جگە لەوەی ئاوی حاجی بدەم[1]، یەکێکی تر وتی: باکێکم نییە گەر لەدوای ئیسلام کارێك ئەنجام نەدەم، جگە لەوەی مەسجیدولحەرام ئاوەدان بکەمەوە، یەکێکی تر وتی: جیهاد لەپێناوی خودا باشترە لەوەی ئێوە وتتان، عومەر دەمکوتی کردن و وتی: دەنگتان لای مینبەری پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەرز مەکەنەوە، ئەو ڕۆژە جومعە بوو، بەڵام گەر جومعەم کرد دەچمە ژوورەوە و داوای فتوای لێدەکەم لەوەی ئێوە جیاوازیتان تیایدا هەبوو، خودا(عز وجل) ئایەتی دابەزاند: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ﴾، تا کۆتایی ئایەتەکە.

## ئایەتی: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا﴾ [التوبة: ٣١]

٦٦٠– عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَفِي عُنُقِي صَلِيبٌ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ: (يَا عَدِيُّ! اطْرَحْ عَنْكَ هَذَا الْوَثَنَ)، وَسَمِعْتُهُ يَقْرَأُ فِي سُورَةِ بَرَاءَةٌ: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾، قَالَ: (أَمَا إِنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَعْبُدُونَهُمْ، وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا أَحَلُّوا لَهُمْ شَيْئاً اسْتَحَلُّوهُ، وَإِذَا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ شَيْئاً حَرَّمُوهُ). [ت٣٠٩٥]

* حسن.

لە عەدی کوڕی حاتەمەوە، وتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و لە گەردنم خاچێکی زێڕ هەبوو، فەرمووی: **(ئەی عەدی، ئەو وەسەنە[2] لە گەردنت بکەرەوە)**، گوێم لێبوو سورەتی "البراءة"ی دەخوێند: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾، فەرمووی: **(ئەوان نەیاندەپەرستن، بەڵام کاتێك شتێکیان بۆ حەڵاڵ دەکردن بە حەڵاڵیان دەزانی، کاتێك شتێکیان لێ حەرام دەکردن بە حەرامیان دەزانی).**

---

[1] واتە: لە دوای موسڵمانبوون باکێکم نییە هیچ کارێکی چاکە ئەنجام نەدەم جگە لە ئاودانی حاجی، واتە: لای ئەو ئاودانی حاجی مەزنترین و گەورەترین کار بوو–و.

[2] لێرەدا (وەسەن) مانای ئەرێت و بەندوباوی بتپەرستی و نەفامی هەیە–و.

## ئایەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ﴾ [التوبة: ٣٤]

**٦٦١**– (خ) عَنْ خَالِدِ بْنِ أَسْلَمَ ـ مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ـ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، فَلَحِقَهُ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ لَهُ: قَوْلُ اللهِ: ﴿**وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ**﴾؟ قَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ: مَنْ كَنَزَهَا فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهَا فَوَيْلٌ لَهُ، إِنَّمَا كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تُنْزَلَ الزَّكَاةُ، فَلَمَّا أُنْزِلَتْ جَعَلَهَا اللهُ طَهُوراً لِلْأَمْوَالِ. ثُمَّ الْتَفَتَ فَقَالَ: مَا أُبَالِي لَوْ كَانَ لِي أُحُدٌ ذَهَباً، أَعْلَمُ عَدَدَهُ وَأُزَكِّيهِ، وَأَعْمَلُ فِيهِ بِطَاعَةِ اللهِ عزّ وجل. (لفظ ابن ماجه) [خ(١٤٠٤) معلّقاً/ جه١٧٨٧]

* صحيح.

(خ) لە خالیدی کوڕی ئەسلەمەوە –مەولای عومەری کوڕی خەتاب– وتی: لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی عومەر ڕۆیشتم، ئەعرابییەك شوێنی کەوت و پێیگەیشت و پێی وت: فەرموودەی خودا: ﴿**وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ**﴾؟[1] ئیبن عومەر پێی وت: هەر کەس گەنجینەی بکات و زەکاتی نەدات وەیل بۆ ئەو، ئەوە بەر لە دابەزاندنی زەکات بوو، کاتێك دابەزی[2] خودا کردی بە پاککەرەوەی ماڵ و سامان، پاشان لایکردەوە و وتی: باکێکم نییە گەر چیای ئوحد زێڕی من بێت و ژمارەکەی بزانم و زەکاتی بدەم و لە تاعەتی خودادا(عز وجل) کاری پێ بکەم. (لفظ ابن ماجة).

## ئایەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ﴾ [التوبة: ٧٩]

**٦٦٢**– (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ البَدْرِيِّ قَالَ: لَمَّا أُمِرْنَا بِالصَّدَقَةِ كُنَّا نَتَحَامَلُ، فَجَاءَ أَبُو عَقِيلٍ بِنِصْفِ صَاعٍ، وَجاءَ إِنْسَانٌ بِأَكْثَرَ مِنْهُ، فَقَالَ المُنَافِقُونَ: إِنَّ اللهَ لَغَنِيٌّ عَنْ صَدَقَةِ هَذَا، وَما فَعَلَ هَذَا الآخَرُ إِلاَّ رِئَاءً، فَنَزَلَت: ﴿**ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ**﴾ الآية. [خ٤٦٦٨، (١٤١٥)/ م١٠١٨]

---

[1] واتە: چی دەڵێی دەربارەی ئەم ئایەتە؟–و.

[2] واتە: کاتێك ئایەتی زەکات دابەزی–و.

(ق) لە ئەبی مەسعوودی بەدرییەوە، وتی: كاتێك فەرمانمان پێكرا بە صەدەقە بە كۆڵبەری زۆرمان لە خۆمان دەكرد[1]، ئەبو عەقیل نیو صاعی[2] هێنا، مرۆڤێكی تر زیاتر لەوەی هێنا، دووڕووان وتیان: خوا بێنیازە لە صەدەقەی ئەمە، ئەمەی دواییش تەنها بۆ ریا ئەوەی كرد، ئایەت دابەزی: ﴿ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَـٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ﴾، ئایەتەكە.

## ئایەتی: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا﴾ [التوبة: ٨٤]

**٦٦٣**– (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ، جاءَ ابْنُهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَسَأَلَهُ أَنْ يُعْطِيَهُ قَمِيصَهُ يُكَفِّنُ فِيهِ أَبَاهُ فَأَعْطَاهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِيُصَلِّيَ، فَقَامَ عُمَرُ فأَخَذَ بِثَوْبِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! تُصَلِّي عَلَيْهِ، وَقَدْ نَهَاكَ رَبُّكَ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَيْهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّمَا خَيَّرَنِي اللهُ فَقَالَ: ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً﴾ [التوبة: ٨٠]، وَسَأَزِيدُهُ عَلَى السَّبْعِينَ). قَالَ: إِنَّهُ مُنَافِقٌ، قَال: فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ﴾[التوبة: ٨٤]. [خ٤٦٧٠، (١٢٦٩)/ م٢٤٠٠ و٢٧٧٤]

٦٦٣– (ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: كاتێ عەبدوڵای كوڕی ئوبەی مرد، كوڕەكەی–كە ناوی عەبدوڵای كوڕی عەبدوڵا بوو– هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، داوای لێكرد كراسەكەی خۆی پێ بدات تا باوكی تێدا كفن بكات، پێغەمبەر پێیدا، پاشان داوای لێكرد نوێژی لەسەر بكات، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستا بۆئەوەی نوێژی لەسەر بكات، عومەر هەستا و بە پۆشاكەكەی

[1] واتە: كۆڵبەری و حەماڵیمان دەكرد و زۆرمان لە خۆمان دەكرد تا شتێك پەیدا بكەین و بیكەین بە صەدەقە.

[2] یەك صاع نزیك بە دوو كیلۆیە–و.

پێغەمبەری خودای(ﷺ)گرت و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، نوێژی لەسەر دەکەی، لە کاتێکدا پەروەردگارت نەهی لێکردووی نوێژی لەسەر بکەی؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: خودا ئاگاداری کردووم و فەرموویەتی: : ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً﴾ [التوبة: ٨٠]، من زیاتر لە حەفتای بۆ دەکەم، عومەر وتی: ئەو دووڕووە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی لەسەر کرد، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ﴾[التوبة: ٨٤].

**٦٦٤-** (خ) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّاب ﷺ قَالَ: لَمَّا ماتَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيِّ ابْنُ سَلُول، دُعِيَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَلَمَّا قَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَثَبْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَتُصَلِّي عَلَى ابْنِ أُبَيٍّ، وَقَدْ قَالَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا: كَذَا وَكَذَا؟ أُعَدِّدُ عَلَيْهِ قَوْلَهُ، فَتَبسَّمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَقَالَ: **(أَخِّرْ عَنِّي يَا عُمَرُ)!** فَلَمَّا أَكْثَرْتُ عَلَيْهِ قَالَ: **(إِنِّي خُيِّرْتُ فَاخْتَرْتُ، لَوْ أَعْلَمُ أَنِّي إِنْ زِدْتُ عَلَى السَّبْعِينَ يُغْفَرُ لَهُ لَزِدْتُ عَلَيْهَا)**. قَالَ: فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ثُمَّ انْصَرَفَ، فَلَمْ يَمْكُثْ إِلاَّ يَسِيراً حَتَّى نَزَلَتِ الآيَتَانِ مِنْ بَرَاءَةٌ: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا﴾ إِلَى ﴿وَهُمْ فَٰسِقُونَ﴾. قَالَ: فَعَجِبْتُ بَعْدُ مِنْ جُرْأَتِي عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَئِذٍ، واللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. [خ١٣٦٦]

(خ) لە عومەری کوڕی خەتابەوە(خوای لێ ڕازی بێت) کاتێ عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول مرد، پێغەمبەری خودای(ﷺ) بۆ بانگرا تا نوێژی لەسەر بکات، کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستا تەکانم دایە بەر خۆ بۆ لای و وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا نوێژ لەسەر ئیبن ئوبەی دەکەی، لە کاتێکدا ڕۆژی ئەوە و ئەوە ئاوا و ئاوای وت؟ قسەکانی عەبدوڵام بۆ پێغەمبەر دەژمارد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەندەیەکی کرد و فەرمووی: **(لێمگەڕێ، ئەی عومەر)**، کاتێ زۆرم لەسەر کرد فەرمووی: **(سەرپشك کراوم منیش هەڵبژاردنم کرد، گەر بزانم من زیاد لە حەفتای بۆ بکەم لێی خۆش دەبێت بۆی زیاد دەکەم)**، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی لەسەر کرد، و پاشان ڕۆیشت، زۆر کەم مایەوە دوو ئایەتی سورەتی (البراءة) دابەزی:

﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا﴾ تا ﴿وَهُمْ فَٰسِقُونَ﴾، وتی: دواتر لە بوێری خۆم بۆ سەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەو ڕۆژەدا سەرمسوڕما، خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن.

## ئایەتی: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ﴾ [التوبة: ١١٣]

**٦٦٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الوَفَاةُ، أَتَاهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَعِنْدَهُ عَبْدُ اللهِ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ وَأَبُو جَهْلِ بْنِ هِشَامٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَيْ عَمُّ إِنَّكَ أَعْظَمُهُمْ عَلَيَّ حَقاً، وَأَحْسَنُهُمْ عِنْدِي يَداً، وَلأَنْتَ أَعْظَمُ حَقاً عَلَيَّ مِنْ وَالِدَيَّ، فَقُلْ كَلِمَةً تَجِبُ لَكَ عَلَيَّ بِهَا الشَّفَاعَةَ يَوْمَ القِيَامَةِ، قُلْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهَ**)، فَقَالا لَهُ: أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ المطَّلِبِ؟ فَسَكَتَ، فَأَعَادَها عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: أَنَا عَلى مِلَّةِ عَبْدِ المطَّلِبِ، فَمَاتَ.

فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ**) فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ﴾ الآية، ﴿وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ﴾ إلى آخر الآية. [ك٣٢٩١]

* قال الذهبي: صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: کاتێك مردن لەسەر ئەبا تالب ئامادە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای، عەبدوڵای کوڕی ئومەیە و ئەبو جەهلی کوڕی هیشامی لە لا بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: (مامی خۆم، تۆ لە هەموویان زیاتر حەقت لە سەرمە، دەستی چاکەت لە لام لە هەموویان زیاترە، تۆ لە باوك و دایکم مافی زۆرترت لەسەر منە، کەلیمەیەك بڵێ بەهۆیەوە لە ڕۆژی قیامەت شفاعەت بۆ کردنت لەسەرم واجب بێت، بڵێ: "لا إله إلا الله")، ئەو دوانە پێیان وت: ئایا لە ئایینی عەبدولموتەلیب پشتهەڵدەکەی؟ ئەبو تالب بێدەنگ بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆی دووبارە کردەوە، بۆیە وتی: من لەسەر ئایینی عەبدولموتەلیبم و مرد.**

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم گەر نەهیم لێنەکرێت)**، بۆیە خودا(سبحانه وتعالى) ئایەتی دابەزاند: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ﴾، ئایەتەکە، ﴿وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ﴾، تا کۆتایی ئایەتەکە.

## (١٠)

## سورة يونس

### ئایەتی: ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ﴾ [يونس: ٥٨]

**٦٦٦**– عَنْ عَبْدِ الرَّحمنِ بنِ أَبْزى عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَا أُبَيُّ! أُمِرْتُ أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ سُورَةَ كَذَا وَكَذَا**)، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! وَقَدْ ذُكِرْتُ هُنَاكَ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**) فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا الْمُنْذِرِ! فَفَرِحْتَ بِذَلِكَ؟ قَالَ: وَمَا يَمْنَعُنِي وَاللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَقُولُ: ﴿**قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ**﴾ فَلْتَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا تَجْمَعُونَ. قَالَ مُؤَمَّلٌ: قُلْتُ لِسُفْيَانَ: هَذِهِ الْقِرَاءَةُ فِي الْحَدِيثِ؟ قَالَ: نَعَمْ. [حم٢١١٣٧]

* حديث صحيح.

لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبزاوە، لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم: **(ئەی ئوبەی، فەرمانم پێکراوە سورەتی ئەوە و ئەوەت بەسەردا بخوێنم)**، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، لەوێ ناوی من هێنرا؟ فەرمووی: **(بەڵێ)**، پێم وت[1]: ئەی باوکی مونزیر، بەوە دڵخۆش بوویت؟ وتی: چی ڕێگریم لێ دەکات، خودا(تبارك وتعالى) دەفەرموێت: ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ﴾، "فلتفرحوا هو خير مما تجمعون–با دڵخۆش بن، ئەوە باشتر و چاکترە لەوەی کۆیدەکەنەوە"، "مُؤَمَّل" دەڵێت: وتم بە سوفیان: ئەمە خوێندنەوەیە لە فەرموودەکەدا؟[2] وتی: بەڵێ.

---

[1] عبدالرحمانی کوڕی ئەبزا دەڵێت بە (ئوبەی)م وت–و.

[2] واتە: ئەمە (فلتفرحوا هو خير مما تجمعون) یەکێکە لە قیرائەتەکان–و.

**ئایەتی: ﴿لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ [يونس: ٦٤]**

**٦٦٧**- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ قَوْلِهِ: ﴿لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾؟ قَالَ: (هِيَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُؤْمِنُ أَوْ تُرَى لَهُ).
[ت٢٢٧٥/ جه ٣٨٩٨/ مي٢١٨٢]

* صحيح.

له عوبادەی کوڕی صامیتەوە، وتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد دەربارەی ئایەتی: ﴿لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾، فەرمووی: **(ئەوە خەونی صالحە باوەڕدار دەیبینێت یان بۆی دەبینرێت[1])**.

**ئایەتی: ﴿ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾[يونس: ٩٠]**

**٦٦٨**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لَمَّا أَغْرَقَ اللهُ فِرْعَوْنَ قَالَ: ﴿ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾، فَقَالَ جِبْرِيلُ: يَا مُحَمَّدُ، فَلَوْ رَأَيْتَنِي وَأَنَا آخُذُ مِنْ حَالِ الْبَحْرِ فَأَدُسُّهُ فِي فِيهِ، مَخَافَةَ أَنْ تُدْرِكَهُ الرَّحْمَةُ). [ت٣١٠٧]

* صحيح.

له ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(کاتێك خودا فیرعەوتی نوقم کرد وتی: ﴿ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾، جیبریل فەرمووی: ئەی محەمەد، گەر منت ببینیبا لیتەی دەریام هەڵدەگرت و دەمئاخنییە دەمییەوە، ترسی ئەوەم هەبوو رەحمەت بیگرێتەوە[2])**.

---

[1] واتە: کەسێکی تر خەونە خۆشەکەی پێوە دەبینێت-و.

[2] واتە: ترسی ئەوەم هەبوو فریا بکەوێت بە تەواوی ئیمان بهێنێ و رەحمەت بیگرێتەوە، واتە جیبریل پێیخۆش نەبوو رەحمەت بیگرێتەوە لەبەر ئەو هەموو بێباوەڕی و ستەمەی ئەنجامی دابوو، لە توغیان و بێباوەڕیدا گەیشتە ئەوەی بڵێت: من باڵاترین پەروەردگاری ئێوەم و عیبادەت بۆ من بکەن، لە ستەمیشدا گەیشتە ئەوەی هەرچی منداڵی نێری بەنی ئیسرائیلە سەر ببڕێت-و.

## (١١)

## سورة هود

ئـایـەتـی: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ [هود: ١١٤]

٦٦٩- (ق) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً أَصَابَ مِنِ امْرَأَةٍ قُبْلَةً، فَأَتَى رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَذَكَرَ ذلِكَ لَهُ، فَأُنْزِلَتْ عَلَيْهِ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾﴾، قَالَ الرَّجُلُ: أَلِيَ هذِهِ؟ قَالَ: (لِمَنْ عمِلَ بِهَا مِنْ أُمَّتِي). [خ٤٦٨٧ (٥٢٦)/ م٢٧٦٣]

**(ق) لە ئیبن مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت) پیاوێك ماچی ئافرەتێكی كرد بوو، هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەوەی بۆ باس كرد، ئایەتی بۆ سەر دابەزی:** ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾﴾**، پیاوەكە وتی: ئەمە بۆ منە؟ فەرمووی: (بۆ هەر كەس لە ئومەتەكەم كاری پێ بكات).**

٦٧٠- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي أَصَبْتُ حَدّاً فَأَقِمْهُ عَلَيَّ، قَالَ: وَلَمْ يَسْأَلْهُ عَنْهُ، قَالَ: وَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ، فَصَلَّى مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمَّا قَضى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم الصَّلاَةَ، قامَ إِلَيْهِ الرَّجُلُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي أَصَبْتُ حَدّاً، فَأَقِمْ فِيَّ كِتَابَ اللهِ، قَالَ: (أَلَيْسَ قَدْ صَلَّيْتَ مَعَنَا)؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (فَإِنَّ اللهَ قَدْ غَفَرَ لَكَ ذَنْبَكَ، أَوْ قَالَ: حَدَّكَ). [خ٦٨٢٣/ م٢٧٦٤]

**(ق) لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: لای پێغەمبەرم بووم پیاوێك هات بۆ لای، و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من تووشی حەد[1] بووم لەسەرم جێبەجێی بكە، وتی: پرسیاری لێ نەكرد، وتی: نوێژ هاتە بەرەوە، لەگەڵ**

---

**[1] واتە: تووشی گوناهێك هاتووم پێویستە حوكمی شەرع بەسەرمدا بسەپێنی-و.**

پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کرد، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) نوێژەکەی تەواو کرد، پیاوەکە هەستا و هات بۆ لای و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من تووشی حەد بووم، کتێبەکەی خودام بەسەردا جێبەجێ بکە، پێغەمبەر فەرمووی: **(ئایا نوێژت لەگەڵ نەکردین؟)**، وتی: بەڵێ، فەرمووی: **(خودا لە گوناهەکەت خۆشبووە، یان فەرمووی: خودا حەددی لێدای)**.

**(١٢)**

**سورة يوسف**

## ئایەتی: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ﴾ [يوسف: ٣]

**٦٧١-** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، فِي قوله عزّ وجل: ﴿الٓرۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ① إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ②﴾ [يوسف: ١-٢]، قَالَ: نَزَلَ القُرْآنُ عَلى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَتَلاهُ عَلَيْهِمْ زَمَاناً، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ قَصَصْتَ عَلَيْنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ﴾ الآية، قَالَ: فَتَلاهُ عَلَيْهِمْ زَمَاناً قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ حدَّثْتَنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل : ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِيَ﴾ [الزمر:٢٣]، كُلُّ ذَلِكَ يُؤْمَرُونَ بِالْقُرْآنِ: قَالَ خلاّد: وَزَادَنِي فيهِ غيرهُ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ ذَكَّرْتَنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾ [الحديد:١٦]. [حب٦٢٠٩/ ك٣٣١٩/ مخ١٠٦٩/٣]

* قال الذهبي: صحيح.

لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، دەربارەی فەرموودەی خودا(عز وجل): ﴿الٓرۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ① إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ②﴾[يوسف: ١- ٢]، وتی: قورئان بۆ سەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) دابەزی و سەردەمێك بەسەریاندا خوێندییەوە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر چیرۆکمان بۆ بگێڕییەوە، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ﴾، ئایەتەکە، سەردەمێك چیرۆکیان بەسەردا خوێنرایەوە و وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر

باسمان بۆ بکەی، خودا(عز وجل) ئایەتی دابەزاند: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِيَ﴾ [الزمر:٢٣]، هەموو ئەوانە بە قورئان فەرمانیان پێ دەکرا، خەللاد دەڵێت: کەسانی تر تیایدا ئەمەیان بۆ زیاد کردم: وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر بیرمان بهێنییەوە، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾ [الحديد:١٦].

## ئایەتی:﴿قَالَتْ هَيْتَ لَكَ﴾ [يوسف: ٢٣]

**٦٧٢**- (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: ﴿هَيْتَ لَكَ﴾ قَالَ: وَإِنَّمَا نَقْرَؤُهَا كما عُلِّمْنَاهَا. [خ٤٦٩٢]

**(خ) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی:﴿هَيْتَ لَكَ﴾، وتی: چۆن فێرکراوین بەو جۆرە دەیخوێنینەوە.**

## ئایەتی: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ﴾ [يوسف: ١١٠]

**٦٧٣**- (خ) عَنْ عُرْوَةَ: أَنَّهُ سَأَلَ عائِشَةَ ﵂ . زَوْجَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم .: أَرَأَيْتِ قَوْلَهُ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ قَدْ﴾ كُذِّبُوا، أَوْ كُذِبُوا؟ قالَتْ: بَلْ كَذَّبَهُمْ قَوْمُهُمْ، فَقُلْتُ: وَاللهِ! لَقَدِ اسْتَيْقَنُوا أَنَّ قَوْمَهُمْ كَذَّبُوهُمْ وَما هُوَ بِالظَّنِّ. فَقَالَتْ: يَا عُرَيَّةُ! لَقَدِ اسْتَيْقَنُوا بِذلِكَ، قُلْتُ: فَلَعَلَّهَا أَوْ كُذِبُوا، قالَتْ: مَعَاذَ اللهِ! لَمْ تَكُنِ الرُّسُلُ تَظُنُّ ذلِكَ بِرَبِّهَا. وَأَمَّا هذِهِ الآيَةُ، قَالَتْ: هُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ، الَّذِينَ امَنُوا بِرَبِّهِمْ وَصَدَّقُوهُمْ، وَطَالَ عَلَيْهِمُ الْبَلاَءُ، وَاسْتَأْخَرَ عَنْهُمُ النَّصْرُ، حَتَّى إِذَا اسْتَيْأَسَتْ مِمَّنْ كَذَّبَهُمْ مِنْ قَوْمِهِمْ، وَظَنُّوا أَنَّ أَتْبَاعَهُمْ كَذَّبُوهُمْ، جاءَهُمْ نَصْرُ اللهِ. [خ٣٣٨٩]

**(خ) لە عوروەوە: پرسیاری لە عائیشە-هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)- کرد، ئەم ئایەتە: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ قَدْ﴾ "كُذِّبُوا" یان "كُذِبُوا"؟، وتی: بەڵکو قەومەکانیان ئەوانیان بەدرۆخستەوە، وتم: سوێند بە خودا، ئەوان دڵنیابوون**

قەومەکانیان ئەوانیان بە درۆ زانیوە و ئەوەش گومان نەبووە، عائیشە وتی: ئەی عورۆکە[1]، ئەوان بەوە لە یەقیندا بوون، وتم: لەوانەیە یان "كُذِبوا"، عائیشە وتی: "معاذ الله !"، پێغەمبەران بەو جۆرە گومان بە پەروەردگاریان ببەن، بەڵام ئەم ئایەتە -عائیشە وتی:- بریتین لە شوێنکەوتوانی پێغەمبەران کە ئیمانیان بە پێغەمبەران هێناوە و بە راستیان دەزانن، و بەڵا لەسەریان درێژەی کێشاوە و سەرکەوتن لێیان دواکەوتووە، تا پێغەمبەران بێهیوابوون لەوانەی ئەوانیان بە درۆزانی لە قەومەکەیان، و وا گومانیان برد شوێنکەوتوانیان ئەوانیان بە درۆ زانیوە، لەو کاتەدا سەرکەوتنی خودایی دێت.

## (١٣)

## سورة (الرعد)

### ئایەتی: ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡ﴾ [الرعد: ٢٤]

**٦٧٤**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِي، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: **(هَلْ تَدْرُونَ أَوَّلَ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ خَلْقِ اللهِ)**؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: **(أَوَّلُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ خَلْقِ اللهِ الْفُقَرَاءُ، وَالْمُهَاجِرُونَ الَّذِينَ تُسَدُّ بِهِمُ الثُّغُورُ، وَيُتَّقَى بِهِمُ الْمَكَارِهُ، وَيَمُوتُ أَحَدُهُمْ وَحَاجَتُهُ فِي صَدْرِهِ لاَ يَسْتَطِيعُ لَهَا قَضَاءً، فَيَقُولُ اللهُ عزّ وجل لِمَنْ يَشَاءُ مِنْ مَلاَئِكَتِهِ: ائْتُوهُمْ فَحَيُّوهُمْ، فَتَقُولُ الْمَلاَئِكَةُ: نَحْنُ سُكَّانُ سَمَائِكَ وَخِيرَتُكَ مِنْ خَلْقِكَ، أَفَتَأْمُرُنَا أَنْ نَأْتِيَ هَؤُلاَءِ فَنُسَلِّمَ عَلَيْهِمْ، قَالَ: إِنَّهُمْ كَانُوا عِبَاداً يَعْبُدُونِي، لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً، وَتُسَدُّ بِهِمُ الثُّغُورُ، وَيُتَّقَى بِهِمُ الْمَكَارِهُ، وَيَمُوتُ أَحَدُهُمْ وَحَاجَتُهُ فِي صَدْرِهِ لاَ يَسْتَطِيعُ لَهَا قَضَاءً، قَالَ: فَتَأْتِيهِمُ الْمَلاَئِكَةُ عِنْدَ ذَلِكَ، فَيَدْخُلُونَ عَلَيْهِمْ مِنْ كُلِّ بَابٍ ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ﴾)**. [حم٦٥٧٠]

* إسناده جيد.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(ئایا دەزانن یەکەمین کەسێك لە دروستکراوانی خودا کێیە دەچنە بەهەشتەوە؟)**،

---

[1] عورۆکە: بچوککراوەی ناوی (عوروە)یە-و.

وتیان: خودا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) زاناترن، فەرمووی: **(یەکەمین کەسێك لە دروستکراوانی خودا دەچنە بەهەشتەوە هەژارانن، هەروەها کۆچکەران کە سەنگەرەکان بەوان دەگیران[1] ، و لە ناخۆشییەکانیان بەوان خۆدەپارێزرا، یەکێك لەوان دەمرێت و پێویستییەکەی لە سینەیدایە و ناتوانێت جێبەجێی بکات، خودا(عز وجل) بەوانەی دەیەوێت لە فریشتەکان دەفەرموێت: وەرن بۆ لایان و سڵاویان لێبکەن، فریشتەکان دەڵێن: ئێمە دانیشتوانی ئاسمانی خۆت و باشترینی دروستکراوانت، ئایا فەرمانمان پێ دەکەی بچین بۆ لای ئەوانە و سەلامیان لێ بکەین، فەرمووی: ئەوانە بەندەگەلێك بوون دەیانپەرستم و شتێك لە هاوەڵیان بۆ بڕیار نەدەدام، سەنگەرەکان بەوان دەگیران، لە ناخۆشییەکان بەوان خۆدەپارێزرا، یەکێك لەوان دەمرد و پێویستییەکەی لە سینەیدا بوو و نەیدەتوانی جێبەجێی بکات، فەرمووی: لەو بارەدا فریشتەکان دێن و لە هەموو دەرگایەکەوە بۆ لایان دەچنە ژوورەوە: ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ﴾).**

(١٤)

## سورة إبراهيم

### ئایەتی: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ﴾ [إبراهيم: ٤]

**٦٧٥**– عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَمْ يَبْعَثِ اللهُ نَبِيّاً إِلاَّ بِلُغَةِ قَوْمِهِ). [حم١٠ ٢١٤١٠]

* متنه صحيح.

لە ئەبی زەڕەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا هەموو پێغەمبەرانی بە زمانی قەومەکانیان رەوانە کردووە).**

[1] واتە: کەلەبەرەکان بەوان پڕ دەکرانەوە–و.

ئایەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَتَ اللَّهِ كُفْرًا﴾ [إبراهيم: ٢٨]

٦٧٦– (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَتَ اللَّهِ كُفْرًا﴾. قَالَ: هُمْ وَاللهِ كُفَّارُ قُرَيْشٍ. [خ٣٩٧٧]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): ﴿الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَتَ اللَّهِ كُفْرًا﴾، وتی: سوێند بە خودا، ئەوانە بێباوەڕانی قورەیش بوون.

## (١٥)

## سورة الحجر

ئایەتی: ﴿إِلَّا مَنِ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُّبِينٌ﴾ [الحجر: ١٨]

٦٧٧– (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، قَالَ: (**إِذَا قَضى اللهُ الأَمْرَ فِي السَّمَاءِ، ضَرَبَتِ المَلاَئِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَاناً لِقَوْلِهِ، كالسِّلْسِلَةِ عَلَى صَفْوَانٍ**. قَالَ عَلِيٌّ، وَقَالَ غَيْرُهُ: صَفْوَانٍ، يَنْفُذُهُمْ ذلِكَ. **فَإِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ، قالُوا: ماذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قالُوا لِلَّذِي قَالَ: الحَقَّ، وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ. فَيَسْمَعُهَا مُسْتَرِقُو السَّمْعِ، وَمُسْتَرِقُو السَّمْعِ هكَذَا وَاحِدٌ فَوْقَ آخَرَ** . وَوَصَفَ سُفْيَانُ بِيَدِهِ وَفَرَّجَ بَيْنَ أَصَابِعِ يَدِهِ الْيُمْنى، نَصَبَهَا بَعْضَهَا فَوْقَ بَعْضٍ . **فَرُبَّمَا أَدْرَكَ الشِّهَابُ الْمُسْتَمِعَ قَبْلَ أَنْ يَرْمِيَ بِهَا إِلَى صَاحِبِهِ فَيُحْرِقَهُ، وَرُبَّمَا لَمْ يُدْرِكْهُ حَتَّى يَرْمِيَ بِهَا إِلَى الَّذِي يَلِيهِ، إِلَى الَّذِي هُوَ أَسْفَلُ مِنْهُ، حَتَّى يُلْقُوهَا إِلَى الأَرْضِ** . وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: **حَتَّى تَنْتَهِي إِلَى الأَرْضِ . فَتُلْقى عَلَى فَمِ السَّاحِرِ، فَيَكْذِبُ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ، فَيُصَدَّقُ فَيَقُولُونَ: أَلَمْ يُخْبِرْنَا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا، يَكُونُ كَذَا وَكَذَا، فَوَجَدْنَاهُ حَقّاً؟ لِلْكَلِمَةِ الَّتِي سُمِعَتْ مِنَ السَّمَاءِ**). [خ٤٧٠١]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتووە، فەرمووی: (**کە لە ئاسمانـدا خـودا بڕیارێـك دەردەکـات، فریشـتەکان باڵیـان دەدەن بەیەکـدا وەك گەردنکەچی بۆ فەرموودەکەی، هەروەك دەنگی بەریوونەوەی زنجیر بۆ سەر بەردی لووس**–عەلی و کەسانی تر دەڵێن: صفوان، ئەو فەرمانەی خودا دەریکردووە رەوانەی فریشتەکانی دەکات– **کاتێك ترس لە دڵیان دەڕوێتەوە، دەڵێن: پەروەردگاری ئێوە**

چی فەرمووی؟ دەڵێن: ئەوەی فەرمووی حەق بوو، ئەو "العلي الكبير–بالا و مەزن"ە، دزە بیست(مسترق السمع[1]) دەیبیستن، دزە بیست بەم جۆرەن، یەك لەسەر یەك – سوفیان بە دەستی خۆی وەسفی کرد، بۆشایی خستە نێوان پەنجەکانی دەستی راست، هەندێکی لەسەر هەندێکی تر دانا–لەوانەیە ئەیزەکە بگاتە گوێهەڵخەرەکە بەرلەوەی هەڵیبدات بۆ سەر هاوەڵەکەی و بیسوتێنێ، لەوانەشە پێی نەگات تا بیخات بەسەر ئەوەی لەدوای ئەوەیە، لەویشەوە بۆ ئەوەی خوار ئەو، تا بەریبداتەوە بۆ زەوی–وابزانم سوفیان وتی: تا لە کۆتاییدا دەگاتە زەوی– هەڵدەدرێتە ناو دەمی ساحیرەوە و سەد درۆی تری لەگەڵ دەکات، بە راستی دەزانن و دەڵێن: ئایا رۆژی ئەونەی ئەونە هەواڵمان نەدا ئاوا و ئاوا دەبێت، ئەوا بە حەق بینیمان؟ بۆ ئەو کەلیمەی لە ئاسمان بیسترا).

٦٧٨– (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مِنَ الأَنْصَارِ: أَنَّهُمْ بَيْنَمَا هُمْ جُلُوسٌ لَيْلَةً مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رُمِيَ بِنَجْمٍ فَاسْتَنَارَ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَاذَا كُنْتُمْ تقُولُونَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، إِذَا رُمِيَ بِمِثْلِ هَذَا**)؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، كُنَّا نَقُولُ: وُلِدَ اللَّيْلَةَ رَجُلٌ عَظِيمٌ، وَماتَ رَجُلٌ عَظِيمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**فَإِنَّهَا لاَ يُرْمَى بِهَا لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنْ رَبُّنَا ـ تَبَارَكَ وَتَعَالَى اسْمُهُ ـ إِذَا قَضَى أَمْراً سَبَّحَ حَمَلَةُ الْعَرْشِ، ثُمَّ سَبَّحَ أَهْلُ السَّمَاءِ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، حَتَّى يَبْلُغَ التَّسْبِيحُ أَهْلَ هَذِهِ السَّمَاءِ الدُّنْيَا. ثُمَّ قَالَ الَّذِينَ يَلُونَ حَمَلَةَ الْعَرْشِ لِحَمَلَةِ الْعَرْشِ: مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ فَيُخْبِرُونَهُمْ مَاذَا قَالَ. قَالَ: فَيَسْتَخْبِرُ بَعْضُ أَهْلِ السَّمَاوَاتِ بَعْضاً، حَتَّى يَبْلُغَ الْخَبَرُ هَذِهِ السَّمَاءَ الدُّنْيَا، فَتَخْطَفُ الْجِنُّ السَّمْعَ، فَيَقْذِفُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ، وَيُرْمَوْنَ بِهِ، فَمَا جَاؤُوا بِهِ عَلَى وَجْهِهِ فَهُوَ حَقٌّ، وَلَكِنَّهُمْ يَقْرِفُونَ فِيهِ وَيَزِيدُونَ**). [م٢٢٢٩]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە، وتی: پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئەنصار هەواڵی پێدام: شەوێك ئەوان لە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتوون،

[1] ئاماژەیە بەم ئایەتە: ﴿ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ ﴾ الحجر: ١٨، واتە: شەیاتین –و.

ئەستێرەیەك هەڵدەدرێت و ڕۆشن دەبێتەوە[1]، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموون: **(لە سەردەمی نەفامیدا کاتێك نموونەی ئەمە هەڵبدرابا چیتان دەوت؟)**، وتیان: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، ئێمە دەمانوت: ئەم شەوە پیاوێکی مەزن لەدایك بووە، و پیاوێکی مەزن کۆچی دوایی کردووە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوە بۆ مردن و ژیانی هیچ کەس هەڵنادرێت، بەڵام پەروەردگارمان(تبارك وتعالى اسمه) کاتێك فەرمانێك دەردەکات هەڵگرانی عەرش "سبحان الله" دەکەن، پاشان ئەهلی ئەو ئاسمانەی بەدوایاندا دێت تەسبیح دەکەن، تا تەسبیح دەگاتە ئەهلی ئەم ئاسمانی دنیا، پاشان ئەوانەی بەدوای هەڵگرانی عەرشدا دێن بە هەڵگرانی عەرش دەڵێن: پەروەردگاری ئێوە چی فەرموو؟ هەواڵیان پێ دەدەن چی فەرمووە، فەرمووی: هەندێ لە ئەهلی ئاسمانەکان لە هەندێکی تر هەواڵەکە دەپرسن، تا هەواڵەکە دەگاتە ئەم ئاسمانی دنیا، جنۆکە پڕدەداتە بیستن و هەڵیدەدەن بۆ دۆستانی خۆیان، بەو نەیزەکانە دادەگیرێنەوە، ئەوەی وەك خۆی دەیهێنن حەقە، بەڵام درۆی تێکەڵ دەکەن و بۆی زیاد دەکەن)**.

٦٧٩- عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مسعود قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا تَكَلَّمَ اللهُ بِالْوَحْيِ، سَمِعَ أَهْلُ السَّمَاءِ لِلسَّمَاءِ صَلْصَلَةً كَجَرِّ السِّلْسِلَةِ عَلَى الصَّفَا، فَيُصْعَقُونَ، فَلاَ يَزَالُونَ كَذَلِكَ حَتَّى يَأْتِيَهُمْ جِبْرِيلُ، حَتَّى إِذَا جَاءَهُمْ جِبْرِيلُ؛ فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ). قَالَ: (فَيَقُولُونَ: يَا جِبْرِيلُ مَاذَا قَالَ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: الْحَقَّ، فَيَقُولُونَ: الْحَقَّ، الْحَقَّ). [د٤٧٣٨]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر خودا بە وەحی قسەی فەرموو ئەهلی ئاسمان بۆ ئاسمان زڕەیەك دەبیستێ وەك زڕەی زنجیر بەسەر بەردی لووسدا، بۆیە دەبوورێنەوە، ئەوان بەو جۆرەن تا جیبریل دێت، کە جیبریل دێت بۆ لایان ترس لە دڵیان دەڕەوێتەوە)**، فەرمووی: **(دەڵێن: ئەی جیبریل، پەروەردگاری تۆ چی فەرموو؟ دەڵێت: حەق، بۆیە ئەوانیش دەڵێن: حەق، حەق)**.

---

[1] واتە: نەیزەکێك دەکشێت و ئاسمان ڕۆشن دەکاتەوە-و.

**ئایەتی: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ﴾ [الحجر: ٢٤]**

**٦٨٠–** عن ابن عباس قَالَ: كانت امرأةٌ تصلِّي خلفَ رسولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، حسناءُ من أحسنِ النَّاسِ، فَكانَ بعضُ القومِ يتقدَّمُ في الصَّفِّ الأوَّلِ، لئلَّا يَراها، ويستأخِرُ بعضُهُم حتَّى يَكونَ في الصَّفِّ المؤخَّرِ، فإذا رَكَعَ نظرَ من تحتِ إبطِهِ، فأنزلَ اللهُ **﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ﴾**. [ت٣١٢٢/ ن٨٦٠/ جه١٠٤٦]

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: ئافرەتێك لەدوای پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) نوێژی دەکرد، جوانێك بوو لە باشترینی خەڵك، یەكێك لە خەڵكەكە پێشدەكەوت تا لە ریزی یەكەمدا بێت و نەیبینێت، یەكێكی تر خۆی دوادەخست تا لە ریزی دواوە بێت، كاتێك ركوعی دەبرد لەژێر باڵییەوە سەرنجی دەدا[1]، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ﴾.**

**ئایەتی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَـٰتٖ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ﴾ [الحجر: ٧٥]**

**٦٨١–** عَن أَبِي سَعِيدٍ الخُدريِّ قَالَ: قَالَ رسولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(اتَّقوا فِراسةَ المؤمنِ، فإنَّه ينظرُ بنورِ اللهِ)**، ثم قرأ: **﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَـٰتٖ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ﴾**. [ت٣١٢٧]

* ضعيف.

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خۆتان لە فیراسەتی باوەڕدار بپارێزن، چونكە ئەو بە نووری خودا وردەبێتەوە)، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَـٰتٖ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ﴾.**

---

**[1] چونكە ئافرەتان لە ریزی دواوە دەوەستان و لەو كاتەدا پەردەیەك یان دیوارێك نەبوو ئافرەتان لە پیاوان دابڕێت–و.**

ئایەتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ﴾ [الحجر: ٨٧]

٦٨٢- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (مَا أَنْزَلَ اللهُ فِي التَّوْرَاةِ، وَلاَ فِي الإِنْجِيلِ، مِثْلَ أُمِّ الْقُرْآنِ، وَهِيَ: السَّبْعُ الْمَثَانِي، وَهِيَ مَقْسُومَةٌ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ). [ت٣١٢٥/ ن٩١٣٠/ مي٣٤١٥]

* صحيح.

**لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خودا نموونەی "أم القرآن"ی لە تەورات و ئینجیلدا دانەبەزاندووە، ئەوەش بریتییە لە: "السبع المثاني"[1]، ئەوەش لە نێوان من و بەندەکەم دابەش کراوە، بۆ بەندەکەشم ئەوە هەیە داوای دەکات[2]).**

٦٨٣- عن ابن عباس رضي الله عنهما في قوله عزّ وجل: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾﴾. قال: البقرة، وآل عمران، والنساء، والمائدة، والأنعام، والأعراف، وسورة الكهف. [ك٣٣٥٣]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) دەربارەی ئایەتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾﴾، وتی: "البقرة، وآل عمران، والنساء، والمائدة، والأنعام، والأعراف، و سورة الكهف"[3].**

---

[1] ئەو حەوت ئایەتەی مەدح و سەنای خودایان پێ دەکرێت و لە نوێژەکاندا دووبارە دەکرێنەوە-و.

[2] فەرموودەکە دوو بەشە: بەشێکی فەرموودەی پێغەمبەرە و بەشێکی فەرموودەی قودسییە، لەو شوێنەوە کە دەفەرموێت: (ئەوەش لە نێوان من و ...تا... داوای دەکات)-و.

[3] واتە: "السبع المثاني"ی بەو حەوت سورەتە تەفسیر کرد-و.

## ئایەتی: ﴿ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ﴾ [الحجر: ٩١]

**٦٨٤-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ۝٩١﴾. قَالَ: هُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ، جَزَّؤُوهُ أَجْزَاءً، فَآمَنُوا بِبَعْضِهِ وَكَفَرُوا بِبَعْضِهِ. [خ٤٧٠٥، (٣٩٤٥)]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): ﴿ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ۝٩١﴾، وتی: ئەوانە بریتین لە ئەهلی کیتاب، بەش بەشیان کرد[1]، ئیمانیان بە هەندێکی هێنا و بە هەندێکی تری بێباوەڕ بوون.**

## (١٦)

## سورة النحل

## ئایەتی: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ﴾ [النحل: ١٢٦]

**٦٨٥-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ، أُصِيبَ مِنَ الْأَنْصَارِ أَرْبَعَةٌ وَسِتُّونَ رَجُلاً، وَمِنَ الْمُهَاجِرِينَ سِتَّةٌ مِنْهُم حَمْزَةُ، فَمَثَّلُوا بِهِمْ، فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ: لَئِنْ أَصَبْنَا مِنْهُمْ يَوْماً مِثْلَ هَذَا لَنُرْبِيَنَّ عَلَيْهِمْ. قَالَ: فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ، فَأَنْزَلَ اللهُ تعالى: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ ۝١٢٦﴾ فَقَالَ رَجُلٌ: لاَ قُرَيْشَ بَعْدَ الْيَوْمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(كُفُّوا عَنِ الْقَوْمِ؛ إِلاَّ أَرْبَعَةً)**. [ت٣١٢٩]

* حسن صحيح الإسناد.

**لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە، وتی: لە رۆژی ئوحد شەست و چوار پیاو لە ئەنصار تووشهاتن، لە کۆچکەرانیش شەش یەکێکیان حەمزە بوو، جەستەیان شێواندبوون، ئەنصار وتیان: گەر رۆژێك وەك ئەم رۆژە دەستمان بەسەریاندا رۆیشت پێیان نیشان دەدەین[2]، وتی: کاتێك فەتحی مەککە هاتە بەرەوە، خودا(سبحانە وتعالى) ئایەتی**

---

[1] **واتە: ئەهلی هەر ئاینێك کتێبەکەی خۆیان بەش بەش کرد-و.**

[2] **واتە: گەر ئێمەش رۆژێك-وەك ئەم رۆژەی ئەوان- بەسەریاندا سەرکەوتبین زیاتر لەوان جەستەی کوژراوەکانیان دەشێوێنین-د، و.**

دابەزاند: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ﴿١٢٦﴾﴾، پیاوێك وتی: لەدوای ئەمڕۆ قورەیش نامێنێت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (دەست لەم قەومە بپارێزن، جگە لە چوار کەسیان).

## (١٧)

## سورة الإسراء

### ئایەتی: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا﴾ [الإسراء: ١]

[أنظر: باب الإسراء والمعراج في السيرة].

**٦٨٦–** عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ قَالَ: قُلْتُ لِحُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ: أَصَلَّى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ؟ قَالَ: لاَ، قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: أَنْتَ تَقُولُ ذٰلِكَ يَا أَصْلَعُ! بِمَ تَقُولُ ذَلِكَ؟ قُلْتُ: بِالْقُرْآنِ بَيْنِي وَبَيْنَكَ الْقُرآنُ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: مَنِ احْتَجَّ بِالْقُرْآنِ فَقَدْ فَلَجَ. قَالَ سُفْيَانُ: يَقُولُ: فَقَدِ احْتَجَّ، وَرُبَّمَا قَالَ: قَدْ أَفْلَجَ. فَقَالَ: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا﴾ قَالَ: أَفَتُرَاهُ صَلَّى فِيهِ؟ قُلْتُ: لاَ. قال: لَوْ صَلَّى فِيهِ، لَكُتِبَتْ عَلَيْكُمْ فيهِ الصَّلاَةُ كَمَا كُتِبَتِ الصَّلاَةُ فِي المَسْجِدِ الحَرَام.
قَالَ حُذَيْفَةُ: قد أُتِيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِدَابَّةٍ طَوِيلَةِ الظَّهْرِ مَمْدُودَةٍ هَكَذَا، خَطْوُهُ مَدُّ بَصَرِهِ، فَمَا زَايَلاَ ظَهْرَ الْبُرَاقِ حَتَّى رَأَيَا الْجَنَّةَ وَالنَّارَ، وَوَعْدَ الْآخِرَةِ أَجْمَعَ، ثُمَّ رَجَعَا عَوْدَهُمَا عَلَى بَدْئِهِمَا. قَالَ: وَيَتَحَدَّثُونَ أَنَّهُ رَبَطَهُ، لِمَ؟ أَيَفِرُّ مِنْهُ، وَإِنَّمَا سَخَّرَهُ لَهُ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ. [ت٣١٤٧]

* حسن الإسناد.

لە زوڕی کوڕی حوبەیشەوە، وتی: بە حوزەیفەی کوڕی یەمانم وت: ئایا پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە "بيت المقدس" نوێژی کرد؟ وتی: نەخێر، وتم: با، وتی: تۆ ئەوە دەڵێی، ئەی سەر رووت[1]، بە چیدا ئەوە دەڵێی؟ وتم: بە قورئان لە نێوان من و تۆ، حوزەیفە وتی: هەر کەس بەڵگە بە قورئان بهێنێتەوە (فقد فلج–زەفەری پێ

---

[1] یان ئەی سەر رووتاوە(أصلع)و.

بردووە)، سوفیان وتی: دەڵێت: "فقد احتج–بەڵگەی بەدەستهێناوە"، لەوانەشە وتبێتی: "قد أفلج–بەسەر نەیارەکەیدا سەرکەوتووە و زاڵبووە"، حوزەیفە وتی: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا﴾، ئایا (صلی–نوێژی کرد)ی تێدا دەبینیت؟ وتم: نەخێر، وتی: گەر نوێژی تێدا بکردبا، نوێژ لەو شوێنە لەسەر ئێوە واجب دەکرا وەك چۆن نوێژ لە "مسجد الحرام" واجب کراوە.

حوزەیفە وتی: وڵاخێکی سواری پشت درێژ بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) هێنرا، بەم جۆرە درێژ بووبوو، هەنگاوەکانی تا چاو هانابکات، لە پشتی بوراق دانەبەزین[1] تا بەهەشت و ئاگر و هەموو بەڵێنەکانی دوارۆژیان بینی، پاشان گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی لێیەوە دەستیان پێکرد بوو، وتی: باس لەوە دەکەن ئەو بەستوویەتەوە[2]، بۆچی؟ ئایا لە دەستی هەڵدەهات، زانای پەنهان و ئاشکرا ئەوی بۆ رامهێنابوو.

## ئایەتی: ﴿وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا﴾ [الإسراء: ١٦]

٦٨٧– (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ قَالَ: كُنَّا نَقُولُ لِلْحَيِّ إِذَا كَثُرُوا فِي الجَاهِلِيَّةِ: أَمِرَ بَنُو فُلاَنٍ. [خ٤٧١١]

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: لە سەردەمی نەفامی گەر گەڕەکێك زۆربوونایە دەمانوت: "أمِرَ بنو فلان"[3].

[1] واتە: پێغەمبەر و جیبریل(علیهما السلام) دانەبەزین–و.

[2] واتە: باس لەوە دەکرێت پێغەمبەر بوراقەکەی بەستووەتەوە، بۆچی ببیەستێتەوە، لە کاتێکدا خودای زانا بە پەنهان و ئاشکرا بۆ پێغەمبەری رامهێناوە؟!.

[3] عەبدوڵای کوڕی مەسعوود تەفسیری (أَمَرْنا)ی ئایەتەکە دەکات، و ئەو بەڵگە زمانەوانییەی بۆ دەهێنێتەوە کە ماناکەی واتە (بەنو فلان زۆربوون و هێز و دەسەڵاتیان زیاد بووە)، کەوابوو مانای وشەکە لە ئایەتەکەدا بەم جۆرەیە: (کاتێك ویستبێتمان ئاوەدانییەك بەرباد بکەین ژمارە و هێزی موتریفانی ئەو ئاوەدانییەمان زۆر و زیاد کردووە)، خودا زاناترە–و.

## ئایەتی: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ﴾ [الإسراء: ٥٩]

٦٨٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: سَأَلَ أَهْلُ مَكَّةَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَجْعَلَ لَهُمُ الصَّفَا ذَهَباً، وَأَنْ يُنَحِّيَ الْجِبَالَ عَنْهُمْ فَيَزْدَرِعُوا، فَقِيلَ لَهُ: إِنْ شِئْتَ أَنْ تَسْتَأْنِيَ بِهِمْ، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ تُؤْتِيَهُمُ الَّذِي سَأَلُوا، فَإِنْ كَفَرُوا أُهْلِكُوا كَمَا أَهْلَكْتُ مَنْ قَبْلَهُمْ، قَالَ: (لاَ، بَلْ أَسْتَأْنِي بِهِمْ)، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَۚ وَءَاتَيۡنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبۡصِرَةٗ﴾. [حم٢٣٣٣]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: ئەهلی مەککە داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد گردی صەفایان بۆ بکات بە زێڕ و چیاکان لەوان کەنارگیر بکات(دوور بخاتەوە) و هەوڵی کشتوکاڵ بدەن[1]، پێی وترا: گەر دەتەوێ لەگەڵیان نەرمونیان و هێواش بە، گەر دەخوازی ئەوەی داوای دەکەن بۆیان بهێنە، گەر بێباوەڕ بوون تیادەچن وەك چۆن ئەوانی پێشوو تیاچوون، فەرمووی: (نەخێر، بەڵکو لەگەڵیان هێواش و نەرمونیان دەبم)، بۆیە خودا(عز وجل) ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَۚ وَءَاتَيۡنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبۡصِرَةٗ﴾.**

## ئایەتی: ﴿نَافِلَةٗ لَّكَ﴾ [الإسراء: ٧٩]

٦٨٩- عَنْ أبي أمامة، ﴿نَافِلَةٗ لَّكَ﴾ قال: إنَّما كانتِ النَّافلةُ خاصَّةً لرسولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ. [حم٢٢٢١٠]

**لە ئەبی ئومامەوە، وتی: "النافلة" تایبەت بوو بە پێغەمبەری خودا(ﷺ).**

- وفي رواية: كانتْ للنَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ نافلةً، ولكم فَضيلةً. [حم٢٢٢٣٠]

إسناده ضعيف.

**لە ریوایەتێکدا: شەونوێژ بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نافیلەیەك بوو و بۆ ئێوە فەزیلەتێك.**

---

[1] واتە: خودا چیاکان لە دەوری مەککە دووربخاتەوە و شوێنەکەیان بکات بە دەشت و تیایدا ئاو و روبار هەبێت و ئەوان زەوییەکان بکەن بە کشتوکاڵ-و.

**ئایەتی: ﴿عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا﴾ [الإسراء: ٧٩]**

**٦٩٠**– (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: إِنَّ النَّاسَ يَصِيرُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ جُثاً، كُلُّ أُمَّةٍ تَتْبَعُ نَبِيَّهَا يَقُولُونَ: يَا فُلاَنُ اشْفَعْ، يَا فُلاَنُ اشْفَعْ، حَتَّى تَنْتَهِيَ الشَّفَاعَةُ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَذلِكَ يَوْمَ يَبْعَثُهُ اللهُ الْمَقَامَ الْمَحْمُودَ. [خ٤٧١٨ (١٤٧٥)]

**(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: لە رۆژی قیامەت خەڵکی بە چۆکدا دێن، هەر ئومەتێك شوێنی پێغەمبەری خۆی دەکەوێت، دەڵێن: ئەی فلان شفاعەت بکە، ئەی فلان شفاعەت بکە، تا شفاعەت دەگاتە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوەش ئەو رۆژەیە خودا "مقام المحمود"ی پێ دەبەخشێت.**

**ئایەتی: ﴿وَقُل رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ﴾ [الإسراء: ٨٠]**

**٦٩١**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِمَكَّةَ، ثُمَّ أُمِرَ بِالْهِجْرَةِ، فَنَزَلَتْ عَلَيْهِ: ﴿وَقُل رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا ٨٠﴾. [ت٣١٣٩]

* ضعيف الإسناد، قال الترمذي: حسن صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککە بوو، پاشان فەرمانی پێکرا بە کۆچ کردن، ئایەت دابەزی: ﴿وَقُل رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا ٨٠﴾.**

**ئایەتی: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ﴾ [الإسراء: ٨٥]**

**٦٩٢**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: بَيْنَا أَنَا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم في حَرْثٍ، وَهْوَ مُتَّكِئٌ عَلَى عَسِيبٍ، إِذْ مَرَّ الْيَهُودُ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ؟ فَقَالَ: ما رَابَكُمْ إِلَيْهِ؟ وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ يَسْتَقْبِلُكُمْ بِشَيْءٍ تَكْرَهُونَهُ، فَقَالوا: سَلُوهُ، فَسَأَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ، فَأَمْسَكَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِمْ شَيْئاً، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ يُوحى إِلَيْهِ، فَقُمْتُ

مَقَامِي، فَلَمَّا نَزَلَ الْوَحْيُ قَالَ: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾. [خ٤٧٢١ (١٢٥)/ م٢٧٩٤]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە زەرعێکدا بووم، ئەو لەسەر پەلکی دارخورمایەك شانیدادابوو، یەهوودی تێپەڕین، هەندێکیان بە هەندێکیان وت: دەربارەی ڕۆحی پرسیاری لێ بکەن؟ فەرمووی: دوودڵیتان لە چیدایە؟ یەکێکیان وتی: بە شتێك پێشوازیتان لێ نەکات لاتان ناپەسەند بێت، وتیان: پرسیاری لێ بکەن، بۆیە دەربارەی ڕۆح پرسیاریان لێ کرد، پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ بوو و بە شتێك وەڵامی نەدانەوە، زانیم وەحی بۆ دەکرێت، لە شوێنی خۆم بە پێوە وەستام، کاتێك وەحی دابەزی، فەرمووی: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾.

### ئایەتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍ﴾ [الإسراء: ١٠١]

**٦٩٣-** عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ: أَنَّ يَهُودِيَّيْنِ قَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: اذْهَبْ بِنَا إِلَى هَذَا النَّبِيِّ نَسْأَلُهُ، فَقَالَ: لاَ تَقُلْ: نَبِيٌّ، فَإِنَّهُ إِنْ سَمِعَهَا تَقُولُ نَبِيٌّ، كَانَتْ لَهُ أَرْبَعَةُ أَعْيُنٍ، فَأَتَيَا النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَسَأَلاَهُ عَنْ قَوْلِ اللهِ عزّ وجل: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍ بَيِّنَٰتٍ﴾. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تُشْرِكُوا بِاللهِ شَيْئاً، وَلاَ تَزْنُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَسْحَرُوا، وَلاَ تَمْشُوا بِبَرِيءٍ إِلَى سُلْطَانٍ فَيَقْتُلَهُ، وَلاَ تَأْكُلُوا الرِّبَا، وَلاَ تَقْذِفُوا مُحْصَنَةً، وَلاَ تَفِرُّوا مِنَ الزَّحْفِ** ـ شَكَّ شُعْبَةُ ـ **وَعَلَيْكُمْ يَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ خَاصَّةً: لاَ تَعْدُوا فِي السَّبْتِ**)، فَقَبَّلاَ يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ، وَقَالاَ: نَشْهَدُ أَنَّكَ نَبِيٌّ. قَالَ: (**فَمَا يَمْنَعُكُمَا أَنْ تُسْلِمَا**)؟ قَالاَ: إِنَّ دَاوُدَ دَعَا اللهَ أَنْ لاَ يَزَالَ فِي ذُرِّيَّتِهِ نَبِيٌّ، وَإِنَّا نَخَافُ إِنْ أَسْلَمْنَا أَنْ تَقْتُلَنَا الْيَهُودُ.

[ت٢٧٣٣/ ن٤٠٨٩/ جه٣٧٠٥]

* ضعيف، قال الترمذي: حسن صحيح.

لە صەفوانی کوڕی عەسالەوە: دوو یەهوودی، یەکێکیان بەویتریانی وت: بڕۆ با بچین بۆ لای ئەم پێغەمبەرە پرسیاری لێ بکەین، وتی: مەڵێ: پێغەمبەرە، چونکە گەر ئەو بیبیستێ تۆ دەڵێی پێغەمبەرە، ئەو چوار چاوی هەبوو، هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پرسیاری فەرموودەی خودا(عز وجل): ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ﴾ یان لێکرد، فەرمووی: **(هاوەڵ بۆ خودا بڕیار مەدەن، زینا مەکەن، نەفسێك مەکوژن خودا حەرامی کردووە مەگەر بە حەق، دزی مەکەن، و سیحر ئەنجام مەدەن، و کەسی بەری مەبەن بۆ لای دەسەڵاتدار بیکوژێت، و سوو مەخۆن، و ئافرەتی پاکداوێن تۆمەتبار مەکەن، و لە مەیدانی جەنگ هەڵمەیەن**–شوعبە شکی هەیە– **هەروەها بەتایبەت بۆ ئێوە ئەی کۆمەڵی یەهوود لە شەمەدا دەستدرێژی مەکەن)**، هەردوو دەست و لاقی پێغەمبەریان ماچ کرد و وتیان: شایەتی دەدەین تۆ پێغەمبەری، فەرمووی: **(چی ڕێگریتان لێ دەکات موسڵمان بین؟)**، وتیان: داود داوای لە خودا کرد بەردەوام لە نەوەکانیدا پێغەمبەر هەبێت، ئێمە دەترسین گەر موسڵمان بین یەهوود بمانکوژێت.

### ئایەتی: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾ [الإسراء: ١١٠]

٦٩٤– (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾. قَالَ: نَزَلَتْ وَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مُخْتَفٍ بِمَكَّةَ، كانَ إِذَا صَلَّى بِأَصْحَابِهِ رَفَعَ صَوْتَهُ بِالقُرْآنِ، فَإِذَا سَمِعَهُ المشْرِكُونَ سَبُّوا القُرْآنَ وَمَنْ أَنْزَلَهُ وَمَنْ جاءَ بِهِ، فقَالَ اللهُ تَعَالَى لِنَبِيِّهِ صلّى الله عليه وسلّم: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ﴾؛ أَيْ: بِقِرَاءَتِكَ، فَيَسْمَعَ المشْرِكُونَ فَيَسُبُّوا القُرْآنَ، ﴿وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾ عَنْ أَصْحَابِكَ فَلاَ تُسْمِعُهُمْ ﴿وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا﴾. [خ٤٧٢٢/ م٤٤٦]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) دەربارەی ئایەتی: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾، وتی: ئەم ئایەتە دابەزی و پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە

مەککە خۆی کەنارگیر کرد بوو، کاتێك نوێژی بە هاوەڵانی دەکرد دەنگی بە قورئان بەرز دەکردەوە، کاتێك هاوەڵدانەران دەیانبیست جنێویان دەدا بە قورئان و ئەو کەسەی دایبەزاندووە و ئەو کەسەی هێناویەتی، خودا(سبحانه وتعالى) بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) فەرموو: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ﴾، واتە: بە خوێندنەوەکەت[1]، چونکە هاوەڵدانەران دەیبیستن و جنێو بە قورئان دەدەن، ﴿وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾، کپی مەکە و دەنگەکەت لە هاوەڵانت مەشارەوە نەیبیستن، ﴿وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا﴾.

٦٩٥- (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂ قالَتْ: أُنْزِلَ ذلِكَ في الدُّعاءِ. [خ٤٧٢٣/ م٤٤٧]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: ئەو ئایەتە دەربارەی دوعا دابەزێنراوە[2].

## (١٨)

## سورة الكهف

ئایەتی: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا﴾ [الكهف: ١٠٣]

٦٩٦- (خ) عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَبِي: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ۝﴾. هُمُ الحَرُورِيَّةُ؟ قَالَ: لاَ، هُمُ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى، أَمَّا الْيَهُودُ: فَكَذَّبُوا مُحَمَّداً صلّى الله عليه وسلّم، وَأَمَّا النَّصَارَى: كَفَرُوا بِالجَنَّةِ وَقالُوا: لاَ طَعَامَ فِيهَا وَلاَ شَرَابَ، وَالحَرُورِيَّةُ: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ [البقرة:٢٧]. وَكَانَ سَعْدٌ يُسَمِّيهِمُ: الْفَاسِقِينَ. [خ٤٧٢٨]

(خ) لە موصعەبی کوڕی سەعدەوە، وتی: پرسیارم لە باوکم کرد: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ۝﴾، ئایا ئەوانە حەرورییەکانن[3]؟ وتی: نەخێر، ئەوانە یەهوود و

---

[1] واتە: "بصلاتك" مانای "بقرائتك-بە خوێندنەوەکەت" دەگەیەنێت-و.

[2] بەپێی فەرموودەکەی خاتوو عائیشە (بصلاتك) مانای (بدعائك) دەگەیەنێت-و.

[3] الحرورية: دانەپاڵە بۆ لای (حروراء)، ئاوەدانییەکە یەکەمجار خەوارج-دژ بە عەلی(خوا لێی ڕازی بێت)- لەوێوە سەریانهەڵدا.

نەصاران، یەهوود محەمەدیان(ﷺ) بەدرۆزانی، نەصاراش: بێباوەڕییان بە بەهەشت نیشاندا و وتیان: نە خۆراکی تێدایە، و نە خواردنەوە، حەروورییەکان ئەمانەن: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ [البقرة:٢٧]، سەعد ئەوانی بە (الفاسقين–لادەران) ناودەبرد.

## ئایەتی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَلِقَآئِهِۦ﴾ [الكهف: ١٠٥]

**٦٩٧–** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لاَ يَزِنُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، وَقَالَ: اقْرَؤُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا﴾**). [خ٤٧٢٩/ م٢٧٨٥]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ڕۆژی قیامەت پیاوێکی مەزنی قەڵەو دێت لای خودا کێشی باڵە مێشوولەیەکی نییە، هەروەها فەرمووی: گەر دەخوازن بخوێننەوە: ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا﴾**.

## (١٩)

## سورة مريم

## ئایەتی: ﴿وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا﴾ [مريم: ٥٧]

**٦٩٨–** عَنْ قَتَادَةَ فِي قَوْلِهِ: ﴿**وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا**﴾، قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لَمَّا عُرِجَ بِي رَأَيْتُ إِدْرِيسَ فِي السَّمَاءِ الرَّابِعَةِ**). [ت٣١٥٧]

* صحيح.

لە قەتادەوە دەربارەی ئایەتی: ﴿وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا﴾، وتی: ئەنەسی کوڕی مالیك بۆی باس کردین، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کاتێك بەرزیان کردمەوە ئیدریسم لە ئاسمانی چوارەم بینی**

## ئایەتی: ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ﴾ [مريم: ٦٤]

٦٩٩- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (يَا جِبْرِيلُ ما يَمْنَعُكَ أَنْ تَزُورَنَا أَكْثَرَ مِمَّا تَزُورُنَا)، فَنَزَلَتْ: ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا﴾ إِلَى آخِرِ الآيَةِ، قَالَ: كانَ هَذَا الجَوَابَ لِمُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم.

[خ٧٤٥٥، (٣٢١٨)]

**(خ) له ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی جیبریل چی رێگریت لێ دەکات سەردانمان بکەی زۆرتر لەوەی سەردانمان دەکەی)، ئایەت دابەزی: ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا﴾، تا کۆتایی ئایەتەکە، وتی: ئەم وەڵامە بۆ محەمەد(ﷺ) بوو.**

## ئایەتی: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا﴾ [مريم: ٧١]

٧٠٠- عن مُرَّةَ الْهَمْدَانِيِّ فِي قَوْلِهِ تعالى: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا﴾ عن عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يَرِدُ النَّاسُ النَّارَ، ثُمَّ يَصْدُرُونَ عَنْهَا بِأَعْمَالِهِمْ، فَأَوَّلُهُمْ كَلَمْحِ الْبَرْقِ، ثُمَّ كَالرِّيحِ، ثُمَّ كَحُضْرِ الْفَرَسِ، ثُمَّ كَالرَّاكِبِ فِي رَحْلِهِ، ثُمَّ كَشَدِّ الرَّجُلِ، ثُمَّ كَمَشْيِهِ). [ت٣١٥٩/ مي٢٨٥٢]

* صحيح.

**لە مورەی هەمدانییەوە، دەربارەی ئایەتی: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا﴾، لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خەڵکی دێن بۆ لای ئاگر[1]، پاشان بە کارەکانیان لە ئاگر دەردەچن، یەکەمیان وەك تروکانی چاوە، پاشان وەك با، پاشان وەك غاری ئەسپ، پاشان وەك سواری وڵاخی بار، پاشان وەك تەکانی پیادەڕەو، پاشان وەك رۆیشتنی پیادەڕەو).**

---

[1] واتە:دەچنە لێواری ئاگر بەڵام ناخرێنە ناو ئاگرەوە، مەبەستی پەڕینەوەیە بەسەر پردی سیراتدا-و.

### ئایەتی: ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا﴾ [مريم: ٧٧]

٧٠١- (ق) عَنْ خَبَّابٍ قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً قَيْناً، وَكَانَ لِي عَلَى الْعَاصِي بْنِ وَائِلٍ دَيْنٌ، فَأَتَيْتُهُ أَتَقَاضَاهُ، فَقَالَ لِي: لاَ أَقْضِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ، قَالَ: قُلْتُ: لَنْ أَكْفُرَ بِهِ حَتَّى تَمُوتَ ثُمَّ تُبْعَثَ، قَالَ: وإِنِّي لَمَبْعُوثٌ مِنْ بَعْدِ الموْتِ؟ فَسَوْفَ أَقْضِيكَ إِذَا رَجَعْتُ إِلَى مالٍ وَوَلَدٍ. قَالَ: فَنَزَلَتْ: ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾﴾. [خ٤٧٣٥ (٢٠٩١)/ م٢٧٩٥]

**(ق) لە خەبابەوە، وتی: من پیاوێکی ئاسنگەر بووم، قەرزێکم هەبوو لەسەر عاصی کوڕی وائیل، هاتم بۆ لای تا لێی وەربگرمەوە، پێی وتم: بۆت ناگێڕمەوە تا بێباوەڕی بە محەمەد نیشان دەدەی، وتی: وتم: بێباوەڕی پێ نیشان نادەم تا تۆ دەمریت و زیندوو دەکرێیەوە، وتی: بۆچی من لەدوای مردن زیندوو دەکرێمەوە؟ گەر ماڵ و سامان و منداڵەکانم بۆ گەڕانەوە ئەوکات قەرزەکەت بۆ دەگێڕمەوە، وتی: ئایەت دابەزی:** ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾﴾.

## (٢١)

## سورة الأنبياء

### ئایەتی: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ [مريم: ٤٧]

٧٠٢- عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَجُلاً قَعَدَ بَيْنَ يَدَيْ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ لِي مَمْلُوكِينَ يُكَذِّبُونَنِي، وَيَخُونُونَنِي، وَيَعْصُونَنِي، وَأَشْتُمُهُمْ وَأَضْرِبُهُمْ، فَكَيْفَ أَنَا مِنْهُمْ؟ قَالَ: **(يُحْسَبُ مَا خَانُوكَ وَعَصَوْكَ وَكَذَّبُوكَ، وَعِقَابُكَ إِيَّاهُمْ، فَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ بِقَدْرِ ذُنُوبِهِمْ كَانَ كَفَافاً لاَ لَكَ وَلاَ عَلَيْكَ، وَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ دُونَ ذُنُوبِهِمْ كَانَ فَضْلاً لَكَ، وَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ فَوْقَ ذُنُوبِهِمْ اقْتُصَّ لَهُمْ مِنْكَ الْفَضْلُ)**.

قَالَ: فَتَنَحَّى الرَّجُلُ فَجَعَلَ يَبْكِي وَيَهْتِفُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَمَا تَقْرَأُ كِتَابَ اللهِ ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ﴾ الْآيَةَ)، فَقَالَ الرَّجُلُ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ! مَا أَجِدُ لِي وَلِهَؤُلَاءِ شَيْئاً خَيْراً مِنْ مُفَارَقَتِهِمْ، أُشْهِدُكُمْ أَنَّهُمْ أَحْرَارٌ كُلُّهُمْ. [ت٣١٦٥]

* صحيح الإسناد.

لە عائیشەوە: پیاوێك لە بەردەم پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، دوو بەندەی بەموڵککراوم هەن بەدرۆم دەزانن، و ناپاکیم لێ دەکەن، و لێم یاخی دەبن، منیش قسەیان پێ دەڵێم و لێیان دەدەم، حاڵی من لەوان چۆنە؟ فەرمووی: **(ئەوەی ناپاکییان لێکردوی و لێت یاخی بوون و بە درۆت دەزانن لەگەڵ سزاکەی تۆ بۆ ئەوان حساب دەکرێت، گەر سزاکەی تۆ بۆ ئەوان بە بڕی گوناهەکانیان بوو سەربەسەرە و نە بۆ تۆیە و نە لەسەر تۆیە، گەر سزاکەت بۆ ئەوان لە خوار گوناهەکانیانەوە بێت بۆ تۆ فەزڵە، گەر سزاکەت بۆیان لەسەرو گوناهەکانیانەوە بێت زیادەیەك لە تۆ وەردەگیرێت بۆ ئەوان).**

وتی: پیاوەکە کەناری گرت و دەستی بە گریان و هاوار کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: **(کتێبەکەی خودا ناخوێنییەوە: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ﴾، ئایەتەکە)**، پیاوەکە وتی: سوێند بە خودا، ئەی پێغەمبەری خودا، بۆ خۆم و بۆ ئەوانە شتێکی باشتر لە جیابوونەوەیان نابینمەوە، ئێوە دەکەم بە شاهید ئەوان هەموویان ئازادن.

### ئایەتی: ﴿فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَـٰتِ﴾ [مريم: ٨٧]

**٧٠٣**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَـٰتِ﴾ قَالَ: ظُلْمَةُ اللَّيْلِ، وَظُلْمَةُ بَطْنِ الحُوتِ، وَظُلْمَةُ البَحْرِ. [ك٣٤٤٥]

* قال الذهبي: على شرطهما.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی ڕازی بێت) دەربارەی ئایەتی: ﴿فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ﴾، وتی: تاریکی شەو و تاریکی سکی حوتەکە و تاریکی دەریاکە[1].

## (٢٢)

## سورة الحج

### ئایەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ﴾ [الحج: ١]

٧٠٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ نَزَلَتْ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ﴾ عَلى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ فِي مَسِيرٍ لَهُ، فَرَفَعَ بِهَا صَوْتَهُ حَتَّى ثَابَ إِلَيْهِ أَصْحَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: (أَتَدْرُونَ أَيُّ يَوْمٍ هذا؟ يَوْمَ يَقُولُ اللهُ جَلَّ وَعَلا لآدَمَ: قُمْ فَابْعَثْ بَعْثَ النَّارِ، مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمائةٍ وَتِسْعَةٍ وَتِسْعِينَ) ! فَكَبُرَ ذَلِكَ عَلى المسْلِمِينَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (سَدِّدُوا وَقَارِبُوا وَأَبْشِرُوا، فَوَالذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا أَنْتُمْ فِي النَّاسِ إِلاَّ كَالشَّامَةِ فِي جَنْبِ البَعِيرِ، أَوْ كَالرَّقْمَةِ فِي ذِرَاعِ الدَابَّةِ، وَإِنَّ مَعَكُمْ لَخَلِيقَتَيْنِ مَا كَانَتَا مَعَ شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ كَثَّرَتَاهُ: يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ، وَمَنْ هَلَكَ مِنْ كَفَرَةِ الجِنِّ وَالإِنْسِ). [حب ٧٣٥٤/ ك٦٧، ٨٦٩٢]

* إسناده على شرطهما (شعيب).

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: ئەم ئایەتە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ﴾، بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) دابەزی ئەو لە ڕۆیشتندا بوو، دەنگی خۆی بە ئایەتەکە بەرزکردەوە تا هاوەڵانی گەڕانەوە بۆ لای، پاشان فەرمووی: **(دەزانن ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ ڕۆژێك خودا(جل وعلا) بە ئادەم دەفەرموێت: هەستە نوێنەرانی ئاگر ڕەوانە بکە، لە هەر هەزارێك نۆسەد و نەوەد و نۆ)**، ئەوە لەسەر موسڵمانان گەورە و قورس بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ڕاست و دروست بن و نزیکببنەوە لە ڕاستی و دروستی و گەشبین بن، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، ئێوە لە**

[1] تەفسیری (الظلمات)ی بەو سێ تاریکییە کرد—و.

ناو خەڵکدا وەك خاڵێك[1] وان لە لاتەنیشتی حوشترێکدا، یان وەك نیشانەیەك لە دەستی ئاژەڵ، لەگەڵ ئێوە دوو دروستکراو هەن لەگەڵ هەر شتێك بن زۆری دەکەن، یاجووج و ماجووج و ئەوانەی تیاچوون لە بێباوەڕانی جن و ئینس).

## ئایەتی: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ﴾ [الحج: ١١]

**٧٠٥**– (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ﴾. قَالَ: كانَ الرَّجُلُ يَقْدَمُ المدِينَةَ، فَإِنْ وَلَدَتِ امْرَأَتُهُ غُلاماً، وَنُتِجَتْ خَيْلُهُ، قَالَ: هَذَا دِينٌ صَالِحٌ، وَإِنْ لَمْ تَلِدِ امْرَأَتُهُ وَلَمْ تُنْتَجْ خَيْلُهُ، قَالَ: هَذَا دِينُ سُوءٍ. [خ٤٧٤٢]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) وتی: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ﴾، وتی: پیاوێك دەهات بۆ مەدینە، گەر ژنەکەی کوڕی ببوایە و ماینەکەی بەری بدایە دەیوت: ئەمە دینێکی باشە، گەر ژنەکەی منداڵی نەبوایە و ماینەکەی بەری نەدایە دەیوت: ئەمە دینێکی خراپە.

## ئایەتی: ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍۭ بِظُلْمٍ﴾ [الحج: ٢٥]

**٧٠٦**– عن شُعْبَةَ، عَنِ السُّدِّيِّ أَنَّهُ سَمِعَ مُرَّةَ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللهِ . قَالَ لِي شُعْبَةُ: وَرَفَعَهُ وَلاَ أَرْفَعُهُ لَكَ . يَقُولُ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍۭ بِظُلْمٍ﴾؛ قَالَ: لَوْ أَنَّ رَجُلاً هَمَّ فِيهِ بِإِلْحَادٍ وَهُوَ بِعَدَنِ أَبْيَنَ، لأَذَاقَهُ اللهُ عزّ وجل عَذَاباً أَلِيماً. [حم٤٠٧١/ ك٣٤٦٠]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

لە شوعبەوە، لە سودییەوە، ئەو لە "مُرّة"ی بیستووە، گوێی لە عەبدولا بووە – شوعبە پێی وتم: ئەو بەرزی کردەوە[2]، بەڵام من بەرزی ناکەمەوە بۆ تۆ[3]–

---

[1] خاڵێك: واتە نیشانەیەك–و.

[2] واتە: خودا چیاکان لە دەوری مەککە دووربخاتەوە و شوێنەکەیان بکات بە دەشت و تیایدا ئاو و رووبار هەبێت و ئەوان زەوییەکان بکەن بە کشتوکاڵ–و.

[3] واتە: ئەو فەرموودەکەی بەرزکردەوە بەڵام من بەرزی ناکەمەوە–و.

دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ﴾، وتویەتی: گەر کەسێك تیایدا[1] خواستی ئیلحادی[2] بۆ دروست ببێت و ئەو لە "عەدەنی ئەبیەن[3]" بێت، خودا سزایەکی بەئێشی تووش دەکات.

## ئایەتی: ﴿وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ﴾ [الحج: ٢٧]

٧٠٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لما فَرَغَ إِبْرَاهِيمُ عليه السلام مِنْ بِنَاءِ البَيْتِ قَالَ: رَبِّ قَدْ فَرَغْتُ، فَقَالَ: أَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ، قَالَ: رَبِّ وَمَا يَبْلُغُ صوتي! قَالَ: أَذِّنْ وَعَلَيَّ الْبَلاَغُ، قَالَ: رَبِّ كَيْفَ أَقُولُ؟ قَالَ: يَاأَيُّهَا النَّاسُ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْحَجُّ، حَجُّ الْبَيْتِ الْعَتِيقِ، فَسَمِعَهُ مَنْ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، أَلاَ تَرَى أَنَّهُمْ يَجِيئُونَ مِنْ أَقْصَى الأَرْضِ يُلَبُّونَ.

[ك٣٤٦٤/ هق٥/١٧٦/ مخ١٠/١١]

* قال الذهبي: صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: کاتێك ئیبراهیم(علیه السلام) لە بیناکردنی بەیت لێبوویەوە، وتی: پەروەردگار، لێبوومەوە، خودا فەرمووی: بانگ بدە بە ناو خەڵکیدا بۆ حەج کردن، وتی: پەروەردگار، دەنگم ناگات، فەرمووی: تۆ بانگ بدێرە و گەیاندن لەسەر من، وتی: پەروەردگار، چی بڵێم؟ فەرمووی: "خەڵکینە، حەجتان لەسەر نووسراوە، حەجی ماڵە دێرینەکە"، ئەوەی لە نێوان ئاسمان و زەویدا بوو بیستی، نابینی لە دوورترین زەوییەوە دێن و "لبيك اللهم" دەکەن[4].

---

(١) واتە: لە کەعبەی موشەڕەفدا-و.

(٢) خواستی هەر گوناه و خراپە و لادان و تاوانێك-و.

(٣) شوێنێکە لە یەمەن-و.

(٤) واتە: وەڵامی بانگەکەی خودا دەدەنەوە لەسەر زمانی ئیبراهیم-و.

ئایەتی: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْ﴾ [الحج: ٣٩]

٧٠٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا أُخْرِجَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ مَكَّةَ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَخْرَجُوا نَبِيَّهُمْ، إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، لَيَهْلِكُنَّ، فَنَزَلَتْ ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ۝٣٩﴾ فَعَرَفْتُ أَنَّهُ سَيَكُونُ قِتَالٌ.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککە دەرکرا، ئەبوبەکر وتی: ئەوانە پێغەمبەرەکەی خۆیان دەرکرد، "إنا لله وإنا إليه راجعون"، ئەوانە تیادەچن، ئایەت دابەزی: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ۝٣٩﴾، زانیم جەنگان بەرپا دەبێت.

- وعند الترمذي: فقال أبو بكرٍ: لقد عَلِمتُ أنه سيكونُ قِتالٌ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَهِيَ أَوَّلُ آيَةٍ نَزَلَتْ فِي الْقِتَالِ. [ت٣١٧١/ ن٣٠٨٥]

* صحيح الإسناد.

لای ترمزی: ئەبوبەکر وتی: دەمزانی جەنگان روودەدات، ئیبن عەباس دەڵێت: ئەوە یەکەمین ئایەتێکە دەربارەی جەنگان دابەزیوە.

## (٢٣)

## سورة المؤمنون

ئایەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ﴾ [المؤمنون: ٦٠]

٧٠٩- عن عَائِشَةَ - زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم - قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ﴾، قَالَتْ عَائِشَةُ: أَهُمُ الَّذِينَ يَشْرَبُونَ الْخَمْرَ وَيَسْرِقُونَ؟ قَالَ: (لاَ يَا بِنْتَ الصِّدِّيقِ! وَلَكِنَّهُمُ الَّذِينَ يَصُومُونَ وَيُصَلُّونَ وَيَتَصَدَّقُونَ، وَهُمْ يَخَافُونَ أَنْ لاَ تُقْبَلَ مِنْهُمْ، أُولَئِكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ). [ت٣١٧٥/ جه٤١٩٨]

* صحيح.

لە عائیشەوە—هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)— وتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ﴾، عائیشە وتی: ئایا ئەوانە ئەو کەسانەن عارەق دەخۆنەوە و دزی دەکەن؟ فەرمووی: **(نەخێر، ئەی کچەکەی صدیق، بەڵکو ئەوانەن ڕۆژوو دەگرن و نوێژ دەکەن و صەدەقە ئەنجام دەدەن، لەگەڵ ئەوەش دەترسن لێیان قبووڵ نەکرێت، ئەوانە ئەو کەسانەن لە خێردا پێشبڕکێ دەکەن)**.

**ئایەتی: ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾ [المؤمنون: ١٠١]**

٧١٠– (خ) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِابْنِ عَبَّاسٍ: إِنِّي أَجِدُ فِي الْقُرْآنِ أَشْيَاءَ تَخْتَلِفُ عَلَيَّ.

قَالَ: ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾، ﴿وَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ٢٧﴾ [الصافات: ٢٧]، ﴿وَلَا يَكۡتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثٗا﴾ [النساء:٤٢]، ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشۡرِكِينَ ٢٣﴾[الأنعام:٢٣]، فَقَدْ كَتَمُوا فِي هَذِهِ الْآيَةِ.

وَقَالَ: ﴿أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا﴾، إلى قوله: ﴿دَحَىٰهَآ﴾ [النازعات:٢٧ . ٣٠]، فَذَكَرَ خَلْقَ السَّمَاءِ قَبْلَ خَلْقِ الْأَرْضِ، ثُمَّ قَالَ: ﴿أَئِنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ﴾، إلى ﴿طَآئِعِينَ﴾ [فصلت:٩ . ١١]، فَذَكَرَ فِي هَذِهِ خَلْقَ الْأَرْضِ قَبْلَ خَلْقِ السَّمَاءِ.

وَقَالَ: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ [النساء:٩٦]، ﴿عَزِيزًا حَكِيمٗا﴾ [النساء:٥٦]، ﴿سَمِيعَۢا بَصِيرٗا﴾ [النساء:٥٨]، فَكَأَنَّهُ كَانَ ثُمَّ مَضَى؟

فَقَالَ: ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ﴾ فِي النَّفْخَةِ الْأُولَى، ثُمَّ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ ﴿فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ﴾، ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ﴾، عِنْدَ ذَلِكَ ﴿وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾، ثُمَّ فِي النَّفْخَةِ الْآخِرَةِ ﴿وَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ٢٧﴾.

وَأَمَّا قَوْلُهُ: ﴿مَا كُنَّا مُشۡرِكِينَ﴾، ﴿وَلَا يَكۡتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثٗا﴾، فَإِنَّ اللهَ يَغْفِرُ لِأَهْلِ الْإِخْلَاصِ ذُنُوبَهُمْ، وَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: تَعَالَوْا نَقُولُ: لَمْ نَكُنْ مُشْرِكِينَ، فَخُتِمَ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ

فَتَنْطِقُ أَيْدِيهِمْ، فَعِنْدَ ذَلِكَ عُرِفَ أَنَّ اللهَ لاَ يُكْتَمُ حَدِيثاً، وَعِنْدَهُ ﴿يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ الْآيَةَ [النساء:٤٢].

وَخَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ، ثُمَّ خَلَقَ السَّمَاءَ، ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ فِي يَوْمَيْنِ آخَرَيْنِ، ثُمَّ دَحَا الْأَرْضَ، وَدَحْوُهَا: أَنْ أَخْرَجَ مِنْهَا الْمَاءَ وَالْمَرْعَى، وَخَلَقَ الْجِبَالَ وَالْجِمَالَ وَالْآكَامَ، وَمَا بَيْنَهَا فِي يَوْمَيْنِ آخَرَيْنِ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿دَحَىٰهَآ﴾، وَقَوْلُهُ: ﴿خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ﴾، فَجُعِلَتِ الْأَرْضُ وَمَا فِيهَا مِنْ شَيْءٍ فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ، وَخُلِقَتِ السَّمَاوَاتُ فِي يَوْمَيْنِ.

﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ سَمَّى نَفْسَهُ ذَلِكَ، وَذَلِكَ قَوْلُهُ؛ أَيْ: لَمْ يَزَلْ كَذَلِكَ، فَإِنَّ اللهَ، لَمْ يُرِدْ شَيْئاً إِلاَّ أَصَابَ بِهِ الَّذِي أَرَادَ. فَلاَ يَخْتَلِفْ عَلَيْكَ الْقُرْآنُ، فَإِنَّ كُلاًّ مِنْ عِنْدِ اللهِ.

[خ معلق. مقدمة سورة فصلت]

**(خ) لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، وتی: پیاوێك بە ئیبن عەباسی وت: من لە قورئاندا شتانێك دەبینمەوە "تختلف عليّ–لێم ئالۆز دەبن"[1].**

**وتی:** ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾، ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ﴾ [الصافات: ٢٧][2]،﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾ [النساء:٤٢]، ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾[الأنعام:٢٣][3]**، کەچی لەم ئایەتەدا شاردنەوەیان کرد.**

**هەروەها وتی:** ﴿ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ بَنَىٰهَا﴾، **تا ئایەتی:** ﴿دَحَىٰهَآ﴾ [النازعات:٢٧ ـ ٣٠]، **باس لە دروست کردنی ئاسمان دەکات بەر لە دروست کردنی زەوی، پاشان**

---

[1] **واتە: ناجۆریم لا دروست دەکەن–و.**

[2] **واتە: لە ئایەتەکەی (١٠١)ی سورەتی (المؤمنون) فەرمووی: (ولا یتساءلون)، کەچی لە ئایەتەکەی (٢٧)ی سورەتی (الصافات) دەفەرموێ: (فأقبل بعضهم على بعض یتساءلون)؟–و.**

[3] **واتە: لە ئایەتەکەی (٤٢)ی سورەتی (النساء) فەرمووی: (ولا یکتمون الله حدیثا)، کەچی لە ئایەتەکەی (٢٣)ی سورەتی (الأنعام) درۆ دەکەن و بە خەیاڵی خۆیان قسە و کردەوەیان لە خودا دەشارنەوە و سوێند دەخۆن و دەڵێن: (سوێند بە خودا، پەروەردگار، ئێمە هاوەڵدانەر نەبووین) هاوەڵدانەریش بوون؟–و.**

فەرمووی: ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ﴾، تا ئایەتی: ﴿طَائِعِينَ﴾ [فصلت:٩ - ١١]، لەمەدا باس لە دروست کردنی زەوی دەکات بەر لە دروست کردنی ئاسمان[(١)].

هەروەها خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[النساء:٩٦][(٢)]، هەروەها: ﴿عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ [النساء:٥٦]، هەروەها: ﴿سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ [النساء:٥٨]، وەك ئەوەی لە رابردوودا خودا بەو جۆرە بووبێت و پاشان تێپەڕی بێت؟!!.

ئیبن عەباس وتی: ﴿فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ﴾: لە نەفخەی یەکەمدایە، پاشان فوو بە کەڕەنادا دەکرێتەوە: ﴿فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ﴾، لەو بارەدا ﴿فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ﴾، رەچەڵەك لە نێوانیان نییە و ﴿وَلَا يَتَسَاءَلُونَ﴾، پرسیار لە یەکتر ناکەن، پاشان لە دوایین نەفخەدا ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾، هەندێکیان روو لە هەندێکیان دەکەن و لەیەکتر دەپرسن[(٣)]، ئەوەش کە دەفەرموێت: ﴿مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾، لەگەڵ ئەوەی دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا﴾، کاتێك خودا لە گوناهی ئەهلی ئیخلاص خۆشدەبێت، هاوەڵدانەران دەڵێن: وەرن با ئێمەش بڵێین: ئێمە هاوەڵدانەر نەبووین، بۆیە خودا مۆر دەدات لە دەمیان، ئەندامەکانیان دێنە قسە بە کاروکردەوەکان، لەو بارەدا دەزانرێت قسە لە خودا

---

(١) واتە: لە ئایەتەکانی سورەتی (النازعات) باس لە دروستکردنی ئاسمان دەکات بەر لە دروستکردنی زەوی، کەچی لە ئایەتەکانی سورەتی(فصلت) باس لە دروستکردنی زەوی دەکات بەر لە دروستکردنی ئاسمان؟-و.

(٢) واتە: پرسیارەکەی دەربارەی هاتنی (کان) بوو کە مانای رابردووی هەیە، وەك بڵێت: بۆچی خودا دەفەرموێت: (خودا بەو جۆرە بووە)، بۆچی نافەرموێت: (خودا بەو جۆرەیە)، لە کاتێکدا ناو و سیفەتەکانی خودا هەمیشەیین و تیاچوون روویان لێ ناکات؟-و.

(٣) ئەمە وەڵامی پرسیاری یەکەمی کەسەکەیە لە ئیبن عەباس-و

شاراوە نییە، بۆیە ﴿يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ [النساء:٤٢]، ئەوانەی بێباوەڕ بوون ئاوات دەخوازن موسڵمان بوونایە[١].

خودا زەوی بە دوو ڕۆژ دروست کرد[٢]، پاشان ئاسمانی دروست کرد[٣]، پاشان لەسەر ئاسمان ئیستیوای کرد و لە دوو ڕۆژی تردا حەوت ئاسمانی ڕێکخست(فسواهن)[٤]، پاشان لە دوو ڕۆژی تردا زەوی خڕ کرد، واتە زەوی ڕاخست و ئاو و لەوەڕگای لێوە دەرهێنا و چیا و درەخت و گرد و ئەوەی لە نێوانیاندایە دروست کرد[٥]، ئەوەش ئایەتی: ﴿دَحَىٰهَآ﴾ و ﴿خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ﴾ە، بۆیە زەوی و ئەوەی تێیدایە لە چوار ڕۆژدا ئامادەکرا و ئاسمانیش لە دوو ڕۆژدا دروستکرا[٦].

ئەوەش کە دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾، خودا بۆ خۆی بەو جۆرە ناوی خۆی هێناوە[٧]، ئەوەش فەرموودەی ئەوە، واتە: بەردەوام و لە داهاتووشدا بەهەمان

---

(١) ئەمە وەڵامی پرسیاری دووەمی کەسەکەیە–و

(٢) ئەوەی ئایەتەکانی سورەتی (فصلت) باسی دەکەن لە دروستکردنی زەوی بەر لە دروستکردنی ئاسمان لەو دوو ڕۆژەدایە–و.

(٣) ئەوەی ئایەتەکانی سورەتی (فصلت) باسی دەکەن لە دروستکردنی زەوی بەر لە دروستکردنی ئاسمان لەو دوو ڕۆژەدایە–و.

(٤) پاش دروستکردنی ئاسمان لە دوو ڕۆژدا ماددە و کەرەستەی ئاسمانی بۆ حەوت ئاسمان دابەش کرد و جیاکردەوە و ڕێکخست، واتە یەکەمجار کەرەستە و ماددەی هەموو ئاسمانەکانی دروست کرد، ئەوجا ڕێکیخست و دابەشی کرد بۆ حەوت ئاسمان–و.

(٥) دوای ڕێکخستنی حەوت ئاسمانەکان لە دوو ڕۆژی تردا زەوی ڕاخست و ئاو و لەوەڕگای لێوە دەرهێنا و چیا و درەخت و گرد و ئەوەی لە نێوانیاندایە دروست کرد، کەوابوو: دوو ڕۆژ دروستکردنی زەوی و دوو ڕۆژ دروستکردنی ماددەی ئاسمانەکان و ڕێکخستن و دابەش کردنیان بۆ حەوت ئاسمان، پاشان دوو ڕۆژی تر ئامادەکردنی شتەکان لە زەویدا، هەمووی دەکاتە شەش ڕۆژ–و.

(٦) ئەمە وەڵامی پرسیاری سێیەمی کەسەکەیە–و

(٧) واتە: ئەو خودایە و چۆنی بوێت بەو جۆرە وەسفی خۆی دەکات، خودا هەر ئەو خودایە قورئانی دابەزاندووە و لەو کتێبەدا وەسفی خۆی دەکات، ڕابردوو و کاتی دابەزینی قورئان و داهاتووش ئەو خاوەنی ئەو سیفەتە بەرز و بڵندایە–و

شێوەیە[1]، خودا هەر شتێكی ویستبێت بەدیهێناوە بەوەی ویستوویەتی[2]، هاوار بە حاڵت دژیەكی و ناتەبایت لە قورئاندا بۆ دروست نەبێت، چونكە هەمووی لای خوداوەیە.

## (٢٤)

## سورة النور

### ئایەتی: ﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ﴾ [النور: ١٥]

٧١١- (خ) عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عائِشَةَ ﵂: كانَتْ تَقْرَأُ: ﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ﴾، وَتَقُولُ: الْوَلْقُ الْكَذِبُ.

قَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: وَكَانَتْ أَعْلَمَ مِنْ غَيْرِهَا بِذلِكَ؛ لأَنَّهُ نَزَلَ فِيهَا. [خ٤١٤٤]

(خ) لە ئیبن ئەبی مولەیكەوە، لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): ئەو ئەمەی دەخوێندەوە: ﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ﴾، دەیوت "الولق" بریتییە لە درۆ.

ئیبن ئەبی مولەیكە وتی: ئەو[3] لەوەدا زاناتر بوو لە كەسانی تر، چونكە دەربارەی ئەو دابەزی بوو[4].

### ئایەتی: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ﴾ [النور: ٣١]

٧١٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ﴾ الْآيَةَ، فَنُسِخَ وَاسْتُثْنِيَ مِنْ ذَلِكَ: ﴿وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا﴾ الْآيَةَ [النور: ٦٠]. [د٤١١١]

* صحيح الإسناد.

---

(١) ئەمە وەڵامی پرسیاری چوارەمی كەسەكەیە-و

(٢) واتە: بڕیاری پێشینەی خودا لە ئەزەلەوە بۆ هەموو شتەكان گۆڕانی بەسەردا نایەت، لە ئەزەلدا بڕیاری دابێت بۆ كەسێك لێبوردە و بە بەزەیی بێت لە داهاتوودا بەو جۆرە دەبێت و گۆڕانی بەسەردا نایەت-و

(٣) واتە: عائیشە-و

(٤) چونكە ئایەتەكان دەربارەی ئەو درۆ و بوختانە بوو بۆ خاتوو عائیشەیان هەڵبەست-و

لە ئیبن عەباسەوە: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ﴾، نەسخکرایەوە، لەوەش ئەمە هەڵواردنی بۆ کرا: ﴿وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا﴾[النور:٦٠].

## ئایەتی: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ [النور: ٣١]

**٧١٣**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ قَالَ: لاخَلْخَالَ ولا شَنْفَ وَلاقِرْطَ وَلا قِلادَةَ ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ قَالَ: الثِّيَابُ. [ك٣٥٠١]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت): ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾، نە پاوانە و نە خشڵی هەڵواسراو بە گوێ و نە گوارەی گوێ و نە گەردانە[1]، ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾، وتی: پۆشاك[2].

## ئایەتی: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ [النور: ٣١]

**٧١٤**- (خ) عَنْ عائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: يَرْحَمُ اللهُ نِسَاءَ المهَاجِرَاتِ الأُوَلَ، لَمَّا أَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾؛ شَقَّقْنَ مُرُوطَهُنَّ فَاخْتَمَرْنَ بِهَا. [خ٤٧٥٨]

(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: خودا رەحم بە ئافرەتە کۆچکەرە پێشەنگەکان بکات، کاتێك خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾، پۆشاکەکانیان دەدڕی و سینەی خۆیان پێ دادەپۆشی.

---

[1] واتە: هیچ کاك لەوانە نابێت دەربخات، چونکە ئەوانە بریتین لە (زینة)-و

[2] واتە: (ما ظهر منها-ئەوەی دەبێت دەربکەوێ و توانای شاردنەوەی نییە) بریتییە لە پۆشاك-و

**ئایەتی: ﴿وَلَا تُكۡرِهُواْ فَتَيَٰتِكُمۡ عَلَى ٱلۡبِغَآءِ﴾ [النور: ٣٣]**

**٧١٥-** (م) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ جَارِيَةً لِعَبْدِ اللهِ بْنِ أُبَيِّ ابْنِ سَلُولَ يُقَالُ لَهَا: مُسَيْكَةُ، وَأُخْرَى يُقَالُ لَهَا: أُمَيْمَةُ، فَكَانَ يُكْرِهُهُمَا عَلَى الزِّنَى، فَشَكَتَا ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَنْزَلَ اللهُ ﴿وَلَا تُكۡرِهُواْ فَتَيَٰتِكُمۡ عَلَى ٱلۡبِغَآءِ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾. [م٣٠٢٩]

**(م) لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە: جاریەیەكی عەبدوڵای كوڕی ئوبەی كوڕی سەلوول پێی دەوترا: "مُسَيْكَة"، جاریەیەكی تری پێی دەوترا: "أُمَيْمَة"، ئەو ناچاری دەكردن لەسەر زیناكردن، لای پێغەمبەر(ﷺ) سكاڵای ئەوەیان كرد، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿وَلَا تُكۡرِهُواْ فَتَيَٰتِكُمۡ عَلَى ٱلۡبِغَآءِ﴾، تا ﴿غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾.**

**٧١٦-** عن مُعْتَمِرِ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِيهِ: ﴿وَمَن يُكۡرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعۡدِ إِكۡرَٰهِهِنَّ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾، قَالَ: قَالَ سَعِيدُ بْنُ أَبِي الْحَسَنِ: غَفُورٌ لَهُنَّ: الْمُكْرَهَاتُ. [د٢٣١٢]

* صحيح مقطوع.

**لە موعتەمیری كوڕی سولەیمانەوە، لە باوكییەوە: ﴿وَمَن يُكۡرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعۡدِ إِكۡرَٰهِهِنَّ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾، وتی: سەعیدی كوڕی ئەبی حەسەن وتی: خودا بۆ ئافرەتە ناچاركراوەكان "غفور-لێخۆشبوو"ە[1].**

**ئایەتی: ﴿وَلَا تُكۡرِهُواْ فَتَيَٰتِكُمۡ عَلَى ٱلۡبِغَآءِ﴾ [النور: ٥٨]**

**٧١٧-** عَنْ عِكْرِمَةَ: أَنَّ نَفَراً مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ قَالُوا: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، كَيْفَ تَرَى فِي هَذِهِ الْآيَةِ الَّتِي أُمِرْنَا فِيهَا بِمَا أُمِرْنَا، وَلاَ يَعْمَلُ بِهَا أَحَدٌ؛ قَوْلُ اللهِ عزّ وجل: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِيَسۡتَـٔۡذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَبۡلُغُواْ ٱلۡحُلُمَ مِنكُمۡ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٖۚ مِّن قَبۡلِ صَلَوٰةِ ٱلۡفَجۡرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعۡدِ صَلَوٰةِ ٱلۡعِشَآءِۚ ثَلَٰثُ

---

[1] **واتە: خودا (غفور رحيم)ە بۆ كەنیزەكە ناچاركراوەكان بە زینا، نەك (غفور رحيم) بۆ خاوەنەكانیان كە ناچاریان دەكەن بە زینا-و**

عَوْرَاتٍ لَّكُمْۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّۚ طَوَّافُونَ عَلَيْكُم﴾، قَرَأَ الْقَعْنَبِيُّ إِلَى: ﴿عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّ اللهَ حَلِيمٌ رَحِيمٌ بِالْمُؤْمِنِينَ يُحِبُّ السَّتْرَ، وَكَانَ النَّاسُ لَيْسَ لِبُيُوتِهِمْ سُتُورٌ وَلاَ حِجَالٌ، فَرُبَّمَا دَخَلَ الْخَادِمُ أَوْ الْوَلَدُ، أَوْ يَتِيمَةُ الرَّجُلِ، وَالرَّجُلُ عَلَى أَهْلِهِ، فَأَمَرَهُمُ اللهُ بِالاِسْتِئْذَانِ فِي تِلْكَ الْعَوْرَاتِ، فَجَاءَهُمُ اللهُ بِالسُّتُورِ وَالْخَيْرِ، فَلَمْ أَرَ أَحَداً يَعْمَلُ بِذَلِكَ بَعْدُ. [د٥١٩٢]

* موقوف، حسن الإسناد.

لە عیکریمەوە: چەند کەسێك لە ئەهلی عێراق وتیان: ئەی ئیبن عەباس، ئەم ئایەتە چۆن دەبینی کە تیایدا فەرمانمان پێکراوە بەوەی فەرمانمان پێکراوە و هیچ کەس کاری پێ ناکات، فەرموودەی خودا(عز وجل): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُواْ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍۚ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِۚ ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم﴾، "الْقَعْنَبِيُّ" تا ﴿عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ی خوێندەوە.

ئیبن عەباس وتی: خودا حەلیم و رەحیمە بە باوەڕداران و داپۆشینی پێخۆشە، خەڵکی داپۆشین و پەردەی نەبوو، لەوانەیە خزمەتکار یا منداڵ، یان منداڵی کچی بێباب کە لای پیاوێك بوو بچوویانایەتە ژوورەوە، و پیاوەکە لەسەر هاوسەرەکە(خانەوادەکە)ی بوایە، بۆیە خودا(سبحانە وتعالی) فەرمانی پێکردن بە مۆڵەت وەرگرتن لەو سێ کاتی عەورەتەدا، خودا داپۆشین و خێری بۆ هێنان، ئێستا کەسێك نابینم بەوە کار بکات[1].

---

[1] چونکە ژیانی سادەیان گۆڕانی بەسەردا هات و ماڵ و خانوو بەرین کرا و ژووری زۆری لێ دروستکرا و دەرگا و قاپی و قوفڵ و کێلۆن بۆ ژوورەکان دانران و پیاو لەگەڵ خانەوادەی خۆی دەیتوانی داپۆشراو بێت و کەس نەیان بینێت–و

**ئایەتی: ﴿أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ﴾ [النور: ٦٠]**

**٧١٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ﴾. قال: هي الجلابيب. [مخ١٣/٢١]

* إسناده حسن.

**لە ئیبن عەباسەوە: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ﴾، وتی: ئەوە بریتییە لە "الجلابیب"[1].**

**(٢٥)**

**سورة الفرقان**

**ئایەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ﴾ [الفرقان: ٣٤]**

**٧١٩-** (ق) عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، كَيْفَ يُحْشَرُ الْكافِرُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: **(أَلَيْسَ الَّذِي أَمْشَاهُ عَلَى الرِّجْلَيْنِ فِي الدُّنْيَا قادِراً عَلَى أَنْ يُمْشِيَهُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)**.

قَالَ قَتَادَةُ: بَلَى وَعِزَّةِ رَبِّنَا. [خ٤٧٦٠/ م٢٨٠٦]

**(ق) لە قەتادەوە، لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە(خوا لێی رازی بێت): پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، لە ڕۆژی قیامەت بێباوەڕ چۆن لەسەر روویان حەشر دەكرێن؟ فەرمووی: (ئایا ئەو كەسەی لە دنیا لەسەر دوو لاق دەیبات بەڕێوە ناتوانێت لە ڕۆژی قیامەت لەسەر روخساری بیبات بەڕێوە؟!).**

**قەتادە وتی: با، بە عیززەتی پەروەردگارمان.**

---

[1] كۆی وشەی (جلباب)ە كە بریتییە لە كراس، پۆشاكی دەرەدامان، سەرپۆشاك، سەرپۆشی شۆڕبووەوە بۆ سەر سینە-و.

(٢٦)

## سورة الشعراء

**ئایەتی: ﴿وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُمْ﴾ [الشعراء: ١٦٦]**

٧٢٠- عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم﴾. قَالَ: هُوَ ـ وَاللهِ ـ الْقُبُلُ. [مي١١٦٣]

* إسناده حسن.

**لە موجاهیدەوە: ﴿وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم﴾، وتی: سوێند بە خودا ئەوە پێشەوەیە[1].**

**ئایەتی: ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ﴾ [الشعراء: ٢٢٤]**

٧٢١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾﴾، فَنَسَخَ مِنْ ذَلِكَ وَاسْتَثْنَى، فَقَالَ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ [الشعراء:٢٢٧]. [د٥٠١٦]

* حسن الإسناد.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾﴾، لەوەی نەسخ کردەوە و هەڵواردنی بۆ کرد و فەرمووی: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ [الشعراء:٢٢٧].**

---

[1] مەبەستی داوێنی ئافرەتە-و.

(٢٨)

## سورة القصص

### ئایەتی: ﴿فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ﴾ [القصص: ٢٥]

**٧٢٢**–عَنْ عُمَرَ ﷺ: ﴿فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ﴾ قَالَ: كانت تجيء وهي خَرَّاجةٌ وَلأَّجةٌ واضعةٌ يدها على وجهها، فقام معها موسى وقال لها: امشي خَلْفي وانعتي لي الطريق، وأنا أمشي أمامكِ فإنا لا ننظرُ في أَدْبارِ النساء. ثم قالت: ﴿يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ٢٦﴾ لِما رأَتْه من قوته ولقوله لها ما قال، فزاده ذلك فيه رغبة. فقال: ﴿قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ٢٧﴾؛ أي: في حُسْنِ الصحبة والوفاء بما قلتُ، قال موسى: ﴿قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَۖ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ﴾ قال: نعم، قال: ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ٢٨﴾ [القصص:٢٥ ـ ٢٨] فَزَوَّجَه، وأقام معه يَكفيه، ويعمل له في رعاية غَنمه، وما يحتاج إليه منه، وزوَّجَه صفورة أو أختها شرقاء وهما اللتان كانتا تَذُودَان. [ك٣٥٣٠]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە عومەرەوە(خوا لێی رازی بێت): ﴿فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ﴾، ئەو دەهات، دەهاتە دەرەوە و دەچووە ژوورەوە و دەستی لەسەر روخساری دانابوو، موسا لەگەڵی هەستا و پێی وت: لە دوامەوە وەرە و رێگەکەم بۆ وەسف بکە، منیش لە پێشتەوە دەڕۆم، ئێمە تەماشای دوای ئافرەت ناکەین، پاشان ئافرەتەکە وتی: ﴿يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ٢٦﴾، کاتێك هێزی موسای بینی[١] و ئەو قسەی لێ بیست کە پێی وت[٢]، ئەوەش حەزی زۆرتری تیادا دروست**

---

[١] واتە: کاتێك هێزی موسای بینی لە لادانی تاشە بەردەکە لەسەر دەمی بیرەکە ئافرەتەکە زانی کەسێکی بەهێزە–و

[٢] ئەو قسەی کە وتی: ئێمە لەدوای ئافرەتەوە ناڕۆین، بۆی دەرکەوت کەسێکی ئەمینە–و

کرد، بۆیه باوکی وتی: ﴿قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ۝٢٧﴾، واته له باشی و چاکی هاوەڵی و وەفا بەوەی وتم[(١)]، موسا وتی: ﴿قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَۖ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ﴾، وتی: باشه، موسا وتی: ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ۝٢٨﴾[القصص:٢٥ . ٢٨]، بۆیه کچەکەی کردە هاوسەری، ئەوەندەی پێویست بێت لەگەڵی مایەوە و کاری شوانی مەڕەکانی بۆ دەکرد و ئەوەی ئەو[(٢)] ئاتاج بوو بە ئەنجامدانی لە لایەن موساوە بۆی ئەنجام "صفورة" یان خوشکەکەی "شرقاء"ی لێ مارە کرد، ئەو دوانە ئەو دوو کەسە بوون بەری ئاژەڵەکانیان گرتبوو.

## ئایەتی: ﴿أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ﴾ [القصص: ٢٨]

**٧٢٣**– (خ) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سَأَلَنِي يَهُودِيٌّ مِنْ أَهْلِ الْحِيرَةِ: أَيَّ الأَجَلَيْنِ قَضى مُوسى؟ قلْتُ: لاَ أَدْرِي، حَتَّى أَقْدَمَ عَلَى حَبْرِ الْعَرَبِ فَأَسْأَلَهُ، فَقَدِمْتُ فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَقَالَ: قَضى أَكْثَرَهُمَا وَأَطْيَبَهُمَا، إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا قَالَ فَعَلَ. [خ٢٦٨٤]

(خ) له سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، وتی: یەهودییەکی ئەهلی حیرە پرسیاری لێکردم: موسا کام لە دوو وادەکەی تەواو کرد؟ وتم: نازانم، تا دەچم بۆ لای حەبری عەرەب و پرسیاری لێ دەکەم، هاتم و پرسیارم لە ئیبن عەباس کرد، وتی: زۆرینەکە و باشترەکەی ئەنجامدا، پێغەمبەری خودا[(٣)] گەر بڵێت ئەنجام دەدات.

---

(١) واته لە باشی و چاکی هاوەڵی کردن و وەفا بەوەی وتم إنشاء الله لە صالحان و چاکان دەبم–و

(٢) واته: باوکی دوو کچەکە–و

(٣) پێغەمبەری خودا: مەبەستی هەر پێغەمبەرێکە خودا پەیامی بۆ ناردبێت، نەک پێغەمبەرێکی تایبەت–د.

### ئایەتی: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ﴾ [القصص: ٥٦]

**٧٢٤-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِعَمِّهِ: (**قُلْ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ**)، قَالَ: لَوْلاَ أَنْ تُعَيِّرَنِي قُرَيْشٌ، يَقُولُونَ: إِنَّمَا حَمَلَهُ عَلَى ذلِكَ الْجَزَعُ، لأَقْرَرْتُ بِهَا عَيْنَكَ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ﴾. [م٢٥]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە مامی خۆی فەرموو: (**بڵێ: "لا إله إلا الله" لە ڕۆژی قیامەت بەوە شایەتیت بۆ دەدەم**)، وتی: گەر قورەیش تانەیان لێنەدابام، بڵێن: ترس و نیگەرانی هەڵینا بۆ وتنی ئەوە[1]، چاوی تۆم پێ ڕۆشن دەکردەوە، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ﴾.

### ئایەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾ [القصص: ٨٥]

**٧٢٥-** (خ) عَنِ ابنِ عباس ﴿لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾. قَالَ: إِلى مكة. [خ٤٧٧٣]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە ﴿لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾، وتی: بۆ مەككە[2].

## (٢٩)

## سورة العنكبوت

### ئایەتی: ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ﴾[العنكبوت: ٢٨]

**٧٢٦-** عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ: ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، قَالَ: مَا نَزَا ذَكَرٌ عَلَى ذَكَرٍ، حَتَّى كَانَ قَوْمُ لُوطٍ. [مي١١٧٩]

* إسناده صحيح.

---

[1] واتە: ترس و نیگەرانی سەرەمەرگ-و

[2] واتە: "معاد" مانای مەككەی هەیە-و

لە عەمری کوڕی دینارەوە: ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ الْعَالَمِينَ﴾، وتی: هیچ نێرێك لە هیچ نێرێك نەپەڕیوە تا سەردەمی قەومی "لوط".

(٣٠)

## سورة الروم

### ئایەتی: ﴿الم ۝ غُلِبَتِ الرُّومُ ۝﴾ [الروم: ١ - ٢]

٧٢٧- عَنْ سعيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿الم ۝ غُلِبَتِ الرُّومُ ۝ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ﴾. قَالَ: غُلِبَتْ وَغَلَبَتْ، قَالَ: كَانَ الْمُشْرِكُونَ يُحِبُّونَ أَنْ يَظْهَرَ أَهْلُ فَارِسَ عَلَى الرُّومِ، لِأَنَّهُمْ وَإِيَّاهُمْ أَهْلُ الْأَوْثَانِ، وَكَانَ الْمُسْلِمُونَ يُحِبُّونَ أَنْ يَظْهَرَ الرُّومُ عَلَى فَارِسَ، لِأَنَّهُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ، فَذَكَرُوهُ لِأَبِي بَكْرٍ، فَذَكَرَهُ أَبُو بَكْرٍ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَمَا إِنَّهُمْ سَيَغْلِبُونَ**)، فَذَكَرَهُ أَبُو بَكْرٍ لَهُمْ، فَقَالُوا: اجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ أَجَلاً، فَإِنْ ظَهَرْنَا كَانَ لَنَا كَذَا وَكَذَا، وَإِنْ ظَهَرْتُمْ كَانَ لَكُمْ كَذَا وَكَذَا، فَجَعَلَ أَجَلاً خَمْسَ سِنِينَ فَلَمْ يَظْهَرُوا، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**أَلاَ جَعَلْتَهُ إِلَى دُونَ** - قَالَ: أُرَاهُ - **الْعَشْرِ**)، قَالَ سَعِيدٌ: وَالْبِضْعُ مَا دُونَ الْعَشْرِ، قَالَ: ثُمَّ ظَهَرَتِ الرُّومُ بَعْدُ. قَالَ: فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿الم ۝ غُلِبَتِ الرُّومُ ۝﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ ۝ بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ مَن يَشَاءُ﴾.

قَالَ سُفْيَانُ: سَمِعْتُ أَنَّهُمْ ظَهَرُوا عَلَيْهِمْ يَوْمَ بَدْرٍ. [ت٣١٩٢]

* صحيح.

لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لە ئیبن عەباسەوە دەربارەی فەرموودەی خودا(سبحانه وتعالى): ﴿الم ۝ غُلِبَتِ الرُّومُ ۝ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ﴾، وتی: "غُلِبَتْ- ژێرکەوت" و "غَلَبَتْ-سەرکەوت"، وتی: هاوەڵدانەران پێیانخۆش بوو ئەهلی فارس بەسەر ئەهلی ڕۆمدا سەربکەون، چونکە ئەوان لەگەڵ ئەوان[1] ئەهلی بتپەرستی بوون،

[1] واتە: چونکە هاوەڵدانەران لەگەڵ فارس ئەهلی بتپەرستی بوون-و

موسڵمانان پێیانخۆش بوو رۆم بەسەر بە فارسدا سەربکەون، چونکە ئەهلی کیتا بوون، ئەوەیان بۆ ئەبوبەکر باس کرد، ئەبوبەکر ئەوەی بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) باس کرد، پێغەمبەر فەرمووی: **(ئەوان سەرکەوتن بەدەستدەهێننەوە)**، ئەبوبەکر ئەوەی بۆ ئەوان[1] باس کرد، وتیان: وادەیەك لە نێوان و ئێمە و خۆت دابنێ، گەر ئێمە سەرکەوتین ئەوە و ئەوەمان بۆ هەیە، گەر ئێوە سەرکەوتن ئەوە و ئەوەتان بۆ هەیە، وادەی پێنج ساڵی دانا ئەوان سەرنەکەوتن، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد، فەرمووی: **(بۆ نەتکرد بە کەمتر لە–وتی پێموایە– "دە")**، سەعید دەڵێت: "البضع" لە خوار (دە)وەیە، وتی: پاشان رۆم سەرکەوتنی بەدەستهێنا، ئەوەش فەرموودەی خودایە(سبحانه وتعالی): ﴿الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢﴾ تا ئایەتی: ﴿يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ﴾.

سوفیان وتی: بیستوومە رۆم لە رۆژی بەدردا سەرکەوتن بەسەریاندا[2].

## (٣١)

## سورة لقمان

### ئایەتی: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ﴾ [لقمان: ٦]

**٧٢٨–** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تَبِيعُوا الْقَيْنَاتِ وَلاَ تَشْتَرُوهُنَّ، وَلاَ تُعَلِّمُوهُنَّ، وَلاَ خَيْرَ فِي تِجَارَةٍ فِيهِنَّ، وَثَمَنُهُنَّ حَرَامٌ)** فِي مِثْلِ هَذَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ.

[ت١٢٨٢، ٣١٩٥/ جه٢١٦٨]

* حسن.

---

[1] واتە: بۆ هاوەڵدانەران–و

[2] واتە: سەرکەوتن بەسەر فارسدا–و

لە ئەبی ئومامەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، فەرمووی: **(جاریەی گۆرانیبێژ مەفرۆشن و مەکڕن، و فێریان مەکەن، خێر نییە لە بازرگانی ئەوانەدا، نرخەکانیان حەرامە)**، لە نموونەی ئەوە ئەم ئایەتە دابەزیوە: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، تا کۆتایی ئایەتەکە.

**(٣٢)**

**سورة السجدة**

### ئایەتی: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ﴾ [السجدة: ١٦]

**٧٢٩**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ فِي هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ١٦﴾. قَالَ: كَانُوا يَتَيَقَّظُونَ مَا بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ يُصَلُّونَ.

وَكَانَ الْحَسَنُ يَقُولُ: قِيَامُ اللَّيْلِ. [د١٣٢١/ ت٣١٩٦]

* صحيح.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ١٦﴾، وتی: لە نێوان مەغریب و عیشا ئامادە دەبوون و نوێژیان دەکرد.

حەسەن دەیوت: شەونوێژە.

### ئایەتی: ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ دُونَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَكۡبَرِ﴾ [السجدة: ١٦]

**٧٣٠**- (م) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ دُونَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَكۡبَرِ﴾. قَالَ: مَصَائِبُ الدُّنْيَا، وَالرُّومُ، وَالْبَطْشَةُ، أَوِ الدُّخَانُ . شُعْبَةُ الشَّاكُّ فِي الْبَطْشَةِ أَوِ الدُّخَانِ.. [م٢٧٩٩]

(م) لـە ئوبـەی کـوڕی کەعبـەوە، دەربـارەی ئایـەتی: ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ﴾، وتـی[1]: موسیبەتەکانی دنیا، و ڕۆم، و دەستوەشاندن(البطشة) یان دووکەڵەکە(الدخان)-شوعبە لە دەستوەشاندنەکە یان دووکەڵەکە شکی بۆ دروستبووە-[2].

## (٣٣)

## سورة الأحزاب

### ئایەتی: ﴿ٱدْعُوهُمْ لِآبَآئِهِمْ﴾ [الأحزاب: ٥]

**٧٣١**- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ . مَوْلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم . ما كُنَّا نَدْعُوهُ إِلاَّ زَيْدَ بْنَ مُحَمَّدٍ، حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ: ﴿ٱدْعُوهُمْ لِآبَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ﴾. [خ٤٧٨٢/ م٢٤٢٥]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): زەیدی کوڕی حاریسە- مەولای پێغەمبەری خودا(ﷺ)- تەنها بە زەیدی کوڕی محەمەد بانگمان دەکرد، تا قورئان دابەزی: ﴿ٱدْعُوهُمْ لِآبَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ﴾.

### ئایەتی: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ﴾ [الأحزاب: ٣٥]

**٧٣٢**- عَنْ أُمِّ عُمَارَةَ الْأَنْصَارِيَّةِ: أَنَّهَا أَتَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: مَا أَرَى كُلَّ شَيْءٍ إِلاَّ لِلرِّجَالِ، وَمَا أَرَى النِّسَاءَ يُذْكَرْنَ بِشَيْءٍ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾. [ت٣٢١١]

* صحيح الإسناد.

---

[1] واتە: "العذاب الأدنى" بریتییە لەو سێ شتە-و

[2] مەبەست بە دەستوەشان(البطشة) ئەم ئایەتەیە: ﴿يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنْتَقِمُونَ﴾الدخان: ١٦، مەبەست بە دووکەڵەکە(الدخان) ئەم ئایەتەیە: ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ﴾ الدخان: ١٠-و.

**لە ئوم عەمارەی ئەنصارییەوە: ئەو هـات بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ) و وتـی: هەرچـی شتە بۆ پیاوان دەبینم، نابینم ئافرەتان بە شتێك بـاس بكـرێن، ئـەم ئایەتـە دابـەزی: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾.**

**٧٣٣-** عن أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا لَنَا لاَ نُذْكَرُ فِي الْقُرْآنِ كَمَا يُذْكَرُ الرِّجَالُ؟ قَالَتْ: فَلَمْ يَرُعْنِي مِنْهُ يَوْماً إِلاَّ وَنِدَاؤُهُ عَلَى الْمِنْبَرِ: (**يَا أَيُّهَا النَّاسُ**) ! قَالَتْ: وَأَنَا أُسَرِّحُ رَأْسِي، فَلَفَفْتُ شَعْرِي ثُمَّ دَنَوْتُ مِنَ الْبَابِ، فَجَعَلْتُ سَمْعِي عِنْدَ الْجَرِيدِ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: (**إِنَّ اللهَ عزّ وجل يَقُولُ:** ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾) هَذِهِ الْآيَةَ قَالَ عَفَّانُ: ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾. [حم٢٦٥٧٥]

* إسناده صحيح.

**لە ئوم سەلەمەوە وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە چیمانە لە قورئاندا باس ناكرێین وەك چۆن پیاوان باس دەكرێن؟ وتی: رۆژێكی نەخایاند بانگی پێغەمبەر: (یا أیها الناس-ئەی خەڵكینە) لەسەر مینبەر بوو، وتی: من سەرم دادەهێنا، قژم لـوول كرد و لە دەرگاكە نزیك بوومەوە، گوێم خستە لای پەلكەدارخورمایـەك گـوێم لـێ بـوو دەیفەرموو: (خودا(عز وجل) دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾)، ئەم ئایەتە، عەففان وتی: ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾.**

## ئایەتی: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ﴾ [الأحزاب: ٣٧]

**٧٣٤-** (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ: أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ﴾ نَزَلَتْ في شَأْنِ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ وَزَيْدِ بْنِ حارِثَةَ. [خ٤٧٨٧]

**(خ) لە ئەنەسی كوڕی مالیكـەوە(خوا لێـی رازی بێـت): ئـەم ئایەتـە: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ﴾، دەربارەی كاروباری زەینەبی كچی جەحش و زەیدی كـوڕی حاریسە دابەزی.**

▪ وفي رواية قال: جاءَ زَيْدُ بْنُ حارِثَةَ يَشْكُو، فَجَعَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(اتَّقِ الله، وَأَمْسِكْ عَلَيْك زَوْجَكَ)**. قَالَ أَنَسٌ: لَوْ كانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كاتِماً شَيْئاً لَكَتَمَ هذِهِ.

قَالَ: فَكَانَتْ زَيْنَبُ تَفْخَرُ عَلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم تَقُولُ: زَوَّجَكُنَّ أَهَالِيكُنَّ، وَزَوَّجَنِي اللهُ تَعَالَى مِنْ فَوْقِ سَبْعِ سَمَاوَاتٍ. [خ٧٤٢٠]

**لە ریوایەتێکدا، وتی: زەیدی کوڕی حاریسە هات و سکاڵای دەکرد[1]، پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (لە خودا بترسە، و دەست بگرە بە ژنەکەتەوە)، ئەنەس وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) شتێکی بشاردبایەوە ئەمەی دەشاردەوە.**

**وتی: زەینەب فەخری دەکرد بەسەر ژنەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) و دەیوت: خانەوادەکانتان ئێوەی داوە بە شوو، خودا(سبحانە وتعالی) لەسەرو حەوت ئاسمانەوە منی بە مێردداوە.**

## ئایەتی: ﴿تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ﴾ [الأحزاب: ٥١]

**٧٣٥-** (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كُنْتُ أَغارُ عَلَى اللَّاتِي وَهَبْنَ أَنْفُسَهُنَّ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وأَقُولُ: أَتَهَبُ المرْأَةُ نَفْسَهَا؟ فَلَمَّا أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: **﴿تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾**، قُلْتُ: ما أَرَى رَبَّكَ إِلاَّ يُسَارِعُ فِي هَوَاكَ. [خ٤٧٨٨/ م١٤٦٤]

**(ق) لە لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: غیرەم دەکرد لەو ئافرەتانەی خۆیان بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەبەخشی، دەموت: ئایا ئافرەت نەفسی خۆی دەبەخشێت؟ کاتێك خودا(سبحانە وتعالی) ئەم ئایەتە دابەزاند: ﴿تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾، وتم: من پەروەردگارت وا دەبینم لە ئارەزووی تۆدا خێرایە.**

---

[1] واتە: لەدەست ژنەکەی سکاڵای دەکرد-و

**٧٣٦-** (ق) عَنْ مُعَاذَةَ، عَنْ عائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كانَ يَسْتَأْذِنُ في يَوْمِ المرْأَةِ مِنَّا، بَعْدَ أَنْ أُنْزِلَتْ هذِهِ الآيَةُ: ﴿تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾. فَقُلْتُ لَهَا: ما كُنْتِ تَقُولِينَ؟ قَالَتْ: كُنْتُ أَقُولُ لَهُ: إِنْ كانَ ذَاكَ إِلَيَّ، فَإِنِّي لاَ أُرِيدُ يَا رَسُولَ اللهِ أَنْ أُوثِرَ عَلَيْكَ أَحَداً. [خ٤٧٨٩/ م١٤٧٦]

(ق) له "معاذة"وە، له عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) له رۆژی[(١)] ئافرەتێك له ئێمە مۆڵەتی دەخواست، لەدوای ئەوەی ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾، به عائیشەم وت: چیت دەوت؟ وتی: دەموت: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر ئەوە بۆ لای منە، من نامەوێت لای تۆ بەسەر هیچ کەسێکدا پێش بخرێم.

### ئایەتی:﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعْدُ﴾ [الأحزاب: ٥٢]

**٧٣٧-** عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا مَاتَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَتَّى أُحِلَّ لَهُ النِّسَاءُ.
* صحيح الإسناد. [ت٣٢١٦/ ن٣٢٠٤، ٣٢٠٥]

له عائیشەوە، وتم: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەمرد تا ئافرەتی بۆ حەڵاڵ بوو.

## (٣٥)

## سورة فاطر

### ئایەتی: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا﴾ [فاطر: ٣٢]

**٧٣٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ فِي هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ﴾: قَالَ: (هؤلاءِ كُلُّهم بمَنزِلَةٍ واحدةٍ، وكُلُّهم في الجَنَّةِ). [ت٣٢٢٥]
* صحيح.

---

(١) له رۆژی: واتە: له سەرەی–و

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەربارەی ئەم ئایەتە: : ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ﴾، فەرمووی: **(هەموو ئەوانە لە یەك مەنزیلەتن، و هەموویان لە بەهەشتن).**

**٧٣٩**– عَنْ أَبِي الدَّرداءِ قَالَ: سَمِعتُ رسولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ يقولُ: قال اللهُ عزَّ وجلَّ: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ﴾: **(فأمَّا الذين سَبَقوا بالخَيراتِ، فأولئك الذين يَدخُلونَ الجنَّةَ بغيرِ حِسابٍ، وأمَّا الذين اقتَصَدوا، فأولئك يُحاسَبونَ حِسابًا يَسيرًا، وأمَّا الذين ظَلَموا أنفُسَهم، فأولئك الذين يُحاسَبونَ في طُولِ المَحشَرِ، ثُمَّ هم الذين تَلافاهم اللهُ برَحمتِه، فهم الذين يَقولونَ:** ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ ۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ﴾، إلى قَولِه: ﴿لُغُوبٌ ۝٣٥﴾ [فاطر: ٣٤-٣٥].                [حم٢١٧٢٧]

* إسناده ضعيف.

لە ئەبی دەرداوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(خودا(عز وجل) فەرموویەتی:** ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ﴾، **ئەوانەی بە خێرات پێشکەوتوون ئەوانە بە لێپێچانەوەیەکی ئاسان موحاسەبە دەکرێن، ئەوانەی ستەمیان لە نەفسی خۆیان کرد لە درێژی مەحشەردا موحاسەبە دەکرێن، پاشان ئەوانە بریتین لەو کەسانەی خودا بە بەزەیی خۆی ئەوان دەگرێتەوە، ئەوانە ئەو کەسانەن دەڵێن:** ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ ۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ﴾، إلى قَولِه: ﴿لُغُوبٌ ۝٣٥﴾[فاطر: ٣٤-٣٥]).

**(٣٦)**

**سورة يس**

## ئایەتی: ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَـٰرَهُمْ﴾ [يس: ١٢]

٧٤٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: كَانَتْ بَنُو سَلِمَةَ فِي نَاحِيَةِ الْمَدِينَةِ، فَأَرَادُوا النُّقْلَةَ إِلَى قُرْبِ الْمَسْجِدِ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَـٰرَهُمْ﴾، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ آثَارَكُمْ تُكْتَبُ) ؛ فَلَمْ يَنْتَقِلُوا. [ت٣٢٢٦]

* قال الترمذي: حسن غريب. وقال شعيب: صحيح لغيره.

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: "بنو سَلِمَة" لە لایەکی مەدینەوە بوون، ویستیان بگوێزنەوە بۆ نزیك مزگەوتەکە، ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَـٰرَهُمْ﴾، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئاسارەکەتان دەنوسرێت)، بۆیە نەیانگواستەوە.**

## ئایەتی: ﴿وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا﴾ [يس: ٣٨]

٧٤١- (ق) عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لأَبِي ذَرٍّ حِينَ غَرَبَتِ الشَّمْسُ: (**تَدْرِي أَيْنَ تَذْهَبُ**)؟ قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: (**فَإِنَّهَا تَذْهَبُ حَتَّى تَسْجُدَ تَحْتَ الْعَرْشِ، فَتَسْتَأْذِنَ، فَيُؤْذَنَ لَهَا، وَيُوشِكُ أَنْ تَسْجُدَ فَلاَ يُقْبَلَ مِنْهَا، وَتَسْتَأْذِنَ فَلاَ يُؤْذَنَ لَهَا، يُقَالَ لَهَا: ارْجِعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ، فَتَطْلُعُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَذلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ﴾**). [خ٣١٩٩/ م١٥٩]

**(ق) لە ئەبی زەڕەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: کاتێك خۆر ئاوا بوو پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەبی زەڕی فەرموو (دەزانی بۆ کوێ دەچێت؟) وتم: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: (ئەوە دەڕوات تا لە ژێر عەرشدا سوژدە دەبات، داوای مۆڵەت دەکات و مۆڵەتی پێ دەدرێت، خەریکە سوژدە ببات و لێی قبوول نەکرێت و داوای مۆڵەت بکات و مۆڵەتی نەدرێت، پێی دەوترێت: لە کوێوە هاتووی**

**بگەڕێوە بۆ ئەوێ، بۆیە لە خۆرئاواوە هەڵدێت، ئەوەش فەرموودەی خودایە(سبحانه وتعالى): ﴿وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ٣٨﴾).**

### ئایەتی: ﴿فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ﴾ [يس: ٧٧]

**٧٤٢-** عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: جَاءَ العَاصُ بْنِ وَائِلٍ إلى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِعَظْمٍ حَائِلٍ فَفَتَّهُ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَيَبْعَثُ اللهُ هَذا بَعْدُ مَا أَرَمَّ؟ قَالَ: (**نَعَمْ يَبْعَثُ اللهُ هَذا، يُمِيتُكَ ثُمَّ يُحْيِيكَ ثُمَّ يُدْخِلُكَ نَارَ جَهَنَّم**)! قَالَ: فَنَزَلَتِ الآياتُ: **﴿أَوَ لَمۡ يَرَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن نُّطۡفَةٖ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ٧٧...﴾** إلى آخر السورة. [ك٣٦٠٦]

* قال الذهبي: على شرطهما.

لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: عاصی کوڕی وائیل بە ئێسقانی بەچکە حوشترێکەوە هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئێسقانەکەی پرواند و وتی: ئەی محەمەد، ئایا خودا ئەمە لەدوای پوان و ڕزان زیندوو دەکاتەوە؟ فەرمووی: (**بەڵێ، خودا ئەمە زیندوو دەکاتەوە، تۆ دەمرێنێ و پاشان زیندووت دەکاتەوە و پاشان دەتخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە**)، وتی: ئەم ئایەتانە دابەزین: **﴿أَوَ لَمۡ يَرَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن نُّطۡفَةٖ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ٧٧...﴾** تا کۆتایی سورەتەکە.

## (٣٧)

## سورة الصافات

### ئایەتی: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا﴾ [يس: ١]

**٧٤٣-** عَنْ عَبْدِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: **﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا١﴾** قَالَ: المَلائِكَةُ **﴿فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا٢﴾** قَالَ: المَلائِكَةُ **﴿فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا٣﴾** قَالَ: المَلائِكَةُ. [ك٣٦٠٧]

* قال الذهبي: على شرطهما.

لـە عەبـدوڵای كـوڕی مەسـعوودەوە(خوا لێـی رازی بێـت) دەربـارەی فـەرمودەی خودا(عز وجل): ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ١﴾، وتی: فریشتەن، ﴿فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا ٢﴾، وتی: فریشتەن، ﴿فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ٣﴾، وتی: فریشتەن.

## ئایەتی: ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ﴾ [الصافات: ٢٢]

**٧٤٤–** عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ فِي قَوْلِهِ تَعَالى: ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ﴾. قَالَ: أَمْثَالَهُمْ الذِينَ هُمْ مِثْلُهُمْ. [ك٣٦٠٩]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

لـە عومـەری كـوڕی خەتابـەوە دەربـارەی ئایـەتی: ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ﴾، وتی: هاوشێوەكانیان، ئەوانەی وەك ئەوان وان.

## (٣٩)

## سورة الزمر

## ئایەتی: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ﴾ [الزمر: ٣١]

**٧٤٥–** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ ٣١﴾. قَالَ الزُّبَيْرُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَتُكَرَّرُ عَلَيْنَا الخُصُومَةُ بَعْدَ الَّذِي كَانَ بَيْنَنَا فِي الدُّنْيَا؟ قَالَ: (نَعَمْ)، فَقَالَ: إِنَّ الأَمْرَ إِذاً لَشَدِيدٌ. [ت٣٢٣٦]

* حسن الإسناد.

لە عەبدوڵای كوڕی زوبەیرەوە، لە باوكییـەوە، وتـی: كاتێك ئـەم ئایەتـە دابـەزی: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ ٣١﴾، زوبەیر وتی: ئەی پێغەمبـەری خودا، ئایا نەیاری و دوژمنایەتی بەسەرماندا دووبارە دەبێتەوە لەدوای ئەوەی لە دنیا لە نێوانمان بوو؟ فەرمووی: (بەڵێ)، زوبەیر وتی: كەوابوو كارەكە توند و دژوارە.

**ئایەتی: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ﴾[الزمر: ٥٣]**

**٧٤٦-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ نَاساً مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ، كَانُوا قَدْ قَتَلُوا وَأَكْثَرُوا، وَزَنَوْا وَأَكْثَرُوا، فَأَتَوْا مُحَمَّداً صلّى الله عليه وسلّم فَقَالُوا: إِنَّ الَّذِي تَقُولُ وَتَدْعُو إِلَيْهِ لَحَسَنٌ، لَوْ تُخْبِرُنَا أَنَّ لِمَا عَمِلْنَا كَفَارَةً، فَنَزَلَ: **﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ﴾** [الفرقان:٦٨]. وَنَزَلَ: **﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ﴾**. [خ٤٨١٠/ م١٢٢]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): خەڵکانێك لە ئەهلی هاوەڵدانان کوشتنیان ئەنجام دابوو و زیادەڕەوییان تێدا کرد بوو، زینایان کرد بوو و زیادەڕەوییان تێدا کرد بوو، هاتن بۆ لای محەمەد(ﷺ) و وتیان: ئەوەی تۆ دەیڵێی و بانگی بۆ دەکەی باش و چاکە، گەر هەواڵمان پێ بدەی ئایا ئەوەی ئەنجاممان داوە کەفارەتی هەیە؟ ئایەت دابەزی: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ﴾ [الفرقان:٦٨]، هەروەها ئایەت دابەزی: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ﴾.**

**ئایەتی: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ﴾ [الزمر: ٦٧]**

**٧٤٧-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: جَاءَ حَبْرٌ مِنَ الأَحْبَارِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! إِنَّا نَجِدُ: أَنَ اللهَ يَجْعَلُ السَّمَاوَاتِ عَلَى إِصْبَعٍ وَالأَرَضِينَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالشَّجَرَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالمَاءَ وَالثَّرَى عَلَى إِصْبَعٍ، وَسَائِرَ الخَلاَئِقِ عَلَى إِصْبَعٍ فَيَقُولُ: أَنَا المَلِكُ، فَضَحِكَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ تَصْدِيقاً لِقَوْلِ الحَبْرِ، ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ۝٦٧﴾**. [خ٤٨١١/ م٢٧٨٦]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: حەبرێك لە ئەحبار هات بۆ لای پێغەمبەری خودا و وتی: ئەی محەمەد، ئێمە لای خۆمان ئەمە دەبینین: خودا ئاسمانەکان دەخاتە سەر پەنجەیەك و زەوییەکان دەخاتە سەر پەنجەیەك، درەخت لەسەر پەنجەیەك و ئاو لەسەر پەنجەیەك و "الثرى"[1] لەسەر پەنجەیەك، تەواوی دروستکراوانی تر لەسەر پەنجەیەك و دەفەرموێت: من مەلیکم، پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی تا دانەکانی دواوەی دەرکەوتن وەك بەڕاستزانینی قسەی حەبرەکە، پاشان پێغەمبەری خودا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾.

## (٤٠)

## سورة غافر

### ئایەتی: ﴿وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ﴾ [غافر: ١١]

٧٤٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل ﴿رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ﴾. قَالَ: هِي مِثْلُ الَّتِي فِي البقَرَة: ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ [البقرة: ٢٨]. [ك٣٦٣٦]

* قال الذهبي: على شرطهما.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت) دەربارەی ئایەتی: ﴿رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ﴾، وتی: ئەوە وەك ئەوە وایە لە سورەتی "البقرة": ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ [البقرة: ٢٨].

---

[1] "الثرى" واتە: زەوی–و

٧٤٩– عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالى: ﴿رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ﴾[غافر: ١١]، قَالَ: أَحْيَاهُمْ وَلَمْ يَكُونُوا شَيْئاً، ثُمَّ أَمَاتَهُمْ، ثُمَّ أَحْيَاهُمْ. [مخ١٢/١٢١]

* إسناده حسن.

**لە ئیبن عەباسەوە دەربارەی فەرموودەی خـودا: ﴿رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ﴾ [غافر: ١١]، وتی: ئەوانی زیندووكردەوە ئەوان شتێك نەبوون، پاشان ئەوانی مراند و پاشان زیندوویان دەكاتەوە.**

## ئایەتی: ﴿ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ﴾ [غافر: ٦٠]

٧٥٠– عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ**، قَالَ رَبُّكُمْ: ﴿ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ﴾). [د١٤٧٩/ ت٢٩٦٩/ جه٣٨٢٨]

* صحيح.

**لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (دوعا بریتییـە لـە عیبادەت، پەروەردگارتان دەفەرموێت: ﴿ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ﴾.**

## ئایەتی: ﴿فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ [غافر: ٦٥]

٧٥١– عَن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: مَنْ قَالَ: لا إلهَ إلاَّ اللهُ، فَلْيَقُلْ عَلى أَثَرِهَا: الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ، يُرِيدُ قَوْلَه عزّ وجل: ﴿فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾. [ك٣٦٣٩]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: هەر كەس وتی: "لا إله إلا الله" با بەدوایدا بڵێت: "الحمد لله رب العالمين"، مەبەستی ئـەم فـەرموودەی خـودا(عز وجـل) بوو: ﴿فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾.**

## (٤١)

## سورة فصلت

### ئایەتی: ﴿فَإِنْ أَعْرَضُواْ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً﴾ [فصلت: ١٣]

**٧٥٢-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: اجْتَمَعَتْ قُرَيْشٌ يَوْماً، فَأَتَاهُ عُتْبَةُ بْنُ رَبِيْعَةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَنْتَ خَيْرٌ أَمْ عَبْدُ اللهِ؟ فَسَكَتَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ لهَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَفَرَغْتَ؟**) قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (﴿**بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ، حمٓ ١ تَنزِيلٌ...**﴾ حتى بلغ ﴿**فَإِنْ أَعْرَضُواْ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ١٣**﴾) فَقَالَ لَهُ عُتْبَةُ: حَسْبُكَ حَسْبُكَ مَا عِنْدَكَ غَيْرُ هذا؟ قَالَ: (لا). فَرَجَعَ عُتْبَةُ إلى قُرَيْشٍ فَقَالُوا: مَا وَرَاءَكَ؟ فَقَالَ: مَا تَرَكْتُ شَيْئاً أَرَى أَنَّكُمْ تُكَلِّمُونَهُ إلاَّ قَدْ كَلَّمْتُهُ، قَالُوا: فَهَلْ أَجَابَكَ؟ قَالَ: نَعَمْ، لا وَالذِيْ نَصَبَهَا بَنِيَّةً مَا فَهِمْتُ شَيْئاً مِمَّا قَالَ، غَيْرَ أَنَّهُ أَنْذَرَكُمْ صَاعِقَةً مِثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ، قَالُوا: وَيْلَكَ يُكَلِّمُكَ رَجُلٌ بِالعَرَبِيَّةِ وَلا تَدْرِي مَا قَالَ؟ قَالَ: لا وَاللهِ مَا فَهِمْتُ شَيْئاً مِمَّا قَالَ، غَيْرَ ذِكْرِ الصَّاعِقَةِ.

[ك٣٠٠٢]

* قال الذهبي: صحيح.

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: ڕۆژێك قورەیش کۆبوونەوە، عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبد شەمس هات بۆ لای پێغەمبەر و وتی: ئەی محەمەد، تۆ باشتری یان عەبدوڵا[1]؟ پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ بوو، ئەوجا پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (تەواو بوویت؟)، وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ، حمٓ ١ تَنزِيلٌ...﴾ تا گەیشتە ﴿فَإِنْ أَعْرَضُواْ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ١٣﴾)، عوتبە پێی وت: بەسە، بەسە، شتێکی ترت لا نییە جگە لەمە؟ فەرمووی: (نەخێر)، عوتبە گەڕایەوە بۆ لای قورەیش و وتیان: چی لە دواتەوە هەیە[2]؟ وتی: هەر شتێك پێموابێت ئێوەی دەیڵێن پێم وت، وتیان: ئایا**

---

(1) **مەبەستی "عەبدوڵا"ی باوکی پێغەمبەرە-و**

(2) **واتە: چ هەواڵێکت بەدوای خۆتدا هێناوە؟-و**

وەڵامی تۆی دایەوە؟ وتی: بەڵێ، نە سوێند بەو کەسەی بەڵگەی ڕاستکردووەتەوە، شتێك حاڵی نەبووم لەوەی وتی، جگە لەوەی ئەو بە گرمە و بروسکەیەك وەك گرمە و بروسکەکەی عاد و سەموود ئێوەی دەترساند، وتیان: وەیل بە حاڵت، پیاوەکە بە عەرەبی لەگەڵ تۆ قسە دەکات کەچی تۆ نازانی ئەو چی دەڵێ؟! وتی: نە سوێند بە خودا، شتێك حاڵی نەبووم لەوەی وتی، جگە لە باسی گرمە و بروسکەکە.

## ئایەتی: ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ﴾ [فصلت: ٢٢]

**٧٥٣-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ ﷺ قَالَ: اجْتَمَعَ عِنْدَ الْبَيْتِ قُرَشِيَّانِ وَثَقَفِيٌّ . أَوْ ثَقَفِيَّانِ وَقُرَشِيٌّ .كَثِيرَةٌ شَحْمُ بُطُونِهِمْ، قَلِيلَةٌ فِقْهُ قُلُوبِهِمْ، فَقَالَ أَحَدُهُمْ: أَتُرَوْن أَنَّ اللهَ يَسْمَعُ ما نَقُولُ؟ قَالَ الآخَرُ: يَسْمَعُ إِنْ جَهَرْنَا، وَلاَ يَسْمَعُ إِنْ أَخْفَيْنَا، وَقَالَ الآخَرُ: إِنْ كانَ يَسْمَعُ إِذَا جَهَرْنَا فَإِنَّهُ يَسْمَعُ إِذَا أَخْفَيْنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ﴾ الآيَةَ.　　[خ٤٨١٧ (٤٨١٦)/ م٢٧٧٥]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لە بەیت دوو قورەیشی و سەقەفییەك-یان دوو سەقەفی و قورەیشییەك- کۆبوونەوە، چەوری ورگیان زۆر بوو، و حاڵیبوونی دڵیان کەم بوو، یەکێکیان وتی: ئایا پێتانوایە ئەوەی ئێمە دەیڵێین خودا دەیبیستێ؟ دانەیەکی تریان وتی: گەر دەنگمان هەڵبڕی دەیبیستێ، گەر دەنگمان نزم کردەوە نایبیستێ، ئەویتریان وتی: گەر دەنگ هەڵبڕین ببیستێ دەنگیش نزم بکەینەوە دەبیستێ، خودا(عز وجل) ئایەتی دابەزاند: ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ﴾.

## ئایەتی: ﴿رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا﴾ [فصلت: ٢٩]

**٧٥٤-** عَنْ عَلِيٍ ﷺ فِي قَوْلِهِ تَعَالى: ﴿رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا﴾، قَالَ: إِبْلِيسُ وَابْنُ آدَمَ الَّذِي قَتَلَ أَخَاهُ.　　[ك٣٢١٥]

* قال الذهبي: صحيح.

له عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت) دەربارەی ئایەتی: ﴿رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا﴾، وتی: ئیبلیس و كوڕەكەی ئادەم كە براكەی خۆی كوشت[1].

## ئایەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ﴾ [فصلت: ٣٠]

**٧٥٥**– عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ قَالَ: مَا تَقُولُونَ فِي قَوْلِ اللهِ عزّ وجل: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟﴾، وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾؟ فَقَالُوا: الَّذِينَ قَالُوا: رَبُّنَا اللهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا فَلَمْ يَلْتَفِتُوا، وَقَوْلِهِ: ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾[الأنعام:٨٢] بِخَطِيئَةٍ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: حَمَلْتُمُوها عَلى غَيْرِ وَجْهِ المحْمَلِ، ثُمَّ اسْتَقَامُوا وَلَمْ يَلْتَفِتُوا إِلى إِلهٍ غَيْرِهِ، ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾، أَيْ بِشِرْكٍ. [ك٣٦٤٨]

* قال الذهبي: صحيح.

لە ئەبوبەكری صدیقەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: چی دەڵێن دەربارەی فەرموودەی خودا(عز وجل): ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟﴾، هەروەها دەربارەی فەرموودەی خودا(سبحانه وتعالى): ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾؟ وتیان: ئەوانەی وتیان: پەروەردگارمان "الله"یە و پاشان رێك و راست وەستان لایان نەكردەوە و ئاوڕیان نەدایەوە، ئەوەش كە دەفەرموێت: ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾ [الأنعام:٨٢]، "بظلم" واتە "بخطیئة–بە خەتا و گوناهێك"، ئەبوبەكر وتی: هەڵتاندان بۆ سەر ڕوویەك هەڵنادرێن بۆ سەری، "ثم استقاموا ولم يلتفتوا إلى إله غيره–پاشان رێك و راست وەستان و ئاوڕیان نەدایەوە بۆ لای خواوەندێكی تر جگە لە ئەو"، ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾، "بظلم" واتە: "بشرك–بە هاوەڵدانان".

---

[1] واتە: ئەو دوو كەسە(الذَيْن) بریتن لە ئیبلیس و كوڕەكەی ئادەم كە براكەی خۆی كوشت–و

## (٤٢)

## سورة الشورى

### ئایەتی: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ﴾ [الشورى: ٣٠]

**٧٥٦-** عَنِ الحَسَنِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: دَخَلَ عَلَيْهِ بَعْضُ أَصْحَابِهِ وقَدِ ابْتُلِيَ فِي جَسَدِهِ، فَقَالَ لَهُ بَعْضُهُمْ: إِنَّا لَنَبْتَئِسُ لَكَ لِما نَزَلَ فِيْكَ، قَالَ: فَلا تَبْتَئِسْ لِما تَرَى، فَإِنَّمَا نَزَلَ بِذَنْبٍ وَمَا يَعْفُو اللهُ عَنْهُ أَكْثَرُ. قَالَ: ثُمَّ تَلاَ عِمَرانُ هذه الآية: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ۝٣٠﴾ إلى آخر الآية. [ك٣٢١٥]

* قال الذهبي: صحيح.

**لە حەسەنەوە، لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە، وتی: هەندێ لە هاوەڵانی ڕۆیشتنە ژوورەوە بۆ لای، ئەو لە جەستەدا تووشی نەخۆشییەك هـاتبوو، یـەکێکیان پێـی وت: ئێمە دڵتەنگ و خەمبارین بۆ ئەوەی بەسەر تۆدا دابـەزیوە، وتـی: دڵتـەنگ و خـەمبار مەبە بۆ ئەوەی دەیبینی، ئەوە بـە هـۆی گوناهێکـەوە دابـەزیوە، ئـەوەی خـودا لێـی دەبوورێت زۆرترە، وتی: پاشان عیمران ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ۝٣٠﴾، تا کۆتایی ئایەتەکە.**

## (٤٣)

## سورة الزخرف

### ئایەتی: ﴿أَهُمۡ يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَ﴾ [الزخرف: ٣٢]

**٧٥٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ: ﴿أَهُمۡ يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَۚ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم...﴾ الآية، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ اللهَ قَسَمَ بَيْنَكُمْ أَخْلاقَكُمْ، كَمَا قَسَمَ بَيْنَكُمْ أَرْزَاقَكُمْ، وإِنَّ اللهَ لَيُعْطِي الدُّنْيَا مَنْ أَحَبَّ وَمَنْ لا يُحِبُّ، وَلا يُعْطِي الدِّينَ إِلاَّ مَنْ أَحَبَّ، فَمَنْ أَعْطَاهُ الدِّينَ فَقَدْ أَحَبَّهُ). [ك٣٦٧١]

* قال الذهبي: صحيح.

لە عەبدوڵای كوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی ڕازی بێت): ﴿أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم...﴾، عەبدوڵا وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: **(خودا ئەخلاقی ئێوەی لە نێوانتان دابەش كردووە، وەك چۆن ڕۆزییەكەی ئێوەی لە نێوانتان دابەش كردووە، خودا دنیا دەدات بەو كەسەی خۆشیدەوێت و بەو كەسەی خۆشیناوێت، دین تەنها بە كەسێك دەدات خۆشیدەوێت، بۆیە هەر كەس خودا دینی پێبدات خۆشیویستووە).**

**(٤٤)**

**سورة الدخان**

### ئایەتی: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ﴾ [الدخان: ٣]

**٧٥٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: إِنَّكَ لَتَرَى الرَّجُلَ يَمْشِي فِي الأَسْوَاقِ، وَقَدْ رُفِعَ اسْمُهُ فِي الموْتَى، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ﴾ إلى قَوْلِهِ: ﴿فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ﴾ فِي تِلْكَ السَّاعَةِ يُفْرَقُ أَمْرُ الدُّنيا إلى مِثْلِها مِنْ قَابِلٍ. [ك٣٦٧٨/ مخ١٠/٢٤٨]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: تۆ پیاوێك دەبینی بە بازاڕدا دەڕوات ناوەكەی بەرزكراوەتەوە بۆ ناو مردووان، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ﴾ تا ئایەتی: ﴿فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ﴾، لەو ساتەدا كاروباری دنیا جیادەكرێتەوە تا ساتی هاوكات لە ساڵی داهاتوو.

### ئایەتی: ﴿فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ﴾ [الدخان: ١٠]

**٧٥٩-** (ق) عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: بَيْنَما رَجُلٌ يُحَدِّثُ فِي كِنْدَةَ فَقَالَ:

يَجِيءُ دُخانٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَأْخُذُ بِأَسْماعِ المَنافِقِينَ وَأَبْصَارِهِمْ، يَأْخُذُ المؤْمِنَ كَهَيْئَةِ الزُّكامِ، فَفَزِعْنَا! فَأَتَيْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ، وَكانَ مُتَّكِئاً، فَغَضِبَ، فَجَلَسَ فَقَالَ: مَنْ عَلِمَ فَلْيَقُلْ، وَمَنْ لَمْ يَعْلَمْ

فَلْيَقُلِ: اللهُ أَعْلَمُ، فَإِنَّ مِنَ الْعِلْمِ أَنْ تَقُولَ لِمَا لاَ تَعْلَمُ: لاَ أَعْلَمُ، فَإِنَّ اللهَ قَالَ لِنَبِيِّهِ صلّى الله عليه وسلّم: ﴿قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ﴾ [ص: ٨٦]، وَإِنَّ قُرَيْشاً أَبْطَؤُوا عَنِ الإِسْلاَمِ، فَدَعا عَلَيْهِمِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَيْهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ**)، فَأَخَذَتْهُمْ سَنَةٌ حَتَّى هَلَكُوا فِيهَا، وَأَكَلُوا المَيْتَةَ وَالْعِظَامَ، وَيَرَى الرَّجُلُ ما بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ كَهَيْئَةِ الدُّخانِ. فَجَاءَهُ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، جِئْتَ تَأْمُرُنَا بِصِلَةِ الرَّحِمِ، وَإِنَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا فَادْعُ اللهَ. فَقَرَأَ: ﴿فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿عَآئِدُونَ﴾، أَفَيُكْشَفُ عَنْهُمْ عَذَابُ الآخِرَةِ إِذَا جاءَ؟ ثُمَّ عَادُوا إِلَى كُفْرِهِمْ. فَذلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ﴾ [الدخان:١٦] يَوْمَ بَدْرٍ، وَ﴿لِزَامًا﴾ يَوْمَ بَدْرٍ، ﴿الٓمٓ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ﴾ إِلَى ﴿سَيَغْلِبُونَ﴾ [الروم]، وَالرُّومُ قَدْ مَضى.

[خ٤٧٧٤ (١٠٠٧)/ م٢٧٩٨]

**(ق) لە مەسرووقەوە، وتی: پیاوێك لە كیندە قسەی دەكرد و دەیوت:**

**دووكەڵەكە ڕۆژی قیامەت دێت و بیستن و بینینی دووڕووان دەگرێتەوە، بە شێوەی هەڵامەت باوەڕدار دەگرێت، ئێمە ترساین، بۆیە هاتم بۆ لای ئیبن مەسعوود، ئەو شانیدادابوو، تووڕە بوو و دانیشت و وتی: هەر كەس دەزانێت با بڵێت، هەر كەسیش نازانێت با بڵێت: خودا زاناترە، چونكە لە زانست ئەوەیە شتێك نایزانی بڵێی: نازانم، خودا(سبحانە وتعالی) بە پێغەمبەرەكەی خۆی فەرمووە:** ﴿قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ﴾ [ص: ٨٦]، **قورەیش لە ئیسلام دواكەوتن، پێغەمبەر(ﷺ) دوعای لێكردن و فەرمووی: (خودا بە حەوت ساڵ گرانی وەك گرانییەكەی یوسف كۆمەكیم بكە لەسەریان)، گرانی ئەوانی داگرتەوە تا لە ناویدا تیاچوون و مردارەوەبوو و ئێسقانیان دەخوارد، پیاو لە نێوان ئاسمان و زەوی لە شێوەی دووكەڵ شتی دەبینی.**

**ئەبو سوفیان هات بۆ لای و وتی: ئەی محەمەد، تۆ هاتووی فەرمانمان پێ دەكەی بە سیلەی ڕەحم، قەومەكەت تیاچوون داوا لە خودا بكە، پێغەمبەر ئەمەی خوێندەوە:** ﴿فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ﴾ **تا** ﴿عَآئِدُونَ﴾، **ئایا كاتێ**

سزای دوارۆژ دێت لەسەریان لادەبرێت؟![1] پاشان گەڕانەوە بۆ بێباوەڕی خۆیان، ئەوەش ئەم فەرموودەی خودایە(سبحانه وتعالى)﴿يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَىٰ﴾[الدخان:١٦] ڕۆژی بەدر، ﴿لِزَامًا﴾[2] ﴿الم ۝ غُلِبَتِ الرُّومُ ۝﴾ تا ﴿سَيَغْلِبُونَ﴾، ڕۆم تێپەڕی.

## ئایەتی: ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ﴾ [الدخان: ٢٩]

**٧٦٠**- عَنْ أَنَسِ بنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (ما من مؤمنٍ إلّا ولَهُ بابانِ بابٌ يصعَدُ منهُ عملُهُ، وبابٌ ينزِلُ منهُ رزقُهُ فإذا ماتَ بَكَيا عليهِ فذلِكَ قولُهُ عزّ وجل: ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنظَرِينَ ۝﴾). [ت٣٢٥٥]

* ضعيف.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەر باوەڕدارێك دوو دەرگای هەیە: دەرگایەك کارەکانی لێوە بەرز دەبێتەوە، دەرگایەك ڕۆزییەکەی لێوە دادەبەزێت، کاتێك کەسەکە مرد بۆی دەگرین، ئەوەش ئەم فەرموودەی خودایە(عز وجل)**: ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنظَرِينَ ۝﴾).

---

[1] (ئایا کاتێ سزای دوارۆژ دێت لەسەریان لادەبرێت؟): ئەم پرسیارکردنە ئینکاری قسەی ئەو کەسەیە دەڵێت: دووکەڵەکە لە ڕۆژی قیامەتدایە، وەك چۆن لە سەرەتای فەرموودەکەوە ڕاشکاوانە باسی کرد، ئیبن مەسعوود دەڵێت: ئەوە قسەیەکی پووچە، چونکە خودا(سبحانه وتعالى) فەرموویەتی: ﴿إِنَّا كَاشِفُوا الْعَذَابِ قَلِيلًا إِنَّكُمْ عَائِدُونَ﴾[الدخان:١٥]، ئەوەی ئاشکرایە لادانی ئەو سزایە و پاشان گەڕانەوەیان بۆ سەر بێباوەڕی لە ڕۆژی دواییدا نییە، بەڵکو ئەوە لە دنیادایە.

[2] "اللزام": مەبەست پێی ئەم ئایەتەیە: ﴿... فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا﴾[ الفرقان: ٧٧]، واتە: سزاکەیان پێویست و پەیوەست دەبێت، وتویانە: ئەوە بریتی بوو لەوەی لە ڕۆژی بەدر بەسەریان هات لە کوشتن و بەدیلگیران، ئەوەش بریتییە لە دەستوەشاندنە گەورەکە(البطشة الكبرى).

**٧٦١-** عَنْ عَلِّي قَالَ: إِنَّ المؤمِنُ إذا مَاتَ بَكَى عَلَيْهِ مُصَلاَّةٌ مِنَ الأَرْضِ وَمَصْعَدُ عَمَلِهِ مِنَ السَّمَاءِ، ثُمَّ تَلا: ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ﴾. [مخ٢/٧٤١]

* إسناده حسن.

**لە عەلییەوە: كاتێك باوەڕدار دەمرێت جێ نوێژەكەی لە زەوی و شوێنی بەرزبوونەوەی كارەكەی لە ئاسمان بۆی دەگرین، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ﴾.**

## (٤٦)

## سورة الأحقاف

### ئایەتی: ﴿أَوْ أَثَـٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ﴾ [الأحقاف: ٤]

**٧٦٢-** عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ؛ قَالَ سُفْيَانُ: لاَ أَعْلَمُهُ إلاَّ عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: ﴿أَوْ أَثَـٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ﴾. قَالَ: (الْخَطُّ). [حم١٩٩٢]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**لە سوفیانەوە، لە صەفوانی كوڕی سولەیمەوە، لە ئەبی سەلەمەی كوڕی ئەبی عبدالرحمانەوە، لە ئیبن عەباسەوە، سوفیان وتی: تەنها لە پێغەمبەرەوەی(ﷺ) دەزانم: ﴿أَوْ أَثَـٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ﴾، ئیبن عەباس وتی: (خەت[1]).**

### ئایەتی: ﴿وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ﴾ [الأحقاف: ١٧]

**٧٦٣-** (خ) عَنْ يُوسُفَ بْنِ ماهَكَ قَالَ: كَانَ مَرْوانُ عَلَى الْحِجَازِ، اسْتَعْمَلَهُ مُعَاوِيَةُ، فَخَطَبَ فَجَعَلَ يَذْكُرُ يَزِيدَ بْنِ مُعَاوِيَةَ لِكَيْ يُبَايَعَ لَهُ بَعْدَ أَبِيهِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ

---

[1] **واتە: "أثارة من العلم" بریتییە لە خەت(نووسین)-و.**

شَيْئاً، فَقَالَ: خُذُوهُ، فَدَخَلَ بَيْتَ عائِشَةَ فَلَمْ يَقْدِرُوا، فَقَالَ مَرْوَانُ: إِنَّ هَذَا الَّذِي أَنْزَلَ اللهُ فِيهِ: ﴿وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ﴾، فَقَالَتْ عائِشَةُ مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ: ما أَنْزَلَ اللهُ فِينَا شَيْئاً مِنَ القُرْآنِ، إلاَّ أَنَّ اللهَ أَنْزَلَ عُذْرِي. [خ٤٨٢٧]

(خ) لە یوسوفی کوڕی ماهەکەوە وتی: موعاویە "مەروان"ی لەسەر حیجاز بەکاریهێنابوو[(١)]، وتاری دا و باسی یەزیدی کوڕی موعاویەی کرد بۆ ئەوەی لەدوای باوکی بەیعەتی پێ بکرێت، عبدالرحمانی کوڕی ئەبی بەکر شتێکی پێ وت[(٢)]، مەروان وتی: بیگرن، ڕۆیشت بۆ ماڵی عائیشە[(٣)] و نەیانتوانی بیگرن، مەروان وتی: ئەمە ئەو کەسەیە خودا ئەم ئایەتەی لەسەر دابەزاندووە: ﴿وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ﴾، عائیشە لەودیو پەردەوە وتی: خودا دەربارەی ئێمە[(٤)] شتێك لە قورئانی دانەبەزاندووە، جگە لەوەی خودا عوزرەکەی[(٥)] منی دابەزاندووە.

## (٤٧)

## سورة محمد "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

### ئایەتی: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ﴾ [محمد: ٣٨]

٧٦٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: يَا رَسُولَ اللهِ! مَنْ هَؤُلاَءِ الَّذِينَ ذَكَرَ اللهُ: إِنْ تَوَلَّيْنَا اسْتُبْدِلُوا بِنَا، ثُمَّ لَمْ يَكُونُوا أَمْثَالَنَا؟ - قَالَ: وَكَانَ

---

(١) واتە: والی موعاویە بوو لەسەر حیجاز-و.

(٢) واتە: قسەیەکی پێ وت بە دڵی مەروان نەبوو-و.

(٣) واتە: عبدالرحمانی کوڕی ئەبوبەکر ڕۆیشت بۆ ماڵی خاتوو عائیشەی خوشکی-و.

(٤) مەبەستی منداڵەکانی ئەبی بەکری صدیقە(خوا لێی رازی بێت)، نەك ئەبوبەکر و منداڵەکانی، چونکە ئایەتی: ﴿إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾[ التوبة: ٤٠]، هاوەڵەکە بریتییە لە ئەبوبەکری صدیق-و.

(٥) مەبەستی دابەزینی ئەو ئایەتانەیە عائیشەیان(خوا لێی رازی بێت) لە زینا بەری کرد و تۆمەتەکەیان ڕەواندەوە-و.

سَلْمَانُ بِجَنْبِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم . قَالَ: فَضَرَبَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَخِذَ سَلْمَانَ، وَقَالَ: (هَذَا وَأَصْحَابُهُ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ؛ لَوْ كَانَ الْإِيمَانُ مَنُوطاً بِالثُّرَيَّا، لَتَنَاوَلَهُ رِجَالٌ مِنْ فَارِسَ). [ت ٣٢٦١]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: خەڵكانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوانە كێن خودا باسی كردوون: گەر ئێمە پشتهەڵبكەین بە ئێمە ئاڵوگۆڕ دەكرێن، پاشان وەك ئێمە نابن؟ وتی: سەلمان بە تەنیشت پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بوو، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) كێشای بە رانی سەلماندا و فەرمووی: (ئەمە و هاوەڵانی، سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە، گەر ئیمان بە حەوتەوانانەوە بلكێت پیاوانێك لە فارس دەستی بۆ دەبەن).**

## (٤٨)

## سورة الفتح

### ئایەتی: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾ [الفتح: ٨]

**٧٦٥-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنهما: أَنَّ هذِهِ الآيَةَ الَّتِي فِي الْقُرْآنِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾ [الأحزاب: ٤٥]. قَالَ فِي التَّوْرَاةِ: يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَحِرْزاً لِلأُمِّيِّينَ، أَنْتَ عَبْدِي وَرَسُولِي، سَمَّيْتُكَ المُتَوَكِّلَ، لَيْسَ بِفَظٍّ وَلاَ غَلِيظٍ وَلاَ سَخَّابٍ بِالأَسْوَاقِ، وَلاَ يَدْفَعُ السَّيِّئَةَ بِالسَّيِّئَةِ، وَلكِنْ يَعْفُو وَيَصْفَحُ، وَلَنْ يَقْبِضَهُ اللهُ حَتَّى يُقِيمَ بِهِ المِلَّةَ الْعَوْجاءَ، بِأَنْ يَقُولُوا: لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، فَيَفْتَحَ بِهَا أَعْيُناً عُمْياً، وَآذَاناً صُمّاً، وَقُلُوباً غُلْفاً. [خ٤٨٣٨ (٢١٢٥)]

**(خ) لە عەبدوڵای كوڕی عەمری كوڕی عاصەوە(خوایان لێ رازی بێت)، ئەم ئایەتەی لە قورئاندایە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾ [الأحزاب: ٤٥]، وتی: لە تەوراتدا هاتووە: ئەی پێغەمبەر، ئێمە تۆمان وەك شایەت و مژدەدەر و پەناگا بۆ**

ئومییەکان رەوانە کردووە، تۆ بەندە و پێغەمبەری منی، ناوی تۆم ناوە متەوەکیل، کەسێکی وشك و رەق نیت و گاڵەکەری ناو بازاڕەکان نییە، خراپە بە خراپە پاڵپێوە نانێت، بەڵکو دەبورێت و چاوپۆشی دەکات، خودا نایمرێنێت تا ئوممەتێکی خواری پێ راستدەکاتەوە، بەوەی بڵێن: "لا إلـه إلا الله"، بەوە چاوە کوێرەکان و گوێ کەڕەکان و دڵە داخراوەکان بکرێنەوە.

## ئایەتی: ﴿وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ﴾ [الفتح: ٢٦]

٧٦٦- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ﴿وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ﴾. قَالَ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ). [ت٣٢٦٥]

* صحيح.

لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ):﴿وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ﴾، فەرمووی: **(لا إله إلا الله)**[1].

## ئایەتی: ﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ﴾ [الفتح: ٢٩]

٧٦٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ: ﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ﴾. قَالَ: السَّمْتُ الْحَسَنُ.

لە ئیبن عەباسەوە دەربارەی فەرموودەی خودا: ﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ﴾، فەرمووی: (السمت الحسن[2]).

---

[1] واتە: (كلمة التقوى) بریتییە لە (لا إله إلا الله).

[2] السمت الحسن: بریتییە لە جوانی و باشی رووڵەتی دەرەوە، و روخساری شیرین–و.

٧٦٨– عَنْ سَالِمٍ أَبِي النَّضْرِ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عُمَرَ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، قَالَ: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: أَنَا حَاضِنُكَ فُلاَنٌ، وَرَأَى بَيْنَ عَيْنَيْهِ سَجْدَةً سَوْدَاءَ فَقَالَ: مَا هَذَا الأَثَرُ بَيْنَ عَيْنَيْكَ؟ فَقَدْ صَحِبْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ ﷺ، فَهَلْ تَرَى هَا هُنَا مِنْ شيءٍ؟! [هق٢/٢٨٦]

**لە سالمی کوڕی ئەبی نەزرەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای ئیبن عومەر و سەلامی لێکرد، وتی: تۆ کێی؟ وتی: من ئامێزگرەکەی[1] خۆتم، لە نێوان دوو چاوانی سوژدەیەکی رەشی بینی، وتی: ئەو ئەسەرە چییە لە نێوان دوو چاوانت؟ هاوەڵی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمانم کرد(خوایان لێ رازی بێت)، ئایا شتێکت لەوە لەو شوێنەیان دەبینی؟!**

٧٦٩– عَنْ أَشْعَثَ بْنِ أَبِي الشَّعْثَاءِ عَنْ أَبِيهِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّهُ رَأَى أَثَرًا فَقَالَ: يَا عَبْدَ اللهِ إِنَّ صُورَةَ الرَّجُلِ وَجْهُهُ، فَلا تَشِنْ صُورَتَكَ.

**لە ئەشعەسی کوڕی ئەبی شەعسائەوە، لە باوکییەوە، لە ئیبن عومەرەوە: ئەو ئەسەرێکی بینی، وتی: ئەی بەندەی خودا، شێوەی پیاو روخسارییەتی، شێوەی خۆت ناشیرین مەکە.**

٧٧٠– عَنْ أَبِي عَوْنٍ قَالَ: رَأَى أَبُو الدَّرْدَاءِ امْرَأَةً بِوَجْهِهَا أَثَرٌ مِثْلُ ثَفِنَةِ الْعَنْزِ، فَقَالَ: لَوْ لَمْ يَكُنْ هذَا بِوَجْهِكِ كَانَ خَيْرًا لَكِ. [هق٢/٢٨٦]

**لە ئەبی عەونەوە، وتی: ئەبو دەردا ئافرەتێکی بینی ئەسەرێك لە روخساریدا بوو، وەك ئەنشکی بزن، وتی: گەر ئەوە لە روخسارت نەبوایە بۆ تۆ باشتر بوو.**

---

[1] **ئامێزگر یان بەخێوکەر: ئەو کەسەیە منداڵێکی دەدرێتە دەست چاودێری و سەرۆکاری دەکات و فێری کار و سیفەتە باشەکانی دەکات، لە فێرکارییەکان وەك مامۆستایەك وایە بۆ منداڵەکە–و.**

(٤٩)

## سورة الحجرات

### ئایەتی: ﴿لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ﴾ [الحجرات: ٢]

٧٧١- (خ) عَنْ نَافِعِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: كَادَ الْخَيِّرَانِ أَنْ يَهْلِكَا: أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ رضي الله عنهما، رَفَعَا أَصْوَاتَهُمَا عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم حِينَ قَدِمَ عَلَيْهِ رَكْبُ بَنِي تَمِيمٍ، فَأَشَارَ أَحَدُهُمَا بِالأَقْرَعِ بْنِ حابِسٍ أَخِي بَنِي مُجَاشِعٍ، وَأَشَارَ الآخَرُ بِرَجُلٍ آخَرَ. قَالَ نَافِعٌ: لاَ أَحْفَظُ اسْمَهُ.، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ لِعُمَرَ: ما أَرَدْتَ إِلاَّ خِلاَفِي! قَالَ: ما أَرَدْتُ خِلاَفَكَ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا فِي ذلِكَ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ﴾ الآيَةَ.

قَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ: فَمَا كانَ عُمَرُ يُسْمِعُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَعْدَ هذِهِ الآيَةِ حَتَّى يَسْتَفْهِمَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ ذلِكَ عَنْ أَبِيهِ؛ يَعْنِي: أَبَا بَكْرٍ. [خ٤٨٤٥، (٤٣٦٧)]

(خ) لە نافیعی ئیبن عومەرەوە، لە ئیبن ئەبی مولەیكەوە، وتی: خەریك بوو دوو كەسە پڕ خێرەكە -ئەبوبەكر و عومەر(خوایان لێ ڕازی بێت)- تیابچن، لای پێغەمبەر(ﷺ) دەنگیان بەرزكردەوە، كاتێك كۆمەڵی بەنی تەمیم هاتن بۆ لای پێغەمبەر، یەكێكیان[1] ئاماژەی بۆ ئەقرەعی كوڕی حابس برای بەنی موجاشیع كرد[2]، ئەویتریان ئاماژەی بە پیاوێ تر كرد، نافیع وتی: ناوەكەیم لەبیرنەماوە، ئەبوبەكر بە عومەری وت: تەنها دەتەوێ پێچەوانەی من بیت، لەوەدا دەنگیان بەرزبوویەوە، خودا(سبحانه وتعالى) ئایەتی دابەزاند: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ﴾، ئایەتەكە.

---

(١) واتە: ئەبوبەكر-و.

(٢) واتە: بۆ دانانی لەسەر هۆزەكەی وەك گەورە و ئەمیریان-و.

ئیبن زوبەیر[1] وتی: لەدوای ئەم ئایەتە عومەر دەنگی نەدەگەیشتنە بیستنی پێغەمبەری خودا تا داوای حاڵی کردنی لێ دەکرد، ئەوەی لە باوکییەوە باس نەکرد، واتە: ئەبوبەکر[2].

**٧٧٢-** (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم افْتَقَدَ ثَابِتَ بْنَ قَيْسٍ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ أَنا أَعْلَمُ لَكَ عِلْمَهُ. فَأَتَاهُ فَوَجَدَهُ جالِساً في بَيْتِهِ، مُنَكِّساً رَأْسَهُ، فَقَالَ: ما شَأْنُكَ؟ فَقَالَ: شَرٌّ، كانَ يَرْفَعُ صَوْتَهُ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَأَتَى الرَّجُلُ فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ قَالَ كَذَا وَكَذَا. فَقَالَ مُوسى بْنُ أَنَسٍ: فَرَجَعَ المَرَّةَ الآخِرَةَ بِبِشَارَةٍ عَظِيمَةٍ، فَقَالَ: **(اذْهَبْ إِلَيْهِ، فَقُلْ لَهُ: إِنَّكَ لَسْتَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَلكِنْ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ)**. [خ٣٦١٣]

(خ) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی سابیتی کوڕی قەیسی پرسی، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من هەواڵت بۆ دەزانم، هات بۆ لای بینی لە ماڵەوە دانیشتووە و سەری داخستووە، پێی وت: چیتە؟ وتی: "شەڕ، ئەو دەنگی بەرز دەکردەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا(ﷺ)، کارەکانی پووچ بوونەتەوە و ئەو لە ئەهلی ئاگرە"[3]، پیاوەکە هات و هەواڵی دا بە پێغەمبەر ئەو ئاوا و ئاوا دەڵێت، موسای کوڕی ئەنەس دەڵێت: جارێکی تر بە مژدەیەکی مەزنەوە گەڕایەوە و فەرمووی: **(بڕۆ بۆ لای و پێی بڵێ: تۆ لە ئەهلی ئاگر نیت، بەڵکو لە ئەهلی بەهەشتی)**.

---

[1] دەبێ ئەم ناوە (ابن الزهیر) بێت نەك (ابن الزبیر)، چونکە ابن زوهەیر کوڕی زوهەیری کوڕی عەبدوڵای کوڕی جەدعانە کە بە (ابن أبي مولیكة) بەناوبانگە و کونییەکەی بریتییە لە (أبو بكر)-و.

[2] لە باوکییەوە واتە: لە ئەبوبەکرەوە کە کونیەی (ابن أبي مولیكة)یە-و.

[3] تا ئەم جێگە قسەی سابیتی کوڕی قەیسە و باس لە خۆی دەکات-و.

**ئایەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ﴾ [الحجرات: ٤]**

**٧٧٣-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ فِي قَوْلِهِ: **﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾**. قَالَ: فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ حَمْدِي زَيْنٌ وَإِنَّ ذَمِّي شَيْنٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(ذَاكَ اللهُ)**. [ت٣٢٦٧]

* صحيح.

**لە بەرائی کوڕی عازیبەوە، دەربارەی ئایەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾، وتی: پیاوێك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، (حەمدم جوانییە و زەمم ناشیرینی)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە خودایە).**

**ئایەتی: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ﴾ [الحجرات: ٧]**

**٧٧٤-** عَنْ أَبِي نَضْرَةَ قَالَ: قَرَأَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ: **﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ﴾**، قَالَ: هَذَا نَبِيُّكُمْ صلّى الله عليه وسلّم يُوحَى إِلَيْهِ، وَخِيَارُ أَئِمَّتِكُمْ لَوْ أَطَاعَهُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُوا، فَكَيْفَ بِكُمُ الْيَوْمَ. [ت٣٢٦٩]

* صحيح الإسناد.

**لە ئەبی نەزرەوە، وتی: ئەبو سەعیدی خودری وتی: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ﴾، وتی: ئەوە پێغەمبەرەکەتانە(ﷺ) وەحی بۆ رەوانە دەکرێت، بەڵام باشترینی ئیمامانی ئێوە گەر لە زۆر شت گوێڕایەڵیان بکەن تووشی تەنگەلانی و نارەحەتی دەبن، ئەی دەبێ ئەمڕۆتان چۆن بێت[1]؟!.**

---

[1] باس لە رۆژگارێك دەکات دەسەڵاتداران لە ریزی چاکان دەرچوون و ستەم لە رەعییەتی خۆیان دەکەن-و.

**ئایەتی: ﴿وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ﴾ [الحجرات: ٧]**

**٧٧٥-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ﴾. قَالَ: الشُّعُوبُ: الْقَبَائِلُ الْعِظَامُ، وَالْقَبَائِلُ: الْبُطُونُ. [خ٣٤٨٩]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): ﴿وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ﴾، وتی: "الشعوب" بریتییە لە هۆزی گەورە(گەل)، "القبائل" بریتییە لە تیرە و بنەماڵەکان.**

**٧٧٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَطَبَ النَّاسَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ فَقَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ اللهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ، وَتَعَاظُمَهَا بِآبَائِهَا، فَالنَّاسُ رَجُلاَنِ: رَجُلٌ بَرٌّ تَقِيٌّ كَرِيمٌ عَلَى اللهِ، وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ هَيِّنٌ عَلَى اللهِ، وَالنَّاسُ بَنُو آدَمَ، وخلقَ اللهُ آدَمَ مِنْ تُرَابٍ، قَالَ اللهُ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾). [ت٣٢٧٠]

* صحيح.

**لە ئیبن عومەرەوە: رۆژی فەتحی مەککە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاری بۆ خەڵك دا و فەرمووی: (ئەی خەڵکینە، خودا لوتبەری نەفامی و خۆ مەزن کردنی بە باب و باپیران لە ئێوە لابرد، خەڵکی دوو پیاون: پیاوێکی چاکەکاری تەقوادار بەڕێز لای خودا، لەگەڵ بەدڕەفتارێکی بەدبەختی سووك لای خودا، خەڵکی رۆڵەی ئادەمن، خودا ئادەمی لە خاك دروست کرد، خودا دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾.**

## (٥٠)

## سورة ق

### ئایەتی: ﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ﴾ [ق: ١٨]

**٧٧٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ۝١٨﴾. قَالَ: يَا غُلامُ، أَسْرِجِ الفَرَسَ، إِسْقِ مَاءً، لا يُكْتَبُ إلا الخَيْرُ والشَّرُّ. [ك٣٧٣٠/ مخ٣٠٧/١٢]

* إسناده صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، دەربارەی ئایەتی: ﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ۝١٨﴾، وتی: ئەی غولام، ئەسپەكە زین بكە، ئاوێك بگێڕە[1]، تەنها خێر و شەڕ دەنوسرێت.**

### ئایەتی: ﴿وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ﴾ [ق: ٤٠]

**٧٧٨-** (خ) عَنْ ابنِ عباسٍ قال: أَمَرَهُ أَنْ يُسبِّحَ فِي أَدْبَارِ الصَّلَوَاتِ كُلِّهَا؛ يَعْنِي قَوْلَهُ: ﴿وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ﴾. [خ٤٨٥٢]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: خودا فەرمانی بە پێغەمبەر كرد لەدوای هەموو نوێژەكان تەسبیحات بكات، مەبەستی ئەو بەشەی ئایەتەكەیە: ﴿وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ﴾.**

---

[1] زانایان دەربارەی مانای قسەكەی ئیبن عەباس لەسەر ئایەتەكە: (ئەی غولام ئەسپەكە زین بكە، ئاوێك بگێڕە) دەڵێن: واتە ئەم قسانە(ئەسپەكە زین بكە، ئاوێك بگێڕە) نانوسرێن، بەڵكو (تەنها خێر و شەڕ) دەنوسرێن، واتە: قسەی ئاسایی نانوسرێت، قسەیەك دەنوسرێت خێر یان شەڕی لێوە پەیدا بێت-و.

## (٥١)

## سورة الذاريات

### ئایەتی: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا۝١﴾ [الذاريات: ١]

**٧٧٩**- عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: رَأَيْتُ أَمِيرَ المؤْمِنِينَ عَلَّيَ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَامَ عَلى المِنْبَرِ فَقَالَ: سَلُونِي قَبْلَ أَنْ لا تَسْأَلُونِي، وَلَنْ تَسْأَلوا بَعْدي مِثْلي، قَالَ: فَقَامَ ابْنُ الكَوَّاءِ فَقَالَ: يَا أَمِيْرَ المؤْمِنِينَ، ما ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا۝١﴾؟ قَالَ: الرِّيَاحُ، قَالَ: فَمَا ﴿فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا۝٢﴾؟ قَالَ: السَّحَابُ، قَالَ: فَمَا ﴿فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا۝٣﴾؟ قَالَ: السُّفُنُ، قَالَ: فَمَا ﴿فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا۝٤﴾؟ قَالَ: الملائِكَةُ، قَالَ: فَمَنِ ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ۝٢٨ جَهَنَّمَ﴾ [إبراهيم: ٢٨]؟ قَالَ: مُنَافِقُو قُرَيْشٍ. [ك٣٧٣٦]

* قال الذهبي: صحيح.

لە ئەبی توفەیلەوە وتی: ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبی تالیم(خوا لێی ڕازی بێت) بینی، لەسەر مینبەر وەستا بوو و وتی: پرسیارم لێ بکەن بەرلەوەی نەتوانن پرسیارم لێ بکەن، لەدوای من پرسیار لە نموونەی وەك من ناکەن، وتی: "ابن الكوّاء" هەستا و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا۝١﴾ چییە؟، وتی: "با"ن، وتی: ﴿فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا۝٢﴾ چییە؟ وتی: هەورن، وتی ئەدی: ﴿فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا۝٣﴾ چییە؟ وتی: کەشتین، وتی: ﴿فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا۝٤﴾ چییە؟ وتی: فریشتەن، وتی: ئەوانە کێن: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ۝٢٨ جَهَنَّمَ﴾ [إبراهيم: ٢٨]؟ وتی: دووڕووانی قورەیشن.

## (٥٣)

## سورة والنجم

### ئایەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ﴾ [النجم: ٣٢]

**٧٨٠-** عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿إِلَّا ٱللَّمَمَ﴾؛ قَالَ: زِنى العَينينِ النّظَرُ، وزِنى الشّفتينِ التّقْبِيلُ، وزِنى اليَدينِ البَطْشُ، وزِنى الرّجْلَيْنِ المشْيُ، وَيُصَدِّقُ ذَلك أَوْ يُكَذِّبُهُ الفَرْجُ، فَإِنْ تَقَدَّمَ بِفَرْجِهِ كَانَ زَانياً، وَالا فَهُو اللَّمَمُ. [ك٣٧٥١]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە ئیبن مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت)، دەربارەی فەرموودەی خودا(عز وجل): ﴿إِلَّا ٱللَّمَمَ﴾، وتی: زینای دوو چاو نەزەرە، زینای دوو لێو ماچە، زینای دوو دەست دەستلێدانە، زینای دوو لاق رۆیشتنە، داوێن یان ئەوانە بەڕاست دەگێڕێت یان بە درۆیان دەخاتەوە، گەر داوێنی خۆی پێشخست زیناکەرە[1]، ئەگەر نە، بریتییە لە گوناهی بچووك(اللمم).**

## (٥٥)

## سورة الرحمن

### ئایەتی:﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ [الرحمن: ١٣]

**٧٨١-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى أَصْحَابِهِ، فَقَرَأَ عَلَيْهِمْ سُورَةَ الرَّحْمَنِ مِنْ أَوَّلِهَا إِلَى آخِرِهَا، فَسَكَتُوا، فَقَالَ: (**لَقَدْ قَرَأْتُهَا عَلَى الجِنِّ، لَيْلَةَ الجِنِّ، فَكَانُوا أَحْسَنَ مَرْدُوداً مِنْكُمْ، كُنْتُ كُلَّمَا أَتَيْتُ عَلَى قَوْلِهِ: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، قَالُوا: لاَ بِشَيْءٍ مِنْ نِعَمِكَ رَبَّنَا نُكَذِّبُ، فَلَكَ الحَمْدُ**). [ت٣٢٩١]

* حسن.

---

[1] واتە: گەر لە کارەکە رۆیشتە پێشەوە و دەستی پێکرد ئەوە دەبێتە زیناکەر-و.

له جابرەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ لای هاوەڵانی و سورەتی (الرحمن)ی له سەرەتاوە تا کۆتایی بەسەریاندا خوێندەوە، ئەوانیش بێدەنگ بوون، فەرمووی: **(شەوی جن بەسەر جنۆکەدا خوێندمەوە لە ئێوە باشتر بەرخوردیان هەبوو، هەرکات دەچوومە سەر ئایەتی: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، دەیانوت: پەروەردگار، شتێك له نیعمەتەکانی تۆ بە درۆنازانین، و حەمد بۆ تۆیە).**

## ئایەتی: ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ [الرحمن: ٢٩]

**٧٨٢**- (خ) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: **﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾**؛ قَالَ: (مِنْ شَأْنِهِ أَنْ يَغْفِرَ ذَنْباً، وَيُفَرِّجَ كَرْباً، وَيَرْفَعَ قَوْماً، وَيَخْفِضَ آخَرِينَ).

[خ مقدمة السورة/ جه٢٠٢]

* حسن.

(خ) لە ئەبی دەرداوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەربارەی فەرموودەی خودا(سبحانه وتعالى): ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾، فەرمووی: **(لە شانوشکۆی خودا ئەوەیە لە گوناهێك خۆشببێت و تەنگانە و ناخۆشییەك بڕەوێنێتەوە و کۆمەڵێك بەرزبکاتەوە، و خەڵکانێکی تر دابەزێنێت).**

## (٥٦)

## سورة الواقعة

## ئایەتی: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ۝٧٥﴾ [الواقعة: ٢٩]

**٧٨٣**- عَنِ ابْنِ عَبَّاس: **﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ۝٧٥﴾**. قَالَ: نُجُوم القُرْآنِ، فُصِل القرآنُ مِنَ الذِّكر، فَوُضِعَ فِي بَيْتِ العِزَّةِ فِي السَّماءِ الدُّنيا، فَجَعَلَ جِبْرِيلُ يُنَزِّلُهُ عَلى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يُرَتِّلُهُ تَرْتِيلاً. [مخ١٠/١٦٢، ٣٩١]

* إسناده حسن.

لە ئیبن عەباسەوە: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ۝٧٥﴾، وتی: "نجوم القرآن- بەشەکانی قورئان"، لە "الذكر" قورئان دابڕا و لە "بيت العزة" لە ئاسمانی دنیا دانرا، جیبریل دایدەبەزاند بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) و بە تەرتیل پێی دەخوێندەوە"[1].

### ئایەتی: ﴿وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ﴾ [الواقعة: ٨٢]

٧٨٤- (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مُطِرَ النَّاسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (أَصْبَحَ مِنَ النَّاسِ شَاكِرٌ، وَمِنْهُمْ كَافِرٌ، قَالُوا: هذِهِ رَحْمَةُ اللهِ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَقَدْ صَدَقَ نَوْءُ كَذَا وَكَذَا). قَالَ: فَنَزَلَتْ هذِهِ الآيَةُ: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ۝٧٥﴾ حَتَّى بَلَغَ ﴿وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ۝٨٢﴾ [الواقعة]. [م٧٣]

(م) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) باران بەسەر خەڵکیدا باری، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ڕۆژمان لێبوویەوە خەڵکانێك هەبوون شوکرکار و خەڵکانێکیش بێباوەڕ و سپڵە، ئەوان وتیان: ئەمە ڕەحمەتی خودایە، هەندێکیش وتیان: کەشوهەوای ئەوە و ئەوە ڕاستی کرد)**، وتی: ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ۝٧٥﴾، تا گەیشتە: ﴿وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ۝٨٢﴾[الواقعة].

## (٥٧)

## سورة الحديد

### ئایەتی: ﴿أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾ [الحديد: ١٦]

٧٨٥- (م) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: مَا كَانَ بَيْنَ إِسْلاَمِنَا وَبَيْنَ أَنْ عاتَبَنَا اللهُ بِهذِهِ الآيَةِ: ﴿أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾، إِلاَّ أَرْبَعُ سِنِينَ. [م٣٠٢٧]

[وانظر: ٦٧١]

---

[1] واتە: قورئان لە (الذكر)ەوە بە یەکجار دابەزی بۆ (بيت العزة)، ئەوەش ئایەتی: ﴿إِنَّا أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ﴾ [الدخان: ٣]، لە (بيت العزة)ەوە بەش بەش جیبریل دایبەزاند بۆ سەر دڵی پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەم ئایەتە ئاماژەی پێ دەکات: ﴿وَقُرۡآنًا فَرَقۡنَاهُ لِتَقۡرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكۡثٖ وَنَزَّلۡنَاهُ تَنزِيلًا﴾ الإسراء: [١٠٦]-و.

(م) لە ئیبن مەسعوودەوە وتی: نێوان موسڵمانبوونمان و سەرزەنشتی خودا بۆ ئێمە بەم ئایەتە: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ﴾ چوار ساڵ بوو.

**(٥٨)**

## سورة المجادلة

### ئایەتی: ﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ﴾ [المجادلة: ٨]

**٧٨٦-** عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ يَهُودِيّاً أَتَى عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَصْحَابِهِ فَقَالَ: السَّامُ عَلَيْكُمْ، فَرَدَّ عَلَيْهِ الْقَوْمُ، فَقَالَ نَبِيُّ اللهَ صلّى الله عليه وسلّم: **(هَلْ تَدْرُونَ مَا قَالَ هَذَا)**؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، سَلَّمَ يَا نَبِيَّ اللهِ! قَالَ: **(لاَ، وَلَكِنَّهُ قَالَ كَذَا وَكَذَا، رُدُّوهُ عَلَيَّ)**، فَرَدُّوهُ، قَالَ: **(قُلْتَ: السَّامُ عَلَيْكُمْ)**؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عِنْدَ ذَلِكَ: **(إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، فَقُولُوا: عَلَيْكَ)**، قَالَ: عَلَيْكَ مَا قُلْتَ، قَالَ: ﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ﴾.　[ت٣٣٠١]

* صحيح.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: یەهوودییەك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی و وتی: "السام علیکم-مردنتان لەسەر بێت"، خەڵکەکە وەڵامیاندایەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (دەزانن ئەوە چی وت؟)، وتیان: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، سەلامی کرد، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (نەخێر، بەڵام ئاوا و ئاوای وت، بیگێڕنەوە)، ئەوانیش کابرایان گەڕاندەوە، فەرمووی: (وتت: "السام علیکم؟")، وتی: بەڵێ، لەو بارەدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئەهلی کیتاب سەلامی لێکردن بڵێن: "علیك-لەسەر تۆ")، وتی: "علیك ما قلت-ئەوەی وتت لەسەر تۆ بێت"، وتی: ﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ﴾.**

## (٥٩)

## سورة الحشر

### ئایەتی: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟...﴾ [الحشر: ٨- ١٠]

**٧٨٧-** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ قَالَ: النَّاسُ عَلى ثَلاثِ مَنَازِلَ: فَمَضَتْ مِنْهُمُ اثْنَتَانِ وَبَقِيَتْ وَاحِدَةٌ، فَأَحْسَنُ مَا أَنْتُم كَائِنُونَ عَلَيْهِ أَنْ تَكُونُوا بِهذِهِ المَنْزِلَةِ الَّتِي بَقِيَتْ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ...﴾ الآية، ثُمَّ قَالَ: هَؤلاءِ المهَاجِرُونَ، وَهذِهِ مَنْزِلَةٌ، وَقَدْ مَضَتْ. ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ...﴾ الآية، ثُمَّ قَالَ: هَؤلاءِ الأَنْصَارُ، وَهَذِهِ مَنْزِلَةٌ، وَقَدْ مَضَتْ. ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ...﴾ الآية، قَالَ: فَقَدْ مَضَتْ هَاتَانِ المَنْزِلَتَانِ، وَبَقِيَتْ هَذِهِ المَنْزِلَةُ، فَأَحْسَنُ مَا أَنْتُمْ كَائِنُونَ عَلَيْهِ أَنْ تَكُونُوا بِهذِهِ المَنْزِلَةِ الَّتِي بَقِيَتْ. [ك ٣٨٠٠]

* قال الذهبي: صحيح.

**له سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: خەڵکی لەسەر سێ مەنزیلەتن: دوانیان ڕۆیشتن، و یەکێکیان ماوەتەوە، باشترین شتێك ئێوە لەسەری بن ئەوەیە دەستبگرن بەم مەنزیلەتەی ماوەتەوە، پاشان ئەمەی خوێندەوە:﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ...﴾ ئایەتەکە، پاشان وتی: ئەوانە بریتی بوون لە کۆچکەران، ئەمە مەنزیلەتێك کە تێپەڕیوە، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ...﴾ ئایەتەکە، پاشان وتی: ئەوانە بریتین لە ئەنصار، ئەمەش مەنزیلەتێکە تێپەڕیوە، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ...﴾ ئایەتەکە، وتی: ئەو دوو مەنزیلەتە تێپەڕین و ئەم مەنزیلەتە ماوەتەوە، بۆیە باشترین شتێك ئێوە لەسەری بن ئەوەیە دەستبگرن بەم مەنزیلەتەی کە ماوەتەوە.**

## ئایەتی: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ [الحشر: ٩]

**٧٨٨**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَبَعَثَ إِلَى نِسَائِهِ فَقُلْنَ: ما مَعَنَا إِلاَّ الماءُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ يَضُمُّ . أَوْ يُضِيفُ . هَذَا**)؟ فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: أَنَا، فَانْطَلَقَ بِهِ إِلَى امْرَأَتِهِ، فَقَالَ: أَكْرِمِي ضَيْفَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَتْ: مَا عِنْدَنَا إِلاَّ قُوتُ صِبْيَانِي، فَقَالَ: هَيِّئِي طَعَامَكِ، وَأَصْبِحِي سِرَاجَكِ، وَنَوِّمِي صِبْيَانَكِ إِذَا أَرَادُوا عَشَاءً. فَهَيَّأَتْ طَعَامَهَا، وَأَصْبَحَتْ سِرَاجَهَا، وَنَوَّمَتْ صِبْيَانَهَا، ثُمَّ قامَتْ كَأَنَّهَا تُصْلِح سِرَاجَهَا فَأَطْفَأَتْهُ، فَجَعَلاَ يُرِيَانِهِ أَنَّهُمَا يَأْكُلاَنِ، فَبَاتَا طَاوِيَيْنِ! فَلَمَّا أَصْبَحَ غَدَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**ضَحِكَ اللهُ اللَّيْلَةَ . أَوْ عَجِبَ . مِنْ فَعَالِكُمَا**)، فأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾. [خ٣٧٩٨/ م٢٠٥٤]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر کەسێکی نارد بۆ لای هاوسەرەکانی وتیان: تەنها ئاومان لەماڵدایە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کێ ئەمە لەخۆدەگرێت یان میوانداری دەکات؟)، پیاوێك لە ئەنصار وتی: من، بردییەوە بۆ لای خانەوادەکەی، و وتی: رێز لە میوانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بگرە، ژنەکە وتی: تەنها خۆراکی منداڵەکانم هەیە، پیاوەکە وتی: خۆراکەکە ئامادە بکە و چراکەت پێ بکە و گەر منداڵەکان ژەمی شێوانیان ویست بیانخەوێنە، ژنەکە خواردنەکەی ئامادە کرد و چراکەی پێکرد و منداڵەکانی خەواند، پاشان هەستا وەك ئەوەی چراکە چاك بکات کوژاندییەوە، وایان نیشانی میوانەکە دا خواردن دەخۆن، ئەو شەوە بە برسێتی مانەوە، کاتێك رۆژیان لێبوویەوە هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەر فەرمووی: (ئەم شەو خودا پێکەنی-یان سەرسوڕما- لە کارەکەی هەردووکتان)، خودا(سبحانە وتعالی) ئایەتی دابەزاند:** ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾.

## (٦١)

## سورة الصف

### ئایەتی: ﴿لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ [الصف: ٢]

**٧٨٩**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ قَالَ: قَعَدْنَا نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَتَذَاكَرْنَا، فَقُلْنَا: لَوْ نَعْلَمُ أَيَّ الْأَعْمَالِ أَحَبُّ إِلَى اللهِ لَعَمِلْنَاهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ① يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ②﴾ [الصف: ١- ٢]. قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ: فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [ت٣٣٠٩/ مي٢٤٣٥]

* صحيح الإسناد.

**لە عەبدوڵای کوڕی سەلامەوە، وتی: چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتین و یادمان دەکردەوە، وتمان: گەر بمانزانیبا چ کارێك لای خودا باشترینە ئەنجاممان دەدا، خودا(سبحانە وتعالی) ئایەتی دابەزاند:** ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ① يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ②﴾ [الصف: ١- ٢]**، عەبدوڵای کوڕی سەلام وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) خوێندییەوە بەسەرماندا.**

## (٦٢)

## سورة الجمعة

### ئایەتی: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُواْ بِهِمْ﴾ [الجمعة: ٣]

**٧٩٠**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَأُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الجُمُعَةِ: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُواْ بِهِمْ﴾، قَالَ: قُلْتُ: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟

فَلَمْ يُرَاجِعْهُ حَتَّى سَأَلَ ثَلاَثاً، وَفِينَا سَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ، وَضَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ، ثُمَّ قَالَ: (لَوْ كَانَ الإِيمَانُ عِنْدَ الثُّرَيَّا، لَنَالَهُ رِجالٌ. أَوْ رَجُلٌ. مِنْ هؤُلاَءِ).

[خ٤٨٩٧/ م٢٥٤٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین، سورەتی جومعەی بۆ سەر دابەزی: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُواْ بِهِمْ﴾، وتی: ئەوانە کێن، ئەی پێغەمبەری خودا؟ وەڵامینەدایەوە تا سیان پرسیاریان کرد، سەلمانی فارسی لە ناومان بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی خستە سەر سەلمان، پاشان فەرمووی: **(گەر ئیمان لە حەوتەوانان بێت پیاوانێك-یان پیاوێك- لەمانە دەیگەنێ)**.

## ئایەتی: ﴿وَإِذَا رَأَوْاْ تِجَٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيْهَا﴾ [الجمعة: ١١]

**٧٩١-** (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ اللهِ ﷺ قَالَ: أَقْبَلَتْ عِيرٌ وَنَحْنُ نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم الجُمُعَةَ، فَانْفَضَّ النَّاسُ؛ إِلاَّ اثْنَيْ عَشَرَ رجُلاً، فَنَزَلَتْ هذِهِ الآيَةُ: ﴿وَإِذَا رَأَوْاْ تِجَٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا﴾.

[خ٢٠٦٤ (٩٣٦)/ م٨٦٣]

(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: کاروانییەك گەڕایەوە و ئێمە رۆژی جومعە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژمان دەکرد، خەڵکی بڵاوەیان لێکرد جگە لە دوازدە پیاو، ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَإِذَا رَأَوْاْ تِجَٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا﴾.

## (٦٣)

## سورة المنافقون

## ئایەتی: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ﴾ [المنافقون: ١]

**٧٩٢-** (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي سَفَرٍ أَصَابَ النَّاسَ فِيهِ شِدَّةٌ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيّ لأَصْحَابِهِ: لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ حَتَّى

يَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِهِ. وَقَالَ: لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى المَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ. فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَأَخْبَرْتُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ أُبَيٍّ فَسَأَلَهُ، فَاجْتَهَدَ يَمِينَهُ ما فَعَلَ، قالُوا: كَذَبَ زَيْدٌ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَوَقَعَ فِي نَفْسِي مِمَّا قالُوا شِدَّةٌ، حَتَّى أَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل تَصْدِيقِي فِي: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ﴾، فَدَعَاهُمُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لِيَسْتَغْفِرَ لَهُمْ، فَلَوَّوْا رُؤُوسَهُمْ. وَقَوْلُهُ: ﴿خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ﴾ [المنافقون:٤]، قَالَ: كانُوا رِجالاً أَجْمَلَ شَيْءٍ.
[خ٤٩٠٣، (٤٩٠٠)/ م٢٧٧٢]

(ق) لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە، وتی: لە سەفەرێك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتینە دەرەوە، تەنگەلانی و ناڕەحەتی تووشی خەڵك هات، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی بە هاوەڵانی خۆی وت: خەرجی مەکەن بۆ ئەوانەی لای پێغەمبەری خودان تا لە دەوری بڵاوە بکەن، هەروەها وتی: کە گەڕاینەوە بۆ مەدینە بەعیززەتەکان زەلیلەکان دەردەکەن، هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵم پێدا، ناردی بە دوای عەبدوڵای کوڕی ئوبەیدا و پرسیاری لێکرد، تا توانی سوێندی خوارد و کۆشا، وتیان: زەید درۆی کردووە لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، لەوەی ئەوان وتیان توندی و ناڕەحەتی کەوتە دەروونمەوە، تا خودا لە ئایەتی: ﴿إِذَا جَـآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُـونَ﴾، قسەکانی منی بە ڕاستگێڕا، پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردن بۆئەوەی داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکات، بەڵام سەری خۆیان بادا، ﴿خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ﴾ [المنافقون:٤]، وتی: پیاوانێك بوون جوانترین کەس[1].

---

[1] واتە: ئەو کۆمەڵە درووە لە جەستە و ڕوواڵەتدا پیاوانێکی جوانخاس و پێکەوتوو بوون، بەڵام دڵیان نەخۆش بە دەردی دووڕوویی، خودا دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ﴾ [المنافقون: ٤] "کاتێك دەیانبینی بە جەستە و ڕوواڵەتیان سەرسام دەبیت"، بەڵام وەك تەختەداری وشك و ڕەق و گیانیان تێدا نییە: ﴿كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ﴾ [المنافقون: ٤]–و.

(٦٤)

## سورة التغابن

### ئایەتی: ﴿إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ﴾ [التغابن: ١٤]

**٧٩٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَسَأَلَهُ رَجُلٌ عَنْ هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾. قَالَ: هَؤُلَاءِ رِجَالٌ أَسْلَمُوا مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، وَأَرَادُوا أَنْ يَأْتُوا النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَأَبَى أَزْوَاجُهُمْ وَأَوْلَادُهُمْ أَنْ يَدَعُوهُمْ أَنْ يَأْتُوا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمَّا أَتَوْا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَأَوْا النَّاسَ قَدْ فَقُهُوا فِي الدِّينِ، هَمُّوا أَنْ يُعَاقِبُوهُمْ، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾ الْآيَةَ. [ت٣٣١٧]

* حسن.

لە ئیبن عەباسەوە، پیاوێك پرسیاری ئەم ئایەتەی لێکرد: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾، وتی: ئەوانە پیاوانێك بوون لە ئەهلی مەککە موسڵمان بووبوون، دەیانویست بێن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام ژنەکانیان و منداڵەکانیان لێیان نەدەگەڕان بێن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، کاتێك هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەڵکیان بینی لە دین حاڵی بووبوون، هەوڵیاندا سزای ژن و منداڵەکانیان بدەن، بۆیە خودا(عز وجل) ئایەتی دابەزاند: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾، ئایەتەکە.

(٦٦)

## سورة التحريم

### ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ﴾ [التحريم: ١]

**٧٩٤-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كانَ يَمْكُثُ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، وَيَشْرَبُ عِنْدَهَا عَسَلاً، فَتَوَاصَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ: أَنَّ أَيَّتَنَا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ صلّى الله

عليه وسلّم فَلْتَقُلْ: إِنِّي أَجِدُ مِنكَ رِيحَ مَغَافِيرَ، أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟ فَدَخَلَ عَلَى إِحْدَاهُما فَقَالَتْ لَهُ ذلِكَ، فَقَالَ: (لاَ، بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، وَلَنْ أعودَ لَهُ)، فَنَزَلَتْ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ﴾ إِلَى ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾ لِعَائِشَةَ وَحَفْصَةَ، ﴿وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ﴾ [التحريم:٣] لِقَوْلِهِ: (بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً).

[خ٥٢٦٧، (٤٩١٢)/ م١٤٧٤]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) لای زەینەبی کچی جەحش دەمایەوە، و هەنگوینی لا دەخواردەوە، من و حەفصە ڕێکەوتین، پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای هەرکاممان با بڵێت: من بۆنی "مغافیر"ت[1] لێ دەکەم، "مغافیر"ت خواردووە؟ ڕۆیشت بۆ لای یەکێکیان و ئەوەی پێ وت، فەرمووی: **(نەخێر، بەڵکو لای زەینەبی کچی جەحش هەنگوینم خواردووەتەوە، جارێکی تر ناگەڕێمەوە بۆ خواردنەوەی)**، ئایەت دابەزی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ﴾ تا ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾ بە عائیشە و حەفصە[2]، ﴿وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ﴾ [التحريم:٣]، بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەر: **(بەڵکو هەنگوینم خواردووەتەوە)**[3].

## ئایەتی: ﴿رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا﴾ [التحريم: ٨]

**٧٩٥**- عن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما في قول الله عزّ وجل: ﴿يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَـٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا﴾،

---

[1] مغافیر: کۆی وشەی (مغفور)ە، شیلەیەکی شیرینە لە درەختی (عرفط) دەچۆڕێت-د-و.

[2] واتە: (إن تتوبا إلى الله)-گەر هەردووکتان بۆ لای خودا تەوبە بکەن بە عائیشە و حەفصە دەڵێت-و.

[3] واتە: (وإذ أسرّ النبي إلى بعض أزواجه حديثا)-پێغەمبەر بە نهێنی قسەیەکی بۆ یەکێك لە هاوسەرەکانی خۆی کرد، بریتییە لەو لە قسەی پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوسەرەکانی فەرموو: (بەڵکو هەنگوینم خواردووەتەوە)-و.

قَالَ: لَيْسَ أَحَدٌ مِن الموَحِّدين إِلَّا يُعْطَى نُورًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَأَمّا المنافِق فَيُطفىَ نُورُه، وَالْمُؤْمِنُونَ مُشْفِقٌ مِمَّا رأى منْ إِطْفَاءِ نُورِ المنافِق، فَهُوَ يَقُول: ﴿رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا﴾. [ك٣٨٣٢]

ضعّفه الذهبي فقال: عُتبة واهٍ.

له ئیبن عەباسەوە(خوایان لیّ رازی بێت) دەربارەی فەرموودەی خـودا(عز وجـل): ﴿يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا﴾، رۆژی قیامەت یەك بە یەكی یەكتاپەرستان نورێكی پێ دەدرێت، كەسی دووڕوو نوورەكەی دەكوژێتەوە، باوەڕدار دەترسێت كاتێك دەبینێ نووری دووڕوو دەكوژێتەوە، بۆیە ئەو دەڵێت: ﴿رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا﴾.

## ئایەتی: ﴿فَخَانَتَاهُمَا﴾ [التحريم: ١٠]

**٧٩٦**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿**فَخَانَتَاهُمَا**﴾، قَالَ: مَا زَنَتا، أَما امرْأَةُ نُوحٍ فَكَانَتْ تَقُولُ لِلنّاسِ: إِنَّهُ مَجْنُونٌ، وَأَمَّا امرْأَةُ لُوطٍ فَكَانَتْ تَدُلُّ عَلى الضَّيْفِ، فَذَلك خِيَانَتُهما. [ك٣٨٣٣]

* قال الذهبي: صحيح.

له ئیبن عەباسەوە(خوایان لیّ رازی بێت): ﴿فَخَانَتَاهُمَا﴾، وتی: زینایان نەكرد بوو[١]، ژنەكەی نوح بە خەڵكی دەوت: ئەو شێتە، ژنەكەی "لوط"یش خەڵكی دەهێنا بۆ سەر میوان، ئەوە ناپاكی ئەوان بوو.

[١] واتە: ژنەكەی نوح و ژنەكەی "لوط" زینایان نەكرد بوو و مانای خیانەتەكە لە ئایەتەكەدا زینا ناگەیەنێت-و.

## (٧٠)

## سورة المعارج

### ئایەتی: ﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ [المعارج: ٤]

**٧٩٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ۝٤﴾، قَالَ: يوم القيامة. ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ۝٤٧﴾ [الحج:٤٧]، قَالَ: مِنْ الأيامِ السِّتَّةِ الَّتِي خَلَقَ اللهُ فيها السَّماواتِ والأَرْضَ، وفِي قَوْلِهِ: ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ [السجدة:٥] قَالَ: مِنَ الأَيامِ السِّتة الَّتِي خَلَقَ اللهُ فِيها السَّماوات والأَرْضَ. [مخ١٢/١١٤]

* إسناده حسن.

**لە ئیبن عەباسەوە، دەربارەی: ﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ۝٤﴾، وتی: ڕۆژی قیامەت، ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ۝٤٧﴾ [الحج:٤٧]، وتی: لەو شەش ڕۆژەی خودا تیایاندا ئاسمانەکان و زەوی دروستکرد، هەروەها دەربارەی: ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ [السجدة:٥]، وتی: لەو شەش ڕۆژەی خودا تیایاندا ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد.**

## (٧١)

## سورة نوح

### ئایەتی: ﴿لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ﴾[نوح: ٢٣]

**٧٩٨-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: صَارَتِ الأَوْثَانُ الَّتِي كانَتْ فِي قَوْمِ نُوحٍ فِي الْعَرَبِ بَعْدُ، أَمَّا وُدٌّ: كَانَتْ لِكَلْبٍ بِدُومَةِ الجَنْدَلِ، وَأَمَّا سُوَاعٌ: كانَتْ لِهُذَيْلٍ، وَأَمَّا يَغُوثُ: فَكانَتْ لِمُرَادٍ، ثمَّ لِبَنِي غُطَيْفٍ بِالجُرُفِ عِنْدَ سَبا، وأَمَّا يَعُوقُ: فَكانَتْ لِهَمْدَانَ، وَأَمَّا نَسْرٌ:

فَكَانَتْ لِحِمْيَرَ، لآلِ ذِي الْكَلاَعِ. أَسْمَاءُ رِجَالٍ صَالِحِينَ مِنْ قَوْمِ نُوحٍ، فَلَمَّا هَلَكُوا أَوْحَى الشَّيْطَانُ إِلَى قَوْمِهِمْ: أَنِ انْصِبُوا إِلَى مَجَالِسِهِمْ الَّتِي كَانُوا يَجْلِسُونَ أَنْصَاباً وَسَمُّوهَا بِأَسْمَائِهِمْ، فَفَعَلُوا، فَلَمْ تُعْبَدْ، حَتَّى إِذَا هَلَكَ أُولَئِكَ، وَتَنَسَّخَ الْعِلْمُ، عُبِدَتْ. [خ٤٩٢٠]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): ئەو بتانەی لە ناو گەلەکەی نوحدا بوون دواتر هاتنە ناو عەرەب، "ود" بتی کەلب بوو لە "دمة الجندل"، "سواع": بتی هوزەیل بوو، "يغوث" بتی موراد بوو، پاشان بتی بەنی غوتەیف بوو لە "جُرُف"، لای "سبا"، "يعوق" بتی هەمدان بوو، "نسر": بتی حیمەیر بوو، بۆ ئالی "ذي الكلاع"، ئەوانە ناوی کۆمەڵێك پیاوی صالح بوون لە گەلەکەی نوح، کاتێك تیاچوون شەیتان وەحی بۆ گەلەکەیان کرد لەو شوێنانەی ئەوان دادەنیشتن بت داکوتن و بە ناوی ئەوان ناویان بنێن، ئەوانیش ئەوەیان ئەنجامدا، ئەو بتانە نەپەرستران تا ئەوانە[1] و زانست سڕایەوە و پەرستران.**

## (٧٢)

## سورة الجن

### ئایەتی: ﴿قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ﴾ [الجن: ١]

**٧٩٩-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: انْطَلَقَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم في طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، عامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكاظٍ، وَقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمُ الشُّهُبُ، فَرَجَعَتِ الشَّيَاطِينُ، فَقَالُوا: ما لَكُمْ؟ فَقَالُوا: حِيلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ، قَالَ: ما حالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ إِلاَّ ما حَدَثَ، فَاضْرِبُوا مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، فَانْظُرُوا ما هَذَا الأَمْرُ الَّذِي حَدَثَ. فَانْطَلَقُوا، فَضَرَبُوا مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، يَنْظُرُونَ ما هَذَا الأَمْرُ الَّذِي حالَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، قَالَ: فَانْطَلَقَ الَّذِينَ تَوَجَّهُوا نَحْوَ تِهَامَةَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِنَخْلَةَ، وَهُوَ عامِدٌ إِلَى سُوقِ عُكاظٍ، وَهُوَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ صَلاَةَ

---

**[1] تا ئەوانە: واتە تا ئەو خەڵکەی یەکەمجار بتەکانیان بۆ داتاشین تیاچوون-و.**

الْفَجْرِ، فَلَمَّا سَمِعُوا الْقُرْآنَ تَسَمَّعُوا لَهُ، فَقَالوا: هَذَا الَّذِي حالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، فَهُنَالِكَ رَجَعُوا إِلى قَوْمِهِمْ، فَقَالُوا: يَا قَوْمَنَا ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ۝ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ۝﴾. وَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل عَلَى نَبِيِّهِ صلّى الله عليه وسلّم: ﴿قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾، وَإِنَّمَا أُوحِيَ إِلَيْهِ قَوْلُ الجِنّ. [خ٤٩٢١ (٧٧٣)/ م٤٤٩]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی دەرچوون، ڕوویان لە بازاڕی عوکاز کرد، شەیتانەکان لە هەواڵی ئاسمان دابڕابوون، و نەیزەك ڕەوانە دەکرایە سەریان، بۆیە شەیتانەکان دەگەڕانەوە، وتیان: ئێوە چیتانە؟ وتیان: ئێمە لە هەواڵی ئاسمان دابڕاوین و نەیزەك ڕەوانە دەکرێت بۆ سەرمان، وتی: تەنها ڕوودانی ڕوداوێك بووەتە هۆی دابڕانی ئێوە لە هەواڵی ئاسمان، بڕۆن خۆرهەڵات و خۆرئاوای زەوی بگەڕێن، بزانن ئەوە چییە ڕوویداوە، ئەوانیش بڵاوەیان کرد و خۆرهەڵات و خۆرئاوای زەوی گەڕان، وردەبوونەوە بزانن ئەو شتە چییە ئەوانی لە هەواڵی ئاسمان دابڕیوە، وتی: ئەوانەی ڕویان کردە "تِهامَة" ڕۆیشتن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) لای دارخورمایەك، ئەو[1] بازاڕی عوکازی بەمەبەست گرتبوو، ئەو نوێژی بەیانی بە هاوەڵانی دەکرد، کاتێك قورئانیان بیست گوێیان بۆ هەڵدا و وتیان: ئەمەیە ئێوەی لە هەواڵی ئاسمان دابڕیوە، لێرەوە گەڕانەوە بۆ لای هۆزەکەیان، وتیان: ئەی هۆز، ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ۝ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ۝﴾، خودا(عز وجل) ئایەتی بۆ سەر پێغەمبەرەکەی دابەزاند: ﴿قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾.

٨٠٠– (ق) عَنْ مَعْنِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: سَأَلْتُ مَسْرُوقاً: مَنْ آذَنَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم بِالْجِنِّ لَيْلَةَ اسْتَمَعُوا الْقُرْآنَ؟ فَقَالَ: حَدَّثَنِي أَبُوكَ ـ يَعْنِي عَبْدَ اللهِ ـ أَنَّهُ آذَنَتْ بِهِمْ شَجَرَةٌ. [خ٣٨٥٩/ م٤٥٠/ ١٥٣]

---

[1] ئەو: واتە پێغەمبەر(ﷺ)–و.

(ق) لە مەعنی کوڕی عبدالرحمانەوە، وتی: گوێم لە باوکم بوو وتی: پرسیارم لە مەسرووق کرد: کێ بە جنەکانی ڕاگەیاند ئەو پێغەمبەرە ئەو شەوەی گوێیان لە قورئان گرت؟ وتی: باوکت -واتە: عەبدوڵا- بۆی باس کردم درەختێك پێی ڕاگەیاندن.

٨٠١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ الْجِنُّ يَصْعَدُونَ إِلَى السَّمَاءِ يَسْتَمِعُونَ الْوَحْيَ، فَإِذَا سَمِعُوا الْكَلِمَةَ زَادُوا فِيهَا تِسْعاً، فَأَمَّا الْكَلِمَةُ فَتَكُونُ حَقّاً، وَأَمَّا مَا زَادُوهُ فَيَكُونُ بَاطِلاً، فَلَمَّا بُعِثَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مُنِعُوا مَقَاعِدَهُمْ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِإِبْلِيسَ، وَلَمْ تَكُنْ النُّجُومُ يُرْمَى بِهَا قَبْلَ ذَلِكَ، فَقَالَ لَهُمْ إِبْلِيسُ: مَا هَذَا إِلاَّ مِنْ أَمْرٍ قَدْ حَدَثَ فِي الْأَرْضِ، فَبَعَثَ جُنُودَهُ، فَوَجَدُوا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَائِماً يُصَلِّي بَيْنَ جَبَلَيْنِ، أُرَاهُ قَالَ: بِمَكَّةَ، فَلَقُوهُ فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: هَذَا الَّذِي حَدَثَ فِي الْأَرْضِ. [ت٣٣٢٤]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە وتی: جن بەرزدەبوونەوە بۆ ئاسمان گوێیان بۆ وەحی دەگرت، گەر وشەیەکیان ببیستبایە نۆیان بۆ زیاد دەکرد، کەلیمەکە حەق دەبوو، ئەوەی بۆیان زیاد کرد بوو باتڵ دەبوو، کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕەوانە کرا ڕێگرییان لێکرا لە شوێنەکانیان، ئەوەیان بۆ ئیبلیس باس کرد، بەرلەوە ئەستێرە[1] هەڵنەدەدرا، ئیبلیس پێی وتن: ئەوە هیچی تر نییە جگە لە ڕوودانی کارێك لە زەوی، سەربازەکانی خۆی ڕەوانە کرد، بینییان پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نێوان دوو چیا بە پێوە وەستاوە و نوێژ دەکات، پێموایە وتی لە مەککە، بە ئیبلیس گەیشتنەوە و هەواڵەکەیان پێدا[2]، وتی[3]: ئەوە ئەو شتەیە لە زەوی ڕوویداوە.

---

[1] ئەستێرە: واتە: ئەو نەیزەکانەی دەگیرێنە شەیتانەکان-و.

[2] واتە: جنەکان بە ئیبلیس گەیشتنەوە-و.

[3] واتە: ئیبلیس وتی-و.

## (٧٣)

## سورة المزمل

### ئایەتی: ﴿قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ [المزمل: ٢]

**٨٠٢–** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ أَوَّلُ الْمُزَّمِّلِ، كَانُوا يَقُومُونَ نَحْواً مِنْ قِيَامِهِمْ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، حَتَّى نَزَلَ آخِرُهَا، وَكَانَ بَيْنَ أَوَّلِهَا وَآخِرِهَا سَنَةٌ. [د١٣٠٥]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: كاتێك سەرەتای "المزمل" دابەزی وەك ئەوەی لە مانگی رەمەزان پێیهەڵدەستن[١] شەوان ئەنجامیان دەدا، تا كۆتاییەكەی دابەزی[٢]، نێوان سەرەتاكەی و كۆتاییەكەی ساڵێك بوو.**

## (٧٤)

## سورة المدثر

### ئایەتی: ﴿ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا﴾ [المدثر: ١١]

**٨٠٣–** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ الوَلِيدَ بْنَ المغيرةِ جَاءَ إِلى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَرأَ عَلَيْهِ القُرْآنَ، فَكَأَنَّهُ رَقَّ لَهُ، فَبَلَغَ ذلكَ أَبَا جَهْلٍ فَأَتَاهُ فَقَالَ: يَا عَمِّ، إِنَّ قَوْمَكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَجْمَعُوا لَكَ مَالاً، قَالَ: لِمَ، قَالَ: لِيُعْطُوكَهُ فَإِنَّكَ أَتَيْتَ مُحَمَّداً لِتَعْرِضَ لِمَا قِبَلَهُ، قَالَ: قَدْ عَلِمَتْ قُرَيْشٌ أَنِّي مِنْ أَكْثَرِهَا مَالاً، قَالَ: فَقُلْ فِيهِ قَوْلاً يَبْلُغُ قَوْمَكَ أَنَّكَ مُنْكِرٌ لَهُ، أَوْ أَنَّكَ كَارِهٌ لَهُ، قَالَ: وَمَاذَا أَقُولُ؟ فَوَاللهِ مَا فِيكُمْ رَجُلٌ أَعْلَمُ بِالأَشْعَارِ مِنِّي، وَلا أَعْلَمُ بِرَجَزِهِ وَلاَ بِقَصِيدِهِ مِنِّي، وَلا بِأَشْعَارِ الجِنِّ، وَاللهِ مَا يُشْبِهُ الَّذِي يَقُولُ شَيْئاً مِنْ هذا، وَوَاللهِ إِنَّ لِقَوْلِهِ الَّذِي يَقُولُ حَلاوَةً، وإِنَّ عَلَيْهِ لَطَلاوَةً، وإِنَّهُ لَمُثْمِرٌ أَعْلاهُ، مُغْدِقٌ أَسْفَلُهُ، وَإِنَّهُ لَيَعْلُو وَمَا يُعْلى، وإِنَّهُ لَيَحْطِمُ ما تَحْتَهُ! قَالَ: لا يَرْضَى

---

[١] **واتە: وەك نوێژی تەراویح كە لە رەمەزان ئەنجام دەدرێت ئەوان نوێژیان لە شەودا ئەنجام دەدا–و.**

[٢] **واتە: كۆتایی سورەتەكە–و.**

عَنْكَ قَوْمُكَ حَتَّى تَقُولَ فِيْهِ، قَالَ: فَدَعْنِي حَتَّى أُفَكِّرَ، فَلَمَّا فَكَّرَ قَالَ: هذا ﴿سِحْرٌ يُؤْثَرُ﴾ يَأْثُرُهُ عَنْ غَيْرِهِ، فَنَزَلَتْ: ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا﴾. [ك٣٨٧٢]

* قال الذهبي: على شرط البخاري.

له ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): وەلیدی کوڕی موغیرە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر قورئانی بەسەردا خوێندەوە، وەك ئەوەی دڵی بۆی نەرم بووبێت، ئەوە بە ئەبو جەهل گەیشتەوە، هات بۆ لای و وتی: مامی خۆم، هۆزەکەت دەیانەوێت ماڵ و سامانت بۆ کۆبکەنەوە، وتی: بۆچی؟ وتی: بۆئەوەی پێتیبدەن، چونکە تۆ چوویت بۆ لای محەمەد بۆئەوەی لەوەوە شتێکت دەستبکەوێت، وتی: قورەیش دەزانێت ماڵ و سامانم لە هەموویان زۆرترە، وتی: کەوابوو شتێك دەربارەی بڵێ[1]، بە قەومەکەت بگاتەوە تۆ ئەو رەددەکەیەوە[2]، یان تۆ بێزاری لەو، وتی: چی بڵێم؟ سوێند بە خودا، هیچ کەس لە ئێوە لە من شارەزاتر نییە بە هۆنراوە، هیچ کەس لە ئێوە بە سەرەوا و داڕشتنی هۆنراوە لە من زاناتر نییە، هەر بەو جۆرە بە هۆنراوەی جین، سوێند بە خودا ئەوەی ئەو دەیڵێ لە هیچ کام لەمانە ناچێت، سوێند بە خودا شیرینی هەیە لەو قسەی ئەو دەیڵێت، جوانی و قەشەنگی لەسەرە، سەرەوەی بەردارە و ژێرەوەی تەڕ و پاراو، ئەوە بەرز و بڵند دەبێت و هیچ شتێك سەریناکەوێت، ئەوە ژێرەوەی خۆی تێکدەشکێنێت، ئەبو جەهل وتی: قەومەکەت لێت رازی نابن تا شتێك دەربارەی دەڵێی، وتی: لێمگەڕێ تا بیردەکەمەوە، کاتێك بیریکردەوە وتی ئەمە: ﴿سِحْرٌ يُؤْثَرُ﴾، لە کەسانی تری دەگوێزێتەوە، ئایەت دابەزی: ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا﴾.

---

[1] واتە: شتێکی خراپ دەربارەی محەمەد بڵێ-و.

[2] واتە: قسەیەك بڵێ بە هۆزەکەت بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی تۆ باوەڕت بە محەمەد نەهێناوە-و.

**ئایەتی: ﴿فَرَّتۡ مِن قَسۡوَرَةِۭ﴾ [المدثر: ٥١]**

**٨٠٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿فَرَّتۡ مِن قَسۡوَرَةِۭ ٥١﴾. قَالَ: هُوَ رِكْزُ النَاسِ. قَالَ سُفْيَانُ: يعني: حِسُّهُمْ وَأَصْوَاتُهُمْ. [مخ١١/٢٥٢]

* إسناده صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، دەربارەی ئایەتی: ﴿فَرَّتۡ مِن قَسۡوَرَةِۭ ٥١﴾، وتی: ئەوە بریتییە لە "رِكْز"ی خەڵك، واتە: هەست و دەنگیان.**

**(٧٥)**

**سورة القيامة**

**ئایەتی: ﴿لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ﴾ [القيامة: ١٦]**

**٨٠٥-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ١٦﴾. قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُعَالِجُ مِنَ التَّنْزِيلِ شِدَّةً، وَكَانَ مِمَّا يُحَرِّكُ شَفَتَيْهِ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَأَنَا أُحَرِّكُهُمَا لَكُمْ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُحَرِّكُهُمَا، فَحَرَّكَ شَفَتَيْهِ. فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ١٦ إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ ١٧﴾ قَالَ: جَمْعَهُ لَكَ فِي صَدْرِكَ وَتَقْرَأَهُ، ﴿فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ ١٨﴾ قَالَ: فَاسْتَمِعْ لَهُ وَأَنْصِتْ، ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ ١٩﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا أَنْ تَقْرَأَهُ، فَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَعْدَ ذلِكَ إِذَا أَتَاهُ جِبْرِيلُ اسْتَمَعَ، فَإِذَا انْطَلَقَ جِبْرِيلُ قَرَأَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم كَمَا قَرَأَهُ. [خ٥/ م٤٤٨]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە دەربارەی ئایەتی: ﴿لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ١٦﴾، وتی: لە دابەزینی قورئان پێغەمبەر رووبەڕووی توندی و گرانی دەبوویەوە، لەوەوە دوو لێوی دەبزواند-ئیبن عەباس وتی: من دوو لێوم بۆ ئێوە دەجوڵێنم وەك چۆن پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوو لێوی دەجوڵاند، بۆیە دوو لێوی خۆی جوڵاند- خودا**

ئایەتی دابەزاند: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ۝١٦ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ۝١٧﴾، وتی: کۆکردنەوەی بۆ تۆ لە سینەدا و خوێندنەوەی[1]، ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ۝١٨﴾، وتی: گوێی بۆ بگرە و بێدەنگ بە[2]، ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ۝١٩﴾، پاشان لەسەر ئێمەیە تۆ بیخوێنییەوە، لەدوای ئەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێك جیبریل دەهات بۆ لای گوێی دەگرت، کاتێك جیبریل دەڕۆیشت ئەو چۆن خوێندبوویەوە پێغەمبەر(ﷺ) بەو جۆرە دەیخوێندەوە.

## (٧٧)

## سورة المرسلات

### ئایەتی: ﴿إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ﴾ [المرسلات: ٣٢]

٨٠٦- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿تَرْمِى بِشَرَرٍ﴾ كُنَّا نَعْمِدُ إِلَى الخَشَبَةِ ثَلاَثَةَ أَذْرُعٍ، أَوْ فَوْقَ ذلِكَ، فَنَرْفَعُهُ لِلشِّتَاءِ، فَنُسَمِّيهِ الْقَصَرَ. ﴿كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ۝٣٣﴾: حِبَالُ السُّفْنِ تُجْمَعُ حَتَّى تَكُونَ كَأَوْسَاطِ الرِّجَالِ. [خ٤٩٣٣ (٤٩٣٢)]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): ﴿تَرْمِى بِشَرَرٍ﴾، دەچووین داری وشکمان دەکرد بە سێ قۆڵ، یان لەسەرو ئەوەوە، و بەرزمان دەکردەوە بۆ زستان و پێمان دەوت "القَصَرَ"، ﴿كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ۝٣٣﴾، پەت و گوریسی کەشتی، کۆدەکرێتەوە تا بە باڵای میانە لە پیاوانی لێ دێت.

---

[1] واتە: کۆکردنەوەی قورئان لە سینەی پێغەمبەر و خوێندنەوەی بە زمان لەسەر خودا بوو.

[2] فەرمان بە پێغەمبەر دەکات کاتێك جیبریل وەحییەکەی بەسەردا دەخوێنێتەوە بێدەنگ بێت و گوێ بگرێت و دوو لێوی بە خوێندنەوەی نەبزوێنێت.

## (٧٨)

## سورة النبأ

### ئایەتی: ﴿وَكَأۡسٗا دِهَاقٗا﴾ [النبأ: ٣٤]

٨٠٧- (خ) عَنْ عِكْرِمَةَ: ﴿وَكَأۡسٗا دِهَاقٗا﴾، قَالَ: مَلأَى مُتَتَابِعَةً. قَالَ: وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ: اسْقِنَا كَأْساً دِهَاقاً. [خ٣٨٣٩، ٣٨٤٠]

(خ) لە عیکریمەوە: ﴿وَكَأۡسٗا دِهَاقٗا﴾، وتی: پڕ و بەدوای یەکتردا[1]، وتی: هەروەها ئیبن عەباس دەڵێت: گوێم لە باوکم بوو لە سەردەمی نەفامی دەیوت: "أسقِنا كأسا دهاقا-کوپێکی پڕی یەك لەدوای یەکمان پێ نۆش بکە".

## (٨٠)

## سورة عبس

### ئایەتی: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾ [عبس: ١]

٨٠٨- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: أُنْزِلَ ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾ فِي ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ الأَعْمَى، أَتَى رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَجَعَلَ يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَرْشِدْنِي، وَعِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلٌ مِنْ عُظَمَاءِ الْمُشْرِكِينَ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُعْرِضُ عَنْهُ، وَيُقْبِلُ عَلَى الآخَرِ، وَيَقُولُ: (أَتَرَى بِمَا أَقُولُ بَأْساً)؟ فَيَقُولُ: لاَ، فَفِي هَذَا أُنْزِلَ. [ت٣٣٣١]

* صحيح الإسناد.

لە عائیشەوە وتی: دەربارەی ئیبن ئوم مەکتوومی نابینا ئایەتی: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾، دابەزێنرا، ئەو هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و دەیوت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕێنموونیم بکە، پیاوێك لە مەزنانی هاوەڵدانەران لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پشتی لێهەڵکرد و ڕووی لە

[1] واتە: پیاڵەی شەرابی پڕ و یەك لەدوای یەك-و.

پیاوەکەی تر کرد و دەیفەرموو: (ئایا ئەوەی من دەیڵێم خراپییەکی تێدایە؟)، پیاوەکە دەیوت: نەخێر، دەربارەی ئەمە دابەزێنراوە[1].

### ئایەتی: ﴿وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا﴾ [عبس: ٣١]

٨٠٩- عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ قَالَ: ﴿فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبًّا ۝ وَعِنَبًا وَقَضۡبًا ۝ وَزَيۡتُونًا وَنَخۡلًا ۝ وَحَدَآئِقَ غُلۡبًا ۝ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ۝﴾[عبس: ٢٧- ٣١]، قَالَ: فَكُلُّ هذا قَدْ عَرَفْنَاهُ، فَمَا الأَبُّ؟ ثُمَّ نَقَضَ عَصاً كَانَتْ فِي يَدِهِ فَقَالَ: هذا لَعَمْرُ اللهِ التَّكَلُّفُ، اتَّبِعُوا مَا تَبَيَّنَ لَكُمْ مِنْ هذا الكِتَابِ. [ك٣٨٩٧]

* قال الذهبي: على شرطهما.

له عومەری کوڕی خەتابەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: ﴿فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبًّا ۝ وَعِنَبًا وَقَضۡبًا ۝ وَزَيۡتُونًا وَنَخۡلًا ۝ وَحَدَآئِقَ غُلۡبًا ۝ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ۝﴾[عبس: ٢٧- ٣١]، هەموو ئەمانەمان زانی، ئەی "الأب" چییە؟ پاشان عەساکەی دەستی خۆی بەرزکردەوە[2] و وتی: سوێند بە خودا ئەمە زۆرلەخۆکردن(التکلف)ە، شوێنی ئەوە بکەون بۆتان ڕۆشن دەبێتەوە لەم کتێبە.

## (٩٣)

## سورة الضحى

### ئایەتی: ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ﴾ [الضحى: ٣]

٨١٠- (ق) عَنْ جُنْدُبِ بْنِ سُفْيَانَ ﷺ قَالَ: اشْتَكَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمْ يَقُمْ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً، فَجَاءَتِ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: يَا مُحَمَّدُ، إِنِّي لأَرْجُو أَنْ يَكُونَ شَيْطَانُكَ قَدْ تَرَكَكَ،

---

[1] واتە: ئەو ئایەتانە دەربارەی ئەم ڕووداوە دابەزیوە-و.

[2] واتە: عەساکەی دەستی لە خۆی بەرزکردەوە، چونکە پرسیارکردنەکەی بە باش نەبینی-و.

لَمْ أَرَهُ قَرِبَكَ مُنْذُ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلاثاً. فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿وَٱلضُّحَىٰ ۝١ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ۝٢ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝٣﴾. [خ٤٩٥٠ (١١٢٤)/ م١٧٩٧]

(ق) لە جوندوبی كوڕی سوفیانەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەخۆشكەوت، دوو شەو یان سێ شەو هەڵنەستا، ئافرەتێك هات بۆ لای و وتی: ئەی محەمەد، من رجام وایە شەیتانەكەت وازیلێهێنابیت، ماوەی دوو یان سێ شەوە لە نزیك تۆوە نابینم، خودا(عز وجل) ئایەتی دابەزاند: ﴿وَٱلضُّحَىٰ ۝١ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ۝٢ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝٣﴾.

## (٩٩)

## سورة الزلزلة

### ئایەتی: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ﴾ [الزلزلة: ٧]

٨١١- عَنْ صَعْصَعَةَ بْنِ مُعَاوِيَةَ ـ عَمِّ الْفَرَزْدَقِ ـ: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَرَأَ عَلَيْهِ: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ۝٨﴾، قَالَ: حَسْبِي، لاَ أُبَالِي أَنْ لاَ أَسْمَعَ غَيْرَهَا. [حم٢٠٥٩٣ . ٢٠٥٩٥]

* إسناده صحيح، رجاله رجال الشيخين.

لە صەعصەعەی كوڕی موعاویەوە -مامی فەرەزدەق- ئەو هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتانەی بەسەردا خوێندەوە: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ۝٨﴾، وتی بەسمە، باكێكم نییە شتێكی تر نەبیستم.

## (١٠٢)

## سورة التكاثر

### ئایەتی: ﴿ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ﴾ [التكاثر: ٨]

٨١٢– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ﴾، قَالَ الزُّبَيْرُ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَأَيُّ النَّعِيمِ نُسْأَلُ عَنْهُ، وَإِنَّمَا هُمَا الْأَسْوَدَانِ: التَّمْرُ وَالْمَاءُ؟ قَالَ: (أَمَا إِنَّهُ سَيَكُونُ). [ت٣٣٥٦/ جه٤١٥٨]

* حسن الإسناد.

لە عەبدوڵای کوڕی زوبەیرەوە، لە باوکییەوە، وتی: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ﴾، زوبەیر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە پرسیاری چ نیعمەتێکمان لێ دەکرێت، تەنها دوو ڕەشەکەمان[1] هەیە، خورما و ئاو؟ فەرمووی: **(أما إنه سيكون–دەربارەی ئەوانە پرسیار دەکرێت[2])**.

٨١٣– عَنْ أبي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ أَوَّلَ مَا يُسْأَلُ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ـ يَعْنِي: الْعَبْدَ ـ مِنَ النَّعِيمِ أَنْ يُقَالَ لَهُ: أَلَمْ نُصِحَّ لَكَ جِسْمَكَ، وَنُرْوِيَكَ مِنَ الْمَاءِ الْبَارِدِ). [ت٣٣٥٨]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(یەکەمین شتێك لە نیعمەت لە ڕۆژی قیامەت پرسیاری لێ دەکرێت–واتە لە بەندە– ئەوەیە پێی بوترێت: ئایا جەستەی تۆمان تەندروست(ساغڵەم) نەکرد و لە ئاوی سارد پاراومان نەکردی؟)**.

---

[1] ڕەنگی خورما زاڵ بووە بەسەر بێ ڕەنگی ئاودا و دەوترێت دوو ڕەشەکە، بە زۆری خورمای مەدینە ڕەنگی ڕەشە–و.

[2] وتراویشە مانای (أما إنه سيكون) واتە: لە داهاتوودا دەرگای نیعمەت بە رووی ئێوەدا دەکرێتەوە و خودا لە دواڕۆژ پرسیارتان لێ دەکات دەربارەیان–و.

٨١٤- عَنْ جابرٍ قَالَ: أَتَانِي النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَأَطْعَمْتُهُمْ رُطَباً، وَأَسْقَيْتُهُمْ مَاءً، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(هَذَا مِنَ النَّعِيمِ الَّذِي تُسْأَلُونَ عَنْهُ)**.

[حم١٤٦٣٧]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**له جابرەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر هاتن بۆ لام، منیش خورمای تازەپێگەیشتووم دەرخوارددان و ئاوم پێ نۆش کردن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەمە لەو نیعمەتانەیە دەربارەیان پرسیارتان لێ دەکرێت).**

**(١٠٨)**

## سورة الكوثر

**ئایەتی: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ﴾ [الكوثر: ١]**

٨١٥- (خ) عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عائِشَةَ ، قَالَ: سَأَلْتُهَا عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ①﴾؟ قالَتْ: نَهَرٌ أُعْطِيَهُ نَبِيُّكُمْ صلّى الله عليه وسلّم، شَاطِئَاهُ عَلَيْهِ دُرٌّ مُجَوَّفٌ، آنِيَتُهُ كَعَدَدِ النُّجُومِ. [خ٤٩٦٥]

**(خ) له ئەبی عوبەیدەوە، له عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پرسیارم له عائیشە کرد دەربارەی فەرموودەی خودا(سبحانه وتعالى): ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ①﴾؟ وتی: روبارێکە خودا بە پێغەمبەرەکەی ئێوەی بەخشیوە، دوو بەری روبارەکە دوڕی ناو بۆشە، دەفرەکانی وەك ژمارەی ئەستێرەکانە.**

٨١٦- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أَنَّهُ قَالَ فِي الْكَوْثَرِ: هُوَ الْخَيْرُ الَّذِي أَعْطَاهُ اللهُ إِيَّاهُ.

قَالَ أَبُو بِشْرٍ: قُلْتُ لِسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ: فَإِنَّ النَّاسَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُ نَهَرٌ فِي الجَنَّةِ؟ فَقَالَ سَعِيدٌ: النَّهَرُ الذِي فِي الجَنَّةِ مِنَ الخَيْرِ الَّذِي أَعْطَاهُ اللهُ إِيَّاهُ. [خ٤٩٦٦]

[انظر: **٢٢٥**].

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) ئەو دەربارەی "الكوثر" وتویەتی: ئەوە ئەو خێرەیە کە خودا پێی بەخشیوە.

ئەبو بیشر دەڵێت: وتم: بە سەعیدی کوڕی جوبەیر: خەڵکی بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەوە روبارێکە لە بەهەشت؟ سەعید وتی: ئەو روبارەی کە لە بەهەشتە لەو خێرەیە کە خودا بەوی بەخشیوە[1].

## (١١٠)

## سورة العصر

### ئایەتی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ﴾ [النصر: ١]

٨١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّ هَذِهِ السُّورَةَ لَمَّا أُنْزِلَتْ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ① وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ②﴾، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَيَخْرُجُنَّ مِنْهُ أَفْوَاجاً، كَمَا دَخَلُوهُ أَفْوَاجاً). [مي ٩١]

رجاله ثقاة.

لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): کاتێك ئەم سورەتە ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ① وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ②﴾ بۆ سەر پێغەمبەری(ﷺ) دابەزی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(چەندین کۆمەڵی لێ دەچنە دەرەوە، وەك چۆن چەندین کۆمەڵ هاتنە ناویەوە).**

٨١٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: لَمَّا أُنْزِلَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ①﴾ كَانَ يُكْثِرُ إِذَا قَرَأَهَا وَرَكَعَ أَنْ يَقُولَ: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ) ثَلاَثاً. [حم٣٦٨٣/ ك٣٩٨٣]

* قال الذهبي: صحيح.

---

[1] واتە: روبارەکە بەشێکە لەو خێرە مەزنە(الكوثر) خودا بە پێغەمبەری بەخشیوە-و.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: کاتێك ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ①﴾، بۆ سەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) دابەزی، گەر بیخوێندبایە و ڕکوعی ببردبایە دەیفەرموو: **(سبحانَك اللهم ربنا وبحمدك، أللهم اغفر لي إنك أنت التواب الرحيم–پاك و بێگەردی و حەمد بۆ تۆ ئەی پەروەردگارمان، خودایە لێمخۆشبە، تۆ "التواب الرحيم"ی).**

## (١١٢)

## سورة الإخلاص

### ئایەتی: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ [الإخلاص: ١]

**٨١٩**– (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (قَالَ اللهُ: كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذلِكَ، وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُن لَهُ ذلِكَ، فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ: لَنْ يُعِيدَنِي كَمَا بَدَأَنِي، وَلَيْسَ أَوَّلُ الخَلْقِ بِأَهْوَنَ عَلَيَّ مِنْ إِعَادَتِهِ، وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ: اتَّخَذَ اللهُ وَلَداً وَأَنَا الأَحَدُ الصَّمَدُ، لَمْ أَلِدْ وَلَمْ أُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لِي كُفْأً أَحَدٌ). [خ٤٩٧٤ (٣١٩٣)]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(خودا فەرمووی: ئادەمیزاد بەدرۆم دەخاتەوە و ئەو کارەی بۆ نەبوو، جنێوم پێ دەدات و ئەو کارەی بۆ نەبوو، بە درۆخستنەوەی بۆ من ئەو قسەیەتی: زیندووم ناکاتەوە وەك چۆن دەروستی کردم، یەکەمجار دروستکردن لام سووکتر نییە لە زیندووکردنەوەی، جنێودانی بە من ئەو قسەیەتی: خودا کوڕی هەیە، من "الأحد الصمد"م، هیچم لێ لەدایك نابێت و لەدایك نەبووم و یەکێك نییە هاوتا و هاوشانم بێت).**

## ١- دەروازەی: واجبوونی گوێڕایەڵی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٨٢٠-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ؛ إِلاَّ مَنْ أبى**) ، قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَنْ يَأْبى؟ قَالَ: (**مَنْ اطَاعَنِي دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أبى**). [خ٧٢٨٠]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەموو ئومەتەکەم دەچنە بەهەشتەوە جگە لەوەی نایەوێت)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کێ نایەوێت؟ فەرمووی: **(هەر کەس گوێڕایەڵیم لێ بکات دەچێتە بەهەشتەوە، هەر کەس لێم یاخی ببێت نایەوێت)**.

**٨٢١-** (ق) وعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**وَما أَمَرْتُكُمْ به فَخُذُوهُ، وَما نَهَيْتُكُمْ عنْه فَانتَهُوا**). [جه١]

صحيح

هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوەی فەرمانم پێکردن وەریبگرن، ئەوەش نەهیم لێکردن کۆتایی پێ بهێنن[1])**.

**٨٢٢-** وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللهَ**). [جه٣]

* صحيح

هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس گوێڕایەڵی من بکات گوێڕایەڵی خودای کردووە، هەر کەس لە من یاخی بێت لە خودا یاخی بووە)**.

---

[1] واتە: دەستی لێ هەڵبگرن-و.

## ٢- دەروازەی: سوننەت لە وەحییە

**٨٢٣**- عَنْ مَالِكٍ أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا: كِتَابَ اللهِ، وَسُنَّةَ نَبِيِّهِ). [ط ١٦٦٢]

**لە مالیکەوە: پێیگەیشتووە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (دوو شتم لەناو ئێوە بەجێهێڵاوە هەتا دەستیان پێوە بگرن گومڕا نابن، کتێبەکەی خودا، و سوننەتی پێغەمبەرەکەی).**

**٨٢٤**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنِّي قَدْ تَرَكْتُ فيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا: كِتَابَ اللهِ، وَسُنَّتِي، وَلَنْ يَتَفَرَّقا حَتَّى يَرِدَا عَلَيَّ الحَوْضَ). [ك٣١٩]

* صححه الألباني في صحيح الجامع الصغير (٢٩٣٧).

**لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (من دوو شتم لە ناو ئێوە بەجێهێڵاوە لەدوای ئەو دوانە گومڕا نابن: کتێبەکەی خودا و سوننەتم، ئەو دوانە لەیەکتر جیانابنەوە تا دێن بۆ لام لەسەر حەوزەکە).**

## ٣- دەروازەی: دڵنیابوونەوە لە دروستیی فەرموودە

**٨٢٥**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (سَيَكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي أُنَاسٌ يُحَدِّثُونَكُمْ مَا لَمْ تَسْمَعُوا أَنْتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ؛ فَإِيَّاكُمْ وَإِيَّاهُمْ). [م٦]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، فەرمووی: (لە کۆتاییەکانی ئومەتەکەم خەڵکانێك شتانێکتان بۆ باس دەکەن ئێوە و باپیرانتان نەتانبیستوون، ئێوە لەوان ئاگادار دەکەمەوە).**

- وفي رواية: (يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ دَجَّالُونَ كذَّابُونَ، يَأْتُونَكُمْ مِنَ الأَحَادِيثِ بِمَا لَمْ تَسْمَعُوا أَنْتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ؛ فَإِيَّاكُمْ وَإِيَّاهُمْ، لاَ يُضِلُّونَكُمْ وَلاَ يَفْتِنُونَكُمْ). [م٧]

لە ریوایەتێکدا: **(لە ئاخر زەمان دەجالە درۆزنەکان پەیدا دەبن، کۆمەڵێك قسەتان بۆ دەهێنن ئێوە و باپیرانتان نەتانبیستوون، ئێوە لەوان ئاگادار دەکەمەوە، گومڕاتان نەکەن و تووشی فتنەتان نەکەن)**.

**٨٢٦**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عُمَرَ يَسْأَلُهُ، فَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَى رَأْسِهِ مَرَّةً وَإِلَى رِجْلَيْهِ أُخْرَى، هَلْ يَرَى عَلَيْهِ مِنَ الْبُؤْسِ شَيْئاً، ثُمَّ قَالَ لَهُ عُمَرُ: كَمْ مَالُكَ؟ قَالَ: أَرْبَعُونَ مِنَ الْإِبِلِ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَقُلْتُ: صَدَقَ اللهُ وَرَسُولُهُ: **(لَوْ كَانَ لِابْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ ذَهَبٍ لَابْتَغَى الثَّالِثَ، وَلَا يَمْلَأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلَّا التُّرَابُ، وَيَتُوبُ اللهُ عَلَى مَنْ تَابَ)**. فَقَالَ عُمَرُ: مَا هَذَا؟ فَقُلْتُ: هَكَذَا أَقْرَأَنِيهَا أُبَيٌّ، قَالَ: فَمُرَّ بِنَا إِلَيْهِ، قَالَ: فَجَاءَ إِلَى أُبَيٍّ، فَقَالَ: مَا يَقُولُ هَذَا؟ قَالَ أُبَيٌّ: هَكَذَا أَقْرَأَنِيهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، قَالَ: أَفَأُثْبِتُهَا؟ قَالَ: نعم، فَأَثْبَتَهَا. [حم٢١١١١]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای عومەر داوای شتی لێ دەکرد، عومەر جارێك تەماشای سەری کەسەکەی دەکرد و جارێك تەماشای دوو لاقی، تاکو بزانێت شتێك لە هەژاری و نەبوونی پێوە دیارە، پاشان عومەر پێی وت: ماڵ و سامانەکەت چەندە؟ وتی: چل حوشتر، ئیبن عەباس دەڵێت: وتم: خودا و پێغەمبەرەکەی راستیان فەرمووە: **(گەر ئادەمیزاد دوو دۆڵ زێڕی هەبێت هەوڵی سێیەم دەدات، تەنها خۆڵ بۆشایی ناوەوەی ئادەمیزاد پڕ دەکات، خودا تەوبە لە کەسێك قبووڵ دەکات تەوبە دەکات)**، عومەر وتی: ئەمە چییە؟ وتم: ئوبەی بەم جۆرە بەسەر مندا خوێندییەوە، عومەر وتی: هەستە بمانبە بۆ لای ئوبەی، وتی: هات بۆ لای ئوبەی، وتی: بزانە ئەمە چی دەڵێ؟ ئوبەی وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەو جۆرە بەسەر مندا خوێندییەوە، وتی: ئایا جێگیری بکەم؟ وتی: بەڵێ، بۆیە جێگیری کرد.

## ٤- دەروازەی: نووسینی فەرمووده و زانست

**٨٢٧-** (م) عَنِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ تَكْتُبُوا عَنِّي ، وَمَنْ كَتَبَ عَنِّي غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ، وَحدِّثُوا عَنِّي وَلاَ حَرَجَ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ** - قَالَ هَمَّامٌ: أَحْسِبُهُ قَالَ: - **مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ**). [م٣٠٠٤]

(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**لە منەوە مەنووسن، هەر كەس جگە لە قورئان لە منەوە شتێكی نووسیوە با بیسڕێتەوە، لە منەوە بگێڕنەوە و حەرەج و تەنگەلانی تێدا نییە، هەر كەس**–هەمام وتی: وادەزانم فەرمووی: **بە ئەنقەست– درۆ بە دەم منەوە بكات با شوێنی خۆی لە ئاگر خۆشبكات**).

**٨٢٨-** (خـ) عَنْ عبدِ اللهِ بنِ دينارٍ: كتبَ عمرُ بنُ عبدِ العزيزِ إلى أبي بكر بن حزم: انظرْ ما كانَ مِنْ حديثِ رسولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فاكتبْهُ، فإني خفتُ دروسَ العلمِ وذهابَ العلماءِ. [خ. العلم، باب ٣٤]

**(خـ) لە عەبدوڵای كوڕی دینارەوە: عومەری كوڕی عەبدولعەزیز بۆ ئەبی بەكری كوڕی حەزمی نووسی: وردەبەرەوە بزانە كامە فەرموودەی پێغەمبەری خودایە(ﷺ) بینووسەرەوە، من ترسی تیاچوونی زانست و ڕۆیشتنی زانایانمە.**

**٨٢٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: كُنْتُ أَكْتُبُ كُلَّ شَيْءٍ أَسْمَعُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أُرِيدُ حِفْظَهُ، فَنَهَتْنِي قُرَيْشٌ، وَقَالُوا: أَتَكْتُبُ كُلَّ شَيْءٍ تَسْمَعُهُ، وَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَشَرٌ يَتَكَلَّمُ فِي الْغَضَبِ وَالرِّضَا، فَأَمْسَكْتُ عَنِ الْكِتَابِ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَوْمَأَ بِأُصْبُعِهِ إِلَى فِيهِ فَقَالَ: (**اكْتُبْ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! مَا يَخْرُجُ مِنْهُ إِلاَّ حَقٌّ**). [د٣٦٤٦/ مي٥٠١]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای كوڕی عەمرەوە، وتی: هەر شتێكم لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەبیست دەمنووسی، دەمویست لەبەری بكەم، قورەیش نەهێیان لێ كردم و وتیان: ئایا هەر شتێك دەبیستی دەینووسی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) مرۆڤە و لە تووڕەبوون و**

رازیبووندا قسە دەکات، بۆیە منیش خۆم لە نووسین گرتەوە، ئەوەم بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) باس کرد، بە پەنجەی ئاماژەی بۆ دەمی خۆی کرد و فەرمووی: **(بنووسە، سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، تەنها حەقی لێ دێتە دەرەوە).**

## ٥- دەروازەی: (هَـلَـكَ الـمتنطـعون-زیادەڕەوان و ڕۆچووان و سنووربەزێنان تیاچوون)

٨٣٠- (ق) عَنْ عائِشةَ قالَتْ: صَنَعَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم شَيْئاً فَرَخَّصَ فِيهِ، فَتَنَزَّهَ عَنْهُ قَوْمٌ، فَبَلَغَ ذلِكَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَخَطَبَ فَحَمِدَ اللهَ، ثُمَّ قَالَ: **(مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَتَنَزَّهُونَ عَنِ الشَّيْءِ أَصْنَعُهُ، فَوَاللهِ إِنِّي لأَعْلَمُهُمْ بِالله، وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً).**

[خ٦١٠١/ م٢٣٥٦]

(ق) لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) کارێکی ئەنجامدا و تیایدا بە ڕوخسەت کاری کرد، دەستەیەك خۆیان لێ بەدوورگرت، ئەوە بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتەوە، وتاری دا و حەمدی خودای کرد، پاشان فەرمووی: **(خەڵكانێك چییانە خۆیان بەدوور دەگرن لە شتێ من ئەنجامی دەدەم، سوێند بە خودا من زاناترینی ئەوانم بە خودا و لە هەموویان زۆرتر خەشیەم بۆ خودا هەیە).**

٨٣١- (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عُمَرَ فَقَالَ: نُهِينَا عَنِ التَّكَلُّفِ. [خ٧٢٩٣]

(خ) لە ئەنەسەوە، وتی: لای عومەر بووین، وتی: نەهیمان لێکراوە لە "التكلف- زۆر لە خۆ کردن".

٨٣٢- (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ)** قَالَهَا ثَلاَثاً. [م٢٦٧٠]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هلك المتنطعون-زیادەڕەوان و ڕۆچووان و سنووربەزێنان تیاچوون)**، سێ جار ئەوەی فەرموو.

## ٦- دەروازەی: باشترین هیدایەت

**٨٣٣-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ قال: إنَّ أَحْسَنَ الحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ، وَأَحْسَنَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَ﴿إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَآتٍ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ [الأنعام: ١٣٤]. [خ٧٢٧٧ (٦٠٩٨)]

**(خ) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: باشترین (الحدیث-وتە) کتێبەکەی خودایە، باشترین هیدایەت هیدایەتی محەمەدە(ﷺ)، خراپترینی کاروبارەکان داهێنراوەکانن، و** ﴿إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَآتٍ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ [الأنعام: ١٣٤].

**٨٣٤-** (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ الْغَدَ حِينَ بَايَعَ المسْلِمُونَ أَبَا بَكْرٍ، وَاسْتَوَى عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، تَشَهَّدَ قَبْلَ أَبِي بَكْرٍ فَقَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَاخْتَارَ اللهُ لِرَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم الَّذِي عِنْدَهُ عَلَى الَّذِي عِنْدَكُمْ، وهَذَا الْكِتَابُ الَّذِي هَدَى اللهُ بِهِ رَسُولَكُمْ، فَخُذُوا بِهِ تَهْتَدُوا لِمَا هَدَى اللهُ بِهِ رَسُولَهُ. [خ٧٢٦٩ (٧٢١٩)]

**(خ) لە ئەنەسی کوڕی مایکەوە: ئەو گوێی لە عومەر بوو ڕۆژی دوای ئەو ڕۆژەی موسڵمانان بەیعەتیان بە ئەبوبەکر کرد، ڕۆیشتە سەر مینبەرەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، بەر لە ئەبی بەکر شایەتمانی هێنا و وتی: پاشان: خودا ئەوەی لای خۆیەتی بۆ پێغەمبەرەکەی(ﷺ) هەڵبژارد بەسەر ئەوەی لای ئێوەیە، ئەمە ئەو کتێبەیە خودا پێغەمبەرەکەی ئێوەی پێ هیدایەتدا، دەستی پێوە بگرن ڕێنموونی وەردەگرن بۆ ئەو ڕێگەی خودا پێغەمبەرەکەی پێ هیدایەتدا.**

## ٧- دەروازەی: پابەندبوون بە سوننەتەوە و ڕەدکردنەوەی داهێنراوەکان لە دیندا

**٨٣٥-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا ما لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ).** [خ٢٦٩٧/ م١٧١٨]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لەم ئەمرەی ئێمەدا شتێك دابهێنێت لە ناو ئەمەدا نەبێت رەدکراوەیە).**

- وفي رواية لمسلم: (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ).

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: **(هەر کەس کارێك بکات ئەمری ئێمەی لەسەر نەبێت رەدکراوەیە).**

**٨٣٦**– (خ) عن ابْن عَوْنٍ قال: ثَلاَثٌ أُحِبُّهُنَّ لِنَفْسِي وَلِإِخْوَانِي: هَذِهِ السُّنَّةُ أَنْ يَتَعَلَّمُوهَا وَيَسْأَلُوا عَنْهَا، وَالْقُرْآنُ أَنْ يَتَفَهَّمُوهُ وَيَسْأَلُوا عَنْهُ، وَيَدَعُوا النَّاسَ إِلاَّ مِنْ خَيْرٍ.

[خ. الاعتصام، باب ٢]

**(خـ) لە ئیبن عەونەوە وتی: سێ شت بۆ خۆم و بۆ براکانم پێمخۆشن: ئەم سوننەتە فێری ببن و پرسیار بکەن دەربارەی، قورئان تێبگەن و پرسیار بکەن دەربارەی، وازبهێنن لە خەڵکی مەگەر لە خێردا.**

**٨٣٧**– عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ذَاتَ يَوْمٍ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا، فَوَعَظَنَا مَوْعِظَةً بَلِيغَةً، ذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ، وَوَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ، فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ كَأَنَّ هَذِهِ مَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ، فَمَاذَا تَعْهَدُ إِلَيْنَا؟

فَقَالَ: **(أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللهِ، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، وَإِنْ عَبْداً حَبَشِيّاً، فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلاَفاً كَثِيراً، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الْمَهْدِيِّينَ الرَّاشِدِينَ، تَمَسَّكُوا بِهَا وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ؛ فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ).**

[د٤٦٠٧/ ت٢٦٧٦/ جه ٤٢/ مي٩٦]

* صحيح.

**لە عیربازی کوڕی ساریەوە، وتی: رۆژێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی پێ کردین، پاشان رووی لێکردین، و ئامۆژگارییەکی کاریگەری کردین، و چاوەکان لێیەوە فرمێسکایان رژاند، و دڵان لێیەوە هاتنە هەژان، یەکێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەمە وەك ئامۆژگاریماڵئاواییە، چ وەسیەتێکمان بۆ دەکەی؟**

فەرمووی: (**وەسێتان بۆ دەکەم بە تـەقوای خـودا، و بیسـتن و گوێڕایـەڵی، بـا بەندەیەکی حەبەشیش بێت، چونکە ئەو کەسەی لە ئێوە لەدوای من دەژی ناکۆکی و جیاوازی زۆر دەبینێـت، دەسـتبگرن بـە سـوننەتی مـن و سـوننەتی خەلیفـەکانی راشیدینی هیدایەتدراوان، دەستی پێوە بگرن و توند بە ددان بیگـرن، ئاگادارتـان دەکەمەوە لە کاروبارە داهێنراوەکان، چونکە هەموو داهێنراوێك بیدعەیە، و هەموو بیدعەیەك گومڕاییە**).

## ٨- دەروازەی: هەر کەس بانگ بۆ هیدایەت بکات

**٨٣٨-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى، كَانَ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئاً، وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلاَلَةٍ، كانَ عَلَيْهِ مِنَ الإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئاً**). [م٢٦٧٤]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەر کـەس بـانگ بـۆ هیدایەتێك بکات هاوشێوەی پاداشتی ئەو کەسەی هەیە شوێنی دەکەوێت، ئەوە لە پاداشتیان کەم ناکاتەوە، هەر کەس بانگ بۆ گومڕاییەك بکات هاوشێوەی خراپەی ئەو کەسەی بۆ هەیە شوێنی دەکەوێت، ئەوە شتێك لە گوناهیان کەم ناکاتەوە**).

## ٩- دەروازەی: هەر کەس سوننەتێکی باش(چاك) رەنگرێژی بکات

**٨٣٩-** (م) عَنْ جَرِيرِ بنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي صَدْرِ النَّهَارِ، قَالَ: فَجَاءَهُ قَوْمٌ حُفَاةٌ عُرَاةٌ مُجْتَابِي النِّمَارِ أَوِ الْعَبَاءِ، مُتَقَلِّدِي السُّيُوفِ، عَامَّتُهُمْ مِنْ مُضَرَ، بَلْ كُلُّهُمْ مِنْ مُضَرَ. فَتَمَعَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِمَا رَأَى بِهِمْ مِنَ الْفَاقَةِ، فَدَخَلَ ثُمَّ خَرَجَ، فَأَمَرَ بِلاَلاً فَأَذَّنَ وَأَقَامَ، فَصَلَّى ثُمَّ خَطَبَ فَقَالَ: (﴿**يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ**﴾، إِلَى آخِرِ الآيَةِ ﴿**إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا١**﴾ [النساء:١] وَالآيَةَ [١٨] الَّتِي فِي الْحَشْرِ: ﴿**ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ**

لِغَدٍۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ﴾ تَصَدَّقَ رَجُلٌ مِنْ دِينَارِهِ، مِنْ دِرْهَمِهِ، مِنْ ثَوْبِهِ، مِنْ صَاعِ بُرِّهِ، مِنْ صَاعِ تَمْرِهِ. حَتَّى قَالَ: . وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ).

قَالَ: فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ بِصُرَّةٍ كَادَتْ كَفُّهُ تَعْجِزُ عَنْهَا، بَلْ قَدْ عَجَزَتْ. قَالَ: ثُمَّ تَتَابَعَ النَّاسُ، حَتَّى رَأَيْتُ كَوْمَيْنِ مِنْ طَعَامٍ وَثِيَابٍ، حتَّى رَأَيْتُ وَجْهَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَتَهَلَّلُ، كَأَنَّهُ مُذْهَبَةٌ.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً سَيِّئَةً، كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ، مِنْ غَيْرِ أَن يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ). [م١٠١٧]

(م) لە لە جەریری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: لە سەرەتای ڕۆژەوە لە خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین، وتی: کۆمەڵێکی پێپەتی سەرپەتی، پۆشاکی "النِّمار"[1] یان عەبایان لە خۆیانەوە ئاڵاندبوو، شمشێریان پێ بوو، بەگشتی لە "مضر" بەڵکو هەموویان لە "مضر" بوون، ڕوخساری پێغەمبەری خودا(ﷺ) گۆڕا کاتێك هەژاری بەوانەوە بینی، ڕۆیشتە ژوورەوە و پاشان هاتە دەرەوە، فەرمانی بە بیلال کرد بانگیدا و قامەتی کرد، نوێژی کرد و پاشان وتاریدا، فەرمووی: (﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ﴾، تا کۆتایی ئایەتەکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا①﴾، هەروەها ئایەتی (١٨) کە لە سورەتی (الحشر)دایە: ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ﴾ [الحشر: ١٨]، **پیاوێك لە دینارەکەی، لە درهەمەکەی، لە پۆشاکەکەی، لە صاعی گەنمەکەی، لە صاعی خورماکەی صەدەقە بکات)**، وتی: پیاوێك لە ئەنصار کیسەیەکی هێنا خەریك بوو دەستی نەیگرێت، بەڵکو دەستی دەستەوسان بوو لە گرتنی، وتی: پاشان خەڵکی بەدوای یەکتردا هێنایان، تا دوو کۆما لە خۆراك و پۆشاکم بینی، تا بینیم ڕوخساری پێغەمبەری خودا گەشایەوە وەك ئەوەی ڕووپۆشی زێڕ کرابێت.

---

[1] پۆشاکێکی خوری خەتخەت بووە -و.

**پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس لە ئیسلامدا سوننەتێکی چاك رەنگرێژی بکات پاداشتی ئەوە و پاداشتی ئەو کەسەی لەدوای ئەو کاری پێ دەکات بۆ ئەو هەیە، بەبێ ئەوەی لە پاداشتیان شتێك کەم بکات، هەر کەسیش لە ئیسلامدا سوننەتێکی خراپ رەنگرێژی بکات گوناهی ئەوە و گوناهی ئەو کەسەی لەدوای ئەو کاری پێ دەکات بۆ ئەو هەیە، بەبێ لە گوناهیان شتێك کەم بکات).**

**٨٤٠**- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: أَرْبَعٌ يُعْطَاهَا الرَّجُلُ بَعْدَ مَوْتِهِ: ثُلُثُ مَالِهِ إِذَا كَانَ فِيهِ قَبْلَ ذَلِكَ لِلَّهِ مُطِيعاً، وَالْوَلَدُ الصَّالِحُ يَدْعُو لَهُ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهِ، وَالسُّنَّةُ الْحَسَنَةُ يَسُنُّهَا الرَّجُلُ فَيُعْمَلُ بِهَا بَعْدَ مَوْتِهِ، وَالْمِائَةُ إِذَا شَفِعُوا لِلرَّجُلِ شُفِّعُوا فِيهِ. [مي٥٣٤]

* إسناده صحيح.

**لە ئیبن مەسعوودەوە، وتی: چوار شت بە پیاو دەدرێت لەدوای مردنی: سێیەکی ماڵەکەی گەر بەرلەوە تیایدا بۆ خودا گوێڕایەڵ بووبێت، منداڵێکی صاڵح لەدوای مردن دوعای بۆ بکات، سوننەتێکی چاکە پیاو رەنگرێژی بۆ بکات و لەدوای مردنی کاری پێ بکرێت، ئەو سەد کەسەی گەر تکا بۆ پیاو بکەن تکایان وەردەگیرێت[1].**

## ١٠- دەروازەی: فەرموودەی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ": (نموونەی من و ئێوە)

**٨٤١**- (ق) عَنْ أَبِي مُوسى، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ ما بَعَثَنِي اللهُ بِهِ، كَمَثَلِ رَجُلٍ أَتَى قَوْماً فَقَالَ: يَا قَوْمِ! إِنِّي رَأَيْتُ الجَيْشَ بِعَيْنَيَّ، وَإِنِّي أَنَا النَّذِيرُ الْعُرْيَانُ، فَالنَّجَاءَ، فَأَطَاعَهُ طَائِفَةٌ مِنْ قَوْمِهِ فَأَدْلَجُوا، فَانْطَلَقُوا عَلَى مَهَلِهِمْ فَنَجَوْا، وَكَذَّبَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ فَأَصْبَحُوا مَكَانَهُمْ، فَصَبَّحَهُمُ الجَيْشُ فَأَهْلَكَهُمْ وَاجْتَاحَهُمْ، فَذلِكَ مَثَلُ مَنْ أَطَاعَنِي فَاتَّبَعَ مَا جِئْتُ بِهِ، وَمَثَلُ مَنْ عَصَانِي وَكَذَّبَ بِمَا جِئْتُ بِهِ مِنَ الحَقِّ).** [خ٧٢٨٣، (٦٤٨٢)/ م٢٢٨٣]

---

[1] واتە: سەد کەسی موسڵمان نوێژ لەسەر جەنازەکەی بکەن و دوعای بۆ بکەن-و.

(ق) لە ئەبی موساوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(نموونەی من و نموونەی ئەوەی خودا منی پێ ڕەوانە كردووە وەك نموونەی پیاوێك وایە هات بۆ لای قەومێك و پێی وتن: ئەی قەوم، من بەم دوو چاوە سوپایەكم بینی، من تەنها ترسێنەرێكی رووتم[1]، هەوڵی رزگاربوون بدەن، كۆمەڵێك لە قەومەكەی گوێڕایەڵییان لێكرد و لە سەرەتای شەوەوە ڕۆیشتن، بە لەسەرخۆیی ڕۆیشتن و رزگاریان بوو، دەستەیەك لەوان بەدرۆیانزانی و لە شوێنەكەی خۆیان ڕۆژیان لێبوویەوە، لە بەیانیدا سوپاكە هێرشی بۆ هێنان و تیاچوون و رایماڵین[2]، ئەوە نموونەی ئەو كەسەیە گوێڕایەڵی لە من دەكات و شوێنی ئەوە دەكەوێت من هێناومە، هەروەها نموونەی ئەو كەسەی لە من یاخی دەبێت و ئەو حەقە بە درۆ دەزانێت من هێناومە).**

٨٤٢- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ النَّاسِ كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَاراً، فَلَمَّا أَضَاءَتْ ما حَوْلَهُ جَعَلَ الْفَرَاشُ وَهذِهِ الدَّوَابُّ الَّتِي تَقَعُ فِي النَّارِ يَقَعْنَ فِيهَا، فَجَعَلَ يَنْزِعُهُنَّ وَيَغْلِبْنَهُ فَيَقْتَحِمْنَ فِيهَا، فَأَنَا آخُذُ بِحُجَزِكُمْ عَنِ النَّارِ، وَأَنْتُمْ تَقَحَّمُونَ فِيهَا). [خ٦٤٨٣، (٣٤٢٦)/ م٢٢٨٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(نموونەی من و نموونەی خەڵك وەك پیاوێك وایە هەوڵی كردنەوەی ئاگرێك دەدات، كاتێك دەوروبەری خۆی ڕۆشن كردەوە پەپوولە و ئەم مێروانەی بەردەبنەوە بۆ ناو ئاگر دەكەونە ناوی، ئەویش هەوڵی گێڕانەوە و دوورخستنەوەیان دەدات، بەڵام بەسەریدا زاڵ دەبن و دەچنە ناویەوە، من پشتوێنتان دەگرم لە ئاگر دوورتان دەخەمەوە و ئێوە پەلامار دەدەن و دەچنە ناویەوە).**

---

[1] ترسێنەری رووت: زانایان دەڵێن ئەسڵەكەی: گەر پیاو بیویستبا هۆزەكەی خۆی بترسێنێ و لە شتێكی ترسناك ئاگاداریان بكاتەوە پۆشاكەكەی دادەكەند و بە دەستییەوە دەگرت و بەرزی دەكردەوە و بەوە ئاماژەی بە هۆزەكەی دەدا گەر ئەوان لە ئەو دووربوونایە، بۆئەوەی ئاگاداریان بكاتەوە لەوەی روویان لێ دەكات لە ترس و هەڕەشە.

[2] رایماڵین یان ریشكەندی كردن–و.

## ١١- دەروازەی: هۆشداریدان لە شوێنکەوتنی ئومەتانی پێشوو

**٨٤٣-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، شِبْراً بِشِبْرٍ، وَذِرَاعاً بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا جُحْرَ ضَبٍّ تَبِعْتُمُوهُمْ**). قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: (**فَمَنْ**)؟. [خ٧٣٢٠، (٣٤٥٦)/ م٢٦٦٩]

**(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: (بست بە بست و باڵ بە باڵ شوێنی سوننەتەکانی[1] ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون، تا گەر بچنە کونی بزنمژە شوێنیان دەکەون)، وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، یەهوود و نەصارا؟ فەرمووی: (ئەی کێیتر؟).**

## ١٢- دەروازەی: (ئێوە بە کاروباری دنیای خۆتان زاناترن)

**٨٤٤-** (م) عَنْ طلحةَ قَالَ: مَرَرْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِقَوْمٍ عَلَى رُؤُوسِ النَّخْلِ، فَقَالَ: (**مَا يَصْنَعُ هَؤُلاَءِ**) ؟ فَقَالُوا: يُلَقِّحُونَهُ، يَجْعَلُونَ الذَّكَرَ فِي الأُنْثَى فَتَلْقَحُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا أَظُنُّ يُغْنِي ذَلِكَ شَيْئاً**). قَالَ: فَأُخْبِرُوا بِذلِكَ فَتَرَكُوهُ، فَأُخْبِرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِذَلِكَ فَقَالَ: (**إِنْ كَانَ يَنْفَعُهُمْ ذَلِكَ، فَلْيَصْنَعُوهُ، فَإِنِّي إِنَّمَا ظَنَنْتُ ظَنّاً، فَلاَ تُؤَاخِذُونِي بِالظَّنِّ، وَلَكِنْ إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنِ اللهِ شَيْئاً، فَخُذُوا بِهِ، فَإِنِّي لَنْ أَكْذِبَ عَلَى اللهِ عزّ وجل**). [م٢٣٦١]

**(م) لە تەلحەوە وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پاڵ کۆمەڵێکدا تێپەڕین لەسەر دارخورما بوون، فەرمووی: (ئەوانە چی دەکەن؟)، وتیان: پەڕاندنیان بۆ دەکەن، نێرەکان دەکەنە ناو مێیەکانەوە و دەپەڕێن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (وا گومان نابەم ئەوە شتێك لە سوود بگەیەنێت)، وتی: هەواڵی ئەوەیان پێدرا و وازیان لە کارەکە هێنا، هەواڵی ئەوە بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) درا، فەرمووی: (گەر ئەوە سوودیان پێ دەگەیەنێت با ئەنجامی بدەن، من تەنها گومانێکم برد، بە**

[1] سوننەتەکان: نەرێت و رێگە و رەوگە-و.

**گومان من مەگرن، بەڵام گەر لە خوداوە شتێکم بۆ باس کردن وەریبگرن، چونکە من بە دەم خوداوە(عز وجل) درۆ ناکەم).**

**٨٤٥-** (م) عَنْ عَائِشَةَ وَعَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم مَرَّ بِقَوْمٍ يُلَقِّحُونَ، فَقَالَ: (**لَوْ لَمْ تَفْعَلُوا لَصَلُحَ**) ، قَالَ: فَخَرَجَ شِيصاً، فَمَرَّ بِهِمْ فَقَالَ: (**مَا لِنَخْلِكُمْ**) ؟ قَالُوا: قُلْتَ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: (**أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ**). [م٢٣٦٣]

(م) لــە عائیشــە و لــە ئەنەســەوە: پێغەمبــەر(ﷺ) بــەپاڵ کۆمەڵێکـدا تێپــەڕی پەڕاندنیان بۆ دارخورما دەکرد، فەرمووی: **(گەر ئەوەیان نەکردبا باش دەبوو)**، وتی: خورمایەکی خراپ و قەڵبی گرت، بە پاڵیاندا گوزەری کرد فەرمووی: **(دارخورماکانتان چییانە)**، وتیان: ئاوا و ئاوات فەرموو، فەرمووی: **(ئێوە زاناترن بە کاروباری دنیاتان)**.

## ١٣- دەروازەی: نەسخی سوننەت بە سوننەت

**٨٤٦-** (م) عَنْ أَبِي الْعَلاَءِ بْنِ الشِّخِّيرِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَنْسَخُ حَدِيثُهُ بَعْضُهُ بَعْضاً، كَمَا يَنْسَخُ الْقُرْآنُ بَعْضُهُ بَعْضاً. [م٣٤٤]

**(م) لە ئەبی عەلای کوڕی شەخیرەوە[1]، وتی: فەرموودەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەندێکی هەندێکی تری نەسخ دەکردەوە، وەك چۆن قورئان هەندێکی هەندێکی تری نەسخ دەکاتەوە.**

## ١٤- دەروازەی: فــەرمــانــی پــێــغەمبــەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" واجببوون دەخوازێت.

**٨٤٧-** عَنْ جَابِرٍ قَالَ: لَمَّا اسْتَوَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ الْجُمُعَةِ، قَالَ: (**اجْلِسُوا**) ، فَسَمِعَ ذَلِكَ ابْنُ مَسْعُودٍ، فَجَلَسَ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، فَرَآهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**تَعَالَ يَا عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ**). [د١٠٩١]

* صحيح.

---

[1] ئەبو عەلای کوڕی شەخیر لە شوێنکەوتوانە و هاوەڵی پێغەمبەر نییە.

لە جابرەوە وتی: کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ڕۆژی جومعە چووە سەر مینبەر فەرمووی: **(دانیشن)**، ئیبن مەسعوود گوێی لەوە بوو لە دەرگای مزگەوتەکە دانیشت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی عەبدوڵای کوڕی مەسعوود وەرە)**.

## ١٥- دەروازەی: واجیبوونی کار بە سوننەت

**٨٤٨-** عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَلاَ هَلْ عَسَى رَجُلٌ يَبْلُغُهُ الْحَدِيثُ عَنِّي، وَهُوَ مُتَّكِئٌ عَلَى أَرِيكَتِهِ، فَيَقُولُ: بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كِتَابُ اللهِ، فَمَا وَجَدْنَا فِيهِ حَلاَلاً اسْتَحْلَلْنَاهُ، وَمَا وَجَدْنَا فِيهِ حَرَاماً حَرَّمْنَاهُ، وَإِنَّ مَا حَرَّمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَمَا حَرَّمَ اللهُ)**. [ت٢٦٦٤/ جه١٢/ مي٦٠٦]

* صحيح.

لە میقدامی کوڕی مەعدیکەریب، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئاگادارتان دەکەمەوە لەوانەیە پیاوێك لە منەوە فەرموودەیەکی پێ بگات و ئەو لەسەر قەرەوێڵەکەی شانی دادابێت، دەڵێت: "لە نێوان ئێمە و ئێوە کتێبەکەی خودا هەیە، ئەوەی تیایدا بینیمان حەڵاڵە بە حەڵاڵی دەزانین و ئەوەی تیایدا بینیمان حەرامە بە حەرامی دەزانین[1]"، وەك چۆن خودا کۆمەڵێك شتی حەرام کردووە پێغەمبەری خوداش کۆمەڵێك شتی حەرام کردووە[2])**.

**٨٤٩-** وَعَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: **(أَلاَ إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ، أَلاَ يُوشِكُ رَجُلٌ شَبْعَانُ عَلَى أَرِيكَتِهِ يَقُولُ: عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْقُرْآنِ، فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَلاَلٍ**

---

[1] تا ئەم جێگە قسەی ئەو پیاوەیە کە پێغەمبەر باسی دەکات-و.

[2] واتە: ئاگادار بن وەك چۆن خودا کۆمەڵێك شتی حەرام کردووە پێغەمبەری خوداش کۆمەڵێك شتی حەرام کردووە-و.

فَأَحِلُّوهُ، وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوهُ، أَلاَ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ لَحْمُ الْحِمَارِ الْأَهْلِيِّ، وَلاَ كُلُّ ذِي نَابٍ مِنَ السَّبُعِ، وَلاَ لُقَطَةُ مُعَاهِدٍ؛ إِلاَّ أَنْ يَسْتَغْنِيَ عَنْهَا صَاحِبُهَا، وَمَنْ نَزَلَ بِقَوْمٍ فَعَلَيْهِمْ أَنْ يَقْرُوهُ، فَإِنْ لَمْ يَقْرُوهُ فَلَهُ أَنْ يُعْقِبَهُمْ بِمِثْلِ قِرَاهُ). [د٤٦٠٤]

* صحيح.

هەر لە میقدامەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، فەرمووی: **(ئاگادار بن کتێبەکە و هاوشێوەی کتێبەکە لەگەڵی بە من دراوە، ئاگادار بن خەریکە پیاوێکی تێر لەسەر قەرەوێڵەکەی بڵێت: لەسەرتانە دەست بەم قورئانەوە بگرن، ئەوەی تیایدا بینیتانەوە لە حەلاڵ بە حەلاڵی بزانن، ئەوەی تیایدا بینیتانەوە لە حەرام بە حەرامی بزانن، ئاگادار بن خواردنی گوێدرێژی ئەهلی بۆ ئێوە حەلاڵ نییە، هەر بەو جۆرە هەموو کەڵبەدارێك لە درندە، بەهەمان شێوە دۆزراوەی کەسی هاوپەیمان، مەگەر خاوەنەکەی لێی بێنیاز بێت، هەر کەس بوو بە میوانی کۆمەڵێك لەسەریانە میوانداری لێ بکەن، گەر میوانداریان لێ نەکرد بۆی هەیە بە هاوشێوەی میوانداریەکەی سزایان بدات و مامەڵەیان بکات).**

## ١٦- دەروازەی: خۆپارێزی لە فەرمووده لەوەوە "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٨٥٠-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: كَانَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ إِذَا حَدَّثَ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَدِيثاً، فَفَرَغَ مِنْهُ، قَالَ: أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [جە٢٤]

* صحيح.

لە محەمەدی کوڕی سیرینەوە، وتی: کاتێك ئەنەسی کوڕی مالیك لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموودەیەکی دەگێڕایەوە و لێدەبوویەوە، دەیوت: یان بەو جۆرەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی.

**٨٥١**– عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: قُلْنَا لِزَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ: حَدِّثْنَا عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، قَالَ: كَبِرْنَا وَنَسِينَا، وَالْحَدِيثُ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم شَدِيدٌ. [جه٢٥]

* صحيح.

**لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبی لەیلاوە، وتی: بە زەیدی کوڕی ئەرقەممان وت: لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموودەمان بۆ باس بکە، وتی: پیربووین و لەبیرمانچووە، فەرموودە لە پێغەمبەری خوداوە سەخت و دژوارە.**

## ١٧- دەروازەی: فەرموودە لە متمانەدارانەوە(باوەڕپێکراوانەوە)

**٨٥٢**– (م) عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: جَاءَ بُشَيْرٌ الْعَدَوِيُّ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، فَجَعَلَ يُحَدِّثُ وَيَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَجَعَلَ ابْنُ عَبَّاسٍ لاَ يَأْذَنُ لِحَدِيثِهِ وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، مَا لِي لاَ أَرَاكَ تَسْمَعُ لِحَدِيثِي؟ أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَلاَ تَسْمَعُ! فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّا كُنَّا مَرَّةً إِذَا سَمِعْنَا رَجُلاً يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ابْتَدَرَتْهُ أَبْصَارُنَا، وَأَصْغَيْنَا إِلَيْهِ بِآذَانِنَا، فَلَمَّا رَكِبَ النَّاسُ الصَّعْبَ وَالذَّلُولَ، لَمْ نَأْخُذْ مِنَ النَّاسِ إِلاَّ مَا نَعْرِفُ. [م. المقدمة. باب (٤)]

**(م) لە موجاهیدەوە، وتی: بوشەیری عەدەوی هات بۆ لای ئیبن عەباس، فەرموودەی دەگێڕایەوە و دەیوت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی، ئیبن عەباس گوێی بۆ قسەکانی نەدەگرت و تەماشای نەدەکرد، وتی: ئەی ئیبن عەباس، بۆچی نابینم گوێ لە فەرموودەکانم بگری؟ من لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بۆت باس دەکەم و تۆ گوێ ناگری! ئیبن عەباس وتی: ئێمە گەر جارێک بیستمان پیاوێک دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی، چاومان دەخەینە سەری و گوێی بۆ دەگرین، کاتێک خەڵکی سواری هەموو گران و ئاسانێک(سەخت و تەختێک) بوون تەنها ئەوە لە خەڵکی وەردەگرین دەیزانین[1].**

---

[1] دەیزانین یان دەیناسی–و.

**٨٥٣**- عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ قَالَ: كَانُوا إِذَا أَتَوْا الرَّجُلَ لِيَأْخُذُوا عَنْهُ الْعِلْمَ، نَظَرُوا إِلَى صَلاَتِهِ، وَإِلَى سَمْتِهِ، وَإِلَى هَيْئَتِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُونَ عَنْهُ. [مي٤٣٤]

* إسناده صحيح.

**لە ئیبراهیمی نەخەعییەوە، وتی: ئەوان كاتێك دەهاتن بۆ لای پیاوێك زانستی لێ وەربگرن تەماشای نوێژەكەیان دەكرد، تەماشای ویقار و هەڵكەوتەیان دەكرد، پاشان لێیان وەردەگرت.**

## ١٨- دەروازەی: ئایا فەرموودە بە ماناكەی دەگوێزرێتەوە؟

**٨٥٤**- عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ قَالَ: إِذَا حَدَّثْنَاكُمْ بِالْحَدِيثِ عَلَى مَعْنَاهُ فَحَسْبُكُمْ. [مي٣٢٤]

* إسناده صحيح.

**لە وائیلەی كوڕی ئەسقەعەوە، وتی: گەر لەسەر ماناكەی فەرموودەیەكمان بۆ باس كردن ئەوە بەسە بۆ ئێوە.**

**٨٥٥**- عن جَرِيرِ بْنِ حَازِمٍ قَالَ: كَانَ الْحَسَنُ يُحَدِّثُ بِالْحَدِيثِ، الْأَصْلُ وَاحِدٌ، وَالْكَلاَمُ مُخْتَلِفٌ. [مي٣٢٦]

* إسناده صحيح.

**لە جەریری كوڕی حازمەوە، وتی: حەسەن فەرموودەیەكی باس دەكرد، ئەسڵەكەی یەك بوو و قسەكان جیاوازبوون.**

**٨٥٦**- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ الْحُسَيْنِ قَالَ: حَدَّثَ عُبَيْدُ بْنُ عُمَيْرٍ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَثَلُ الْمُنَافِقِ مَثَلُ الشَّاةِ بَيْنَ الرَّبِيضَيْنِ، أَوْ بَيْنَ الْغَنَمَيْنِ**) ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: لاَ، إِنَّمَا قَالَ كَذَا وَكَذَا. قَالَ: وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم لَمْ يَزِدْ فِيهِ وَلَمْ يُنْقِصْ مِنْهُ، وَلَمْ يُجَاوِزْهُ وَلَمْ يُقَصِّرْ عَنْهُ. [مي٣٢٧]

* إسناده صحيح.

لـە محەمـەدی کـوڕی عـەلی کـوڕی حوسـەینەوە، وتـی: عوبەیـدی کـوڕی عومـەیر فەرموودەیەکی بۆ عەبدوڵای کوڕی عومەر بـاس کـرد و وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: **(نموونەی کەسی دووڕوو وەك کاوڕێك وایە لە نێوان دوو راندا یان لە نێوان دوو رانەمەڕدا)**، ئیبن عومەر وتی: نەخێر، بەڵکو پێغەمبەر ئاوا و ئاوای فەرموو، وتی: کاتێك ئیبن عومەر گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بووبێت تیایدا زیادی نەدەکرد و لێـی کـەم نەدەکرد، تێینەدەڕاند و کورتی نەدەکردەوە.

## ١٩- دەروازەی: دەربارەی خستنەڕوو

٨٥٧- (خ) عَنِ الْحَسَنِ البَصْرِيِّ قَالَ: لاَ بَأْسَ بِالْقِرَاءَةِ عَلَى الْعَالِمِ.

(خـ) لە حەسەنی بەصرییەوە، وتی: خراپ نییە بەسەر زانادا بخوێنیتەوە.

٨٥٨- (خ) وعَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ قَالَ: إِذَا قُرِئَ عَلَى الْمُحَدِّثِ فَلاَ بَأْسَ أَنْ يَقُولَ: حَدَّثَنِي.

(خـ) لـە سـوفیانی سـەورییەوە، وتـی: گـەر بەسـەر فەرموودەوێـژ(الْمُحَـدِّث)دا خوێنرایەوە، خراپ نییە بڵێت: "حدَّثني-بۆی باس کردم".

٨٥٩- (خ) وعَنْ مَالِكٍ وَسُفْيَانَ: الْقِرَاءَةُ عَلَى الْعَالِمِ وَقِرَاءَتُهُ سَوَاءٌ. [خ. العلم، باب ٦]

(خـ) لە مالیك و سوفیانەوە: خوێندنەوە بەسەر زانا و خوێندنەوەکەی ئەو یەکسانە[١].

٨٦٠- عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ: أَنَّهُ كَانَ يَرَى الْعَرْضَ وَالْحَدِيثَ سَوَاءً. [مي٦٦٥]

* إسناده صحيح.

لە مالیکی کوڕی ئەنەسەوە: ئەو لای وابوو خستنەڕوو و بیستنی فەرموودە یەکسانن.

---

[١] واتـە: گـەر کەسـێك فەرموودەیـەك بەسـەر فەرموودەوێـژێك(المحـدث)دا بخوێنێتـەوە و پەسەندی بکات وەك ئەوە وایە فەرموودەکەی لە فەرموودەوێژەکە وەرگرتبێت-و.

## ٢٠- دەروازەی: تەئویلی فەرموودەی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٨٦١-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَدِيثاً، فَظُنُّوا بِهِ الَّذِي هُوَ أَهْنَاهُ وَأَهْدَاهُ وَأَتْقَاهُ. [جه ٢٠/ مي ٦١٢]

* صحيح.

**لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە، وتی: گەر لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموودەیەکم بۆ باس کردن ئەوا گومانی ڕەوانترین[1] و هیدایەتدەرترین و تەقوادارترینی پێ ببەن[2].**

**٨٦٢-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ: أَنَّهُ حَدَّثَ يَوْماً بِحَدِيثٍ عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ رَجُلٌ: فِي كِتَابِ اللهِ مَا يُخَالِفُ هَذَا. قَالَ: أَلاَ أُرَانِي أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَتُعَرِّضُ فِيهِ بِكِتَابِ اللهِ؟ كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَعْلَمَ بِكِتَابِ اللهِ مِنْكَ. [مي ٦١٠]

* إسناده صحيح.

**لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە: ڕۆژێك فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) باس کرد، پیاوێك وتی: لە کتێبەکەی خودادا هەیە[3] پێچەوانەیە لەگەڵ ئەمە، سەعید وتی: دەزانی پێمنیشاندرا، من لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموودەت بۆ باس دەکەم تۆش بە کتێبەکەی خودا تیایدا بەرهەڵستی دەکەی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) زاناتر بووە بە کتێبەکەی خودا لە تۆ[4].**

---

[1] ڕەوانترین: واتە باڵاترین لە ڕووی زمانەوە و شیرینترین لە ڕووی دەربڕینەوە-و.

[2] واتە: لە فەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) هیدایەت و تەقوا بە ڕەوانترین و شیرینترین زمان گوزارشتیان لێدراوە-و.

[3] واتە: لە کتێبەکەی خودادا ئایەت هەیە، پێچەوانە بەم فەرموودەی تۆ باست کرد-و.

[4] واتە: تۆ زانستی هەموو کتێبەکەی خودات لە لا نییە، ئەو ئایەتەش تۆ دەیکەی بە بەڵگە ناحاڵبوونی تۆیە لە ئایەتەکە، چونکە پێغەمبەر شتێك نافەرموێ پێچەوانەی قورئان بێت، دیارە فەرموودەکە سەحیح بووە و جێگەی مشتومڕی زانایان نەبووە، چونکە گەر ڕیوایەتەکە لاواز بوایە سەعیدی کوڕی جوبەیر پێداگرانە و بەقینانە نەیدەدایە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ) و بەرپەرچی قسەکەرەکەی نەدەدایەوە-و.

## ٢١- دەروازەی: مەزنڕاگرتنی سوننەت

**٨٦٣**- عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: حَدَّثَ ابْنُ سِيرِينَ رَجُلاً بِحَدِيثٍ عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ رَجُلٌ: قَالَ فُلاَنٌ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ ابْنُ سِيرِينَ: أُحَدِّثُكَ عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَتَقُولُ: قَالَ فُلاَنٌ كَذَا وَكَذَا؟! لاَ أُكَلِّمُكَ أَبَداً. [مي٤٥٥]

* إسناده حسن.

**لە قەتادەوە وتی: ئیبن سیرین فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بۆ پیاوێك باس کرد، پیاوێکی تر وتی: فڵان ئاوا و ئاوا دەڵێت، ئیبن سیرین وتی: من لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموودەت بۆ باس دەکەم تۆش دەڵێی: فڵان ئاوا و ئاوا دەڵێت؟! هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم.**

**٨٦٤**- عن مُعْتَمِر بْنِ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَمَا تَخَافُونَ أَنْ تُعَذَّبُوا، أَوْ يُخْسَفَ بِكُمْ أَنْ تَقُولُوا: قَالَ رَسُولُ اللهِ، وَقَالَ فُلاَنٌ؟! [مي٤٤٥]

* إسناده صحيح.

**لە موعتەمیری کوڕی سولەیمانی تەیمییەوە، لە باوکییەوە، وتی: ئیبن عەباس وتی: ئێوە ناترسن سزا بدرێن، یان بە ناخی زەویدا بچن کاتێك دەڵێن: پێغەمبەری خودا فەرمووی، و فڵان کەسیش وتی؟[1].**

**٨٦٥**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: أنه رأى رَجُلاً يُصَلِّي بَعْدَ الْعَصْرِ الرَّكْعَتَيْنِ يُكْثِرُ، قَالَ لَهُ: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ، أَيُعَذِّبُنِي اللهُ عَلَى الصَّلاَةِ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِنْ يُعَذِّبُكَ اللهُ بِخِلاَفِ السُّنَّةِ. [مي٤٥٠]

* إسناده جيد.

---

[1] **دیارە کاتێك کەسەکە دەڵێت: (فڵان کەسیش وتی) قسەی ئەو فلانە پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەر بووە، بۆیە ئیبن عەباس ئەوەندە توند هەڕەشەیان لێ دەکات-و.**

لە سەعیدی كوڕی موسەییەبەوە: ئەو پیاوێكی بینی لە دوای عەصر دوو ركات نوێژی ئەنجام دا و زۆری دەكرد[1]، پیاوەكە پێی وت: باوكی محەمەد[2]، ئایا خودا لەسەر نوێژ سزام دەدات؟ سەعید وتی: نەخێر، بەڵام خودا بە سەرپێچی لە سوننەت سزات دەدا.

٨٦٦- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْمَاعِيل البُخَارِيِّ قَالَ: قَالَ زَكَرِيَّا بْنُ عَدِي: لما قَدِمَ ابْنُ المبَارَكِ الْكُوفَةَ كَانَتْ بِهِ عِلَّةٌ، فَأَتَاهُ وَكِيعٌ وَأَصْحَابُنَا وَالْكُوفِيُّونَ، فَتَذَاكَرُوا عِنْدَهُ، حَتَّى بَلَغُوا الشَّرَابَ، فَجَعَلَ ابْنُ المبَارَكِ يَحْتَجُّ بِأَحَادِيثِ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم وَأَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَالمهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ قَالُوا: لاَ وَلَكِنْ مِنْ حَدِيثِنَا، فَقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: أَخْبَرَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَمْرِو الْفُقَيْمِي عَنْ فُضَيْل بْنِ عَمْرٍو عَنْ إِبْراهِيمَ قَالَ: كَانُوا يَقُولُونَ: إِذَا سَكِرَ مِنْ شَرَابٍ لَمْ يَحِلَّ لَهُ أَنْ يَعُودَ فِيهِ أَبَداً، فَنَكَّسُوا رُؤُوسَهُمْ.

فَقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ لِلَّذِي يَلِيهِ: رَأَيْتَ أَعْجَبَ مِنْ هَؤُلاَءِ؟! أُحَدِّثُهُمْ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَعَنْ أَصْحَابِهِ وَالتَّابِعِينَ فَلَمْ يَعْبَؤُوا بِهِ، وَأَذْكُرُ عَنْ إِبْرَاهِيمَ فَنَكَّسُوا رُؤُوسَهُمْ. [هق٨/٢٩٨]

لە محەمەدی كوڕی ئیسماعیلی بوخارییەوە، وتی: زەكەریای كوڕی عەدی وتی: كاتێك ئیبن موبارەك هات بۆ كوفە نەخۆش بوو، وەكیع و هاوەڵانی ئێمە و كوفییەكان هاتن بۆ لای، لای ئەو فەرموودەیان باس دەكرد تا گەیشتنە شەراب[3]، ئیبن موبارەك بەڵگەی دەهێنایەوە بە كۆمەڵێك فەرموودەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) و كۆچكەران و ئەنصار لە ئەهلی مەدینە، ئەوانیش دەیانوت: نەخێر، بەڵكو لە فەرموودەی ئێمەدا[4]، ئیبن موبارەك وتی: حەسەنی كوڕی عەمری فوقەیمی

---

[1] واتە: نوێژەكەی درێژەی دەكێشا-و.

[2] كونیەی سەعیدی كوڕی موسەییبە-و.

[3] واتە: تا گەیشتنە ئەو فەرموودانەی باسی عارەقیان دەكرد-و.

[4] لە فەرموودەی ئێمەدا: واتە لە فەرموودەی ئێمەی كوفییەكاندا بە جۆرێكی ترە.

لە فوزەیلی کوڕی عەمرەوە لە ئیبراهیمەوە هەواڵی پێدایین وتی: ئەوان[1] دەیانوت: گەر لە خواردنەوەیەك سەرخۆش بوو بۆی حەڵاڵ نییە هەرگیز بگەڕێتەوە بۆ ناوی[2]، ئەوانیش سەری خۆیان داخست.

ئیبن موبارەك وتی بەوەی پاڵ خۆی: ئایا سەرسوڕهێنتر لەوانەت بینیوە؟! من لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هاوەڵان و شوێنکەوتوانەوە فەرموودەیان بۆ باس دەکەم کەچی باکێکیان پێی نییە، بەڵام لە ئیبراهیمەوە[3] بۆیان باس دەکەم سەری خۆیان دادەخەن.

## ٢٢- دەروازەی: ئوممەت لەسەر گومڕایی کۆنابێتەوە

**٨٦٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: إِنَّ اللهَ نَظَرَ فِي قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَوَجَدَ قَلْبَ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم خَيْرَ قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَاصْطَفَاهُ لِنَفْسِهِ، فَابْتَعَثَهُ بِرِسَالَتِهِ، ثُمَّ نَظَرَ فِي قُلُوبِ الْعِبَادِ بَعْدَ قَلْبِ مُحَمَّدٍ، فَوَجَدَ قُلُوبَ أَصْحَابِهِ خَيْرَ قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَجَعَلَهُمْ وُزَرَاءَ نَبِيِّهِ، يُقَاتِلُونَ عَلَى دِينِهِ، فَمَا رَأَى الْمُسْلِمُونَ حَسَناً فَهُوَ عِنْدَ اللهِ حَسَنٌ، وَمَا رَأَوْا سَيِّئاً فَهُوَ عِنْدَ اللهِ سَيِّئٌ. [حم٣٦٠٠]

* إسناده حسن.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: خودا لە دڵی بەندەکان وردبوویەوە بینی دڵی محەمەد(ﷺ) باشترین دڵی بەندەکانە، بۆیە بۆ خۆی هەڵیبژارد و پەیامەکەی خۆی پێدا رەوانەکرد، پاشان لە دوای دڵی محەمەد لە دڵی بەندەکان وردبوویەوە بینی دڵی هاوەڵانی باشترین دڵی بەندەکانە بۆیە ئەوانی کرد بە وەزیرانی پێغەمبەرەکەی، لەسەر دینەکەی دەجەنگن، ئەوەی موسڵمانان بە چاك و باشی بزانن لای خودا چاك و باشە، ئەوەی بە خراپی بزانن لای خودا خراپە.

---

[1] واتە: هاوەڵان و گەورە تابعین-و.

[2] واتە: ئەمە رێسایەکی نەگۆڕە: (کل مُسکر حرام-هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە)-و.

[3] چونکە ریوایەتی ئیبراهیم لای کوفییەکان قبووڵکراو بووە و جێگەی مشتومڕ و رەدکردنەوە نەبووە-و.

## ٢٣- دەروازەی: فـەرمـوودەی "هـاوەڵـی پـێـغەمـبـەر" لـە "هاوەڵی پێغەمبەر"ەوە

**٨٦٨-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: مَا كُلُّ الْحَدِيثِ سَمِعْنَاهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، كَانَ يُحَدِّثُنَا أَصْحَابُنَا عَنْهُ، كَانَتْ تَشْغَلُنَا عَنْهُ رَعِيَّةُ الْإِبِلِ. [حم١٨٤٩٣، ١٨٤٩٨]

* حديث صحيح.

**لە بەرائی كوڕی عازیبەوە، وتی: هەموو فەرموودەكان لە پێغەمبەری خودامان نەبیستووە، هاوەڵانمان لە ئەوەوە بۆیان دەگێڕاینەوە، بەخێوكردنی حوشتر سەرقاڵی دەكردین لە ئەو[1].**

[1] لە ئەو: واتە لە پێغەمبەر(ﷺ)-و.

# پێرست



## مەبەستی یەکەم: بیروباوەڕ ١٣

## مەبەستی دووەم: زانست و سەرچاوەکانی ١٩٧

## 

## 